دوکتور مارف خەزنەدار

# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پڕۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردی‌یە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

بەرگی حەوتەم

١٩٤٥ - ١٩٧٥

B



# میژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی

میژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە

تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

**بەرگی حەوتەم**

**١٩٤٥ - ١٩٧٥**

**B**

## دوکتۆر مارف خەزنەدار



کتێب: میژووی ئەدەبی کوردی – بەرگی حەوتەم - B

دانانی: د. مارف خەزنەدار

بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٤٦٦

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم

پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد حەمید

سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود

چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٦



لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٣٣٩)ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ

# پێشەکی

بەم بەرگە پڕۆژەی نووسینەوەی «مێژووی ئەدەبی کوردی» لە سەرەتاوە تا ناوەڕاستی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم تەواو دەبێ (١٩٧٥). لە دوای ئەمە ئەدەبی هاوچەرخ دەست پێ دەکا، سەرچاوە و کەرەستەی بۆ ئامادە کراوە. لە ڕووی کاتەوە بەبەریەوە هەیە لە ڕۆژگارێکی نزیک یا هەندێ دووریشەوە بنووسرێتەوە بەو شێوازەی ئەم زنجیرە کتێبەی پێ نووسراوەتەوە.

دەستەییێک لە شاعیرانی کورد لە سەرەتای ئەدەبی کوردییەوە تا دوایی سەدەی نۆزدەم پێویست بوو بەشی تایبەتی بۆ ژیان و بەرهەمیان تەرخان بکرێ، بەڵام سەرچاوە لە بەردەستدا نەبوو، لە ماوەی لە چاپدانی هەندێ لە بەرگەکانی ئەم کتێبە سەرچاوەی تازە دەست کەوت فریای بەرگە چاپکراوەکان نەکەوت. ئەوانەی سەدەی بیستەمیش تا ئێستا شاعیر و نووسەر هەیە کۆچی دواییان کردووە کەچی لەم کتێبەدا باس لە بەرهەم و هونەریان نەکراوە. ئەمانە لە بیر نەکراون و مێژووی ئەدەبی کوردی پشتگوێیان ناخا. لەبەرئەوەی ئەم بەرگە تەواوکەری بەرگی پێشووە بۆیە تەنیا ئەو بەشانەی گرتۆتە خۆ کە باس لە ژیان و بەرهەمی ئەو شاعیرانە دەکەن کە سەر بەماوەی (١٩٤٥ - ١٩٧٥)ن. هەندێکیان کەوتنە بەرگی شەشەم و پاشماوەکەیان لەم بەرگەدا بڵاوکراوەتەوە، ژمارەیان پەنجا شاعیر و نووسەرە، گەورەترینیان بەتەمەن عوسمان سەبرییە لە ساڵی ١٩٠٥ لە دایک بووە، بچووکترینیان جەمیل ڕەنجبەرە لە ساڵی ١٩٤٨ لە دایک بووە.

سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە سەرەتای ژیانی ڕۆشنبیریمەوە یارمەتییان داوم. سوپاس بۆ عومەر مەعرووف بەرزنجی سەرچاوە و کەرەستەی زۆری خستە بەردەستم بۆ هەردوو بەرگی شەشەم و حەوتەم. سوپاس بۆ ئەحمەد حوسێن ئەحمەد هەندێ کتێبی دەگمەن و سەرچاوەی کۆن و کەرەستەی ڕۆشنبیری دێرینی پێشکێش کردم. سوپاس بۆ بەدران ئەحمەد حەبیب دەوری دیاری هەبوو لە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە بەم شێوەیە. سوپاس بۆ میللەتی کوردی خۆشەویستم ئەگەر ئەو نەبووایە ئەم زنجیرە کتێبەی «مێژووی ئەدەبی کوردی» و ئەوەی بەدرێژایی تەمەنم نووسیومە نەدەبوون.

هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکی
١٥ ئاغستوسی ٢٠٠٥

مارف خەزنەدار

# بەشی یەکەم

## عوسمان سەبری

۱۹۰۵ - ۱۹۹۳

### ژیانی

عوسمان سەبری لە ٥ی کانوونی دووەمی ۱۹۰٥ لە گوندی نارنج لە قەزای کاختە لە کوردستانی عوسمانی لە دایک بووە. باوکی لە ئاغایانی عەشرەتی مردێسی بووە، هێشتا منداڵ بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە. شوکری مامی گرتوویەتییە خۆ و پەروەردەی کردووە و لەبەر خوێندنی داناوە و بووە بەقوتابی قوتابخانەی روشدییە، لە ساڵی ۱۹۲۲ تەواوی کردووە. لەو ماوەیەدا هەردوو مامی شوکری و نووری بەشدارییان لە شۆڕشی کوردی باکوور کردووە بەسەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران، لە ئەنجامی لەناوبردنی شۆڕش و لە سێدارەدانی سەرۆکەکان لە ساڵی ۱۹۲٥ بنەماڵەی عوسمان سەبری لە دیاربەکر (ئامەد) ئاوارەبوون، وەکو هەزاران بنەماڵەی کورد کەوتنە ڕۆژی ڕەشەوە. کردەوە تیرۆریستییەکانی تورکە کەمالییەکان هاندەرێک بوو لاوانی وەکو عوسمان سەبری بکەونە خەباتی نهێنی لە دژی دەوڵەتی تورک. دەسەڵات زەفەری پێ دەبا و دەیگرێ، تا ساڵی ۱۹۲۸ لە بەندیخانە دەمێنێتەوە. لە ساڵی ۱۹۲۹ جارێکی دیکە دەکەوێتەوە ناو داوی جەندرمەی تورک و دەدرێتە دادگای سوپایی. ڕزگاربوونی لەم گرتنە دەبێتە هۆی ئەوەی وڵات بەجێ بێڵێ و پەنا بۆ سووریا ببا، ئەو کاتە وڵاتی شام هێشتا لە ژێر فەرمانڕەوایی فەرەنسا بوو.

عوسمان سەبری لە کانوونی یەکەمی ۱۹۲۹ سنووری تورکیا و سووریا دەبڕێ. هەرچەندە لەم وڵاتەشدا نەیتوانیوە بێ سەرئێشە خەباتی سیاسی بباتە سەر بەڵام تا پاش جەنگی یەکەمی گێتی لە تورکیا باشتر بووە. لە سووریا دەست بەخوێندن دەکاتەوە، بەتایبەتی خۆی فێری زمانی عەرەبی دەکا. جەلادەت بەدرخان دەوری گرنگی بووە لە فێرکردنی عوسمان سەبری. بەڵام زۆربەی کاتی لە سیاسەتدا خەرج کردووە، لە ژیانی ڕێکخراوی سیاسی و پارتییایەتییەوە نزیک بووە. بیروباوەڕی کوردایەتی لە لای بەهێز بووە، باوەڕی بەدیمۆکراتییەت بووە، لەسەر هەژار و بێ دەسەڵاتانی کردۆتەوە. لە دژی



ئەمپریالیستی ئەورووپا بووە، هەرچۆنێک بێ، بیری لە چی کردبێتەوە یا هەر جموجۆڵییێکی سیاسی نواندبێ لە پێشانا بۆ چاکە و بەرژەوەندی بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد بووە. لە پێناوی هێنانەدی ئاواتەکانی زیاتر لە دە جار گیراوە، چەند جارێکیش لە ماڵی خۆی دوورخراوەتەوە، جگە لەوەی ماوەییێکی زۆر بەدەستبەسەری لە ژێر چاودێری پۆلیسی سووریا بووە.

لە ساڵانی ۱۹۳۲ - ۱۹٤٥ لە کۆوار و چاپەمەنییەکانی بەدرخانییان نزیک بووە، نووسینی لە شیعر و پەخشان لە کۆواری «هاوار» و «ڕۆناهی» بڵاوکردۆتەوە. لە ساڵی ۱۹٥۷ جموجۆڵیی سیاسی بەهێز بووە، بەکوڵ خەباتی کردووە. لە ساڵی ۱۹٦۰ لە سەردەمی فەرمانڕەوایی جەمال عەبدولناسر و بەستنی یەکێتی لە نێوان میسر و سووریا عوسمان سەبری گیراوە تا ساڵی ۱۹٦۲ لە بەندیخانە هەڵاتووە و خۆی لە بێرووت شاردۆتەوە، لە ساڵی ۱۹٦۳ گەڕاوەتەوە سووریا، لە دوای ساڵێک لە حەلەب گیراوەتەوە، لەوساوە تا ساڵی ۱۹٦۹ لە ژیانیدا بێ ئارام بووە، لە هیچ جێیێک ئۆقرەی نەگرتووە و چاوی سیخوڕانی سووریا بەدوایەوە بووە ناچار بووە سنوور ببڕێ و بچێتە کوردستانی تورکیا، لەوێ گیراوە و دراوەتەوە سووریا، ئینجا لە دیمەشق خراوەتە بەندیخانەوە، لە ساڵی ۱۹۷۳ ئازاد کراوە، بەڵام خراوەتە ژێر چاودێری پۆلیسەوە. بەدرێژایی ژیانی لە بێ ئارامی و زۆرداری ڕزگاری نەبووە.

عوسمان سەبری لە سەد جار زیاتر گیراوە و ۱۲ ساڵ ژیانی لە بەندیخانە بردۆتە سەر، لەو زیاتر دەستبەسەر و لە ژێر چاودێری پۆلیس بووە. دووجار فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچووە. تا لە ڕۆژی ۱۱ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۳ لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە و لە گوندی بەرکفری نزیک دەرباسییە نێژراوە.

## شیعر و پەخشانی

### شیعری

عوسمان سەبری لە دەرگایێکی گەورەوە دەچێتە ناو گێتیی «شیعری نوێ»ی کوردییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شارەزای ئەدەبی کلاسیکیی کۆنە، لە شیعرە نوێیەکانی دەردەکەوێ چێژی لە شیعری کۆن وەرگرتووە بەڵام هەوڵی نەداوە لاسایی بکاتەوە، بەگشتی شیعری لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە دەچێتە ناو لیریک، ئەمە لە شیعرە کورتەکانیدا، هەرچی شیعرە درێژەکانیشن ئەمانە بەپۆیم (قەسیدە) دەژمێررێن.

لە ڕووی ڕوخسارەوە هەندێ کێشی شیعری دەچنەوە سەر بەحرە سووکەکانی عەرووز، بەڵام زۆر جار لە ناو کێشی سیلابی خۆماڵی بزر دەبن. بەزۆری شیعری لە ڕووی قافیەوە مەسنەوییە، لەگەڵ ئەوەشدا لە شیعرە مەسنەوییەکانیدا گەمە بەقافیە دەکا، بەوەی لە کاتێکدا شیعرەکە لەسەر قافیەی (ا ا ب ب...) دامەزراوە لە ناویدا قافیەی (ا ب جـ ب)یش بەکار دێنێ. فەرهەنگی وشەی شیعری عوسمان سەبری دەوڵەمەندە، وشەی پەتی کوردی بەکار دێنێ، ئەوەی زمانی شیعری دەوڵەمەند کردووە ئەوەیە شاعیر لە زمانانی تورکی و عەرەبی و فرەنسی شارەزا بووە، هەندێ وشە و زاراوە و تەعبیری لەو زمانانەوە وەستایانە هێناوەتە ناو شیعری کوردییەوە. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شیعری عوسمان سەبری نموونەی غەزەلی نیشتمانییە. واتە دڵداری، ئیتر دلبەری دڵدارێکی وەکو عوسمان سەبری سەربەستییە بۆ کورد و هەموو ئادەمزادێکی ژێردەست. لە دەوروبەری ئەم ناوەڕۆکە دەستووڕێتەوە. داهێنانی جوانکاری زۆرە، ڕەمز بەکار دێنێ لە مێژووی میللەتی کورد و ئەفسانەی ئەدەبی میللی سەرزار وەردەگرێ. شاعیر بۆ خوێندەوار و نیمچە خوێندەوار دەنووسی، لەبەرئەوەیە هەندێ شیعری وا دەکەوێتە بەرچاو وەکو لە ئەدەبی میللیی سەرزارەوە نزیک بێ، یا خۆی دەبێتە نموونەی ئەدەبی میللیی نووسراو، لە هەندێ شیعری دیکەیدا تەمومژی سیمبۆلیزم و ڕۆمانتیزم ئاسمانی شیعرەکان تاریک دەکا. سامانی نەتەوەیی کورد لە ئەدەب و مێژوو و بەسەرهات و ئەفسانە سەرچاوەییێکی گرنگە بۆ ئیلهامی شاعیر، وەستایانە ڕووداوی کۆن بەکێشەی سەردەم دەبەستێتەوە و بەرهەمێکی جوانی لێ دروست دەکا. بێ گومان شاعیرییەتی عوسمان سەبری پاڵی بەحەمەڕەش ناوە لە ساڵی **١٩٧٩** کە کۆمەڵێک شیعری لە ئەوروپا بڵاوکردۆتەوە ناوی ناوە «ئاپۆ» ئەمە لە کوردستانی باکوور بۆ پیاوی لێهاتوو و ناودار و بەرچاو بەکار دەهێنرێ، بەلای بڵاوکەرەوە عوسمان سەبری شایانی ئەوە بووە «ئاپۆ»ی پێ بووترێ.

## پەخشانی

عوسمان سەبری لە نووسینی پەخشاندا دەستێکی درێژی هەبوو. بەرهەمی بەگشتی بەشیعر و پەخشانەوە لە کۆوارە کوردییەکانی سووریا بڵاوکراونەتەوە تا دوای جەنگی دووەمی گێتی. بەرهەمە پەخشانەکانی لەم بابەتانەدا دەکەونە بەرچاو:

١- زنجیرەییێک وتاری لە بابەت مێژووی کورد و کوردستان لە کۆواری «هاوار» بڵاوکردۆتەوە.



٢- بایەخی بەوتاری ئەدەبی داوە، هەندێ جار ئەم وتارانەی دەبن بەچیرۆک، ئینجا خۆی هەستی پێ بکا یا نەکا، لە نرخی جوانکاری بەرهەمەکە کەم نابێتەوە.

٣- کۆمەڵێک وتاری هەیە لە بابەت قارەمانانی بزووتنەوەی شێخ سەعیدی پیران و هەڵسانەکانی دیکەی کوردەوە.

٤- بایەخی بە هەندێ لایەنی ئەتنۆگرافی ژیانی کوردەواری داوە، ئیلهامی لە حیکایەتی ئەفسانەیی فۆلکلۆری وەرگرتووە.

٥- پێشەکی بۆ یەکێ لە دیوانەکانی جیگەرخوێن نووسیوە.

بەرهەمی ئەم نووسەر و شاعیرە کەمە، بەڵام دەوری گرنگی بووە لە پێشخستنی خوێندەواری لە ناو کۆمەڵی کورد و دروستکردنی ڕۆشنبیری سەردەم، چونکە نووسینی ڕەنگدانەوەی هیوا و ئامانجی کورد بوو. بۆ نیشتمانپەروەری و یەکێتیی کوردانی نووسیوە، ئامۆژگاری هەموو ئادەمزادێک دەکا کە سڵ نەکا لە داواکردنی مافی خۆی ئەگەر ژێردەست بێ. دژی دووڕوویی و خۆفرۆشی بووە، بەربەرەکانی پیاوخراپانی کۆمەڵی کوردەواری کردووە، لە شێخ و ئاغا و بەگ، لە ڕووی دەسەڵاتی داگیرکەرانی کوردستان لە هاوسێکان و ئەمپریالیستی ئەوروپا و ئەمەریکا وەستاوە.

## نموونەی شیعری

١

عوسمان سەبری لە شیعرێکیدا بەناوی «حالی وەلات» دەڵێ:

دڤێ تو زانبی ئەڤ بوونە سێ سال
من نەدیت خویشک و برا خەلکێ د مال
نە مەدیت ئاغا وەلات پیرا دییان
نە ڤەخوار کەسەرا گەور ئاڤا ژییان
دپرسی ئیرۆ ژ من حالێ وەلات
دێ بێژم ژێ دچن سەد ئاگر و پات
چ چیا دەشت و نەوال ڕێل و زماگ
چ باژار گوند و کەلات ئاڤاهی پاگ
هەیا ب دار و چیا کوچ و زنار
ب گرین کەزەب ژ من ئانینە خار

نە کێزان نە شڤان و شینا گران
سۆگەری ئاڤا چەمان ب خوینا بران
رۆژێ سەد ئێش و برین رەنج و کەسەر
ژ دل و جەرگێ وان دەرتێنە دەر
ئان دبن ئارمانج ژ بۆ تیرا نەیار
ئان بن ژ ڤان وەلات بێ شوون و وار
ئاخڤین ژ جانێ وەلات دوازدە برین
حەرکین دیجلە، فرات دەھ سالا خوین
قە نزانم حەوجەیە وی حالێ خراب
کو ژ من جەرگ و هناڤ کریە کەباب
دبێژم بێ سەروبەر بێ دۆز و تۆل
ژ مەچوون دەشت و چییا نامووس و ئۆل
پر سوپاس ژ خوەدێ، وە ئەو دەرنەدیت
تو بێ قەی نەمامە مێرخاس و عەگیت
وەک دیل خەڵکی تێدا هەمی رەبەن
بێ گرین نابینی رووکی لێ کەن

وەک لە ناوەڕۆکی شیعرەکە دەردەکەوێ سێ ساڵ لە دوای ئاوارەبوون و دوورکەوتنەوە لە کەسوکار لە سووریا وتوویەتی. هەندێ لە بەسەرهاتی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی پیران دەگێڕێتەوە. باس لە کردەوە تیرۆریستییەکانی سەربازی خوێنڕێژی تورک دەکا. توانیویەتی وێنەی ڕووداوە نالەبارەکان هونەروەرانە بگێڕێتەوە، چونکە پێش ئەوەی ئاوارە بێ لە ناو ئەشکەنجەی دۆزەخی تورک بۆ کورد ژیاوە.

ئەم شیعرە ئاخوداخێکە لە دڵ و دەروونێکی پڕ لە سۆزی شکاوەوە هەڵقوڵاوە. ئەو وێنانەی لەسەر پەردەی خەیاڵی شاعیر دەنوێنرێن ڕووداوی ڕاستەقینەن، بەڵام شاعیر لە چوارچێوەی هونەرێکی داهێنراو بەرجەستەی کردوون. لە ئەنجامی دەستدرێژی دەسەڵاتی تورک بۆ سەر میللەتی کورد ئاوی دیجلە و فورات کە لە کوردستان هەڵدەقوڵێن بوون بەخوێناو و هەواڵ دەگەیەننە هەموو ئۆقیانووسەکان بەهۆی کەنداوی بەسرە و ئۆقیانووسی هیندییەوە. عوسمان سەبری لەم شیعرەدا هەست دەجووڵێنێ، خوێنەری کورد ناتوانێ چاو لەم دەستدرێژییە بپۆشێ.



## ٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «مارشا ئاشتی یێ» عوسمان سەبری دەڵێ:

خورتێ چاک ڕابە زوو مە دڤێ دلشادی
سەرخوەبوون، ئاشتی، سەربەستی، ئازادی
ڤان تشتان هەر دڤێ پر خەبات وەست و خوین
بەری مە سەد هەزار، سەد هەزار تێدا چوین
کۆلیدار بوونە هار، وان دڤێ جەنگ و شەر
دڤێ رێ پر ددن دۆلارا زێرێ زەر
ئاگرێ شەر دادان کۆریا بوو دۆژە
تانک و تۆپ قەمبە ل خوینا وان درێژە
ئەڤ هەمی د رەیا دە لەمەندێن چلەک
د مرن کچ و کور، مێر و ژن یەک بە یەک
مەهیلن سەر ببە ئاشتی ئۆل و ژین
ئەم برا تەڤ هەمی بۆ چ ئەڤ قروکین
سۆر و گەور، رەش و زەر ئەم یەکین تەڤ برا
هەمی یان یەک ڕێیە، یەک رامان، یەک چرا
مەسیحی، مووسەوی، مسلمان هەمدەمین
مەجووسی، ئێزدی، تەڤ کورێن ئادەمین
مە دڤێ ئاشتی ناخوەزین سەروبەند
بمرن کۆ لیدار شەرخوەزێن دەولەمەند
هەر بژی ئاشتی، ئاشتیخواز بژین
سەر بلند، سەرفراز هەروەکی باز بژین

عوسمان سەبری ئەم شیعرەی وەکو سروودێک داناوە بۆ لاوان، قسەکانی بەرەو ڕووی ئەوان دەکاتەوە و ئامۆژگارییان دەکا، خەبات بکەن، هەوڵ بدەن، تێبکۆشن لە پێناوی سەربەستی و ئاشتی و ئازادی. تەنیا لاوانی سەردەم ئەم خەباتە ناکەن هەزاران هەزار لاو لە ڕابردوودا بوون بەقوربانی لە ڕێگەی ئەم خەباتە پیرۆزەدا. لە شیعرەکەدا ئاماژە بۆ دەستدرێژی ئەمەریکا دەکا بۆ سەر وڵاتی کۆریا. لە ساڵانی ١٩٥٠ - ١٩٥٣ دۆلارێکی

زۆری خەرج کرد بۆ ئاژاوەنانەوە لە وڵاتی کۆریا و لە ئەنجامدا وڵاتەکە بوو بەدوو دەوڵەت. لاوی کورد هان دەدا لایەنی ئاشتی بن، وەک برا تەماشای هەمموو مرۆڤێک بکەن، سپی بێ یا ڕەش، زەرد بێ یا سوور، مەسیحی بێ یا جوولەکە، موسوڵمان بێ یا مەجووسی.

### ٣

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «دجلە و فرات» دەڵێ:

ژ دل و کـــەزەب ئەڤـــیندارێ دجلە و فـــراتم
نزام بوو چقـاس بێ دلێ خـوە دووری وە دەژین
ئەڤ چەم ژ باکـوور دا دکـەڤـە وەک دوو وەلات
یەک تا بیـرەجـەک یێ دن دچە ناڤ دیاری زین
مەلێ جزیری ئیلهاما خوە ژ وی چەمی دستاند
گـەلەک مـرازی د پەراڤـێن دجلێـدا جـڤـاند
ئەحـمـەدێ خـانی ژ سـەرەکێ ئاڤـاوی ڤـەخـوار
ل سـەر نڤـیـسی سـەر ناڤـا مـەمێ بریندار
فـەقێ تەیران، مـەلێ باتێ پر شـاییـرێن چاک
هەسـپـێن خـوە بەزاندن د شـاخـا چەمێ چالاک
گـەر دجلە ب خـوە کـانیـیـا زانین و ئەڤین بوو
فرات پێ گەرا گەلەک شوین پەنجە ب خوین بوو
د قـادا رۆومـەت و مـێرانی هەر بێ هەمـپـا بوو
هەر دەم ژ بـۆ هەر پەسـفـەکێ هێـژا و سـەزا بوو
من هێـڤـی هەیە دجلە – فـرات بارێ وی راکـە
دوارێ زمـان ل رۆژهلات خـەلقێ مـە شـا کـە

لەم شیعرە نایاب و جوانەدا عوسمان سەبری بەیادی هەندێ ڕەمزی نەتەوەیی کۆمەڵێک وێنە و مانای شیعری داهێنراو دروست دەکا. لەوانە هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات لە ناوچەرگەی شاخەکانی کوردستان هەڵدەقوڵێن. لە قەراغی سەرەتایانەوە تا کەنداوی بەسرە کۆنترین کۆمەڵێکی شارستانییان دروست کردووە، مەدەنییەتی سۆمەر. لە وەسفی ڕووباردا دەڵێ، لە باکوورەوە دەخزێ بۆ خوارەوە، لایێکی شاری بیرەجەکە، لایەکەی دیکەی مەڵبەندی خاتوو زینە، مەبەسی خاکی جزیری بۆتانە. مەلای جزیری ئیلهامی لێ



وەرگرتووە و شیعری جوانی هۆنیوەتەوە. ئەحمەدی خانی ئاوی خواردۆتەوە، لە عەشقی ئەوودا «مەم و زین»ی نووسیوە. بەسەرهاتی مەمی بریندراری گێڕاوەتەوە. فەقێ تەیران و مەلای باتەیی شیعری جوانیان داناوە، ڕەنگین وەکو ڕووباری چالاک لە ناو شاخەکاندا. بەم پێیە دیجلە دەبێتە سەرچاوەی زانیاری و ئەڤین، فوراتیش لە هەندێ جێ دەبێتە بەڵگەی خوێن. مەبەسی شاعیر لێرەدا ئاماژەیە بۆ تێپەڕبوونی ڕووباری فورات بەناو خاکی سووریا پێش ئەوەی بچێتە خاکی عیراقەوە، چونکە لە دوای جەنگی دووەمەوە دەستی دەسەڵاتی سووریا بەخوێنی کورد خوێناوی بووە تا ئێستا.

دیجلە و فورات بووە بەڕەمزێک هەتا ئەگەر ئەفسانەییش بێ، خەیاڵێکی شاعیرانەی ڕۆمانتیکییانە – نەک سیاسی و دیبلۆماسییانە – بۆی هەیە شیعرێک دابنێ و تێیدا بڵێ خاوەنەکان و دانیشتووەکانی قەراغ ئەم دوو زێیە لە کورد و تورک و عەرەب یارمەتیی یەکتری بدەن و سێ دەوڵەت دروست بکەن و لە پاشانا یەک بگرن، هەموو گێتی چی حسێبێکیان بۆ دەکا!.

***

عوسمان سەبری لە ناو خاکی خۆیدا لە دەست زۆرداری دەسەڵاتی تورک ئاوارەی لایێکی دیکەی خاکی خۆی بوو لە سووریا، لێرەش لە ژێر دەسەڵاتی عەرەب لە زۆرداری ڕزگاری نەبوو، خاکەکانی دیکەی کوردیش هەمموویان لە ژێر دەستی بێگانەدا بوون لەبەرئەو ئەم ڕۆشنبیرە کوردە تا سەری نایەوە لە خراپەی زۆرداری ڕزگاری نەبوو.

عوسمان سەبری لە قوتابخانەی ڕوشدییە زۆر شت فێر بووبوو. لە سووریا فێری زمانی عەرەبی بوو. مامۆستای گەورەی لە ژیانیدا خۆی بوو. گیرۆدەی دواڕۆژی میللەتە چەوساوەکەی بوو، بۆ ئەم مەبەسە دوو ڕێگەی گرتبوو، یەکەمیان خەباتی سیاسی لە پێناوی هێنانەدی ئامانجی میللەتی کورد لە سەربەستی و ئازادیدا. دووەمیان خزمەتکردنی ئەو میللەتە بەنووسین و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری. بۆ ئەم مەبەسە ڕێگەی ئەدەبی گرتبوو. شارەزایی لە شیعردا هەبوو دەیتوانی لاسایی پێشینان بکاتەوە، بەڵام ئەمەی نەکرد و لایەنی نوێگەری گرت، شیعری بەتامی نووسییەوە لە بابەت کوردایەتی و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی مرۆڤایەتی و ئاشتیخوازی و ئەنتەرناسیۆنالیزمی و دیمۆکراتی. وتار و چیرۆکی پەخشانی نووسیوەتەوە. جێ پەنجەی دیارە لە ئەدەبی کوردی لە سووریا لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە تا کۆچی دوایی.

## بەشی دووەم

# لوتفی

**١٩٠٥ - ١٩٨٩**

### ژیانی

لوتفی کوڕی شێخ ڕەزا شێتەی کوڕی مارفی قوولەیە، لە نەوەی شێخ حەسەنی گڵەزەردەی بەرزنجییە. لە ساڵی ١٩٠٥ لە گوندی پەڵکانەی ناوچەی قەرەحەسەنی کەرکووک لە دایک بووە. «لوتفی» کردووە بەنازناوی شیعری. لە تەمەنی شەش ساڵیدا لە حوجرەی مزگەوتی گوندی قۆین پەلک لە ناوچەی دووز (تووزخورماتوو) خوێندوویەتی، لە پاشانا چووە بۆ کەرکووک و لە مزگەوتی نائیب ئۆغلی ماوەیێک بووە بەفەقێ، ئینجا شێخ عەبدولکەریمی دارەخورمای خاڵی ناردوویەتی بۆ گوندی دیبەگەی ناوچەی مەخموور. دوو ساڵ لەوێ خوێندوویەتی و گەڕاوەتەوە ئاوایی لەیلان لە کەرکووک، ماوەییێک لەوێ خوێندوویەتی و ئەوجا ڕووی کردۆتە گوندی خاڵۆبازیانی. لێرەدا زۆر نەماوەتەوە گەڕاوەتەوە کەرکووک و لە مزگەوتی ئیمام قاسم نیشتۆتەوە. دوا قۆناغی خوێندنی حوجرەی لە خانەقای سەید ئەحمەد بووە، لای مەلایانی گەورەی ئەو سەردەمە خوێندوویەتی. لە کاتێکدا ئامادە بووە خوێندنی تەواو بکا ئیجازەی مەلایەتی وەرنەگرتووە.

زۆربەی ژیانی لە ناوچەکانی ساڵەیی و شوان بردۆتە سەر، خەریکی کشتوکاڵ بووە، بەزۆری بۆی نەهاتووە و دەست کورت بووە.

لە ساڵی ١٩٣٩ لە کاتی کردنەوەی ڕێگەی ئۆتۆمۆبیل لە نێوان هەولێر و ڕواندز بووە بەچاودێری کرێکارانی کارگێری ڕێگەوبان. بۆ دابینکردنی گوزەرانی لە کارکردن نەوەستاوە، هەندێ جار کاری میری پێ سپێرراوە بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ١٩٥٩ مووچەخۆر بووە لە شارەوانی کەرکووک. هەندێ جاریش لە گوندەکانی ناوچەی ساڵەیی مەلایی کردووە. لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە کە دوا قۆناغی سەردەمی پیربوونی بوو لە گەڕەکی ڕەحیماوە لە کەرکووک نیشتەجێ بووە. لە ڕۆژی ٢٣ی مایسی ١٩٨٩ لە کەرکووک کۆچی دوایی کردووە.



### شیعری

لوتفی وەک شاعیرێکی ئاسایی و لاسایی شیعری کلاسیکی و میللیی کوردی دەکەوێتە ڕوو. بەرهەمی شیعری لەم لایەنەوە لە بەرچاوە. بایەخی بەهەردوو بابەت داوە بەقەوارە شیعری عەرووزی و کێشی میللی هێندەی یەکترین. لە شیعری عەرووزیدا تەنیا بەحرەکانی ڕەمەل و هەزەج و مەدیدی بەکارهێناوە. لە یەکێتیی قافیەدا دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی: «ا ب د ر غ م ن (ە - ـە) ی ێ»ی بەکارهێناوە. لە پاش قافیە ئەم وشانە لە شیعریدا بەرچاو دەکەون: ئەکا، کرد، منم، خۆم، ئەکەم، نییە، هەیە، ئەبێ، ئەوی، بم (ببم).

شیعرە خۆماڵییەکانی لە ڕووی کێشەوە زۆرن، لەمانەدا کێشی دە بڕگەیی و کەمتریش حەوت بڕگەیی بەکارهێناوە، قافیەی ئەم جۆرە شیعرەی مەسنەوییە، کەچی لوتفی یەکێتیی قافیەی بۆ ئەم جۆرە شیعرە بەکارهێناوە. ئەمە دیاردەییێکی دەگمەنە و کەم شاعیری کورد ئەم دەستوورەیان بەکارهێناوە. قەسیدەی بەندی چوارینی هەیە (ا ا ا ب). زمانی شیعری ئاسانە، وێنەی ڕەوانبێژی زۆر نییە. لە ناوەڕۆکدا مەبەسەکانی ئایینی و دڵداری و وەسف و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و ستایش و ماتەمنامەی هەیە. جار جارە دەم لە کۆمەڵایەتی و سیاسەتیش دەدا. لە سەرانسەری دیوانیدا هەست بەڕەشبینییێک دەکرێ لە بیری شاعیردا. ئەمە لە پێشانا لە ئەنجامی هەڵسوکەوتی پەرێشانی و هەژاری خۆی و لە پاشانا لە هەڵسوکەوتی نالەباری کۆمەڵایەتی و مەسەلەی نەتەوەیی کورد هەڵقوڵاوە.

### نموونەی شیعری

#### دڵداری

لە شیعرێکیدا لوتفی دەڵێ:

چاوەکانت بۆتە باعیس ئەشکی ڕوونی چاوەکەم
تیغی ئەبرۆت باعیسە بۆ مەنعی خورد و خاوەکەم
غەمزەکانت هەروەکو تیرە لە دڵ تەئسیری کرد
بۆتە مەنعی خواردن و خەوژین و نان و ئاوەکەم
دڵ وەکو ڕاوچی ئەویش وا بۆتە کار ئاسکی خەتا
من خەتاکارم لە بۆیە بۆتە مانیع ڕاوەکەم

بێ خەبەر وەک وەحشی وا بووم هەر ئەسووڕام دەشت و دەر
هەروەکو تەیرێ لەناکاو تووشی دان و داوەکەم
پەیڕەوی قەیسی بێچارە لازمە بۆ من ئیتر
هەر ڕەفیقی وەحشی دەشتی و دووری دایک و باوەکەم
سەد وەکو لوقمان کە بێت و کوا ئەکا دەرمانی دڵ
دیدەنی ئەو کافییە بۆ زامی جەرگوناوەکەم
بەس تەمەع (لوتفی) بکە دونیایی دوون باقی نییە
غەم بخۆ بۆ مردنی خۆت کوانێ تۆپی جاوەکەم

ئەم گێتییە دڵدارییە شاعیر خۆی دروستی کردووە بۆ وەسفی برۆ و غەمزەی دلبەر، ڕاوکردنی دەشتی خەتاوخوتەنی ئەفسانەی چین و باسکردنی قەیسی بێ چارە. لە ناو هەموو ئەو گێتییە دڵدارییەدا شاعیر شپرزەیی ژیانی خۆی لە بیر نەچۆتەوە. ڕاستە وێڵ و سەرگەردانە لە دەشت و چۆڵ لە لەیلا دەگەڕێ، بەڵام لە باوک و دایکیشی دوورن. شیعری ئەو لە هەر بابەتێک بێ لە واقیعی ژیانی تاڵی خۆی و ڕەشبینی دووری ناخاتەوە.

## کوردایەتی

مەسەلەی نەتەوەیی کورد هەمیشە لە هەڵبەزین و دابەزیندا بووە، ئەمرۆ لە خۆشی و سبەینێ لە ناخۆشیدا بووە. لوتفیش وەکو شاعیرانی دیکە ئاوڕی لەم دیاردەیە داوەتەوە.

١

لە شیعرێکیدا لوتفی دڵشادە و دەڵێ:

کوردستان مژدە بەیانی داوە!
خۆر لەسەر شاخت گوێچکەی کێشاوە
سەیری دنیا کە لە خوار و لە ژوور
هەمووی بەیەکجار لە خەو هەڵساوە
هەرکەس لەم ڕۆژە سست بێ بزانە
ئەو لە کاروانی میللەت جێماوە
ڕۆژ ڕووناک شەوقی دا لە کوردستان
دووکەڵی غەم و غەدری پێچاوە



چەن ساڵە کە تۆ وا خەبات ئەکەی
بەجەور و خەفەت دەرد و سزاوە
داری بەختەکەت وا هاتۆتە بەر
شنە شنێتی بەدەم سەباوە
زۆر ئاگادار بە دوژمنی ناکەس
تێکی بشکێنی و بیخاتە لاوە
پشتی یەک بگرن ئەی میللەتی کورد
لە هەر کوێییێ هەن لە ڕووی دنیاوە
لە بیرتان نەچێ دەستم بەدامان
لەو غەدرەی کەوا لە کورد کراوە
خزمەت بێگانە زۆر بێ بەقایە
مەعلووم خزمەتکار هەر دەرکراوە
(لوتفی) بێنە یاد کردەوەی پێشوو
دەرحەق بەکوردان کە چی کراوە

ئەم شیعرە بۆ پێشوازی بەیانە گرنگەکەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ دانراوە. لە ئەنجامی ڕاپەڕینی کوردی عیراق لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا ئەڤتۆنۆمی بەناوی هەرێمی کوردستانی عیراق دامەزرا، کەچی فێڵ و فەنەری کاربەدەستانی بەغدا لە بنەڕەتدا بەڕاستیان نەبوو، تەکتیکێک بوو بەکاریان هێنا بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد لە داهاتوویێکی نزیکدا. هەڵەی کورد خۆی و ڕێگەدان بەوەی جڵەوی ئەسپەکەی بکەوێتە دەست هاوسێی بێگانەی دوژمن بووە هۆی تێکشکانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کوردستانی عیراق و ئەڤتۆنۆمی سەر نەگرێ و کورد بکەوێتەوە دابەزین و ناخۆشییەوە.

٢

لوتفی ئەم تێکشکانەی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ بەم جۆرە وەسف دەکا:

کوردە نازانی کە چی ڕووی داوە!
دنیا بەجارێ چۆن شڵەژاوە
گەورە تا بچووک گشت دەردەدارە
هەریەک بەجۆرێ بەغەم دووچارە

عەقڵ و شوعوورت داخوا چۆن ماوە
فرمێسکی چاوت وەکو خوێناوە
لە هەندێ جێگە خوێن وەک لافاوە
چەند نەوجەوانان بەبێ گیان ماوە
ئەوەی هەژارە یەکجار خوراوە
بنیادی بێ ڕووح بەپاوە ماوە
چەپۆکی دوژمن وەک تەزرەی بەهار
لە هەموو لاوە بۆ کوردی هەژار
دەخیل بەدەرگات ئەی خودای گەورە
پەنامان بدەی لەم چەرخ و دەورە
بەشەو عەزابی گورگی نادیار
بەڕۆژ گیرۆدەی جەنگی سەگی هار
ڕێگەی ڕزگاری لە هیچ لا نییە
ئەی خودا هاوار چارەمان چییە!
خۆت ڕەحمێ بکەی تەنیای فەریاد ڕەس
چۆن بۆ بێکەسان هەر تۆمان هەی کەس
ڕەببی بۆ خاتر فەخری ئەنبیا
ڕزگارمان بکەی لە شوومی سیا
(لوتفی) با بەس بێ گریانی بێ سوود
ڕازی بەتەقدیر خالیقی مەعبوود

ئەمە وەسفێکی میللییانە و شاعیرانەی کوردە لە دوای تێکشکانی بەیانی ١١ی مارتی ١٩٧٠ لە ١١ی مارتی ١٩٧٥. لێرەدا لوتفی مێژوونووس نییە ڕووداوەکان تۆمار بکا، بەڵکو بەگشتی وێنەی هەست و نەستی ناوەوەی کەسی کورد دەکێشی. فرمێسکیان بۆ دەڕێژێ و لە کردگار دەپاڕێتەوە لە کارەساتی دیکە بیانپارێزێ.



### ٣

لە شیعرێکی دیکەیدا لوتفی دەڵێ:

دڵ لە دووریت وا دیارە مەیلی گریانی هەیە
هەورەکەی میحنەت ئەهات و تاوی بارانی هەیە
وا لە شاخ و چۆڵ خەوتوو چاو بەئەشک و دڵ بەغەم
ئیمڕۆ ڕۆژی شادی کوردە کەیفی شارانی هەیە
زۆر لەمێژە تێئەکۆشێ کاکە بۆ تۆ خاکەکەت
دڵ ئومێددارە کە ئەمجار فیکری جارانی هەیە
ڕووم نەبوو من دابنیشم تێکەڵی وەجبەی ڕەفیق
وا ئەزانم ئیمڕۆکە دڵ مەیلی خەندانی هەیە
داری بەختم ڕوو لە وشکی ڕۆژ بەڕۆژ هەر کز ئەبوو
ئیمڕۆ چووزەرەی دیارە ڕۆژی نیسانی هەیە
خادیم و جاگیر مەبە ئەی کاکی خۆم بۆ هیچ کەسێ
عالەمیش وەک تۆ بۆ ئەمڕۆ گشت گریبانی هەیە
(لوتفی) باغی ئەمەلی تۆ هاتە بەر چاو هەڵبڕە
هەر لە سایەی حەمدی خواوە تەیری خۆشخوانی هەیە

لە سەرەتادا ئەم شیعرە ئەوە دەگەیەنێ شاعیر لەبەر دووری لە یار هەمیشە شین و شەپۆڕ و واوەیلایەتی، لە پاشانا دڵشاد و گوشاد دەبێ کە بەدیداری ئەو یارە شاد دەبێ، وەک لیریکێکی دڵداری دەکەوێتە بەرچاو. ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٤٦ هۆنراوەتەوە لەو کاتەی کۆماری کوردستان لە مەهاباد دامەزرا بوو. پێش ئەوە شاعیر پەشۆکا بوو بۆ کورد، لە دواییدا کە لە کوردستانی ئێران سەربەستی دەست خست، بوو بەڕۆژی شادی بۆ شاعیر. چونکە سەربەستی کورد ڕەمزی دلبەرەکەی شاعیر بوو. لە خوێندنەوەی ئەم لیریکە لە ڕووی کێش و قافیە و پاش قافیە و وشە و دامەزراندنی ڕستەوە شێوازی نالی دێتەوە یادی خوێنەر.

## ستایشی عەشرەتی شوان

له ستایشی عەشرەتی شواندا لوتفی دەڵێ:

ئەوەندە گەڕام لەسەر ڕووی جیهان
داوودە و بەیات چوار کۆمەی شێخان
زەنگنە و جەبباری هەمەوەند تەواو
جاف گەڵباغی گەلاڵی گۆران
پشدەر و مەنگوڕ هەم دەشتی بیتوێن
شارەزوور هەموو هەتا بازیان
نەمدی خاکێکی وەک خاکی شوان
هەوای دڵگیر بێ بۆ دانیشتووان
دەک ئاوەدان بی بەهەشتی کوردان
ئەرازی بێ عەیب جێگەی دەغڵ و دان
شوبهە بە بەهەشت سەرچاوەی باغی
مێرگ و وەنەوشە و نێرگس و ڕەیحان
زۆربەی دێهاتی هەمووی چەماوە
زەرعات و میوە دار و دارستان
مەرعای یەکتایە بۆ مەڕومالات
چەم و ئاوی زۆر وەک باغی جینان
لەگەڵ سەگرمە عەداوەت ئەکەن
بەرامبەرییەتی چیای خاڵخالان

***

من ڕجام وایە لە خزمەت باری
دایم مەحفووز بن لە بەڵای جیهان
دوور بن لە غەم و دەرد و موسیبەت
بژین بەختەوەر شاد و کامەران
(لوتفی) گەر ڕاستە قسەکانی تۆ
بۆچی بەجێت هێشت ڕات کرد لەناویان



لەم شیعرەدا لوتفی لە عەشرەتی شوان و ناوچەی شوان دەدوێ لە کەرکووک. لە شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) دەکا بۆ قوتابیان هۆنرابێتەوە لە بارەی جێگە و شوێن و جوگرافیای ئەو خاکەی عەشرەتی شوانی لێ دەژی. یادی داوودە و بەیات و زەنگنە و جەباری و هەمەوەند و جافی گەڵباغی و گەلاڵی و پشدەر و مەنگوڕ دەکاتەوە. باسی هەرێم و ناوچەکانی شێخان و بیتوێن و شارەزوور و بازیان دەکا. هەموو ئەمانەی بۆ ئەوەیە بڵێ ناوچەی شوان لەمانە جوانتر و ڕەنگینترە. هەروەها یادی چیای سەگرمەی ناوچەی سەنگاو دەکاتەوە. چیای خاڵخالانیشی لە یاد نەکردووە چونکە بەڵگەی جوانی ناوچەی شوانە. شاعیر بە وتەیێکی کۆمیدی جوان کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ کە بەخۆی دەڵێ بۆچ ئەم جوانییەت بەجێ هێشت و لە ناو ئەم خەڵکە چوویتە دەرەوە!

***

لەتیفی کوڕی شێخ ڕەزا شێتەی بەرزنجی ناسراو بەلوتفی لە ئەدەبی کوردیدا شاعیرێکی ئاسایی و دیارە. بەڕوخسار و ناوەڕۆک زۆربەی بابەتەکانی شیعری عەرووزی کلاسیکی و خۆماڵی میللی هەیە. بەشی زۆری بەرهەمی لە نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و کەموکووڕی کۆمەڵایەتی و ئایینی دەدوێ. ناوەڕۆکی شیعری ڕەنگدانەوەی دەست کورتی و هەژاری ژیانی تایبەتی خۆی و بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەکەیەتی، ئەمە هەمووی بۆتە هۆی ئەوەی ڕەشبینی دڵ و دەروونی داگیر بکا.

# بەشی سێیەم

## ئەمینی عەبدال

**١٩٠٦ - ١٩٦٤**

### ژیانی

ئەمین کوڕی عەبدال باسۆرە لە ساڵی ١٩٠٦ لە گوندی ئەمانچایر لە ناوچەی قارسی کوردستانی عوسمانی لە دایک بووە. باوکی قەت بیری لەوە نەکردۆتەوە ئەمینی بەلەنگاز لە دایکبووی گوندێکی هەژار و نەخوێندەوار و دواکەوتوو ڕۆژێ لە ڕۆژان ببی بەزانا و شاعیر. تەمەنی سێزدە ساڵ بووە لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی دایک و باوکی زێدی باپیرانیان بەجێ هێشتووە و خۆیان لە دڕندەیی تورکە کەمالییەکان ڕزگار کردووە. ئەمین لە ساڵی ١٩٢٠ وەکو گەلێ لە منداڵە ئاوارەکانی کوردستانی عوسمانی لە مردن ڕزگاری دەبێ بەوەی لە هەتیوخانەی ئەمەریکییەکان لە شاری ئەلێکساندرۆپول (لینینەکان)ی ئەرمەنستان بەخێو دەکرێ. لە ساڵی ١٩٢٣ ئەمین ڕوو دەکاتە شاری تفلیس و لە لای مامی دەژی. خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی و خانەی پەروەردە تەواو دەکا و دەگەڕێتەوە ئەرمەنستان و ماوەیێک دەبێتە مامۆستا لە هەندێ لە گوندەکانی کورد لە ناوچەی ئەپاران. لە ساڵی ١٩٣١ دەبێ بەقوتابی زانستگای یەریڤان و لە ساڵی ١٩٣٦ تەواوی دەکا. لەو کاتەدا دەبێتە یەکێ لە ئەندامانی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی «ریاتازە». خەریکی نووسینی وتار و بڵاوکردنەوەی تێکستی ئەدەبی میللی (فۆلکلۆر) دەبێ.

بەبێ ئەوەی واز لەو جموجۆڵییە ڕۆشنبیرییەی بێنی جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە سەر خوێندنی باڵا. ماوەیێک خەریکی خوێندن و لێکۆڵینەوە دەبێ لە ئەدەبی کوردیدا تا لە ساڵی ١٩٤٤ دوکتۆرای لە ئەدەب وەرگرتووە. بەینێک بووە بەمامۆستا لە زانستگای یەریڤان، لە پاشانا کراوە بەکارگەری زانستی لە ئەکادیمیەی ئەرمەنستان و خەریکی کوردناسی بووە بەتایبەتی لە ئەتنۆگرافیا و فۆلکلۆری کوردی کۆڵیوەتەوە.

ئەمین ڕۆشنبیرێکی بەتوانا بوو کۆششی لە بەرچاوە لە هەموو گۆڕەپانەکانی کولتووری کوردی قەفقاسی ڕووسیا. دڵسۆزی کارە زانستی و ئەدەبییەکانی بووە تا کۆچی دوایی لە ٢٢ ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٤ و ناوی بەزیندوویی ماوەتەوە لە مێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا.



### ئەمینی زانا

لە قۆناغی یەکەمی مافی خوێندەواری کوردی لەو وڵاتەدا ( ١٩٣٠ - ١٩٣٧ ) ئەمین دەوری باڵای هەبوو لە پێشخستنی خوێندەواری لە کۆمەڵی کوردەواری بەتایبەتی دانانی کتێبی قوتابخانە بەپێی بەرنامەی خوێندنی هەموو زانستییەکان بەزمانی کوردی. لەو کتێبانەدا کە ژمارەیان دەگاتە دەیان کتێب هەندێکیان خۆی دایناون و هی دیکەیان بەهاوکاری لەگەڵ دانەرانی دیکە، جگە لەمە چەند کاری گرنگی دیکەی گەیاندۆتە ئەنجام لەوانە دانانی فەرهەنگی ئەرمەنی - کوردی (١٩٣٣) و کتێبی «فۆلکلۆرا کورمانجا» (١٩٣٦) لەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕۆشنبیرانی کورد ئەم کتێبەیان داناوە، تا ئێستا بەگەورەترین و چاکترین کتێبی کوردی دەژمێررێ لە بابەت پاراستنی تێکستی ئەدەبی میللیی سەرزار. هەروەها بەشداری کردووە لە گۆڕینی «دەستووری یەکێتیی سۆڤیەت» (١٩٣٨) بۆ زمانی کوردی.

لە قۆناغی دووەمی مێژووی خوێندەواری کوردی لەو وڵاتەدا (لە ١٩٤٥ەوە تا کۆچی دوایی ئەمین) لەسەر دانانی کتێبی قوتابخانە کوردییەکان بەردەوام بوو، جگە لە کتێبی بەرنامەی خوێندن چالاکی لە دانانی کتێبی یاریدەدەر بەرچاو بوو، کتێبی «ڕاست نووسین» سەرچاوەیێکی بنچینەیی بوو بۆ یەکخستنی ڕاست نووسین بەپێی ئەو ئەلفوبێیەی لەسەر بنجی ئەلفوبێی کیریلی دانرا بوو بۆ نووسینی زمانی کوردی. ئەو کتێبە لە ساڵی ١٩٥٢ چاپ کراوە، لە ساڵی ١٩٥٨ دووبارە چاپ کراوەتەوە.

مەیدانی جموجۆڵی زانستی ئەمین فراوان بووە، لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن بەشداری کردووە، وانە و موحازەرەی لە قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی و خوێندنی زانستگا وتۆتەوە. کارگەری زانستی بووە لە ئەکادیمیەی ئەرمەنستان و هەندێ باسی لە بابەت ئەدەب و فۆلکلۆر و ئەتنۆگرافیای کورد بڵاوکردۆتەوە. لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی «ریاتازە» لەسەر گەلێ مەسەلەی ڕۆژانەی ژیانی کورد و دەسەڵاتی ئەو سەردەمەی سۆڤیەتەکانی نووسیوە. بەم جۆرە ئەمین یەکێکە لەو ڕۆشنبیرانەی بۆ هەموو چینەکانی کۆمەڵی کوردی نووسیوە لە قوتابیان و مامۆستایان و خوێندەوارانی بەرز و هەموو خەڵکی دیکەی کورد بەگشتی.

## ئەمینی نووسەر و شاعیر

ئەمین لە سەرچاوەکانی ژیانی پێشووی فێری شیعر دانان بووە، لە قوتابخانە فێری شتی دیکە بووە لەوانەیە یارمەتی دابێ بۆ چەسپاندنی بیری شیعرەکە. لە ڕووی ڕوخسارەوە نووسەر لە مەرجەکانی شیعری میللی سەرزاری کوردی نەچۆتە دەرەوە، کێش و قافیەی خۆماڵی بەکارهێناوە، زمانی شیعری گۆڕیوە، لە زمانی کۆمەڵی کشتوکاڵی و دانەوێڵەیی دەری هێناوە بۆ زمانی شارستانی. زمانی پاکە وەکو هەموو شیعری کوردی ئەو وڵاتە، لەبەر نزیکی لە زمانی ڕووسی و ئەرمەنی هەندێ وشەی فەرهەنگی و زاراوەی تازە بابەتی ئەو دوو زمانە کەوتوونەتە ناو زمانی شیعرییانەوە. ئەگەر لەو شیعرانەدا وشەی عەرەبی و تورکی بەرچاو بکەون هەر ئەو وشە کۆنانەن کە بەدرێژایی مێژوو چوونەتە ناو زمانەکەیانەوە. هەرچی وشەی فارسیشە بەنەبوو حسێب دەکرێ.

بەگشتی شیعری ئەمین بریتییە لە لیریک، هەندێ لەو بابەتە شیعرەی لە ڕووی ژمارەی دێڕەکانیانەوە زۆر کورتن، لە برووسکەییێک دەکەن ناوەڕۆکیان لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و وتەی دانایانە وەرگیرا بێ. هەروەها لە پۆیێم (قەسیدەی درێژ) بەرهەمی هەیە، بیری هەندێکیانی لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەرگرتووە، هی هەندێکی دیکەیانی لە داهێنانی خۆیەتی. هەندێ لە پۆیێمە بەرچاوەکانی ئەمانەن: مەمێ و زینێ، زەلیخا و فەتولا، ئەحمێ خۆلێ، سێ برا، گولیزەر و هی دیکە.

شیعری لە سەرەتادا لەو کتێبانەدا بڵاوکراوەتەوە کە ناوە ناوە شاعیر و نووسەران بەناوی بەرهەمی نووسەرانەوە بڵاویان دەکردەوە، لە دواییدا لە ساڵی ١٩٣٥ بەشێکی شیعری ئەمین بەناوی بەهار لە یەریڤان بڵاوکرایەوە.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شیعری ئەمین فراوانە هەموو لایێکی گەشبینی گرتۆتەوە، ئەگەر ڕەشبینی لای هەبێ بەرامبەر بەدوژمنە، دوژمنیش نەیاری دەسەڵاتی سۆڤیەتە، ئەوەی نەیاری سۆڤیەتیش بێ کوردی خۆش ناوێ. ئەمەیە بیروباوەڕی کوردی ئەو وڵاتە. هەرچۆنێ بێ بەرهەمی شیعریان بەگشتی ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی و لە ڕووی هونەرییەوە چۆتە ناو گەنجینەی قسەی جوانەوە.

ناوەڕۆکی شیعری ئەمین خەریکی ئەم مەبەسانەن کە لەو خاڵانەی لای خوارەوە ڕوون دەکرێنەوە:

١- کوردایەتی: شاعیر بەپێی هەموو شتێکی پێوەندی بەکوردەوە هەیە کوردایەتی دەکا.



باس لە جوگرافیای کوردستان دەکا، لە سامانی نەتەوەی کورد دەدوێ، بەشان و باهووی گەورەکانی هەڵدەڵێ. وەسفی بەهار و بلبل و شاخ دەکا، شۆڕەژنی کورد و کچی نازەنین و سلۆی ڕەنجبەر و حەسۆی شوان لە دەشت و زۆزانانی شاخی ئەلەگەز سەرچاوەی ئیلهامی ئەمینی عەبدالن.

٢- نیشتمانی سۆڤیەت: ئەمین و زۆربەی خوێندەوارانی کورد، کوردی بەڕاستی بوون، دەسەڵاتی ئەوێ لە درندەیی تورکە کەمالییەکان ڕزگاری کردبوون، لەسەر ئەو باوەڕە بوون دەسەڵاتی سۆڤیەت هەموو کورد ڕزگار دەکا، لەبەرئەوە لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە خۆیان گونجاندبوو لەگەڵ ئەو بیروڕایەی پیاو دەتوانێ دوو نیشتمانی هەبێ. هەرچۆنێ بێ ئەمە ڕاست بێ یا هەڵە ئەنجامی بەچاکە کەوتەوە، ئەم ڕاستییەش لە هەموو ئەو بەرهەمە ئەدەبییانە دەردەکەوێ کە شاعیر و نووسەرانی ئەو وڵاتە دایان هێناون.

ئەمین شیعری بۆ ناوچە و شار و ئاوەدانییەکانی وڵاتی سۆڤیەتی کۆن نووسیوە، وەکو ڕووسیا و ئەرمەنستان و گورجستان و لینینگراد (سانت پیتر سبورگ) و مۆسکۆ و یەریڤان و لینینەکان. هەروەها بۆ شۆڕشی ئوکتۆبەر و جەژنی کرێکاران و لینین و کۆلخۆز و شتی دیکەی نووسیوە.

لە ڕووی جوانکارییەوە بەرهەمی شیعری ئەمین لەو پلە هونەرییە دەوەستێ کە شاعیرە بەتواناکانی کوردی قەفقاسی ڕووسیا گەیشتوونەتێ.

## نموونەی شیعری

١

لە لیریکی «ئەلەگەز»یدا ئەمین دەڵێ:

بنیا چیایێ ئەلەگەزێ
هەوا هێنک تەمز دا
ناڤ کولیلکێ ئەوازی دا
هەیە گوندێ ئەلەگەز

***

کولیلک هێشین دبن چاوا
بنتیرنجا رۆوا گور دا

ئەلەگەزا مە ژی ئوسا
پێشدا دچە گاڤ پەی گاڤا

***

عەرد را دکر تراکتۆریست
ژ ئەڤینێ دل لێ دلیست
کلام دگۆت – «جانێ یار»
تێدا هەبوو ئەڤین – بهار

***

دبێی منیکێ پەرواز ڤەدا
ب هز کرنا وانرا شاد بوو
لێ ڤە د گەرە تە دگۆ وا
بەر ب دەشتی یار دچوو

***

خەبات پرە چار نکال
هەوا هێنک تەمزدا
گوندێ مەیە بەختەوار
ئەلەگەزە: گوندێ کوردا

ئەلەگەز گوندێکی گەورە یا شارۆچکەیێکی هەمیشە بەهارە لە بناری چیای ئەلەگەز، کوردی ئەو وڵاتە بەپایتەختی دادەنێن بۆ گوند و ئاوەدانییەکانی دەوروبەری کە هەموویان کوردن. زۆزانەکانیشیان لە قەد چیای ئەلەگەز هاوینان ئاوەدان دەبن. ئەمین یادی بەهار و هاوین دەکاتەوە. یادی گوڵ و گوڵاڵە دەکاتەوە. باس لەو وەرچەرخانەی ڕۆژگار دەکاتەوە لە دەوری فەرمانڕەوایی قەیسەری ڕووس و سوڵتانی عوسمانی ڕەنجبەر نان بۆ خۆی و گیا بۆ مانگا لەڕەکەی نەبوو، ئێستا لەسەر تراکتۆر دانیشتووە لاوک دەچڕێ بەدەم دروێنەی دەغڵ و دانەوە.

## ٢

لە لیریکی «بلبل»دا شاعیر دەڵێ:

بلبل دانی سەرێ دارا
ئەوی دسترا، دلیلاند



سەوتاخوەش، بینا بهارێ
ڤەرڤارا وی دشاند

***

باغچە ئو کولیلک ب هەڤرا
دکەنیان ئو شاد بوون
گولێ سۆر ژی ب روح و جان
بۆنا بلبل ستوخار بوون

***

چقا رندە دەنگێ بلبل
کلاما عەمرێ مە دبێ
ئەو شا دبە ب ئەشق و دل
چا زارێد مە دێ ئو باڤێ

ئەمینی شاعیر بەگشتی هۆگری سروشتە، بەتایبەتی بەهار. ئەمەی لە جوانی ئەو ناوچانە وەرگرتووە کە تیایاندا ژیاوە، لە کوردستانی عوسمانی یا ناو پارچە زەوییە بچووکەکەی خۆی ئەلەگەز ئەویش بەخەڵک و خاکەوە کورد و کوردستانە. لەو شیعرەدا ئەمین بەچاوێکی سۆفیزمییانە لە پێوەندی نێوان گوڵ و بلبل نادوێ، بەڵکو وەکو ڕەمزی خۆشی بەهار باسیان لێوە دەکا، وەکو بووک و زاوا و بە یەکتری شادبوون بەخەڵکیان پیشان دەدا.

## ٣

لە شیعری «لینینگرادا» دەڵێ:

ئەز هاتمە ژ ئەلەگەزێ
ژ چیایێ بەدەو چار سەری
تەرا ئانییە کلامێ تەزە
سەلاما ئالاڤی دلباری

***

ئەزێ شامە دلێ من بار
کە لە تژی، تەرا بووم یار
نها دچم، دوور دکەڤم
گەلۆ کەنگێ تە ڤەگەرم

***

من تەدا دیت برجێد بەلەک
سوقاقێت راست کەلەک - کەلەک
مووزێ، مەدەن، کار و هەبوون
ئەشقا ماریا هەیە شابوون

***

ئەز بیر ناکم چەمێ نێڤا
پرێد مەزن، سوورێد دۆرێ
چوون - هاتنا پێلێد ئاڤێ
د ململمن ل وێ دووزێ

***

ئەز بیر ناکم مالا پووشکین
شکلێ دانتێس شەروودێ ب کین
وەکی ب گوللا خوە پیستۆنێ
پۆئیترا ئانی روژا مرنێ

***

من دیت کە لا پیترۆ پاڤلێ
زیندانێد کوور، جیێ جەزایێ
نە تە بێد چووک پەنجەرێ تاری
بینا مردار بێ ستاری

***

ئەز بیر ناکم مەدەنێ نها
شەقاشەقا چەرخا ماشینا



هەواس و ئەشق، سدقێ پالا
ب دل و جان خەڤاتا وانا

***

تە دوور دکەڤم لینینگراد
تە بیر دکم ئەز تو جار
تێلێ سازێ من تەشداند
ئەشقێ تەمە ئەزێ دلبار

لەم شیعرەدا شاعیری کورد وەسفی شاری لینینگراد دەکا، ئەم شارە لە سەدەی هەژدەم لە لایەن قەیسەری ڕووس پیتری یەکەمەوە بناغەی لێ دراوە، بەناوی ئەوەوە ناوزەد کراوە «سانتپیترسبورگ»، لە پاشانا ناوی بووە بە«پیتروگراد»، لە سەردەمی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان ناویان نا «لینینگراد». لە دوای ڕووخانی دەسەڵاتی سۆڤیەت (١٩٩٢) شارەکە هاتەوە سەر ناوە کۆنەکەی خۆی «سانتپیترسبورگ».

ئەمینی عەبدال لەم لیریکەیدا لە وەسفی ئەو شارە هیچ ناڕاستییەکی لەگەڵ خۆیدا نەکردووە و خۆی هەڵنەخەڵەتاندووە و مەرایی بۆ دەسەڵات نەکردووە وەکو هەندێ لە شاعیری کوردی ئەو وڵاتە. بەڕاستی شاری سانت پیتر سبورگ یەکێکە لە شارە هەرەجوانەکانی گێتی، ئەوەی بۆ یەکەم جار چاوی پێی دەکەوێ ئاشقی دەبێ و ئارەزوو دەکا جارێکی دیکە چاوی پێی بکەوێتەوە.

شاعیری کورد سڵاوی ئەلەگەزی کوردانی بردووە لەم گەشتەیدا بۆ سانت پیتر سبورگی ڕووس. لە وەسفی شاردا وێنەی ڕووباری نێڤا دەکێشی کە هەر لە ناو شاردا دەڕژێتە ناو کەنداوی فینلەندە، ئەوجا قەڵای پیتروپاڤل کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بەندیخانەی ڕۆشنبیر و شاعیران بووە، یەکێکی وەکو مەکسیم گورکی لەو قەڵایە بەند کراوە. لە شیعرەکەدا هەندێ وشەی بێگانەی ڕووسی بەکار دێنێ وەکو «پۆئێت» بۆ (شاعیر)، هەروەها یادی ماڵی پووشکین دەکاتەوە. ئەو خانووەی کۆچی دوایی تێدا کرد ئێستا بووە بەمۆزە. ئەو شارە ئێستا خۆی مۆزەیێکی گەورەیە. شاعیر ناوی ئەو کەسە دەبا کە دانتێس بوو ئەوەی لە کاتی شیربازیدا بەدەمانچە پووشکینی بریندار کرد لە دوای دوو ڕۆژ کۆچی دوایی کرد.

***

ئەمینی عەبدال زانا و نووسەر و شاعیری کوردی قەفقاسی ڕووسیا یەکێک بوو لەو

ڕۆشنبیره کەمانەی ئەو وڵاتە توانییان لە هەردوو مەیدانی زانستی و ئەدەب خزمەتی ئەو بەشە کوردە بکەن کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم هەوڵی دا سەرلەنوێ دەست بەخوێندن و نووسین و مەدەنییەت بکاتەوە. لە پێشخستنی خوێندەواری لە قوتابخانە کوردییەکاندا کۆششی ئەمین لە بەرچاو بوو، لێکۆڵینەوەی زانستی لە زانستگا و ئەکادیمیە لە بارەی کوردناسییەوە بەنرخ بوو. لە نووسینی ئەدەبیدا وتار و چیرۆک و لیریک و پۆیێم (قەسیدەی درێژ) دەوری باڵای هەبوو. ئەمە بوو بەهۆی دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کوردی لە قەفقاسی ڕووسیادا.

# بەشی چوارەم

## فەرامەرز (ڕەشید نەجیب)

### ١٩٠٦ – ١٩٦٨

### ژیانی

ڕەشید کوڕی مەحموود ئاغا کوڕی هەمزە ئاغا لە بنەماڵەی فەرخەی سلێمانییە. ناوی «نەجیب»ی لەسەر دەستووری عوسمانی هەڵبژاردووە وەک لەقەب. ناوی «فەرامەرز»یشی کردووە بەنازناو بۆ شیعر و ئەدەبیات. لە شیعردا بەفەرامەرز و لە ناو خەڵکیدا بەڕەشید نەجیب ناوبانگی دەرکردووە.

فەرامەرز لە ساڵی ١٩٠٦ لە سلێمانی لە دایک بووە. لە تەمەنی مێردمنداڵیدا لە ساڵی ١٩٢٠ باوکی کۆچی دوایی کردووە. سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت بووە. ئەم خوێندنەی زۆری نەخایاندووە و زوو ڕووی کردۆتە قوتابخانەی سەرەتایی ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی دەسەڵاتی عوسمانی. بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٢٠ بووە بەمووچەخۆری میری لە نەخۆشخانەی سلێمانی، لە پاشانا چەند ساڵێکیش لە هەڵەبجە ئەم کارەی بردۆتە سەر. لە ساڵی ١٩٢٨ ماوەیێک خەریکی وەرگێڕان بووە لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی لە کۆمەڵەی زانستی سلێمانی و هەر لەو سەردەمەدا لە ساڵی ١٩٣٠ لە قوتابخانەی شەو بەخۆڕایی وانەی وتۆتەوە. ئەوجا بووە بەقایمقام لە هەندێ لە قەزاکانی سلێمانی و هەولێر.

لە ساڵی ١٩٣٢ فەرامەرز بەغدای کردە مەڵبەندی ژیانی و لەوێ نیشتەجێ بوو و لە ساڵی ١٩٣٦ ژنی هێناوە. بەگشتی فەرامەرز زۆری نەخوێندووە، بەڵام کەسێکی زیرەک و هوشیار بووە، لە ڕووی خوێندەوارییەوە لە دەرەوەی قوتابخانە خۆی پێ گەیاندووە. خۆی مامۆستای خۆی بووە و بۆ ئەم مەبەسە نامەخانەیێکی ئاوەدانی لە ماڵەوە پێک هێناوە. بەهۆی بەهرەی تایبەتی خۆیەوە پێشکەوتووە. لە ساڵی ١٩٤٩ بووە بەبەڕێوەبەری بەشی عەرەبی و کوردی لە ئێستگەی بێتەلی ڕادیۆی بەغدا. لەمەوە بوو بەمووچەخۆرێکی لە ڕوو لە دەسەڵاتی عیراقدا. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کاری گەورەی پێ بسپێرڕێ لە بەڕێوەبردنی شارە گەورەکان، وا بوو لە ساڵی ١٩٥٣ وە تا ساڵی ١٩٥٨ بوو



بەموتەسەریفی لیواکانی (پارێزگاکانی) هەولێر و کەرکووک و مووسڵ و بەسرە.

لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ فەرامەرز خانەنشین کرا. ئیتر بەلای مووچەخۆری میرییەوە نەچوو چونکە بەیەکێک لە کاربەدەستە گەورەکانی ڕۆژگارانی فەرمانڕەوایی مەلیکی ژمێررا بوو. هەڵوێستی لەم لایەنەوە پیاوانە بوو، خۆی لە دەسەڵاتی تازە نزیک نەکردەوە، مەرایی بۆ نەکرد و دژیشی نەوەستا. ئەو چەند ساڵەی دوایی پێش مردنی خەریکی خوێندن و نووسین بوو لە ماڵەوە تا ساڵی ١٩٦٨ لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ئەعزەمییە نێژرا.

### فەرامەرزی شاعیر

فەرامەرزی شاعیر یەکێکە لە سێکوچکەی بنیادنەرانی شیعری نوێی کوردی (بزووتنەوەی ڕۆمانتیکی) لە ناوچەی سلێمانی. سێکوچکە بریتی بوو لە نووری شێخ ساڵح و گۆران و فەرامەرز. ئەوە هەیە فەرامەرز لەسەر شاعیرییەتەکەی بەردەوام نەبوو. ئەوە ئاشکرایە نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی لە ساڵی ١٩٢٠وە دەست پێ دەکا. لەو سەردەمەوە چێژی ئەدەبی و خەیاڵی شیعری لای دروست دەبێ. کاری لە مەیدانی ڕۆشنبیریدا دەبێتە هۆی مشتوماڵ کردنی توانای ئەدەبی.

لە ساڵانی ١٩٢٧ – ١٩٢٨ دەبێتە بەرپرس و سەرنووسەری ڕۆژنامەی «ژیان»، یەکەمین بەرهەمی لەو ڕۆژنامەیەدا لە ساڵی ١٩٢٧ بڵاو دەکاتەوە. لە پاشانا کە لێی دوور دەکەوێتەوە بە وتار و شیعر بەسەری دەکاتەوە. بەم جۆرە لە ساڵی ١٩٣٠ بەرهەمی شاعیر لەسەر لاپەڕەکانی ژیان دەکەوێتە بەرچاو. هەر لەو ماوەیەدا بەشداری لە نووسینەکانی بڵاوکراوەی «دیاریی لاوان» و «یادگاری لاوان» دەکا. هەروەها نووسەری هەمیشەیی کۆواری «گەلاوێژ» بووە لە سەرەتاوە تا کۆتایی (١٩٣٩ – ١٩٤٩).

بەشداریکردنی فەرامەرز لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی تەنیا لە سەرەتای بزووتنەوەکەدا بووە. ئەو قۆناغە لە مێژووی ئەدەبدا بەقۆناغی لاساییکردنەوەی ئەدەبی عوسمانی ناسراوە. ئەمە بزووتنەوەیێکی تازە بوو جەوهەرەکانی لە ڕۆمانتیکی سەدەی نۆزدەمی ئەورووپا وەرگرتبوو بەتایبەتی فەرەنسی و ئینگلیزی و ڕووسی. هەموو کەڵەشاعیرانی نوێکردنەوە بەو قۆناغە تێپەڕین. گۆران زوو دەرباز بوو، نووری شێخ ساڵح ماوەیێکی زۆر لەگەڵ ئەم قوتابخانە شیعرییە مایەوە، هەرچی فەرامەرزیش بوو زوو وازی لە ئەدەب هێنا.

شیعری فەرامەرز لە ڕووی ڕوخسارەوە زمانی تێکەڵاوە، وشەی عەرەبی کە لە شیعری ڕۆمانتیکی تورکی عوسمانی بەکار دێ، ئەویش بەزۆری بەکاریان دێنێ. لە کێشدا هەمیشە خەریکی کێشە سووکەکانە. لە قافیەدا ڕەنگاوڕەنگە زۆربەی لەسەر سیستێمی چوارین دەڕوا. ئەم جۆرە قافیانە لە لای دەبینرێن: ا ب ا ب، ا ب ب ا، ا ا ب ب (مەسنەوی)، ا ب ب جـ، ا ب ا جـ د. شاعیر ناوی بۆ هەموو شیعرەکانی داناوە، لەم لایەنەوە لە دەستووری شیعری کلاسیکی لای داوە. ئەوان بێ ناو بوون بەقافیە دەناسرانەوە یا ڕستەی یەکەمی سەرەتای شیعریان.

## شیعری فەرامەرز

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «عەشق و خەیاڵ» لە ساڵی ١٩٢٧ دایناوە دەڵێ:

ئەوقاتێ ئەبێ ڕووحم ئەکا تەرکی مەکانی
وەک تەیری جینانی
هەر وەک کە وەڕس بووبێ لە دیداری حەقیقەت
یەعنی کە لە زات
تەسلیمی خەیاڵاتی ئەکا دەستی عەنانی
قەسدەن ئەیەوێ دەرچێ لە دنیا وو لە خیلقەت
ئەو وەختە لەسەر باڵی دلاوێزی خەیاڵات
هێندە دفڕم تاکو دەبم خاریجی عالەم
ئەم عالەمە مەعلوومە کەوا پڕیە لە ماتەم
بەو نەوعە ئەکەم تەیی مەکان قەتعی مەسافات
ئەوساکە موجەڕڕەد لە هەموو بەند و عەلائیق
شۆریدە وو شاهیق
لەو بەرزییە بنیادی ئەنێم قەسری سەعادەت
تیمسالی لە تافەت
کاشانەیە ئەترافی کە پڕ بێ لە حەدائیق
تەنرا بە ئەزهاری موعەتتەر بە نەزاکەت



لەو گوڵشەنەدا خۆم و پەرستیدەیی حیسسم
تیمسالی ئەکەین عەشق و ژیانێکی موعەللا
عەشقێکی موقەددەس موتەنەووێر موتەبەسسیم
ژینێ نەبێ وێنەی نە لە دنیا نە لە عوقبا
عەشقێ کە پڕی خەندە وو گوڵبانگی سوروور بێ
عەشقێ ئەبەدی بێ لە عەدەم خەیلی بەدوور بێ

ئەم شیعرەی فەرامەرز دەچێتە خانەی لاسایی شیعری عوسمانییەوە لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی. ئەم بزووتنەوەیە نوێکردنەوەیێک بوو لە شیعری کوردیدا. بەشێکی زۆری وشەی ئەم لیریکە عەرەبییە. هەندێ لەو وشانە ناچنە ناو شیعری عەرەبییەوە، کەچی هەندێکیان لە کۆنەوە لە شیعری کلاسیکی تورکی عوسمانی بەکار دەهێنران. هەندێکی دیکەیان کەوتبوونە ناو ئەو جۆرە شیعرەی لە هەنگاوی یەکەمی نوێکردنەوەدا هاتبوونە بەرهەم، واتە هەنگاوی پێش ڕێبازی ڕۆمانتیکی.

٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «ئالامی بەشەر» فەرامەرز زیاتر لە ڕۆمانتیزم نزیک دەبێتەوە:

لەو ساوە کە من مودریکی ئەندۆهی بەشەر بووم
مەعلووم بوو لە لام هیچیی و ئالامی نەهوفتەی
تەشریحی ئەکەم مەنقەبەیی حاڵ و گوزەشتەی
مەئیووس و ئەلەمبار و ئەسەفناکی کەدەر بووم
ڕۆژێ نییە ئەم شاهی نوجوومە بەجەلالی
نەڕوانێ بەسەر لەوحەیی خوێنینی بەشەردا
شەوگار نییە لەمعەی نەزەری شاهی لەیالی
زەرد هەڵنەگەڕێ هالەیی ئەنواری لە دەردا
گاهێ ئەبیەم سەیحەیی دڵسۆزی کەساسێ
بۆ دەفعی سەفالەت وەکو ئەوتاری ڕوبا بێ
هەر وەک تەلی ناڵندیی تارێ کە شکا بێ
پڕ ڕەعشە ئەپارێتەوە بۆ پارچە پەلاسێ

بەعزەن یەتە بەر دیدەیی نمناکی حەزینم
فاجیعەیی مەرگی موجافات
ئانەن یەتە جۆشش غەزەبی کۆن و نەوینم
ئەم قەتعەیە ئەوسا ئەکەمە شیعری موجازات
دنیا نە بەهەشتە نە چەمەنزاری سەفایە
سەحنێکی بە ئاشووبە ژیانیشی جەفایە

ئەم شیعرەی فەرامەرز نموونەییێکە نزیکترە لە گێتیی ڕەشبینی ڕۆمانتیکی و هەندێ لە چوارچێوەی لاسایی عوسمانی دوور کەوتۆتەوە، لە ناو تەمومژی ئاوارەییدا خنکاوە، باوەڕی بەژیان نەماوە، لە شارستانی دوور کەوتۆتەوە. ئەگەر هەست بەجەوهەرەکانی ڕۆمانتیکی بکرێ لەم شیعرەدا بێ گومان لە نموونەی شیعری نوێی تورکی عوسمانی وەرگیراوە.

## ٣

لە لیریکێکی نموونەی شیعری نوێ لە ساڵی **١٩٣٣** هۆنیویەتییەوە بەناوی «فەریادی دووری» فەرامەرز دەڵێ:

دیجلە هاوارم بەرە بۆ وڵات
وڵاتی پڕ دەرد ئالام و ئاوات
دەنگی دڵسۆزی جگەر بڕینی
فەریادی یاری دۆستی دێرینی
بڵێ بەندەکەی غەمخۆری جاران
شێتی جەمالتە لە کووچەی شاران
سیروان کەوسەری بەهەشتی کوردان
ئیکسیری زام و ئازار و دەردان
وەختێ پرشنگی نوورانیت وەک زیو
ڕووناکی ئەکا دۆڵ و دەر و شیو
لەباتی منیش بە ئەشکی ڕەوان
بشۆ غوباری کەژی هەورامان



نەسیم گیانبەخشی زیندوو و جەمادات
ڕووحی (فەرامەرز) ببێ بە فیدات
شنەیێ بایێ کزەی هەوایێ
لە شاخ و نزار دەشت و چیایێ
بێنە دەخیلە بۆ جەرگی سۆزان
تۆزێ لە هەوای شاخەکەی قەیوان
هەوری سپی ڕەنگ تۆ بێرە ڕەحمەت
تینێ بدە خۆت پڕ گوڕ و هەڵمەت
بڕۆ لە زەڵم و تانجەڕۆ و سیروان
لە گشت ڕووبار و گۆمی کوردستان
لەسەر شاباڵت بارانێ بێنە
تەنووری دڵمی پێ دامرکێنە

لەم شیعرە ڕەنگینەدا ئەگەر شاعیر ناوی هەندێ جێگەی نەهێنایە لە جوگرافیای کوردستان لەوانە بوو خەیاڵی خوێنەر بچووبایە بۆ ئەوەی وا بزانێ فەرامەرز ئاگاداری ئەوە نییە ڕووباری دیجلە لە ناوجەرگەی کوردستانی باکوور هەڵدەقوڵێ. کە ناوی سیروان و هەورامان و قەیوان و زەڵم و تانجەڕۆی بردووە، بێ گومان زانیویەتی نیوەی دیجلە لە کوردستانە و لەوێش هەڵدەقوڵێ. ئیتر شاعیر لە با دەپاڕێتەوە شنە بکا بۆ ئەوەی لەسەر شاباڵی باران بار بکا بۆ ئەوەی ئەو بارانە گڵپەی تەندووری دڵی دامرکێنێتەوە.

## ٤

فەرامەرز لە ساڵی **١٩٢٧** شیعرێکی بۆ نووری شێخ ساڵح نووسیوە:

ئەی کێوی بڵند پایە ئەیا شاخی مەعەللا
هەر گاھ کە ئەکەی جەزبی نەزەرگاهی حەزینم
بەم بەرزیی و بەم سەتوەتەوە ئەی کەژی واڵا
سروە و شنەکەت دەفعی ئەکا ئاھ و ئەنینم
ئەی کێوی عەسر دیدە ئەتوێ مازیی ئومەت
تەئییدی ئەکەی خاتیرەیی شاهیی کوردان

بۆ شەوکەتی ڕابردوو و ئەییامی سەفامان
بڕژێتە گەواهی حەشەم و قودرەتی میللەت
گاهێ کە ئەپۆشێ سەری تۆ تاجی سەحابی
پڕ قەهر و مەرارەت ئەدەیە پڕمەیی گریان
شوبهەی نییە ئەی شاخی وەفادار و قەدرزان
بۆ میللەتەکەت وا بە پەرۆش و بە عیتابی
ئێستاکە کەوا فەسڵی زەمستانی هەرەمتە
بێ بەرگ و نەوا ڕیش و سەرت گشتی سپی بوون
مەعلوومە لە لام هەر ئەمە ئەسبابی ئەلەمتە
کوردانی حوکمڕانت کەوا ئێستا نەوی بوون
خۆزگەم ئەمەیە قودرەتی ئیعجازی تەبیعەت
ئەی مولهیمی ئەشعاری لەتیف کێوی سەر ئازاد
ئەی باعیسی دەنگی سروودی شاعیری ناشاد
ئەی کێوی ئەساتیری ئەیا شاخی موتەلسەم
تۆشی وەکو من ئێستە بهێنایە خەتابەت
دار و دەوەن و بلبل و ئەلواحی بەدیعەت
هەریەک وەکو شیعرێکی بەدیعی بە فەساحەت
ئیحیایی بکەن دەبدەبەیی عەهدی کەیانی
یەعنی ببنە سەفحەیی تەئریخی موجەسسەم

نووری شێخ ساڵح شاعیری یەکەمی سێکۆچکەی بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردی بوو لە سلێمانی لەگەڵ گۆران و فەرامەرز. لەم شیعرەدا لە کێوێکی بڵند دەدوێ. لە سلێمانی گەلێ شاعیر باسی کێوی بڵندیان کردووە، هەندێکیان ناویان هێناوە و مەبەسیان پیرەمەگروون بووە، هی دیکەیان ناویان نەهێناوە، بەڵام ئەو شاخەی باسیان لێوە کردووە بەڕەمز دیسانەوە مەبەسیان پیرەمەگروون بووە. ئیتر ئەم وەسفەی فەرامەرز بەڕاستی پیرەمەگروون دەگرێتەوە، کەچی مەبەسی لە کێوی بڵند نووری شێخ ساڵحە، بەداهێنەری شیعری نوێی دەژمێرێ، ئەو ڕەنگاوڕەنگییەی لە کێوی بڵنددا هەیە لە شیعری نووری شێخ ساڵحیش بەرچاو دەکەوێ.



## ٥

فەرامەرز شیعری بۆ عەبدوڵڵا گۆرانیش وتووە لە ساڵی **١٩٣٣** بەناوی «عەشقی بێ سوود» :

دڵی پەشێواو دەمێ بوو ون بووی
لە مەیدانی عەشق ئالام و غەمدا
لە ناو ئەحلام و سەمای پڕ تەمدا
زۆر شوکور دیسان بەتیرێ کون بووی
هەرچەن ئەزانم عەشق بێ سوودە
نەتیجەی حوزن و گریان و شینە
وەسڵی فیراقە شادیی ئەنینە
بەڵام لە لای دڵ دڵەی فەرسوودە
عەقڵ و دووربینی خەوە سەرابە
مەنتیق پرشنگی دوو چاوی کاڵە
حیکمەت پڕیشکی کوڵمێکی ئاڵە
خوێناوی جگەر مەیە شەرابە
یەزدان شاهیدە ئەی دڵی لاسار
جێگە نزرگەی خەیاڵی دڵدار
گەر نەمزانیایە خەڵوەتگەی یاری
وە یا زاماری چاوی بیماری
ئێستا ئەمناردی بۆ شاری عەدەم
نەجاتم ئەدای لە دەست دەرد و غەم

شاعیر ئەم لیریکەی پێشکێش بەگۆران کردووە، ئەگینا لەم شیعرەدا هەست بەهیچ جۆرە شوێنەوارێک ناکرێ پێوەندی بەگۆرانەوە هەبێ، تەنیا ئەوە نەبێ بەشێوازێکی شاعیرانەی ڕۆمانتیکی باس لە گیانی دڵداری دەکا ئەوەی لە فرمێسک و پەژارە و ئاوارەیی بەولاوە بۆنی هیچی لێ نایە. لەوانەیە پێوەندی ئەم شیعرە بەگۆرانەوە وەکو فەرامەرز هەستی پێ دەکا ئەوە بێ گۆران یەکێکە لە نوێکەرەوەکانی شیعری کوردی و توانای ئەوەی هەیە لەم جۆرە شیعرە بگا.

## ٦

شاعیر بۆ لافاوەکەی ساڵی **١٩٣٢**ی شاری سلێمانی بەناوی «شاری بەدبەخت»ەوە دەڵێ:

فەرتەنە و با و و برووسکە ئاه و واوەیلا و فیغان
گرمە و و ناڵەی سەما شین و شەپۆڕی سەرزەمین
دەنگی ئیستیعدادی دایک و گریەیی پیر و جوان
هاڕەیی لافاو و سەیل و نەوحەیی ئاخ و ئەنین
گاه لە تاو تیفلی خەواڵوو دایکی بێچارە و هەژار
بێ تەرەددود بێ مەحابا خۆی ئەخستە ئاوەوە
گاه لە تاو مەوتی منداڵی باوکی بەدبەخت بێ قەرار
هەروەکو مەل بۆ ئومێدێ خۆی ئەکرد بەداوەوە
شاری بەدبەخت هەر تەبیعەت مابوو لێت بێتە خرۆش
وا ئەویش پڕ چەک موسەللەح هاتە مەیدانی هوجووم
با ئەمیش سەرباری دەرد بێ با قەلیش هەم دەنگی بووم
با سەماش جووت بێ لەگەڵ ئەرز بەڵکو کوردان بێنە جۆش
جۆشی وام ناوێ کە بگرین یاخو سینە چاک بکەن
جۆشی پڕ سۆزم ئەوێ کیسەی حەمییەت بێننە دەر
بۆ ئیعانەی شاری بەدبەخت بۆ وڵاتی قوڕ بەسەر
بۆ برای بێ نان و شێو بۆ مردووانی بێ کەفەن

ئەم لیریکە بریتییە لە شینێکی پڕ سۆز و فرمێسک ڕشتنێکی گەرم بۆ ئەو کارەساتەی لە ئەنجامی لافاوەکەی ئەو ساڵەی سلێمانی کەوتە ناوەوە. هەندێ وێنەی تراجیدییانە لە شیعرەکەدا بەدی دەکرێ، وەکو شێوانی دایک بەهۆی خنکانی جیگەرگۆشەی. شاری سلێمانی بەدبەخت هەموو جۆرە کارەساتێکی بەسەردا هاتووە. کوشتن و تاڵان و داگیرکردن. سەرباری ئەمە هەمیشە سروشتیش گورزی خۆی دەوەشێنێ، ئەمە لە لافاو و ڕەشەبا و ڕووداوی دیکە خۆی دەنوێنێ.



## فەرامەرزی نووسەر

لەو سەردەمەی فەرامەرز بایەخی بەئەدەب داوە زیاتر خەریکی پەخشان بووە و بەرهەمی لەم لایەنەوە هەندێ زیاترە لە شیعری. لەبەرئەوە تەنیا وەکو شاعیرێک ناچێتە ناو مێژووی ئەدەبەوە بەڵکو وەکو یەکێک لە بەشدارانی بەهێزکردنی پەخشانی کوردی دەکەوێتە بەرچاو. لە نووسینی پەخشانیدا زمانی ڕەوان و مەیلی بۆ کوردی پەتی بووە، لەبەرئەوە هەرچەندە لە شیعریدا وشەی بێگانەی بەکارهێناوە کەچی لە پەخشانیدا ئەم دیاردەیەی پێوە دیار نییە.

بابەتە ئەدەبییەکانی پەخشانی لە چوارچێوەی وتاری ئەدەبی و کورتە چیرۆک بەرچاو دەکەون. لە زۆرینەی بەرهەمیدا ئەم دوو ژانرە ئەدەبییە بەتەواوی لە یەکتریدا نەبوونەتەوە، بۆیە دەکرێ «وتارەچیرۆک» یا «چیرۆکەوتار»یان پێ بوترێ. بێ گومان لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان بەڕوونی وەک وتار یا کورتە چیرۆک دەکەونە بەرچاو. هەموو وتاری ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و چیرۆکەکانی لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی ئەو سەردەمە بڵاوکراونەتەوە.

کارە پەخشانییەکانی فەرامەرز دەکرێن بەدوو بەشەوە:

١- وتاری ئەدەبی و چیرۆک: ئەم بابەتە نووسینانەی بەقەوارە بچووکن. ئەوەی زۆر لە بەرچاو بێ لەم جۆرە نووسینانەی ئەمانەن: دوو چاو و بەیتێک (١٩٤٦)، تێکۆشینی کوڕێک و میهرەبانی باوکێک، نووسینی بێ قۆرت (١٩٤٠)، ئەمین زەکی (١٩٤٨)، گوێی ئاگردان (١٩٤٨).

٢- وتاری کۆمەڵایەتی: شێوازی نووسینی لەم بابەتە بەرهەمەیدا ئەدەبی و هونەری و ڕۆمانتیکییانەیە. لەم نووسینانەیدا بەشێوازێک باس لە کەموکوڕییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکا خوێنەر هەست بەچێژێکی هونەری و بزووتنەوە و جریوەیێکی پڕ لە سۆز دەکا لە ناو دڵ و دەروونیدا. هەندێ لە بەرهەمەکانی بەم ناوونیشانانەن: نووسینی کوردی، خووی بەد (١٩٤٧)، هاوین و کوێستانە شیرینەکانمان (١٩٤٧)، دارستانەکانمان، گاندی (١٩٤٨).

جگە لەمە هەندێ بەرهەمی دیکەی فەرامەرز دەچنە ناو خانەی لێکۆڵینەوە و زانستی ئەدەب و ڕەخنە، لەوانە پێویستە ئاماژە بۆ ئەم بەرهەمانە بکرێ: وەلیی دێوانە (ئەمەی پێشکێش بەعەبدوڵڵا گۆران کردووە) (١٩٣٤)، زەردەشت و دینی زەردەشتی (١٩٣٤)، ئەدەبیاتی کوردی (١٩٣٣ - ١٩٣٤).

سەرەڕای ئەمانە فەرامەرز دەستی وەرگێڕانیشی بووە لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ زمانی کوردی، لەمانە بەشێکی لە گەشتنامەکەی ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیز بیللی فریزەری لە ساڵانی (١٩٣٠ - ١٩٤١) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. جگە لەمە دوو کتێبی قوتابخانەی سەرەتایی قوتابخانە کوردییەکانی عیراقی لە عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

لە دوا ساڵانی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەم فەرامەرز وازی لە ژیانی ئەدەبی هێناوە و خەریکی وەزیفەی گەورەی میری بووە. لە دوای خانەنشینی لە ساڵی **١٩٥٨** بۆ ماوەی دە ساڵێک خەریکی خوێندنەوە بووە. پێش کۆچی دوایی لە مایسی ساڵی **١٩٦٧** دەستی کردووە بەنووسینی ڕۆمانی «مامۆستا برزوو». ناوەڕۆکی ڕۆمانەکە کۆمەڵایەتییە لە ژیانی کوردەواری دەدوێ. قارەمان و جێگە و شوێن و نەریت و خوو و ڕەوشت هەمووی کوردەوارین، بەزمانێکی پاراو و ئاسان تۆمار کراوە. نووسەر هەوڵی داوە مەرجەکانی هونەری ڕۆمان نووسین بخاتە پراکتیکەوە.

## نموونەی پەخشانی فەرامەرز

یەکێ لە پەخشانە ڕەنگینەکانی فەرامەرز ئەوەیە لە ساڵی **١٩٤٨** بەناوی «گوێی ئاگردان» بڵاوی کردۆتەوە: «لە سەرما و سۆڵەی زستاندا، بەتایبەتی لە وڵاتی خۆماندا کە لوولە سەهۆڵ وەکو بلوور ئەدرەوشێتەوە و بەفر وەکو پەمووی سپی دنیا داگیر ئەکا، چ باسێ لە باسی ئاگر و ئاگردان خۆشترە! تۆ گەرمی و تینی ئاگری زستان بەگشتی و موبارەکی ئاگر بخەرە لاوە، مەبەستم ئەمە نییە، مەبەستم گوێی ئاگردانە، ئاگردان خۆی نیشانەی خێزانێکی کۆماڵێکی ئاوەدان و گردە. ئاگردان چ لە ماڵدا بێ و چ لە مزگەوت و دیوەخان، کانییەکە سەرچاوەی هۆشی میللی لێوە پەیدا ئەبێ. هۆشی میللی وەکو هەموو ئەیزانین ئەنجامی حیس و عەنعەنەیێکی یەکسان، تەئریخێکی یەکگرتوو و بڕوا و ڕەوشتێکی لەیەک چووە. ئەم سێ پایە لە ئاگردانەوە گڵپە و ڕووناکی، تین و تەوژم پەیدا ئەکا. لە هەندێ لە شارەکانماندا ئەشێ ئاگردان و سەرگوروشتە و حیکایەتێکی گوێی ئاگردان نرخ و ئەهمییەتی کۆنی نەمابێ، بەڵام لە بەشی زۆری وڵاتەکەماندا لە لادێدا ئەوەی مومەیزاتی میللیمانی پاراستبێ ئەتوانم بڵێم ئاگردانە. لە گوێی ئاگردانە مناڵە وردەکانمان ئەفسانەی کۆنی کوردی، حیکایەتی دێرینی پەری و دێو لە مێشکیاندا ئەچەسپێ. هەرچەندە وەکو تارماییەکی لێڵیش بێ، شکۆی ڕابردوومان لە دڵیاندا جێگیر



ئەبێ. ئەمانە بەجۆرێ کاریان لێ ئەکا هەموو کارەساتی ڕۆژگار لە بیر ناباتەوە. بەکورتی مناڵە وردەکانمان لە گوێی ئاگردان زمانیان ئەپژێ و بەگڕ و گڵپەی ئاگری ئاگردان دڵ و مێشکیان زاخاو ئەدرێتەوە. بۆ لاوەکانمان ئاگردان ڕەمز و نیشانەیێکی ترە. بۆ ئەوان مەیدانی جوامێری و شاسوارییە گڕی ئاگردان لەواندا تەنیا دەست و پل گەرم ناکاتەوە، بەشکو گیانی جوامێریشیان تیا ئەبووژێنێتەوە. گەرمای ژیانی هەزار ساڵەی لە ناو ئەم دۆڵ و شاخە جوانەیان تیا ئەهێنێتە جۆش. هەریەکەیان بەزمانێکی سادە و دڵێکی پاکەوە سەرگوروشتەی قارەمانی خۆی، وە یا هی لاوانی تر ئەگێڕێتەوە. لەم گێڕانەوەیەدا نە فیزی تیایە نە خۆ هەڵکێشان. باسی پەلاماردان و کوشتنی پڵنگێکت بەچەشنێ بۆ ئەگێڕێتەوە کە من و تۆ باسی بەفاقە چۆلەکە گرتنێ وا ناگێڕینەوە. یەکێکی تریان تێت ئەگەیەنێ چۆن لە ڕۆژێکی تۆف و سەر بەکڵاوە بەفردا ڕێگای خۆی ڕزگار کرد و گەیشتە ئاوایی. ئەم ڕەوشتە، ئەم عەنعەنەی گوێی ئاگردانەیە کە جوامێری و جەنگاوەری و بەخۆدا ڕاپەڕموونی بۆ ئێمە کردووە بەشتێکی سروشتی و ئەم خسڵەتانەی بۆ ئێمە پاراستووە».

لەم وتارە ڕۆمانتیکی و هونەرییەدا نووسەر گرنگی ئاگردان لە ماڵی کورددا دەخاتە بەرچاوی خوێنەر. سروشتی کوردستان وای کردووە لە زستانا هەموو خێزانێک لە دەوری ئاگردان کۆببنەوە. بەشێک لە مێژووی ئەم میللەتە لە دەوری ئاگرداندا دەکەوێتەوە، منداڵ پەروەردە دەبێ، داهێنانی ئەدەبی میللی سەرزار (فۆلکلۆر) دروست دەبێ. بەرنامە و پیلانی ژیان گفتوگۆی لەسەر دەکرێ. جگە لە پیرۆزی ئاگر کە جەوهەرێکە لە جەوهەرەکانی ژیانی ئادەمزاد بەتایبەتی لە زستاندا.

***

ڕەشید نەجیب ناسراو بەفەرامەرز نووسەر و شاعیرێکی بەتوانای ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بوو. بەرهەمی ئەدەبی بەقەوارە کەم بوو، چونکە زوو لە گێتیی ئەدەب دوور کەوتەوە. یەکێک بوو لە سێکوچکەی دامەزرێنەرانی ڕێبازی «شیعری نوێ»ی کوردی لەگەڵ نووری شێخ ساڵح و گۆران لە نێوان هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەم لە سلێمانی. کۆمەڵێک بەرهەمی بەپێزی خستە ناو سامانی نەتەوەیی لە بابەتی شیعری نوێ و وتار و کورتە چیرۆکی کوردی.

# بەشی پێنجەم

## عەلائەدین سەجادی

**١٩٠٧ – ١٩٨٤**

### ژیانی

عەلائەدین کوڕی نەجمەدین کوڕی عیسامەدین لە بنەماڵەی سەجادی شاری سنەیە. لە ساڵی ١٩٠٧ لە گەڕەکی قەتارچیان لە سنە لە دایک بووە. خوێندنی بەرایی لە حوجرەی مزگەوت دەست پێ کردووە. بەفەقێیەتی گەلێ شوێنی کوردستانی ئێران و عیراقی کردووە. لە دوا جارا لە سلێمانی نیشتۆتەوە و لە ساڵی ١٩٣٨ ئیجازەی زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی لەوێ وەرگرتووە. ئەوجا ڕووی کردۆتە بەغدا و لە مزگەوتی نەعیمە خاتوون لە گەڕەکی بەناوبانگی مەیدان دامەزراوە. پێش نوێژی مزگەوتەکە بووە و هەر لەوێش ژیاوە.

لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتی لە ڕۆژنامەگەری نزیک بۆتەوە، بەم هۆیەوە پێوەندی بەچاپ و چاپەمەنییەوە بووە. لە کۆواری «گەلاوێژ» کاری کردووە، کۆواری «نزار»ی بەڕێوە بردووە، لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بەغدا لە ساڵی ١٩٥٩ کراوە بەمامۆستای موحازیر لە ئەدەبی کوردی لە بەشی زمانی کوردی کۆلێجی ئەدەبیاتی بەغدا، لەم کارەدا ماوەتەوە تا ساڵی ١٩٧٤. لەو ساڵەدا کە بەیانی ١١ی مارتی ١٩٧٠ سەری نەگرت و نێوانی دەسەڵاتی بەغدا و ڕاپەڕینی نیشتمانی کورد تێکچوو سەجادی کرا بەئەمینداری گشتی ئەوقاف (بەپلەی وەزیر) لە هەرێمی ئەڤتۆنۆمی کوردستانی عیراق لە شاری هەولێر. سەجادی لە لایێک ئەم کارەی پێ خۆش بوو چونکە سوودی دارایی بۆی هەبوو. لە لایێکی دیکەوە پێی ناخۆش بوو چونکە ئەو دەسەڵاتەی ئەم کارەی پێ سپارد بوو لە دژی کورد و فەرمانڕەوایی شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ بوو. بەهەموو جۆرێ سەجادی دەیتوانی ئەم کارە نەکا. لەم پۆستە گەورەیەی میری مایەوە تا ساڵی ١٩٧٧ ئینجا خانەنشین کرا. لە دوای ئەوە گەڕایەوە بەغدا جێی هەمیشەیی زیندەگانی و بەتەواوی کەوتە سەر کۆتایی هێنان بەو پڕۆژانەی پرۆگرامی بۆ دانابوون لە بابەت ئەدەبی کوردییەوە. کوژرانی کوڕی گەورەی لە جەنگی عیراق و ئێران (١٩٨٠ – ١٩٨٨) پشتی شکاند و هێزی لێ بڕی و لە پەلوپۆی خست توانای نووسین و



لێکۆڵینەوەی کەم بووەوە تا لە ڕۆژی ١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٤ لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بەخاک سپێررا.

### سەجادیی ڕۆژنامەنووس

لەگەڵ نیشتەجێبوونی سەجادی لە بەغدا ئیبراهیم ئەحمەد خەریکی دەرکردنی کۆواری «گەلاوێژ» بوو لەبەر ئیشوکاری پارێزەری (ئەوقاتی) و جموجوڵی سیاسی نهێنی کاروباری بەڕێوەبردن و چاپکردنی کۆوارەکەی بەسەجادی سپارد بوو، ئەمیش بەزۆری ژووری ژیانی خۆی لە مزگەوت کردبووە جێگەی بەڕێوەبردنی کۆوارەکە، لەگەڵ ئەوەشدا «گەلاوێژ» ژووری تایبەتی هەبوو وەک نووسینگە و سەجادی کاری تێدا دەکرد. ئەم کارە مەشقێکی گرنگ بوو و زەمینەیێک بوو ببێ بەپسپۆر لە ڕۆژنامەگەریدا و سەرچاوەییێکی زۆر لە ئەدەبی کوردی کۆ بکاتەوە و شارەزایی لە مێژووی خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردیدا پەیدا بکا. جگە لە «گەلاوێژ» لە ساڵی ١٩٤٨ سەجادی کۆواری «نزار»ی بەزمانی کوردی و عەرەبی لە بەغدا دەرکردووە، ئەمەیان بڵاوکراوەییێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو.

### سەجادی پسپۆری ئەدەبی کوردی

مەیدانی نووسینی سەجادی لە بابەت ڕۆشنبیری کوردی بەگشتی و ئەدەبی کوردی بەتایبەتی گەلێ فراوان بوو. جموجۆڵییە خوێندەوارییەکانی لەم خاڵانەدا دەکەونە بەرچاو:

١- گرنگترین کاری «مێژووی ئەدەبی کوردی» بوو. دووجار لە بەغدا چاپ کراوە یەکەمیان ١٩٥٢، دووەمیان ١٩٧١. لەم کارەیدا سەجادی توانیویەتی زانیارییێکی زۆر لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە کۆ بکاتەوە، لە سەرەتاوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم. ئەو سەرچاوە و کەرەستانەی تا ئەو کاتە لە ناوەوە بوون بەکاری هێناون. بۆ ئەو سەردەمەی کتێبەکە بڵاوکرایەوە ڕووداوێکی مەزنی نێوەندی ئەدەبی کوردی و ڕۆشنبیری کوردی بوو.

٢- لە بابەت زمانی کوردی و مێژووی ئەدەب و ڕەخنەوە سەجادی لێکۆڵینەوەی بەپێزی هەیە، لەوانە «دەستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی» (بەغدا ١٩٦١)؛ «ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی» (بەغدا ١٩٦٨)؛ «نرخ شناسی» (بەغدا ١٩٧٠)؛ «دوو چامەکەی نالی و سالم» (بەغدا ١٩٧٣)؛ «دەقەکانی ئەدەبی

کوردی» (بەغدا ١٩٧٨)؛ «خۆشخوانی» (بەغدا ١٩٧٨).

٣- سەجادی لە زانستی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکاندا بەشداری کردووە، زانیارییێکی زۆری هێناوەتە ناو نامەخانەی کوردییەوە. هەندێکیان تاقیکردنەوەییێکن بۆ یەکەمین جار ئەنجام دەدرێن، لەمانە لە مێژوودا «شۆڕشەکانی کورد» (بەغدا ١٩٥٩)؛ لە ئەتنۆگرافیا «کوردەواری» (بەغدا ١٩٧٤) بوون بەسەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوەی دیکە لە دوارۆژدا.

## سەجادیی نووسەر

سەجادی نووسەرێک بوو شێوازی خۆی هەبوو لە نووسیندا، بەزۆری کارە داهێنراوە پەخشانییەکانی شیعرئامێزی ڕۆمانتیکییانە بوون. ئەمە لە بەشێکی بەرهەمیدا ڕوون و ئاشکرایە. کارە داهێنراوەکانی لەم بەرهەمانەدا بەرچاو دەکەون:

١- لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا دیباجەییێکی پەخشانەشیعری نووسیوە بۆ هەموو ئەو شاعیرانەی بەدرێژی باسی لە ژیان و بەرهەمی شیعریانی کردووە. ئەو پارچە شیعرانە نووسەر وەک شاعیرێک دەخەنە ڕوو.

٢- پەخشانە جوانەکانی سەجادی لە کتێبی «گەشتێک لە کوردستانا» (١٩٥٦) لێکسیکۆن و زمانی ئەدەبی یادداشت و تێبینی ڕۆژانەیان هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. ئەو کتێبەی سەجادی بریتییە لە تێبینی لە بابەت ئەو گەشتەیەوە لە کوردستانی عیراق کردوویەتی لە بەغداوە بۆ مووسڵ و هەولێر و کەرکووک و سلێمانی.

٣- یەکێ لە کارە گەورە و بەنرخەکانی «ڕشتەی مرواری»یە (بەغدا ١٩٥٧ - ١٩٨٣) لە هەشت بەرگدا بڵاوکراوەتەوە. ئەم کارە بریتییە لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و ئامۆژگاری بەشێوەی ساتیر و کۆمیدی بەهەواییێکی ڕۆمانتیکییانە نووسراوەتەوە. سەجادی ئەم قسە و بەسەرهاتانەی لە خەڵک بیستووە. خاوەنەکانیان بەزمانێکی میلیی سەرزار وەکو بەرهەمێکی فۆلکلۆری بۆیان گێڕاوەتەوە، ئەو بەشێوازێکی ئەدەبی و زمانێکی بەرز تۆماری کردوون. بەرهەمێکە شانازی ئەدەبی کوردییە.

٤- لە چیرۆکدا سەجادی یەکێکە لە نووسەرە بەراییەکانی دەوری گرنگیان بووە لە پەرەسەندن و گۆڕان و پێشکەوتنی وتار و چیرۆکی کوردی. نووسەر لە نەوەی یەکەمی ئەم هونەرەیە کە لە نێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی گێتیی سەدەی بیستەم



پەیدا بوو. چیرۆکی لەسەر لاپەڕەکانی گۆواری «گەلاوێژ» (١٩٣٩ - ١٩٤٩) بڵاوکراوەتەوە. لە پاشانا بەناوی «هەمیشە بەهار» (بەغدا ١٩٦٠) لە کتێبێکدا چاپ کراوەتەوە.

ژیانی میللیی ناو کۆمەڵی کوردەواری بوون بەسەرچاوەی بنچینەیی چیرۆکی سەجادی، بەتایبەتی ژیانی کۆمەڵی گوندایەتی و ئاوەدانییە کشتوکاڵییەکان. ئەمە لە ناوونیشانی هەندێ لە چیرۆکەکاندا دەردەکەوێ، وەکو «شاییەکەی ڕەشەی خەجەلاو» و «بۆ نەچووین بۆ کوێستان؟» و «جەوهەر ئاغا» و «ڕێوییەکەی قەمچووغە» و هی دیکە.

## نموونەی نووسینی

١

لە پێشەکیی باسی ئەحمەدی خانی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا سەجادی دەنووسێ:

قەڵەم کە نووسی نەخشی زەڕ کفتی
شەیدای دەنگێ بوو کەوا ژنەفتی
چیرۆک نووسەکان تا بە هۆمیرۆس
لەبەر ئەو دەنگە بوون بەچیرۆک نووس
ئەو دەنگە دەنگی نەوای خانی بوو
شمشاڵی گیانی نەوجەوانی بوو
بادەپەرستان سەرخۆشانی ڕاز
قەتاری عاشق پۆلی چاو بەناز
میر و شاریار بەگزادەی دیار
فریشتە و پەری ئاغە و جووتیار
ڕەوالانی مەم کناچانی زین
سەراپەردەکەی ئەمیر زەینەدین
چەکۆ و عارف ستی و تاژدین
حەیزەبوون بەکر وەیشوومەی بە کین
ئەمانە هەموو کەوتنە خۆشخوانی
بەتیشکی فیکری ئەحمەدی خانی

## ٢

لە پەراگرافێکی «ڕشتەی مرواری» سەجادی ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە:

«کابرایێک لە پاش نیوەشەو بەناو شارا ئەسووڕایەوە، پاسەوانەکان هاتن گرتیان، وتیان تۆ دزی. وتی: باوکم من دز نیم بەڵام نامەوێ بچمەوە ماڵی خۆم! هەرچەند قسەی کرد کەڵکی نەبوو، بردیان بۆ بەندیخانە و ئەو شەوە حەپسیان کرد و بەیانی بردیانە لای قازی. قازی وتی: تۆ بۆچی ویستووتە دزی بکەی؟ ئەویش وتی: جەنابی قازی من دز نیم، بەڵام نیو سەعات مۆڵەتم بدە و پیاوێکم لەگەڵ بنێرە ئەچمە ماڵەکەی خۆم و ئەگەڕێمەوە ئەو وەختە چیم لێ ئەکەی لێم بکە. قازی وتی باشە و پیاوێکی لەگەڵ نارد. کابرا چووە ماڵەوە ژنێکی زۆر ناشیرینی هەبوو، وتی: ژنەکە هەستە خۆت کۆکەرەوە با بچین. ژنەکە کەوتە تەکی و چوونەوە بۆ لای قازی. کابرا دەستی برد پەچەی ژنەکەی هەڵدایەوە و وتی: جەنابی قازی! یەکێ ئا ئەمە ژنی بێ نەوەک تا نیوەشەو بەڵکو تا بەیانیش ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە؟! قازی کە ئەمەی بیست و ژنەکەی چاوپێکەوت بەڕەڵای کرد».

## ٣

سەجادی لە چیرۆکی «شاییەکەی ڕەشەی خەجەلاو»دا بەشێوازێکی ساتیرانە و کۆمیدیانە باس لە کوردێکی عیراق دەکا گوایا وەک نوێنەری کورد پەرلەمانتارە لە پەرلەمانی سەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیکی (١٩٢١ – ١٩٥٨) لە بەغدا. لە ماوەی ئەندامیەتی پەرلەمانی ورتە لە دەمی نەهاتۆتە دەرەوە. گفتوگۆ بەزمانی عەرەبی بووە. ئەو ئاغا دەرەبەگەی نوێنەری کورد نەخوێندەوار بووە، زمانی عەرەبی نەزانیوە، لەو سەردەمەی لە بەغدا بووە هیچی لێ فێر نەبووە.

ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە ئەم چیرۆکەی سەجادی کراوە بەڕووسی و لە ساڵی ١٩٦٨ لە مۆسکۆ بڵاوکراوەتەوە و نێوەندی خوێندەواری پێشوازیی باشیان کردووە.

سەجادی بەم وتانە دوایی بەچیرۆکەکەی دێنێ:

«لە بارەکەی تریشا بەڵێ ڕاست بوو ئاغە نائیب بوو لە مەجلیسدا، بەڵام من هەر وا جار جار ئەچووم بۆ گوێگرتن، چونکە شوێن هەیە بۆ گوێگران. بەو قورعانەی تۆ ناوتەتە سەر ڕانی ڕاستت لەو چەند ساڵەدا نە بیستم و نە دیم ئاغە لەو مەجلیسەدا ورتەیێک لە



دەمی بێتە دەرەوە! ئێستا و ئەوسا زمانەکەش فێر نەبوو لایەقەلی بزانێ خەڵکەکە قسە لە چییەوە ئەکەن! سا چاک یا خراپ پەنجەکە هەر بەرز ئەکرایەوە ئیتر تێبگەین یا تێنەگەین شەرت نەبوو. ئیتر ئیش رایی کردنی چی، قسەی چی، بەشوێن ئیشوکاری ئەم و ئەوا هەڵسووڕانی چی؟!

ها، ئەوەم لە بیر نەبوو، پیاو درۆ نەکا چاکە، ڕۆژێکیان لەو ڕێکەوتانە بوو کە منیش چووبووم بۆ گوێگرتن، هەرچەندە شوێنی گوێگران جیا بوو لە شوێنی نائیبەکان، بەڵام وا ڕێکەوت بوو لێوە نزیک بووم، گوێم لێ بوو دەنگێکی لێوە هات وتی: پەککو لەوی گەرمایێ، بەقوڕێ گیرێ ئەو شارە لۆ گەرمای. کابرای تەنیشتی لێی تێ نەگەیشت، لێی پرسی کە ئەوە چی ئەڵێ!؟

ئەویش تێی گەیاند وتی: ئەوی شارە عارە... عارە...

پەککو... واتە حارە (بەعەرەبی واتە گەرمە).

بەڕەحمەت بێ مامە ڕەشە شاییەکی خۆشی بۆ کردین».

***

عەلائەدین سەجادی خوێندەوارێکی بەدیمەنی کورد بوو لە سەدەی بیستەمدا. نووسەر و ڕۆژنامەنووس و کارگەری زانستی بوو. لە زۆربەی مەیدانەکانی ئەدەبی و زانستی و کۆمەلایەتی و مرۆڤایەتی بەرهەمی بەکەڵکی هەیە. باڵادەست بوو لە نووسینی وتار و چیرۆک و یادداشت و بابەتەکانی دیکەی پەخشان. نووسینی بەگشتی زاخاوی مێشک و خۆراکی گیان و ئارامی دڵ و دەروون بوو بۆ خوێنەر و خوێندەوارانی سەردەمی خۆی و لە پاشانا بۆ نەوەکانی دوارۆژ.

# بەشی شەشەم

# بەختیار

## ١٩٠٨ – ١٩٥٢

## ژیان و بیر و ڕەوشت

فایەق کوڕی مەلا عەبدوڵلای زێوەری شاعیر لەساڵی ١٩٠٨ لە سلێمانی لە دایک بووە. هەرچەندە «بەختیار»ی وەکو نازناو هەڵبژاردووە کەچی لە شیعریدا ناوی ڕاستەقینەی خۆی «فایەق»ی بەکارهێناوە. لە ناو کۆمەڵدا بەبەختیار زێوەر و فایەق بەختیار ناسراوە.

وەک بەرکولێک بۆ فێربوون سەرەتا لە حوجرەی مزگەوت خوێندوویەتی، بەڵام زوو ڕووی کردۆتە قوتابخانە و باوەڕنامەی شەش ساڵەی سەرەتایی وەرگرتووە. لە پاشانا قوتابخانەی برینپێچی ئاژەڵی تەواو کردووە. لە هەندێ لە ئاوەدانییەکانی ناوچەی سلێمانی و شارۆچکەی پردێ (ئاڵتوون کۆپری) خەریکی ئەم کارە بوو. لەو کاتەی لە ساڵی ١٩٤٦ قوتابخانەی ناوەندی شەو لە سلێمانی کراوەتەوە بەختیار خوێندنی لەوێ تەواو کردووە و باوەڕنامەی قوتابخانەی ناوەنجی وەرگرتووە.

لە منداڵییەوە شوێنەواری هەندێ نەخۆشی لە بەختیاردا لە بەرچاو بووە، لەوانە ڕۆشنایی چاوێکی کز بووە و لەو شتە پێویستییەی ژیان بێ بەش بووە. هەروەها گرفتاری نەخۆشییێکی کوشندەتر بووە، نەخۆشی مێشک. لە ساڵی ١٩٤٨ کە باوکی کۆچی دوایی کردووە، نەخۆشییەکە زیاتر تەشەنەی کردووە و بەدەست ئازاری دژوارەوە ناچار بووە پەنا بۆ پزیشکانی بەغدا ببا. نەشتەرگەری قورسی مێشکیان بۆ کردووە. لە ئەنجاما بێ سوود بووە و لە دوای شەش مانگ لە ڕۆژی ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٢ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی جۆگا لەتەک باوکی نێژراوە.

زێوەری باوکی کاری گەورەی کردۆتە سەر بەختیار، دروستبوونی کەسایەتی لە ڕووی خوو و ڕەوشتی ئادەمزادی و خەیاڵی شاعیرییەوە لە ئەنجامی پەروەردەی باوکیەتی. لە سەرەتای ژیانیەوە بەگیانی کوردایەتی پەروەردە کراوە و لە دواییدا نەریتی کوردەواری فێر بووە بەمانای ڕۆژگارانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم. لە ناوەڕاستی ئەو سەدەیەدا لە وردە ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردی ئەو سەردەمە نزیک بووە، وەکو کۆمەڵەکانی هیوا و ژ. ک. و ڕزگاری و شۆڕش.



پرسی سەرەکی کە بیری شاعیری داگیر کردووە و هەمیشە لە یادیدا بووە و بۆ وەرام گەڕاوە مەسەلەی چارەنووسی نەتەوەیی کورد بووە. لەبەرئەوە بەزۆری ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە شیعریدا ڕەنگی داوەتەوە.

بەڵگەییێکی دیکە بۆ ئەوەی بەهرەی داهێنانی هونەر هیچ جۆرە سنوور و مەرج و دەستوورێکی نییە ئەوەیە ئەو نەخۆشییەی پێوەندی بەمێشکییەوە بووە دەبوو ئاژاوە لە مێشک و خەیاڵی بەختیاردا دروست بکا، کەچی بەپێچەوانەوە ئەو ئاژاوەیەی ناو مێشکی بوو بەهۆی ئەوەی بەرهەمی شیعری ڕێکوپێک بێ، نەرمونیان بێ، ڕوخسار و ناوەڕۆک گونجاو بن و شاعیر دەستێکی باڵای هەبێ لە هارمۆنیای ناوەوەی گەلێ لە شیعرەکانی و لە ڕووی جوانکارییەوە ببن بەنموونەی باڵا لە شیعری کوردیدا.

## شاعیری قۆناغی گواستنەوە

بەختیار بەشیعر دەستی بەژیان کردووە و بەشیعریش ماڵئاوایی لە گێتی کردووە. لە شیعری باوکییەوە فێری شیعر هۆنینەوە بووە. وەکو هەموو شاعیرانی دیکەی ڕەسەن ئەو شیعرەی بەداهێنراو دەژمێررێ بەکاملی لە لای بەختیار لە دایک بووە. هەڵبژاردەی شیعری لە لایەن هەر مێژوونووس و ڕەخنەگرێکی ئەدەبییەوە بەپێی چێژی هونەری ئەو کەسە، ئەو شیعرانە بەکامڵ و بێ کەموکووڕی دەکەونە بەرچاو، جا ئەوە گرنگ نییە لە سەرەتای ژیانی وتبێتی یا لە پێش کۆچی دوایی.

بەهۆی نەخۆشییەوە وەستان و دابڕانێک لە خەیاڵی شیعری لە لای بەختیار ڕووی داوە. نزیکەی دە ساڵێک لە گێتی شیعر دوور کەوتۆتەوە، لە پاشانا کە گەڕاوەتەوە سەری خەیاڵی وەکو جاران کەوتۆتەوە جموجۆڵی وەک نە بای دیبێ نە باران.

جەوهەرەکانی شیعری بەختیاریان دروست کردووە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە لە لای خوارەوە ڕوون دەکرێنەوە.

## شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شاعیر لە ڕووی کێش و قافیەوە لە هەردوو بابەتە شیعری لاسایی عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی وتووە. لە شیعرە عەرووزییەکانیدا لەگەڵ ئەوەی کەمن کەچی هەشت بەحری هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و خەفیف و ڕەجەز و موتەقاریب و کامیل و موجتەسی بەکارهێناوە.

له قافیەشدا دەنگەکانی: (ا ت د ر گ ل م ن (ه – ـه) و ۆ ی ێ)ی بەکارهێناوە. وەکو دیارە بەلای دەنگە تایبەتییەکانی ئەلفوبێی عەرەبی وەکو ث ذ ص ض... نەچووە.

له شیعرە خۆماڵییەکانیدا بەزۆری کێشی دە بڕگەیی بەکارهێناوە، دیارە بەزۆریش قافیەی ئەم جۆرە شیعرە مەسنەوییە. جگە لەوە بەگشتی لە ناو ئەم شیعرە میللییانەشدا کێشی عەرووزی بەرچاو دەکەوێ. ئەم دیاردەیە ئەو شیعرانە لە خانەی بابەتی میللی ناهێننە دەرەوە چونکە تەرکیبی ناوەوەی شیعرەکان میللییانە دروست بووە.

شاعیر لە هونەری تەرجیع بەند و تەرکیب بەندندا دەستێکی درێژی هەیە. تەرجیع بەندێکی لە حەوت بەند پێکهاتووە، هەر بەندی حەوت دێڕە، سەرەتای بەم بەندە دەست پێ دەکا:

ئەی غونچەیی نێرگسی بەهاری
ئارامی دڵانی بێ قـــــەراری

ئەم دێڕەش لە کۆتایی هەموو بەندەکاندا هاتووە:

سەر هەڵبڕە ڕووت ببینم ئەمڕۆ
با خوێنی منت نەیێتە ئەستۆ

لە هونەری تەرکیب بەندیشدا شیعرێکی هەیە لە پێنج بەند پێکهاتووە، هەر بەندی هەشت دێڕە، سەرەتای بەم بەندە دەست پێ دەکا:

وەرە ئەی دلبەری حەمیدە سیفات
موو کەمەر لەب شەکەر ئەنیسی حەیات

پێنج بەندەکانی هەموو تەرکیب بەندەکان بەدێڕی جیاواز کۆتاییان پێ دێ، بەپێچەوانەی تەرجیع بەند، لەوێدا تەنیا دێڕێکە لە دوای هەموو بەندەکاندا دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە.

زمانی شاعیر ئاسانە لە زمانی ستانداردی قسەکردنەوە نزیکە، لەبەرئەوە شیعری ئەدگاری شیعری میللیی فۆلکلۆری پێوەیە، لە هەموو توێژەکانی کۆمەڵی کوردەوارییەوە نزیکە. وشەی بێگانە لە نووسینیدا کەمە، خۆی خەریکی ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی نەکردووە.



## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شیعری بەختیار لە ڕووی ناوەڕۆکەوە سنووڕکێشراوە زۆر فراوان نییە. زۆربەی دەچێتە ناو چوارچێوەی شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و سیاسی و کۆمەلایەتییەوە. وەک ئاشکرایە بۆ سەردەمی ژیانی بەختیار ئەم بابەتانە گرنگترین بەرهەمێک بوون بۆ مەبەسی مەسەلەی نیشتمانی نەتەوەی کورد. لەگەڵ ئەوەشدا بابەتی شیعری دڵداری کلاسیکی نەخستبووە پشتگوێ، ئەم جۆرە شیعرەی زۆر نییە لە دیوانیدا. زیاد لەسەر ئەوە بەختیار یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی سروودی نیشتمانی، ئەم چەشنە شیعرەی دەچێتە خانەی شیعری منداڵانیشەوە.

لای بەختیار ڕێبازە جیاوازەکان کە زاراوەی ڕیالیزم و ڕۆمانتیزم و سیمبۆلیزم و هی دیکەیان بۆ بەکار دەهێنرێ تێکەڵ بەیەکتری کراون. لەبەرئەوە شوێنەواری ئەم هەموو ڕێبازانە لە تاکە شیعرێکی شاعیردا دەبینرێ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ هەندێ جار دەتوانرێ ناسنامەی شیعرێک دیاری بکرێ، بەوەی بۆ بەڵگە بخرێتە خانەی ڕیالیزمەوە یا هەر ڕێبازێکی دیکەوە. یەکێ لە سیفەتە هەرە گرنگەکانی بەرهەمی شاعیر بەگشتی ئەوەیە مانا و وێنە ڕووکەش و ئاشکران، لە سەرەوەن و لە بنەوە نین. لەو شاعیرانەیە شیعری داخراویان نییە، شیعریان دەچێتە ناو شێوازی ئاسانی هونەری مانا لە ڕوو.

## شیعری لاسایی کلاسیکی

١

لە لیریکێکیدا بەختیار دەڵێ:

بێ شەوقە قەمەر وەختی کە هەڵدێ لە هیلالا
مۆمێکە لە چاو حوسنی ڕوخی دلبەری والا
شێتی لەبی تۆم وێڵم و مەجنوونی بیابان
پەروانەیە دڵ وێڵـــە بە دووی دیدەیی کـــالا
عەیشم هەموو غەم بێ خەو و خۆراکە وجوودم
تۆش کافری ڕەحمت نییە یەک ئان لە خەیالا
مردن بەشی گەورەی منە لەم ڕێگەیە قوربان
ڕەحمێ بکە تۆش بمخەرە دەر لەم بنی چاڵە

لەم ڕێگەیی پڕ تاب و غەمە (فایق)ی زێوەر
سووتانە بەشی مردنە حیسسەی لە مە ئالا

ئەم پارچە شیعرە لە بەرهەمە بەراییەکانی سەردەمی لاویەتی شاعیرە، لە ساڵی ١٩٢٨ هۆنیویەتییەوە. وەکو لە مانایدا دەردەکەوێ درێژەپێدانێکی هونەروەرییانەی شاعیرانی پێش خۆیەتی.

٢

لە غەزەلێکیدا لە ساڵی ١٩٤٣ دایناوە دەڵێ:

دلبەرێکی خۆ وڵاتی ئێستەکە دڵدارمە
بۆیە دڵ پڕ سۆزم و جارجار بە دەم هاوارمە
من ئەگەر لەو تەلعەتەی ئیلهامی ڕووحانیم نەبێ
چۆن خەیاڵی فیکر و بیکر و کەڵکەڵەی ئەشعارمە
وەی چ عەییارە هەزار مەکری لە ژێر سەردا هەیە
گاه دڵ دز گەه بە عیشوە لابەری ئازارمە
چاوی بازی هەر بەچاوبازی خەریکی فیتنەیە
لەعلی لێویشی ئەزانم وەک مەیی سەرشارمە
حەز ئەکەم تێر سەیری چاوی کەم بەڵام مورغی دڵم
دێتە لەرزە و پێم ئەڵێ هاوار ئەوە شەمقارمە
نەورەس و نەوپێگەیشتوو دەم بەخەندە بێ ڕەقیب
شەرم ئەکا چونکە یەکەم نازدارەکەی ناوشارمە
زۆر دەمێ بوو وێڵی شۆخێکی وەها بووم سەد شوکر
تازە وا دۆزیمەوە من عاشق و ئەو یارمە
بۆ یەکەم جار ئەو بوو دەرگای مەیکەدەی لێ کردمەوە
مەی گوساری عەشقی هەر لەوساوە پیشە و کارمە
هەر ئەویش بتخانەیی فێر کردم و لای دام لە ڕێ
تاکو ئێستاش جوانپەرستی شوهرەیێکی دیارمە
داخی داخان زوو بە جێی هێشتم بە تەنیا مامەوە
خەڵکی گۆڕ و من ژیانم جێگە گۆڕەوشارمە



وا بە ناچاری و زەبوونی یادی بۆتە دلبەرم
شەرتە کردوومە و خەیاڵی دائیما وادارمە

شاعیر ئارەزووی ئەوە بووە خۆشەویستی هاوولاتی خۆی و کورد و خەڵکی شارەکەی خۆی بێ. ئەگەر بەخەیاڵیش بێ ئەو دلبەرە دەست کەوتووە، کەچی لە دواییدا داخی گران هەڵدەکێشی چونکە ئەو یارەی لە دەست چووە. بۆ شاعیری ڕۆژهەڵاتی جوانکاری لەوەدایە بەسەرهاتی دڵداری دراماتیکییانە کۆتایی پێ بێ، لەبەرئەوە بەختیار یارەکەی لە خۆی دوور دەخاتەوە بۆ ئەوەی دەست لە ئەژنۆ دابنیشێ و بیر لە چارەنووسی خۆی بکاتەوە.

## شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

شاعیر لەگەڵ بای بەیانی گەشتێک بەکوردستاندا دەکا:

فیدات بم بایەکەی وەختی بەیانی
لەگەڵ تۆ خۆشە لای من زیندەگانی
کەژ و دەشت و چەمەن ئەبڕی لەناکاو
لە پیرمام و لە قۆپی و مێرگەپانی
گەهێ قەندیل ئەچی گەه دەوری سوورکێو
سەرەوژێر جار بەجار لای گۆلی وانی
وولاتی کوردەواری ڕاگوزەرتە
بەسەربەستانە مەشغوولی گەڕانی
بەیانیان من خەریکی گا مەلاسم
لە ژوور سەرمی وەکو ئاواتی گیانی
لە سۆزەی فێنکت وا دێتە بیرم
ئەڵێی هەستە ئەگەر پەستی ژیانی
غوباری ناو لەشت دەرمانە بۆ من
پەڕی سیمرغە بۆ نەرم و نیانی
لە کاتێکا خەواڵووم خۆڵی چەند جێ
لە چاوم کە کلێکە ئەسفەهانی

بە بۆنی ئەو وولاتەش کە دیوتە
بهەنوە مێشکم ئەی هاوڕێی نیهانی
ئەگەر تۆ ئەم نیازەم جێبەجێ کەی
منیش پەیمان ئەکەم ڕاست و ڕەوانی
بەچاوی کاڵ و لێوی ئاڵ و خرخاڵ
ئیتر تەفرە نەخۆم وەک نانی نانی
بە چەهرەی یار و عیشوەی دڵ نەبەستم
بەخەندە پێکەنم تۆش پێ بزانی
شەوی وەسڵی بنێمە عاستی پشت گوێ
بە عەشقی یار نەچێژم شادمانی
سەرم تەرخان بکەم بۆ دەردی هۆزم
دڵم جۆش دەم بە عەشقی نیشتمانی
فیدات بم بایەکەی وەختی بەیانی
لە کوێی؟ هەڵکە وەرە هاوڕێی نیهانی

لە هاوینی ساڵی **١٩٤٣** بەختیار ئەم لیریکەی هۆنیوەتەوە، لەگەڵ بای بەیانی گفتوگۆ دەکا. پێی دەڵێ لەگەڵ خۆیدا بیبا و گەشتی پێ بکا بۆ ئەو وڵاتە ڕەنگینە، بۆ ئەوەی پیرمام (هاوینەهەواری سەلاحەدین) و قۆپی قەرەداغ و مێرگەپان و قەندیل و سوورکێو و گۆلی وان ببینێ. لە پاشانا وەسفی کارە چاک و بەسوودەکانی با دەکا و داوای لێ دەکا تاقیکردنەوەی ئەو وڵاتانەی دیویەتی بۆی باس بکا بۆ ئەوەی هوشیار بێتەوە خەریکی چاوی کاڵ و لێوی ئاڵ و خڕخاڵی زێڕ نەبێ و تەنیا ئاگاداری نەتەوەی خۆی بێ کە کوردە لە پێناوی ئەوەی کوردستانیش بگاتە پلەی ئەو وڵاتانەی با شنەی تیایاندا کردووە.

## ٢

دیسانەوە بەختیار لە خاک دەدوێ، بەلای ئەوەوە جوگرافیای کوردستان فراوانە، ناوچەی بارزان پارچەییێکە لەو خاکە ڕەنگینە:

ئەو جێیە خۆشە ناوی بەرزانە
مەڵبەندی کورد و جێی سەربەرزانە
قەلای کوردزمان
چاوی نیشتمان



بۆ کورد پشتیوان
خوێنی بێگانەی تێدا هەرزانە
***
ئەو دڵپاکانە فەخری وڵاتن
بۆ بەرزی ئێمە زۆر بەئاواتن
بە ماڵ و بە سەر
بە خوێنی جگەر
گشت بوونە سەنگەر
بۆ سەربەستی کورد زۆر بەسەباتن
***
چەند جار هەستاون بەرامبەر دوژمن
شەڕیان کردووە تێکڕا پیاو و ژن
لە شەڕا پسپۆڕ
کوردی سیلاحشۆڕ
دوژمنیان چاوشۆڕ
کۆڵیان نەداوە بۆ ڕێی سەرکەوتن
***
ئەی خوێن پاکانی خاکی کوردستان
دریغی مەکەن بۆ خێڵی بارزان
لە هەر کوێیە بن
لە ڕقی دوژمن
قەدریان بگرن
چونکە بۆ ئێمە بوونە پشتیوان

لەم شیعرەدا بەختیار ستایشی ناوچەی بارزان دەکا وەک بەشێک لە کوردستان و خەڵکەکەی وەک تیرەیێکی کوردی ئازا و دەوریان لە بزووتنەوەی ئازادیخوازی نەتەوەی کورد و ئینجا هەموو کورد هان دەدا ڕێزیان لێ بنێن لە هەر کوێیەک بن لە مەڵبەندی خۆیان یا هەر شوێنێکی دیکەی نیشتمانی گەورە.

### ۳

بەختیار لە بابەت دیلیەتی کورد و گیانی قارەمانیەتی لە ناویانا دەڵێ:

کە سەیری کورد ئەکەم وا تێ ئەگەم کوردێکی خنکاوە
بە دوو کەس کوشتوویانە و ناشتوویانە و خوێنی فەوتاوە
ئەگەر باوەڕ ئەکەن ئەی هۆزەکەم لای من بیری خۆم
لەپڕ دێتە دەرێ لەو گۆڕە ئێستەش گیانی تیا ماوە
دەسەوخەنجەر لەپڕ هەڵمەت دەهێنێ هەر وەکو زیندوو
ڕووەو دوژمن ئەچێ غەدری لەمەوپێشی لە بەرچاوە
ئەگەر هۆشی لەسەردا بێ ئەزانێ دوژمنی کێیە!
هەقی خۆی لێ بسێنێ وەک ئەوان کردیان لە دوولاوە
دەسا کوردینە تا فرسەت لە دەستایە و نەکوژراون
لەگەڵ یەک یەک گرن دوژمن هەزاران داوی داناوە
گەهێ کوشتن گەهێ یەخسیر گەهێ هیجرەت گەهێ زنجیر
گەهێ سێدارە وو تۆپ و تفەنگی بۆت حەشارداوە
لە ئاگری داغەوە کوشتاری تۆیە تاکو لووڕستان
سەر و ماڵ و وڵاتت لای ئەم و ئەو بڵقی سەر ئاوە
ئەمە حاڵی وڵاتی کورد و کوردستانە شەو تا ڕۆژ
کەچی گەورە و بچووک کەمتەرخەمن بەم حاڵە شێواوە
وەرن وورد تا درشت هەروەک برا بین دەست لە دەستا بین
لە پێناوی یەکا سەر دابنێین هێزمان هەتا ماوە
وڵات ئاوا بکەین پێشرەو چرای عیلم و مەعاریف بێ
سەنایع فێر بین ئەوسا ئەڵێن کورد خاوەنی ناوە
هەتا ئێمە لە جەهلا بین عەدوومان هەر لە شەوقایە
مەعاریفمان ببێ دوژمن بە دەستی ئێمە کوژراوە

بەختیار ئەم شیعرەی لە جەنگەی شەڕی دووەمی گێتی لە ڕۆژی ۳۰ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹٤۱ هۆنیوەتەوە. باس لە دواکەوتوویی و ژێردەستی ئەم نەتەوەیە دەکا. لەسەر



ئەو باوەڕەیە ئەگەر کورد لە گۆڕیش نرابێ گیانی تێدا ماوە و دەتوانێ زیندوو بێتەوە. مەبەسی لە دوو دوژمنەکە تورک و عەجەمە. بەلای شاعیرەوە بۆرجوازییەتی عەرەب پێشەواییێکی وەکو مستەفا کەمال و ڕەزا شای بۆ هەڵنەکەوتبوو کورد بچەوسێنێتەوە. لە ئاگری داغ تورک کورد لەناو دەبا، لە لوڕستانیش عەجەم کورد دەکوژێ. بێ گومان شاعیر ئاگاداری جەنگی گێتییە، کورد هان دەدا بۆ خەبات بەڵکو لە ئەنجامی جەنگ ئەو مەبەسەی خەباتی بۆ دەکا دەستی بکەوێ.

### ٤

بەلای شاعیرەوە هۆی دواکەوتوویی کورد لە بێسەوادی و نەخوێندەوارییەوەیە:

ئەم کوردە کەوا ئێستە لە هەر مەرتەبە دوونن
هەر مایلی بێ عیلمیی و دواکەوتن و بوونن
ئیمڕۆ لە جیهانا نییە ئینسانێ بەبێ ئیش
خەڵقی وەتەنی ئێمەیە بێکار و چەتوونن
تا فیکری بەدی مەسکەنی ناو میللەتی کوردە
باوەڕ بکە تا ڕۆژی حەشر خوار و زەبوونن
ئەی قەومی زەلیل عەسری تەقەددوم سەرەڕێتە
ئەم عالەمە هەر پێش ئەکەون مەستی فونوونن
عەیبە حەسەد و بوغز و نیفاق ڕۆژی نەماوە
عیلم و عەمەلە ڕووحی بەشەر زینەتی ڕوونن
بۆ خزمەتی ئەمڕۆ وو سبەی سەیری غەرب کەن
یەک لەحزە نەبوون غافل و ئەربابی شوئوونن
تۆش نۆرەتە ئەی میللەتی مەزڵوومە هونەرکەی
خاوەن دڵ و گیان و هونەر و گەرمییە خوونن

بەختیار لەم شیعرەدا وەسفێکی وردی دواکەوتوویی میللەتەکەی خۆی دەکا، ئامۆژگارییان دەکا قۆڵی لێ هەڵماڵن، خەریکی ئیشوکار و ئاوەدانکردنەوە بن. بۆ زانستی و زانیاری کۆشش بکەن. ڕق و کین و دووبەرەکی بخەنە ئەولاوە. ئەگەر دەیانەوێ ئەمڕۆ و سبەینێ بەسەربەستی و بەختیاری بژین تەماشای ڕۆژئاوا بکەن و لە تاقیکردنەوەکانی ئەوان کەڵک وەربگرن.

## ٥

لە شیعرێکیدا بەختیار موناجات لەگەڵ کوردستان دەکا، سۆزی دەگاتە ئەو پلەیەی سۆفی بۆ کردگاری هەڵدەڕێژێ:

فیدات بم خاکی کوردستان نموونەی جەننەتی عەدنان
لە سەر تا خوار
گوڵ و گوڵزار
دڵی غەمبار ئەکا دەرمان فیدات بم خاکی کوردستان
هەوارگە و دیمەنی جوانت
لە گەرمێن و لە کوێستانت
بە بێگانە
وەکو تانە
ئەڵێن گیانە، منم لبنان فیدات بم خاکی کوردستان
بەسەیری تۆ منی مسکین
فەرەح دێتە دڵم چین چین
لەوێ دابەش
ئەبێ بۆ لەش
وەکو ئاتەش ئەکا جەولان فیدات بم خاکی کوردستان
بەڵێ گوڵ خۆی کە ئەنوێنێ
بینای هەستیم ئەلەرزێنێ
بەڵام وەک تۆ
گوڵێکی نۆ
بەڕەنگ و بۆ نییە قوربان فیدات بم خاکی کوردستان
لە بیرمە وەک شتی مەعلووم
مناڵ بووم عاشقی تۆ بووم
کە مامۆستام
لە ڕیز داینام



ووتی ئەی خام بنووسە جوان فیدات بم خاکی کوردستان
ئەویش نەبوایە باوەڕکە
گڵ و بەردت کە مووفەڕکە
ئەیانکرد کێش
دڵی پڕ ئێش
وەک ئاسنکێش بەبێ تاوان فیدات بم خاکی کوردستان
لەسەر من فەرزە تا مردن
لە وەسفی تۆ خەیاڵ کردن
بەشیعری جوان
وە یا پەخشان
دڵی ئینسان بکەم حەیران فیدات بم خاکی کوردستان
بەڵام بۆ خزمەتت گیانە
ئومێدی من بەپیاوانە
ئەوان زۆر جار
هەزاران کار
ئەکەن ڕزگار بەبێ دامان فیدات بم خاکی کوردستان

بەباوەڕێکی گەرمی پڕ لە سۆزی ئەڤینی بەرامبەر بەخاکی کورد شاعیر هەست و نەستی ناو دەروونی دەردەبڕێ، بەشێوەیێک ڕاستگۆیی لێ دەبارێ، پیاو لەوە دەگا ئەم شاعیرە بەدڵ و بەگیان ئەم خاک و نەتەوەیەی خۆش دەوێ. ئەم دڵدارییە کۆنە دەگەڕێتەوە سەردەمی منداڵی شاعیر لەو کاتەی مامۆستای لە پۆلی خوێندن داوای لێ دەکا لە دەفتەری مەشق یا لەسەر تەختەی ڕەش بەجوانی بنووسێ «فیدات بم خاکی کوردستان». ئەم دڵدارییە کۆنە، زادەی ئەمڕۆ و دوێنێ نییە، لەگەڵ لە دایکبوونی شاعیر پەیدا بووە.

## ٦

شاعیر گەشبینە بەوەی کورد دەگاتە ئامانجی خۆی، بۆ ئەم مەبەسە لە ساڵی ١٩٤٨دا دەڵێ:

میللەتێک هیوای بەرزی ژیان بێ
تینووی ئازادی و دیلی زەمان بێ

بەندی و هەژاری زۆر لا گران بێ
هێزی مەردانەی کە هاتە گەردش
وەک ئەتۆم زەمین دێنێتە جونبوش

میللەتێک زۆربەی نەخوێندەوار بێ
چەوساوەی دەستی سەرمایەدار بێ
جەرگ هەڵکزاوی ئاگری زۆردار بێ
کە جوولآیەوە وا خۆی ئەنوێنێ
کە تۆڵەی ڕۆژی ڕەشی بستێنێ

میللەتێک مێژووی ڕووناک و جوان بێ
ئەولای ئەردەلان ئەم لای بۆتان بێس
کانگای ئاڵتوون و نەوت و سامان بێ
هیچ هێزێک نییە ڕێی بباتە بەست
بە زانست و فەن خۆی ئەکا سەربەست

میللەتێک چاوی لە خەو هەڵهێنێ
ببینێ دوژمن زۆری بۆ دێنێ
ستەمە سەری بۆ دانوێنێ
بێگومان ژیان لە خۆی تاڵ ئەکا
تا لاشەی دوژمن لە ناو چاڵ ئەکا

میللەتێک نەوەی کاوەی ئازا بێ
بۆ سەرکەوتنی خۆی دڵنیا بێ
بۆ ژیانیشی دڵ پڕ هیوا بێ
زۆری پێ ناچێ ئەگاتە ئاوات
ئالای سەربەستی بەخوێن هەڵئەکات

بەختیار باس لەو هۆیانە دەکا کە میللەت هان دەدەن بۆ خەباتکردن لە پێناوی دەستخستنی هیوا و ئامانج. ئەو هۆیانە لە کورد دەبینێ: دیلی و هەژاری، نەخوێندەواری و چەوساندنەوە، مێژووی ڕووناک، ئەولای ئەردەلان (سنە)، ئەم لای بۆتان (جزیرە). ئەو میللەتەی نەوەی کاوە بێ، بێ گومان لە دواڕۆژدا دەگاتە ئاوات و ئالای سەربەستی هەڵدەکا.



## سروود

بەختیار کۆمەڵێک سروودی جوانی هەیە، بەناوەڕۆک ناوچەیی و کوردەوارین، بەئاواز و مۆسیقا تورکی و عەرەبین لە قوتابخانە تورکی و عەرەبییەکانی تورکیا و عیراق قوتابییان دەیانچڕی.

١

لە سروودێکیدا شاعیر دەڵێ:

براینە لە خەو هەڵسن بەیانە
زەمانی هەوڵ و عیلم و حورِ ژیانە
هەموو قەومێ بەدائیم تێئەکۆشن
لە ڕێگەی عیلم و فەن دا دڵ بەخۆشن
ئەرێ کوردی فەقیر و بێکەس و غەم
هەتاکەی زەهری نادانی ئەنۆشن
براینە...
وەتەن پڕ لەشکری جەهلە ڕەفیقان
دەری کەین با بەهۆردووی عیلم و عیرفان
براینە...
بەیەک دڵ با لە بۆ پێشکەوتنی کورد
هەوڵ دەین تا بگەینە قەسدی خۆمان
براینە...
براینە ئەگەر زۆر چاک نەخوێنن
لە ژێر باری جەهالەت دا ئەمێنن

لەم سروودەدا بەختیار قوتابیانی منداڵ هان دەدا هوشیار بن، تێبکۆشن و داوای زانستی بکەن، پێشکەوتن بەخوێندەواری دێتە دی نەک بەنەخوێندەواری.

٢

لە سروودێکی دیکەیدا بەختیار ستایشی نیشتمان دەکا:

چەند شیرینە لام دار و بەردی وەتەنم
بەفیدای ئەکەم سەر و گیان و بەدەنم
خاکی وەتەنم گشتی زیو و زەڕە
بەردی وەک گەوهەرە ئاوی چەشنی کەوسەرە
فەرزە بۆ وەتەنمان جان فیدا کردن
لە ڕێی ئەم خاکەدا بە کۆمەڵ مردن
دەسا کوردینە بەسیە ئەم حالەتە
بۆ تەرەققی قەومی کورد ئەمڕۆ ڕۆژی هیممەتە

ئەم سرووده بۆ شیرین کردنی نیشتمانە، بەسەر جوانی خاکدا هەڵدەڵێ. ئەوەندە جوان و دەوڵەمەند و ڕەنگینە شایانی ئەوەیە کورد گیانی خۆی بکا بەقوربانی لە پێناوی ئازادی و سەربەستیی ئەو خاکە.

## ٣

لووتکەی دڵداری شاعیر لەگەڵ خاک لەو موناجاتە دایە کە لەگەڵ شاخی پیرەمەگروونی کردووە:

پیرەمەگروون! موقەددەسی
دۆستی دائیمی کوردی
بەو مەنزەرەی شیرینەوە
دافیعی سەد نەوع دەردی
قامەتی بەرزی تۆ
دامەنی سەوزی تۆ
نیشانە و ڕەمزی تۆ
باعیسە لە بۆ سەرکەوتنی وەتەن
فەسڵی زستان بەرگی سپی
ئەپۆشی و چوویتە ئاسمان
سەیری هەموو دنیا ئەکەی
تۆی شاهەنشای شاخەکان



کۆمەڵێ گەوهەری
هەیکەلی زەفەری
لابەری کەدەری
باعیسی لە بۆ نەهێشتنی میحەن
چونکە دۆستی ئەجدادمانی
نووری چاوی کوردانی
بەردت هەموو دانەی گەوهەر
لائیقی فەخر و شانی
کۆمەڵی گەوهەری
هەیکەلی زەفەری
لابەری کەدەری
باعیسی لە بۆ نەهێشتنی میحەن

لەم سروودەدا بەختیار مێژووی ئەرکیۆلۆجی و ئەفسانەی ئایینی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. پیرەمەگروون پیرۆزە یەکێکە لە کردگارەکانی پێش مێژووی ئادەمزادی سەر ڕووی ئەم زەوییەی ئێمە شاخ و پەرستگا و مەڵبەندی خەڵکانی دێرینی سەردەمی میترایی و زەردەشتی و مانەوییان بووە، لە پاشانا لە دەوری ئیسلام بووە بەگدروون و مەگروون. «پیرە»کەش وەکو «بابا» کردگارەکەیە. لە مێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا «پیر» و «بابا» زۆرە: پیرمام، پیر خدر، پیری ئێزیدییان، بابا خۆشین، بابا یادگار، بابا تاهیر، بابا گورگوڕ و گەلێکی دیکە.

***

فایەق عەبدوڵڵا زێوەر، نازناوی بەختیارە. شاعیرێکی بەتوانا بوو، کەم ژیا، لەبەرئەوە شیعری زۆر نەبوو، ئەوەی هەیەتی بەرزە. شیعری لاسایی دڵداری کلاسیکی کەمە. زۆربەی بەرهەمی نیشتمانپەروەری و کوردایەتییە. سروودی هەیە بۆ قوتابیانی سەرەتایی. زمانی شیعری میللییانە و ئاسانە، مانا و وێنەی شیعری لە ڕووە. ڕێبازە ئەدەبییەکانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لە شیعریدا بەرچاو دەکەون. یەکێکە لە شاعیرە داهێنەرەکانی قۆناغی گواستنەوەی شیعری کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا.

# بەشی حەوتەم

## حاجی جندی

**١٩٠٨ - ١٩٩٠**

### ژیانی

حاجی کوڕی جندی جەواری لە ڕۆژی ١٨ی مارتی ١٩٠٨ لە گوندی یەمانچایر لە ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی لە دایک بووە. باوکی لە بنەماڵەیێکی هەژاری گوندی بووە. لە سەردەمی جەنگی یەکەمی گێتیدا ماڵی باوکی و کەسوکاری لە دەست دڕندەیی تورکی عوسمانی ڕایان کردووە بۆ ئەرمەنستان. لە ماوەی جەنگدا عوسمانییەکان هێرشی جانەوەرانەیان بۆ سەر کوردی ئێزیدی بەهێز بوو. حاجی بەرێکوپێکی هەموو قۆناغەکانی خوێندنی بڕیوە، تا ساڵی ١٩٢٦ کۆتایی بەخوێندنی سەرەتایی و ناوەندی هێناوە. لەو ساڵەدا بووە بەقوتابی زانستگای یەریڤان، لە ساڵی ١٩٣٠ باوەڕنامەی کۆلێجی زمان و ئەدەبی وەرگرتووە.

لەم ماوەیەدا بووژانەوە و پەرەسەندنی خوێندەواری لە ناو کوردی ئەو وڵاتەدا دەستی پێ کردووە. حاجی دەوری گرنگی بووە وەک مامۆستاییێک لە مەیدانی وانە وتنەوە و دانانی کتێب بۆ قوتابخانە کوردییەکان. بەهەموو جۆرێک حاجی لە نێوەندی خوێندن و وەرگرتنی زانست و زانیاری دوور نەکەوتۆتەوە، هەموو پلەکانی خوێندنی بڕیوە. لە ساڵی ١٩٥٥ بەکارگەری زانستی هەڵدەبژێرێ لە ئەکادیمیەی زانستی ئەرمەنستان لە بەشی لێکۆڵینەوەی کوردی دەکەوێتە کار، هەر لەو کاتەدا دەست دەکا بەئامادەکردنی نامەی دوکتۆرا. لە ساڵی ١٩٦٤ دەبێ بەدوکتۆری پسپۆڕ لە زمان و ئەدەبی کوردیدا. لە دوای ئەوەدا پێوەندی پەیدا دەکاتەوە لە زانستگای یەریڤان و سیمیناری بەشی لێکۆڵینەوەی کوردی بەڕێوە دەبا. لە ساڵی ١٩٦٦ پلەی پرۆفیسۆری پێ دەبەخشرێ و لە زانستگا و ئەکادیمیە جێگەی دیاری دەبێ.

بەهۆی جموجۆڵی زانستی و ڕۆشنبیرییەوە چەند نیشان و میدالیەیێکی بەرزی وەرگرتووە و لە هەندێ کۆنگرە و کۆنفرانسی زانستی لە ناوەوەی ڕووسیای سۆڤیەت و دەرەوە بەشداری کردووە. کۆمەڵێک وتار و باسی زانستی و ئەدەبی بڵاوکردۆتەوە.



پێوەندی بەزانستگا و ئەکادیمیەوە ماوە تا دوایی ژیانی لە ڕۆژی ١ی مایسی ساڵی ١٩٩٠ لە یەریڤان کۆچی دوایی کردووە.

### حاجی زانا

حاجی لەگەڵ ئەمینی عەبدال و عەرەبی شەمۆ گەورەترین دەوریان لە بڵاوکردنەوەی خوێندەواری بووە لە ناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا. لە قۆناغی یەکەمی مافی خوێندەواری کورد لەو وڵاتەدا (١٩٣٠ - ١٩٣٧) حاجی زۆرترین کتێبی قوتابخانەی داناوە، بەشداری هەیە لەگەڵ مامۆستایانی دیکە کتێبی بۆ قوتابخانە کوردییەکان نووسیوەتەوە. جگە لەوە بەهاوکاری لەگەڵ دانەرانی دیکە فەرهەنگی ئەرمەنی - کوردی (١٩٣٣) بڵاوکردۆتەوە. بایەخی زۆری بەئەلفوبێی تازەی لاتینی داوە بۆ قوتابیان. هەروەها کتێبی تایبەتی داناوە بۆ خەڵکی بەتەمەن گەورەی نەخوێندەوار.

لە قۆناغی دووەمی مافی خوێندەواری کورد لە ١٩٤٦ەوە تا کۆتایی ژیانی حاجی کۆششی زۆری کردووە بۆ چەسپاندن و بڵاوکردنەوەی ئەلفوبێی کوردی لەسەر بنجی ئەلفوبێی کیریلی کە دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان بۆ نووسینی کوردی دانا بوو. زادەی بیری زانستی حاجی لە زانستگا و ئەکادیمیە لە یەریڤان کۆمەڵێک باسی زانستی بوو لە بارەی هەموو جۆرە لێکۆڵینەوەکان لە گۆڕەپانی کوردناسیدا بەتایبەتی لە فۆلکلۆر. حاجی یەکێ بوو لە گەورەکان لە ڕووی لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە و تۆمارکردن و بڵاوکردنەوەی تێکستی ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) بەشیعر و پەخشانەوە.

### حاجی نووسەر و شاعیر

حاجی وەکو نووسەر و شاعیرێک ئاگاداری بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی بووە لەو کۆمەڵەدا، وەکو برا گەورە یا ڕیش سپییێک یاریدەی شاعیر و نووسەرانی داوە، چاودێری کارەکانیانی کردووە. دەوری باڵای بووە لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبییان. ئەو کتێبە تایبەتییانەی بەرهەمی شاعیر و نووسەرانیان گرتۆتە خۆ، حاجی بەرهەمی خۆی تیایاندا بڵاوکردۆتەوە و سەرپەرشتی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی هەموو شاعیر و نووسەرانی دیکەی کردووە. زۆربەی ئەم کتێبە بەنرخانە لە ساڵانی ١٩٣٥ - ١٩٥٩ بڵاوکراونەتەوە. سەرچاوەیێکی گرنگن بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی لەو وڵاتەدا.

بەرهەمی داهێنراوی ئەدەبی حاجی دەکرێ بەدوو بەشەوە:

١– پەخشان: بەشی زۆری بەرهەمی بەپەخشان نووسیوە، بۆ ئەمە هونەرە ئاساییەکانی ئەدەبی هەڵبژاردووە، وەکو وتار و چیرۆک و ڕۆمان. بەشێکی ناوەڕۆکی ئەمانە لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەرگیراون، بەشێکی دیکەی لە داهێنانی خۆیەتی. ئەوەی سەرچاوەکەی دەچێتەوە سەر ئەدەبی میللی حاجی وەکو خۆی وەری نەگرتووە، بەڵکو بەزمانی بەرزی ئەدەبی سەردەم دایڕشتۆتەوە. هەروەها لە هەندێ قارەمانی حیکایەتی میللیی سەرزار ڕووداوی وای دروست کردووە لەگەڵ هەڵسوکەوتی سەردەمدا بگونجێ. بەم جۆرە خوێندەوار لە خوێندنەوەی ئەم جۆرە بەرهەمانەی حاجی دەتوانێ بەپێی ناوەڕۆکیان ئەوانەی ڕەسەن لە ئەوانەی وەرگیراو جیا بکاتەوە بۆ بەڵگە لە چیرۆکەکانی حاجی ئەم ناوانە بەرچاو دەکەون: فیریک، دمدم، عەمۆیێ کرمانج و هی دیکە.

گەورەترین ڕۆمانی حاجی بەناوی «هەواری» (بەهاوار گەیشتن) بەیادی پەنجا ساڵەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی ١٩٦٧ لە یەریڤان بڵاوکراوەتەوە. نووسەر لەو ڕۆمانەدا لە گرنگی ئەم شۆڕشە دەدوێ نەک تەنیا بۆ نەتەوەکانی وڵاتی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤایەتی. لە ناو ئەمانەشدا بەلای نووسەرەوە بۆ کورد گەلێ گرنگ بووە. ئەمە هەر لە ناوی ڕۆمانەکەدا دەردەکەوێ «بەهاوار گەیشتن» واتە ئەو شۆڕشە بەفریای هاواری کورد گەیشت و ئەو بەشە کوردەی ئەوێ لە چەوساندنەوە ڕزگاری بوو.

٢– شیعر: بەرهەمی شیعری کەمە. بەڕوخسار لە بابەتی لیریکە، کێش و قافیەی سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە، زمانی ئاسان و سەردەمانەیە، لە شیعری پەروەردەییەوە (دیداکتیکییەوە) نزیکە. لە دەوروبەری ناوەڕۆک و مەبەسی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و نیشتمانی رووسیای سۆڤیەتەکان دەسووڕێتەوە. لە بەشی کوردایەتییەکەدا سروشتی خاکی کوردستان سەرچاوەیێکی گرنگە بۆ شاعیر. بەگشتی حاجی لە وەسفدا بەتوانایە، بۆیە وەسفی کەژەکانی ساڵ وەکو زستان و بەهار و هاوین جێگەی تایبەتییان هەیە لە شیعریدا. باسی زۆزان و ژیانی کوردەواری لە گوند و کاری شوانی و ڕەنجبەری و کێڵگە و کشتوکاڵ دەکا. لە بەشی نیشتمانپەروەرییەکەی نیشتمانی سۆسیالیزم لە ڕەمزەکانی دەسەڵاتی ئەو کاتە دەدوێ. بەشان و باهووی کۆمۆنیزم و کۆلخۆز و مۆسکۆ و لینین و ئەرمەنستان و گەلێ ڕەمزی دیکەی دەسەڵاتی سۆسیالیزم هەڵدەڵێ.



## نموونەی شیعری

١

لە شیعرێکیدا حاجی بەناوی «یێ مەنە» دەڵێ:

لە ڕەخ دیوارێ کرێملا کەڤن
لینین ئوستالین خەورا چوونە
لێ شوغلێ وان گاڤ و سەهەت
کولیلک دده ل وەتەنێ مە

***

ئەو چ کو خەون بوو، خەونا سالا
نها بوویە راست ل عەردێ مە
چقا زمانێ تە دگەرە
جەم مە هەنە باغ و باغچە

***

زاڤۆد و فابریک گشک یێ مەنە
یێ مەنە کۆلخۆز دەشت و زۆزان
چیا ئو کەرخانە تەڤ یێ مەنە
ژ بۆنا مەنە چاییر و چیمان

حاجی جندی ئەم لیریکەی بۆ پێداهەڵگوتنی هەندێ لە ڕەمزەکانی دەسەڵاتی سۆسیالیزم وتووە لە رووسیا. کۆشک و باڵەخانەی کریملێن بارەگای دەسەڵاتی دەوڵەت لەوێ «کرێمل»ی پێ دەڵێن. لە قەراغ دیواری قەڵای کریملێن ئارامگای لینین و ستالین بینا کراوە. لە کاتی خۆیدا بەتایبەتی بۆ لینین دروست کرا و جەستەی بەمومیاکراوی لەوێ دانرا. لە دوای مردنی ستالین ئەویشیان بەمومیاکراوی لە تەنیشت لینین دانا. لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا لە کاتی فەرمانڕەوایی نیکیتا خرووشێڤ جەستەی ستالین لابرا و خرایە گۆڕەوە. لە دوای ڕووخانی دەسەڵاتی سۆڤیەت (١٩٩٢) ئارامگای لینین پشتگوێ خرا. هەروەها شاعیر لەم لیریکەدا وشەی «زاڤۆد»ی رووسی بەمانای فابریقە و کارگە بەکارهێناوە.

٢

له لیریکی «لەگلەگ» حاجی دەڵێ:

بهارا خوەش دیسا هات
با ئو باگار تەڤ هلات
ئەشق و شا بوون دونێ کەت
لەگلەگا پار وێدا هات

***

لەگلەگا مە رند کە
وێ دگەرە دۆر گوندە
پەر و باسکا هەڤ ددە
هێلینا خوە شاد بە

***

هێلینا وێ بلندە
ل ئۆرتا گوند جێی رندە
کۆلخۆز نیکا چێکرییە
وەکی هەر سال بێ گوندە

***

لەگلەگا مە دەلالە
چەڤبەلەکە بەدەوە
ناڤا مێرگا دگەرە
گوندێ مەرا شاد بە

شاعیر ئەم لیریکەی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی حەوت بڕگەیی داناوە، ئەم کێشە له گۆرانی میللیی کوردیدا باوە و زیاتریش لەبەر سووکی بۆ شیعری منداڵان بەکار دەهێنرێ. وەک له ناوەڕۆکی شیعرەکه دەردەکەوێ بیرەوەرییێکه بەزمانی خەڵکی گوند، یا منداڵانی ئەوێ وتراوە، هەموو ساڵێک یادی ئەو حاجی لەقلەقە دەکەنەوە کە بۆ هاوینەهەوار هەموو ساڵێک دێتەوە ئەو مەڵبەندە، دیارە خەڵکەکە ئەو دەناسنەوە و حاجی لەقلەقیش ئەوان دەناسێتەوە.



٣

حاجی له شیعرێکیدا بەناوی «هاڤین»ەوە دەڵێ:

هەی هاڤینێ، جان هاڤینێ
ئەم تێر گەریان ناڤ گولگیهێ
مە هەڤرا لیست ل زۆزانێ
ئەم خەبتین ناڤ کۆلخۆزێ

***

گورز پەی گورزا مە لۆد کرن
جەهـ ئو گەنم بەرەڤکرن
باغ و بۆستان مە خایکرن
مێرگ و زەڤی ئاڤرەش کرن

***

پەی خەباتێ کەتنە ئاڤێ
هەی روونشتن ل سەر دارێ
کتێب خوەندن ل وێ دەرێ
هەرسێد مەهێد خوەش هاڤینێ
مە دەرباز کر ب وێ کارێ

شاعیر له هاوین تەنیا جوانی سروشت نابینێ، ناو ئاوایی تەنیا جێی خۆشی و هەڵپەڕکێ و زەماوەند نابێ، بەڵکو هاوین کەژی پێگەیاندنی کشتوکاڵە، دەسکەوتی ئەو کۆششەیە له زستان و بەهارا له کۆلخۆزدا (کێڵگەی هەرەوەزی) ڕەنجبەران دەیکێشن. بەرهەم گەنم و جۆ و میوەجات و هەموو جۆرە سەوزە و ڕووەکێکی دیکە دەبێ.

٤

لەسەر هەوای شیعرەکەی پێشوو حاجی لیریکێک دەهۆنێتەوە بۆ منداڵان بەناوی «بەرف»ەوە:

بەرفێ، بەرفێ بیارە
کولی کولی تو وەرە

دەشت و کەوشەن وەربا بە
عەردی ڕەشێ تە شابە

***

هێدی هێدی ببارە
تو توخومرا ستار بە
سۆر و سەرما لێ نەکە
نەجەمدە، هشک نەکە

***

خەوا شیرن پێ بگرە
کو بهارێ زیل بدە
دەشت و زۆزان شین دبە
کۆلخۆزا مە شاد بە

حاجی بە وشەی ساکار و کێشی سووک وەسفی بارینی بەفر دەکا، ڕەنگە زیاتر مەبەسی ئەوە بێ زمانی منداڵی کوردی پێ پاراو بکا، بەگشتی حاجی ئەو شیعرانەی دایناون بەمەبەسی پەروەردەیی بڵاوی کردوونەتەوە، وەکو مامۆستاییێک قوتابییە بچووکەکانی فێری زمان دەکا. ئەمە بەگشتی لایەنێکی سەرنج ڕاکێشەرە لە کارە ئەدەبی و زانستییەکانیدا. لەو کاتەی نووسەر لە کارە زانستییەکانی قووڵ بووە، لە کارە داهێنراوە پەخشانییەکانی نموونەی بەرهەمی جوان و سەرکەوتوو بووە، کەچی لە شیعریدا ساکار و میللییانە بووە.

***

حاجی جندی لە ڕۆشنبیرە گەورەکانی کوردی قەفقاسی ڕووسیا بوو، لە زانستگا گەیشتە پلەی پرۆفیسۆری، بوو بەئەندامی ئەکادیمیەی ئەرمەنستان، مامۆستاییێکی سەرکەوتووی قوتابخانە و زانستگا بوو. خاوەنی گەلێ لێکۆڵینەوەی زانستییە لە بابەت کوردناسییەوە. کتێبی قوتابخانە و دەرەوەی قوتابخانەی هەیە. یەکێکە لە زانا دیارەکانی ئەدەبی میلیی سەرزار «فۆلکلۆر». بەرهەمی ئەدەبی داهێنراوی هەیە لە پەخشان و شیعر. پەخشانی زۆرە لە بابەتی وتار و چیرۆک و ڕۆمان، شیعری کەمە، زۆربەی ئەو شیعرەی دەچێتە خانەی وەسفی سروشت و دیمەنی کۆمەڵی کشتوکاڵی و پیشەسازییەوە.

# بەشی هەشتەم

## جاسمی جەلیل

### ١٩٠٨ – ١٩٩٨

### ژیانی

جاسم کوڕی جەلیل کوڕی ئۆسێ لە گوندی قزل قولی ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی لە ساڵی ١٩٠٨ لە دایک بووە. ئەو گوندە و ئاوەدانییەکانی دیکەی دەوروبەری هەموویان کوردی ئێزدی بوون لە عەشرەتەکانی ئوتی و چیلی سەر بەعەشرەتی سیپکی. ناوی باوکی جاسم کە جەلیل بوو لە دواییدا بوو بەلەقەب بۆ منداڵی جاسم و نەوەی ئەوەوە. باوکی جاسم ڕەنجبەر بوو، هەندێ مەڕومالاتیان هەبوو. ئەگەر سیاسەتی تیرۆری تورک بەرامبەر بەکورد نەبوایە ئەو خەڵکە لەو ناوچانەدا دەیانتوانی ئاشتییانە و بەئارامی بژین.

لەگەڵ کۆتایی جەنگی یەکەمی گێتی لە ساڵی ١٩١٨ و بەزینی سوپای عوسمانی لە جەنگدا سەربازی قەومی شۆڤێنی تورک هێرشی بردە سەر ئەو ناوچەیە بۆ ئەوەی شوێنەواری کوردی تێدا نەهێڵێ. هەموو خەڵکی ناوچەکە کەوتنە خۆ لە پێناوی ڕزگارکردنی گیانیان، سەربازی تورک بەدوایانەوە بوو. لە دوای کوشتارێکی زۆر لەو خەڵکە ئەوانەی لە ژیاندا مابوون گەیشتنە ئاوەدانییێک ناوی بۆزبر بوو لە قەراغ ڕووباری ئاوارەش لە نزیک ئەلەگەز.

لە پاشانا خەڵکەکە لە گوندەکانی ناوچەی ئەشتەرەک نیشتەجێ بوون. لەم کارەساتەدا جاسم لە کەسوکاری دابڕا، ئەوەی کوژرا و ئەوەی لە ڕووبارا خنکا. ئێستا و ئەوساش کەسێکی لەوانە نەدۆزییەوە. لەو جێیەدا جاسم وێڵ و سەرگەردان و بێ داڵدە بوو، لە شوێنێک بۆ شوێنێک لە پارووی نان دەگەڕا. لە ساڵی ١٩١٩ ڕووی کردە شاری ئەلێکساندرا پۆڵ لەوێ هەتیوخانەیێکی ئەمەریکی لێ بوو. ئەمە دەسکەوتێکی گرنگ بوو لە ژیانی جاسم. هەر لەو ساڵەدا دەستی کرد بەخوێندن لە هەتیوخانەی قوتابخانەکەدا. لە ساڵی ١٩٢٣ هەتیوخانەکە گواسترایەوە شاری ستیپانەڤان، لە دوای دوو ساڵ واتە لە ساڵی ١٩٢٥ جاسم پێنج ساڵی سەرەتایی خوێندبوو. لەو ساڵەدا دەسەڵاتی تازەی



سۆڤیەتەکان هەتیوخانەکەی لە ئەمەریکاییەکان سەندەوە. لەو ماوەیەدا جاسم ناچار بوو کارێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە. بوو بەشاگردی میکانیکی کارەبا. لە ساڵی ١٩٢٦ ڕووی کردە شاری یەریڤان و دەستی بەکارکردن کرد لە پیشەسازی کارەبا. بەهۆی ئەم کارەیەوە وەکو کرێکارێک توانی خۆی لە پارتی کۆمۆنیست نزیک بکاتەوە. لە ساڵی ١٩٢٧ ناردیانە باکۆ بۆ خوێندن لە قوتابخانەی سوپایی پڕوپاگەندەی پارتی کۆمۆنیست تا ساڵی ١٩٣٠ لەوێ مایەوە. بۆ چەند مانگێکیش چووە شاری تفلیس و خوێندنی ئەو قوتابخانەیەی لەوێ تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٣١ گەڕایەوە یەریڤان بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەی پەروەردەی کوردی پێ سپێررا، زۆر لەو کارەیدا نەمایەوە. لە ساڵی ١٩٣٢ خەریکی لایەنی تەکنیکی دەرهێنانی چاپەمەنی بوو.

لەو سەردەمەدا دەسەڵات بایەخی بەچاپکردنی کتێبی قوتابخانە و بەگشتی کتێبی کوردی دەدا. جاسم لەگەڵ دەسنووسی کتێب دەژیا لە ڕاست نووسین و هەڵەچنی شارەزا بوو، ئیتر لەگەڵ ئەو دەسنووسە دەبوو تا وەک کتێب دەگەیشتە خوێنەر.

لە ساڵی ١٩٣٨ – ١٩٤١ بوو بەقوتابی ئامۆژگای مامۆستایان لە یەریڤان. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی دووەمی گێتی، ئەوان جەنگی گەورەی نیشتمانی پێ دەڵێن، وازی لە خوێندن هێنا. لە ساڵی ١٩٤٢ بەکارگەری تەکنیکی دامەزرا لە چاپخانەی زانستگای یەریڤان. لە دوای ئەو لە ساڵی ١٩٤٣ بوو بەمووچەخۆر لە دادگا، لەو کارەیدا تا ساڵی ١٩٥٣ بەردەوام بوو. لە ساڵی ١٩٥٤ کە بەشی کوردی لە ڕادیۆی ئەرمەنستان کرایەوە بەشی مۆسیقا و گۆرانی و فۆلکلۆر بەجاسم سپێررا. لەبەرئەوەی شارەزای مۆسیقای فۆلکلۆری کوردی بوو و بلوێرژەنی چاک بوو لەگەڵ تیپی مۆسیقا بلوێری دەژەنی. تا دوایی شەستەکانی سەدەی بیستەم پێوەندی بەم دەسگا ڕاگەیاندنەوەیەوە مابوو.

جاسم لە ژیانیدا تەمەنی نەوەد ساڵی بردەسەر، بۆیە ماوەی خانەنشینییەکەی درێژ بوو. لە ساڵی ١٩٩٨ لە شاری یەریڤان کۆچی دوایی کرد.

### شیعری

جاسم ئەگەر خوێندەواریش نەبوایە دەبوو بەشاعیرێکی میللیی سەرزار، وەکو هەموو ئەو بەرهەمە میللییەی سەرزار یەکێکی نەخوێندەوار دایهێناوە، لە پاشانا ناوی خاوەنەکەی ون بووە. جاسم لە منداڵییەوە لە گوند هەستی شاعیری بووە، توانیویەتی شیعر بنووسێ، بەڵام لەبەرئەوەی خوێندەواری نەبووە یەکەمین شیعری کەوتۆتە ئەو سەردەمەی فێری

خوێندن و نووسین بووە، لە ساڵی ١٩٣٢ شیعرەکەی لە ڕۆژنامەی «ریاتازە» بڵاوکردۆتەوە. جاسم وەکو شاعیرانی دیکەی کوردی قەفقاسی ڕووسیا لیریک و پۆیێمی ڕووسی وەک ژانرێکی شیعری کاریان لە بەرهەمی کردووە.

١- لیریک: شاعیر کە چاوی بەلیریکی ڕووسی و ئەرمەنی کەوتووە ئاسایی بووە لە لای چونکە ئەو قالبە شیعرییەی لە ئەدەبی میللی کوردیدا دیوە، بەڵام ئەوەندە هەیە لە ناوەڕۆکدا جیاوازییان هەیە. لیریکی ڕووسی باس لە بیرێک و کردەوەییێک و کێشەییێکی سەردەم دەکا، ئەدەبە میللییە کۆنەکەی کوردی ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی، لەبەرئەوە جاسم هەوڵ دەدا لیریکێک دابنێ باس لە سەردەم بکا، یا ئەگەر باسی کۆنیش بکا پێویستە بۆ ڕوونکردنەوەی ئێستا و دوارۆژیش بێ.

٢- پۆیێم: شاعیر کە چاوی بەم هونەرە کەوتووە ناسیویەتییەوە. ئەمەی لە «بەیت»ی ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) دیوە. هەوڵی داوە بەشێکی زۆر لە بەرهەمی ئەدەبی لەم جۆرە ژانرە بێ. چونکە لە بنجدا ئەدەبی میللی کوردی لەم لایەنەوە زۆر دەوڵەمەندە. جاسم کۆمەڵێک پۆیێمی تازەبابەتی هەیە بەیتە کۆنەکانی فۆلکلۆری بوونەتە سەرچاوە بۆی. ئەم دیاردەیە لە داهێنانی شیعریدا تەنیا لە بەرهەمی جاسم دیار دەکەوێ، وەک ئەدەبێکی تێکەڵاو. شاعیر پۆیێمێکی درێژ بە ڕێگەی وەرگێڕان و وەرگرتن بەدەسکارییەوە دروست دەکا، دوو شناسنامە کۆ دەکاتەوە یەکێکیان ئەوەیە «بەیت»ێکی ئەدەبی کوردی دێنێتەوە یاد، ئەوی دیکەیان قسەییێکی تازەیە شاعیر خۆی دەیکا.

لیریک و پۆیێمەکانی بەگشتی ڕەنگدانەوەی ئەدەبی میللی کوردی و شیعری سەردەمی ڕووسی و شیعری نەتەوەکانی قەفقاسن. سەرچاوەی ئیلهامی دەگەڕێتەوە لای حیکایەتی پەخشانی و شیعری میللی، ناوەڕۆکی ئەمانە هەندێ جار بەدەسکارییەوە ناواخنی شیعری خۆی دەکا. بەشێکی زۆر لە پۆیێمەکانی بەناو و ناوەڕۆکی ئەوانەی کۆنن، لەوانە: مەم و زین، عەمەری جەلالی، نادۆ و نازێ، زەمبیل فرۆش، مەم و ئایشێ، لەیل و مەجروم، سوورا برجێ و گەلێکی دیکە. ئەمانە وەک بەرهەمێکی شیعری تێکەڵاو دەکەونە بەرچاو، شناسنامەی تایبەتیی خۆیانیان نییە، بەڵام بەهەموو جۆرێک دەچنە ناو شیعری داهێنراوەوە و دەبن بەبەشێک لە سامانی نەتەوەیی.

جاسم شیعری زۆرە، لە کۆمەڵە کتێبێکدا بڵاوکراونەتەوە، لەوانە «ڕۆژێ من»



(١٩٦٠)، «کەلامێ چیا» (١٩٧٠)، «ئۆدا کوردا» (١٩٧٥)، «کۆفیا دیا من» (١٩٨٤).

شیعری جاسم لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردەوارییە لە سەدەی بیستەمدا لە قەفقاسی ڕووسیا، بەتایبەتی ئەرمەنستان.

لە ژیانی تازەی کۆمەڵی سوسیالیستی دەدوێ. نەتەوەی ڕووس و ئەرمەن بەڕزگارکەری کورد دەزانی. ڕەمزەکانی ئەم دوو نەتەوەیە لە پیاوە ناودارەکان، بەگەورەترین کەسانی سەر ڕووی زەمین لە قەڵەم دەدا، وەسفی شار و هەرێمەکانی ڕووسیا و ئەرمەنستان و گورجستان دەکا. سۆز و خۆشەویستی بێ پایانە بەرامبەر فیکری سۆسیالیزم.

لە بارەی کوردەوە جاسم خوێنەری کورد بەکورد دەناسێنێ، مەبەس ئەوەیە هەموو شتێکی کە لە بابەت کوردستانە بچووکەکەی خۆیان «ئەلەگەز»ی وتووە، زانیارییێکە بیر و هۆشی کوردی دەرەوەی ئەو وڵاتە ڕوون دەکاتەوە. بەتایبەتی ئەو شیعرانەی دەچنە خانەی شیعری پەروەردەییەوە (دیداکتیکی)، لەم جۆرە شیعرەی یەکجار زۆرە. بەقسەی خۆیان «قیزی ئەوێ» واتە کچی کورد لەسەر زاری شاعیر ناکەوێ. شاخ و کانی و ئاو و بەهار و شوان و خورت و کۆڵخۆز و زۆزان و زۆری دیکە شیعریان داگیر کردووە. کورد و کوردستان وێنەی زۆرە لە شیعری جاسمدا، ڕەنگە هەندێ لە ئەرمەنستان و ڕووسیا کەمتر بێ.

## نموونەی شیعری

١

کیژۆڵەییێک بەو کوڕەی خۆشی دەوێ دەڵێ:

ئەز دەستریێم شەڤ و رۆیێ سەڤاتە
برۆ، بژانگ من کلدانە سەڤاتە
خورتێ نازک! خورتێ توورە زوو وەرە
من پەز دۆتییە، شیر کەلاندییە سەڤاتە
تۆ ئو نڤیشک من هلدایە سەڤاتە
دو شەڤە من خەو ل چەعڤا هەرماندییە
خورتێ نازک! خورتێ توورە سەڤاتە

کیژۆڵەییێکی نازەنینی ساکار لە یەکێ لە گوندەکانی بناری شاخی ئەلەگەز ئەوەی لە ناو

دڵیدا هەیە دەری دەبڕێ. ئەم جۆرە ناوەڕۆکە لە ئەدەبی کوردی دەرەوەی قەفقاس بەرچاو ناکەوێ. هەرچەندە شاعیر ئەم لیریکەی بەزمانی کچێک هۆنیوەتەوە و خاوەنەکەی پیاوە، لەگەڵ ئەوەش لە دەرەوەی ئەو وڵاتەدا شیعری لەم جۆرە نییە، پیاو تەعبیر لەوەی لە ناو دڵی ژندا هەیە بکا.

٢

شاعیر باس لە دڵداری خۆی دەکا بەرامبەر بەنیشتمان:

وەتەن دێیی تە هز دکم
تە هز دکم بێمە ساب
وەتەن رۆیی ئەز گول ددم
ڕەنگێ قوماش و زەر باب
تۆ کانێکە ئاڤسار، زەلال
تی شەوتیم بۆ نا تە
تە شیر دا من، دایکا دەلال
چاوا نەسترێم حوباتە

٣

بەناوی «چیاییێد زاگرۆسێ» جاسم دەڵێ:

چیاییێد زاگرۆسێ میناتی داییکا
کورد هەمێز کرنە ل بەر سینگێ خوە
گوژ مێد وان بلند کو بار سەکنینە
ئەو بوونە سۆندێ عەگیتێ لاوێد خوە

***

چەمێ فەراتی، ئاڤا قودرەتێ
دکشە فوور ددە کەمبەر خەیاتی
مینا شیری شێر قەم قنیات دکە
لاوێد خوە عەگیت، لاوێد خوەیە تی

***



کوردستان بووکە، باغ، رەز خەملی
کوردستان دێیە ب حوب ئەڤینتی
عەرد و خالی یا وێ خوبارا دوورە
هەر لاوەک ژ تەیر بلند دفرە

***

لێ بۆی نامووس و بۆی غیرەتێ
بۆی عەرد و خالییێ، بۆ عەشیرەتێ
حازرە هەر کورد وەک رۆستەمێ زال
سەد بەندیرا داینە دە وو قال

***

تم پشت باڤانێ کێم تاقەتانە
خێرخازا ئەو دۆستە و برا
کە دکرێد حەلال زۆر ئوخەباتچی
بال وانا تونە چەفقولی ئاش

***

بۆی سەربەستی یا خوە ناموور حورمەتێ
کەچ و خورت تەمام کەتنە غیرەتێ
دەخوەزین هێن بن زمانی دێ
روحێ خوە بدن بۆی وەلاتێ خوە

ئەم شیعرە بەناوی شاخی زاگرۆسەوە لە بنجدا بۆ یادی کوردستان هۆنراوەتەوە. بۆ ئەوەی بڵێ بڵندی ئەو شاخە بەقەد ئازایی لاوەکانیەتی. ڕووباری فورات کە لەوێ هەڵدەقوڵێ بووە بەهۆی ئەوەی ئادەمزاد لە ژیانی ئاژەڵییەوە دەربازی ژیانی ئینسانی بێ. شاعیر لە کوردستاندا هەموو شتێکی جوان و چاک دەبینێ. ئەوەی لە هەموو شتێک ناشیرینتر بێ نەخوێندەوارییە، بەتایبەتی لە ناو کوردی قەفقاس چونکە لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم تا پاش جەنگی یەکەمی سەدەی بیستەم خوێندەواری لە ناو ئەو کوردانەدا نەبووە. لەبەرئەوە گیروگرفتی هەرەگەورە و کوشندە نەخوێندەوارییە بۆیە هاندانی خەڵکی بۆ فێربوونی زمانی دایک لە بیری هەموو شاعیر و نووسەرێکیاندا هەیە.

***

جاسمی جەلیل خوێندەوار و شاعیرێکی بەکاری کوردی وڵاتی قەفقاسی ڕووسیایە. شاعیرێکی خۆڕسکە، بەشێ لە شیعری ئەگەر ناوی بەسەرەوە نەبێ کەس نازانێ ئەو خاوەنیەتی. شیعری لە هەموو ڕوویێکەوە نموونەی تێکەڵاوی شیعری میللیی سەرزار و شیعری لیریکی و پۆییێمی سەردەمی ئێستای هەموو نەتەوەکانە. ژیانی لە بڵاوکردنەوەی کتێب و چاپەمەنی خەرج کردووە. لە چاپخانەکاندا وەک کارگەری تەکنیکی کاری کردووە. لە هەموو ئەو کۆمەڵە تێکستە فۆلکلۆرییە گرنگانەی لەو وڵاتەدا بڵاوکراونەتەوە بەشداری کردووە، لە کۆکردنەوەی تێکستەکان و دەرهێنانی کتێبەکان لە ڕووی هونەرییەوە کۆششی ئەو لە بەرچاوە. بەشێک لە سامانی نەتەوەیی ئەو بابەتە شیعرەیە بەشێوازێکی نوێ دایڕشتۆتەوە. بەگشتی جێ پەنجەی جاسم لە پێشخستنی ڕۆشنبیری کوردی لە قەفقاسی ڕووسیا لە بەرچاوە.

# بەشی نۆیەم

## دەشتی

**۱۹۰۹ – ۱۹۵۷**

### ژیانی

خدر کوڕی ئەحمەد کوڕی عەلی لە بنەماڵە و عەشرەتی نانەکەلییە. لە ساڵی ۱۹۰۹ لە گوندی مەلاکاغەی بناری چیای قەرەچووغ لە دایک بووە. لە خێزانێکی جوتیاری دەست کورت پەروەردە کراوە، لەو کاتەی هەستی بەوە کردووە دەتوانێ شیعر بنووسێ نازناوی «دەشتی» لە خۆی ناوە بۆ تۆماری شیعری.

دەشتی منداڵ بووە کە ماڵیان گوێزراوەتەوە هەولێر، لەو سەردەمەدا خراوەتە بەرخوێندن لە حوجرەی مزگەوت. وەکو نەریتی خوێندنی ئایینی ئەو کاتە دەشتی ڕووی کردۆتە هەندێ لەو گوندانەی حوجرەی خوێندنی مەلایەتییان تێدا بووە لە شار و دەشتی هەولێر و ناوچەی خۆشناوەتی بەتایبەتی شەقڵاوە و بێتواتە. ماوەیەکی زۆر لەو ئاواییانە ماوەتەوە. قۆناغێکی زۆری خوێندنی ئایینی بڕیوە، ئینجا گەڕاوەتەوە هەولێر و لە مزگەوتی حاجی قادری دەباغ خەریکی خوێندن بۆتەوە و دوا قۆناغی خوێندنی بردۆتە سەر و لەسەر دەستی مەلا عەبدوڵڵای بێتواتەیی ئیجازەی دوازدە زانستییەکەی وەرگرتووە، ئینجا ژنی هێناوە و خەریکی مەلایەتی بووە. بۆ یەکەم جار بەمەلای گوندی دارەبەن لە لای باکووری ڕۆژئاوای نزیک هەولێر دامەزراوە. ماوەی هەڤدە ساڵ لەوێ ماوەتەوە. لە دواییدا کردەوەی ئاغای گوند بۆتە هۆی ئەوەی دڵی لێ بشکێ و ناچار بێ لەوێ بار بکا بۆ گوندی گردەچاڵ (۱۹۵۳) و ماوەیێکی کەم مەلایەتی لێ دەکا و دەگەڕێتەوە هەولێر. بۆ دواجار هەر بەپیشەی مەلایەتی لە ساڵی ۱۹۵۵ ڕوو دەکاتە گوندی خەرابەدراو لە نزیک هەولێر.

دەشتی ئازاری هەبوو لە دەست نەخۆشی دڵ، ئەم دەردە تەمەنی درێژی پێ ڕەوا نەبینی و لە ساڵی ۱۹۵۷ لە گوندی خەرابەدراو کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ئەوێ بەخاک سپێررا.



## شیعری

تەمەنی دەشتی درێژ نەبوو، هەمووی بەپیشەی مەلایەتی و شیعر وتن بردۆتە سەر. شیعری کەمە بەڵام بابەتە گرنگەکانی سەردەمی خۆی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە وتووە.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

دەشتی لە دەستوور و نەریتی قوتابخانەی شیعری کرمانجیی باشووری نالی نەچۆتە دەرەوە. ئاوڕی لە شیعری کێشی سیلابی خۆماڵی و جووت قافیە (مەسنەوی) نەداوەتەوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی شیعری دەشتی لە ڕووی ڕوخسارەوە دەکرێ سرنجی ئەم تێبینییانە بدرێ:

١- شیعری کەم بووە کەچی زۆرترین بەحری عەرووزی لە کێشەکانیدا بەکاری هێناون: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، موتەقاریب، بەسیت، ڕەجەز، سەریع.
٢- لە قافیەدا ئەم دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە: ا ب ت د ر ز م ن (ە – ـە) وو ۆ ی ێ.
٣- لە پاش قافیەدا ئەم وشە و ڕستانەی بەکارهێناوە: تۆ، محەممەد، یا ڕەسووڵەڵڵا، کردین، ئیمڕۆ، دەکا، چبکەم، دڵی من، باغی گوڵان، یا ڕەب، بوو، کوردانم، بەسەردا هات، چوو، بم (ببم)، دێ (دێت)، ناکەوێ، بێ (ببێ).
٤- بەشی هەرە زۆری شیعری دەچنە ناو خانەی غەزەلەوە (لیریک) ئەوانەی ژمارەی دێڕە شیعریان لە دوازدە کەمترە.
٥- چەند قەسیدەیێکی هەیە لەوانەی لە دوازدە دێڕ زیاترن، لە ناو ئەمانەدا قەسیدەی دەوروبەری سی دێڕی بەرچاو دەکەوێ.
٦- دووسێ قەسیدەی بەندی پێنجینی هەیە (اااا ب).
٧- یەک دوو قەسیدەی بەندی چوارینیش (ااا ب) لە دیوانیدا دەبینرێن.
٨- مەولوودنامەی دەشتی بەزمانی کوردی لە زیاتر لە چوارسەد دێڕە شیعری مەسنەوی عەرووزی پێکهاتووە، لە ساڵی ۱۹۸۸ چاپ کراوە. ئەم بەرهەمە لە شاری هەولێر و دەوروبەری ناوی هەیە لە هەندێ ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر دەخوێنرێ.

٩- زمانی شیعری دەشتی ساکارە، مانا لە ڕووە. وشەی فەرهەنگی شیعری کرمانجیی باشوور بەکاردێنێ، واتە هەندێ لە وشەکانی بێگانەن، کەچی لە مانادا قورس نین. لە ڕەوانبێژی گەمەی هونەری داهێنراوی هەیە، وەک لاساییکردنەوەی شیعری کلاسیکی شاعیرە کۆنەکان دەکەوێتە بەرچاو.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

دەشتی لە هەموو مەبەس و بابەتەکانی شیعری کلاسیکی نەوتووە. لە کۆنەکە بایەخی بەشیعری دڵداری و وەسفی دلبەر داوە، ئەگەر سروشتی بەکارهێنابێ بۆ مەبەسی دڵداری بووە. تخوونی مەبەسەکانی دیکە نەکەوتووە، ئەوە نەبێ شیوەنی بۆ کۆچی دوایی شێخ مەحموود کردووە و ماتەمنامەی بۆ نووسیوە.

ناوەڕۆکی تازەی سەردەم لە لای دەشتی وەکو شاعیرانی دیکە مەبەسەکانی نیشتمانپەروەری و سیاسی و کوردایەتییە ئەمەی خستۆتە ناو قالبی شیعرە عەرووزییەکانییەوە. لەم لایەنەوە داهێنانی هەیە و ئەم بابەتە بەرهەمەی دەچێتە ناو ئەو دیوانە شیعرییە کوردییەی بەناوەڕۆک تازەیە و بەڕوخسار کێش و قافیە کۆنە.

## نموونەی شیعری

### وەسف و دڵداری

١

لە شیعرێکیدا دەشتی دەڵێ:

سوبحەینەیی هیجرانی تۆ ئەمڕۆ کەدەری بوو
وەک ڕەوزەیی سینەی سەدەفی تۆ خەبەری بوو
بولبول لە فیغان و دڵی بێکەس لە جەفادا
فەسڵێ کە ئیرەم غونچەیی بێ خەندە دەری بوو
هەرچەندە کە پاڕامەوە لەم زولفەیی چینت
بێ فائیدە ئاخر ئەمەلم دەردەسەری بوو
چاوم ئەتەکێنێتەوە ڕەنگی سەری کوڵمت
لەم ڕۆژەوە ئەبرۆیی کەچی تۆ شەرەری بوو



یا نەعرەتەیی عوشقاقە وە یا شیوەنە دلبەر
یا زەلزەلەی ڕۆژی قیامەتە ئەسەری بوو
عومرێکی درێژم بووە سەرفی ڕەهی وەسڵت
ئاخر لەسەر ئەم حاڵەتە خاکم بەسەری بوو
دەعوایی هەموو کەس کە بڵێن عاشقە ڕووحم
واقیع وەیە (دەشتی) کەسەری پڕ کەسەری بوو

لەم شیعرەدا دەشتی گفتوگۆ لەگەڵ دلبەردا دەکا، بەڵام لەگەڵی نییە، لێی دوورە. شپرزەیی خۆی لەبەر دووری لە خۆشەویست بەراوورد دەکا لەگەڵ ناڵەی بلبل بۆ گوڵ. وێنەی جوانی ڕەوانبێژی تێدایە، وەکو فرمێسکی چاوی شاعیر لە ڕەنگی سەر کوڵمی یارە، هەردووکیان سوورن، یەکەمیان بەڵگەی ناخۆشییە و دووەمیان ڕەمزی خۆشییە، واتە جوانی.

٢

لە وەسفی لەشولاری دلبەر دەشتی دەڵێ:

ڕەنگ و ڕووی گوڵناری من هەم دوژمن و هەم یارمە
بۆ ڕوخی ئەو ڕووحی شیرین دائیما ئەغیارمە
ماهی ڕوو چەرخی کە سووڕا هەوری زولفی کەوتە بەر
بۆیێ بارانی دوو چاو لێشاوی ڕووی تەمبارمە
دڵ بە تەنها کەوتە سەحرایی فیراقی قەددی تۆ
بێکەس و بێدەر بە دایم شین و زاری کارمە
باغەوانی سینەکەت گەر بێ بدووری کفنەکەم
وەسڵە بۆ من چونکە خەیاتی دەری گوڵزارمە
ڕووحی (دەشتی) گەر فیدایی لەنجەیی پەنجەت ببێ
ڕەنجی گەنجم بۆتە ڕەنجم مەتلەعی ئەفکارمە

لەم شیعرەدا هەموو وێنە جوانەکانی خۆشەویست دەبێتە مایەی دڵتەنگی و زویری شاعیر چونکە لێی دوورە.

٣

دەشتی لە وەسفی ئەندامە ڕەنگینەکانی دلبەر ناکەوی، لە دوو کووپلەی قەسیدەییێکی پێنجینیدا دەڵێ:

پڕ زەهرە هەمــوو دەم لە فــیــراقت جگەری مـن
پـەروانـەیـە بـۆ ڕوویـی چـراغـت جگـەری مـن
عـالەم هەمـوو مـەفـتـوونە بە بۆیی جگەری من
ئەی دلبـەری قـەد نەی وەرە سـەیری جگەری من
قــەللابی ســەری زولفــتــە بەندی جگەری من

ئەم چاوە غـەزالـەت سـەبەبی مـیـحنەتە بۆ من
ئەم لەنجـە لەسـەر پەنجە هەمـووی زیللەتە بۆ من
ئەم سیحرە لەسەر دوگمەیی سینەت غەمە بۆ من
نارنجی بەری قـەددی سـەرووت فـیـتنەیە بۆ من
بەم حـاڵـەتە تاکـەی لە جـەفـا بێ جگەری من

لەبەر دووری جیـگەری شاعیـر خوێناوە، هۆی ئەم نالەبارییە هەمووی ئەنجامی جوانی چاوە مامزییەکەیەتی، زەمزەمەی لەنجەولارەکەیەتی، جادووی گۆی مەمانیەتی.

٤

دەشتی لەسەر وەسفە هەستییەکانی دەڕوا لە وێنە کێشانی ئەندامی جوانی دلبەر:

شـەوێ دیتم کـە نـووسـرا بوو بە خـەتتـێکی سـورەیـیـانی
لەسـەر قـوبـەی هەیاسـە و دوگـمـە وو سنجـاقی مـەمکانی
بـەهاری ســــــینـەیـی یـارم ئـەگـــــەر بێت و دەوامی بێ
بە تەقــویمی دڵـی بولبــول دەســووڕێ چەرخی بورجــانی
لەبەر هەندێ کـوورەی نارییــەی غـەم مـەحـوە ئەی دلبــەر
مـوعـەییـەن بوو بە مـەرکـەز دائیـرەی عـەقـرەب بە ڕەمـزانی
تەمــاشـاکــەن ئەوا ڕۆژم لە خـەتتی ئیـســتــیــوا دەرچوو
بەرابەر بوو لەگـەڵ نوقــتــەی مــوقــابیل قــوتبی ناوانی
ڕەقـیـبی سەگ سـیـفەت ئیمڕۆ دڵم مـەقسوودی حاسڵ بوو
گــــەفی ئـەو ڕۆژە تۆ ئەیکەی چ بـاکـم خــــوایە ئـەیزانی



کـە من بەو دەست و پەنجـەی یاسـەمین قـەد دەردەچێ ڕووحم
لە قــوتبی کــۆنە خــانوویا ئەمــێنێ وەقــتی خـێـمــانی
هەتا وەســـــڵـی هەزارم بوو هـەمــــــوودەم ئاه و زارم بوو
ئەوێستــاکـەش کـە (دەشـتی)م وەکـو کـێـوی لە بۆسـتــانم

لەم وەسفـەدا دەشتی هەندێ دیاردە و زاراوەی زانستی ئەستێرەناسی (ئەستـرۆنۆمی) بەکـار دێنێ بۆ بەراورد لە نێـوان ئەندامـانی دلبـەر و بزووتنەوەی ئەو ئەندامـانە، وەکـو ناوبردنی هەندێ لەو زاراوانەی پێوەندییان بەئەستێرەناسییەوە هەیە، وەک ئەستێرەی سورەییا (پێروتەرازوو)، تەقویم، بورج، بورجی دووپشک، خەتی ئیستیوا، قوتب... هتد.

**گەمەی ڕەوانبێژی**

١

لە گەمەییێکی ڕەوانبێژیدا دەشتی دەڵێ:

دلبـەرا فـەوتا لەسـەر ئەم ڕێگە عـەین و مـیم و ڕێ
عەمرەکەم چوو یەک هەناسەم ماوە دەرچێ ڕێ و حێ
ڕووحە تۆزی گەرد و ژێر پایی ویساڵت یەک قەدەم
گەر هەڵێنێ بۆ عـیـیـادەت بێ بە نوون و ئەلف و زێ
نازی چاوت شـوبـهی داوت چین بەچین ئاشق کـوژن
قـەت نەبوو جـارێ بتـرسی تۆ لە حی و شین و ڕێ
حەشری زولفی تۆ لەگەڵ کـافـر یەقین هەمـتـا دەبێ
چونکە پۆشـیـی لە عــالەم ڕێ و واو و مــیم و تێ
ڕوومـەتی گـوڵـناری چیــمـەن پەرچەمی پڕ چینی تۆ
بوونە وێنەی چوونی کوففاران بە جیم و نوون و تێ
جەننەتی سینەت بە ئاهی سەردی من تێـیـدا نەما
غـــەیری دوو نارنجی بۆ دڵ پڕ لە ئەلف و واو و فێ
ئۆف لەبەر گـریان و شین لازم لە دەشـتـا دانیــشین
تا نەڕەنجێ مـەهجـەبین ئەی دال و شین و تێ و یێ

لەم شیعرەدا دەشتی نیوە دێڕی یەکەم و هەموو نیوە دێڕە دووەمەکانی بەچەند تیپێک کۆتایی پێ هێناوە. ئەو وشەیەی لە ئەنجامی یەکگرتنی تیپەکان دروست دەبێ لە سەرەتای هەموو نیوە دێڕە یەکەمەکان بەکاری هێناوە. وشەکان ئەمانەن: عومر، ڕووح، ناز، حەشر، ڕوومەت، جەننەت، ئۆف.

٢

لە گەمەییێکی ڕەوانبێژی لەفزیدا دەڵێ:

یاری عەلەمدارەکەم هاتەوە سەر شارەکەم
هاتەوە سەر شارەکەم یاری عەلەمدارەکەم
لازمە سەرچاوەکەم تاکو ڕەقیب دێتەوە
تاکو ڕەقیب دێتەوە لازمە سەرچاوەکەم
زوهری زولفی یارەکەم وەسڵەکە تریاکە بێ
وەسڵەکە تریاکە بێ زوهری زولفی یارەکەم
زیللەتی شەوتارەکەم حیکمەتە بۆ مەنتیقم
حیکمەتە بۆ مەنتیقم زیللەتی شەوتارەکەم
ئەی دڵی پڕ نارەکەم دوورە نەجاتت ببێ
دوورە نەجاتت ببێ ئەی دڵی پڕ نارەکەم
جەدوەلی پڕ کارەکەم تیغی دوو ئەبرۆ دەدا
تیغی دوو ئەبرۆ دەدا جەدوەلی پڕ کارەکەم
غونچەیی گوڵنارەکەم ناڵەیی بولبول دەدا
ناڵەیی بولبول دەدا غونچەیی گوڵنارەکەم
قەددی سنەودارەکەم ئاسکی کوردانەیە
ئاسکی کوردانەیە قەددی سنەودارەکەم
قیمەتی ئەشعارەکەم حەیفە بە(دەشتی) نەدەی
حەیفە بە(دەشتی) نەدەی قیمەتی ئەشعارەکەم

ئەگەر هەر نیوە دێڕی ئەم لیریکە بکرێ بەدوو کەرتەوە، بۆ بەڵگە «یاری عەلەمدارەکەم» لە بەحری عەرووز بەسیتی مەتوییە (مفتعلن فاعلن)، بەکێشی سیلابی خۆماڵی حەوت بڕگەیە. شاعیر هاتووە دوو کەرتی نیوە دێڕی یەکەمی شیعرەکەی ئاڵوگۆڕ کردووە لە نیوە



دێڕی دووەمدا. بەم پێیە ئەم لیریکە نۆ دێڕییە ئەگەر دووبارەکردنەوەی تێدا نەبێ دەبێتە نیو ئەوەندەی کە هەیە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە دەتوانرێ شیعرەکە لە ڕووی ئەندازیارییەوە بەم شێوەیە بنووسرێتەوە:

یاری عەلەمدارەکەم
هاتەوە سەر شارەکەم
هاتەوە سەر شارەکەم
یاری عەلەمدارەکەم

## نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا دەشتی دەڵێ:

ئەی عیراقی بێکەس و دڵ پڕ لە ئێش و دەرد و غەم
وەی ئەسیری حەربی ناڕێکی لە مەیدانی بە تەم
حەیفە پاشی تۆ بمێنن کوردەکانی بێ حەشەم
چوو لە دەستیان مەعدەنی عیزز و شەرەف بەینەلکەرەم
ئەی گەلی ئەشرافی کوردان بۆ غەریقی زیللەتن
بۆچی وا دائیم خەریکی قووتی مولک و میللەتن
بۆچی وا دەعیە و تەکەببور لێئەدەن پڕ حیددەتن
چاکە شەرمێ کەن لە عالەم بەخۆ کاکەن لە دەم

***

بابەگورگوڕ تاوەکو ئێستاکە پیری ئێوە بوو
خانەقا وو تەکیە وو ڕێبازی شێخی ئێوە بوو
جێگەیی مەولوود و سەد ئیحسان و خێری ئێوە بوو
ئێستاکەش وا پێی خەنی بوون عارەب و تورک و عەجەم

***

چاکە فکرێکەن لە ئیستیقبالی خۆ زوو چارەکەن
تەرکی وەحشەت کەن سیلاحی یەکدی کوشتن پارەکەن

ڕوو لە پەیداکردنی ئالاتی وەک تەییارەکەن
تاوەکو (دەشتی) نەبێ مەشغوولی قاڵ و قیلی غەم

لەم شیعرەدا دەشتی پەنجە بۆ هەندێ مەسەلەی سیاسی ئەو سەردەمە درێژ دەکا. لە کاتێکدا ئەم شیعرەی وتووە ڕاپەڕینەکانی کورد هەندێ کپ بووە. ئیتر شاعیر ویستوویەتی ئامانجی کورد لەگەڵ بوونی عیراق بگونجێنێ. بێ گومان ئەوەی لە بیر نەچووە کورد دواکەوتووە، بۆیە ئامۆژگارییان دەکا بۆ پێشکەوتن. شاعیر باباگوڕگوڕی کەرکووکی کردووە بەڕەمز، تەنیا لەبەر نەوت نا بەڵکو لەبەر کوردستان. عەرەب و تورک و عەجەم بەشیان کردووە. ئینجا کورد هان دەدا و پێیان دەڵێ بەپیشەسازی و تەکنیک و هونەر نەبێ پێش ناکەون.

٢

پیشەی دەشتی بیرکردنەوەیە لە دواکەوتوویی کورد:

بۆ نیگبەتی ئەم میللەتە بێ جانە دڵی من
بۆ میللەتی ئازوردە لە زەلیلانە دڵی من
بۆ حیددەتی ئەم کوردە لە ترسانە دڵی من
بۆ زیللەتی ئەم کوردە لە گریانە دڵی من
کوردینە وەرن شەربەتی ڕێکی بەدەما کەن
ئەم موڵکە لە دەست عالەمی بێگانە ڕەها کەن
یەکدی مەکوژن ڕوویی سەناییع لە هەوا کەن
بەم ئاووری ڕووناکییە سووتاوە دڵی من
خاکی وەتەنی ئێوەیە هەردەم کە دەناڵی
سەد حەیفە کە ئەم مەعدەنە ئەڕوا بە بەتاڵی
ئەمڕۆکە سبەی دێتەوە بۆ حەربی شیمالی
بۆ سەنعەتی تەییارە لە هاوارە دڵی من
لۆکەی وەتەنی ئێوەیە ئەمڕۆ بووە دینار
ڕووحی وەتەنی ئێوەیە ئەم فلسی خەریدار
بەم حاڵەیە (دەشتی) کە دەبێ عاجز و بیمار
هەردەم کە خەفەتخان و بریندارە دڵی من



دڵی شاعیر هەمیشە لە گریان و شین و شەپۆڕ و واوەیلا دایە، چونکە نەتەوەکەی تووشی نەگبەتی بووە. هۆی ئەمە نەبوونی یەکێتییە، لەبەرئەوە ژێردەستن. نیشتمانی کورد دەوڵەمەندە هەمووی کانی مەعدەنە، کشتوکاڵی لۆکەیە، ئەمانەن سەرچاوەی پێشکەوتنی پیشەسازی و بەتایبەتی دروستکردنی فڕۆکە.

٣

بەناوی «کەرکووکی زەلیلم» لە شیعرێکیدا دەشتی باس لە کەرکووکی کوردان دەکا:

زاڵم وەرە ئەم فیتنەیە وو ئەم حاڵە هەتاکەی
وا چاکە لە ڕوومەت لە من و ڕوو لە خودا کەی
بێ فائیدە ئەم خوێنە هەتاکەی بڕژێنم
وا چاکە کە ڕەحمێ بە دڵی پڕ لە جەفاکەی
قوللابەیی زولفی تۆ وەکو لەشکری کوردن
بۆ جەوری دڵی عاشقە زنجیری جەفاکەی
تالیب بە عیراقی تووە دڵ هەر دەمە ئەمما
شێواوە لە گێژی عەرەبا زێڕ و قەڵاکەی
دەستووری قولابەندی قولابی بە قولابت
حوسنی هەیە بۆ میللەتی کوردم بە سەراکەی
مەعلوومە کە ئینگلتەرە کەوتۆتە میانا
ئالا وو خەتتی کورد و عەرەب بادە بە چاکەی
پاپۆڕی نەجاتم نییە بۆ بەحری خیانەت
سەییارە موعەتتەل بووە میزانی سەداکەی
بۆ مەنفەعەتی ئەجنەبیی و لەندەنە ئیمڕۆ
مەعدەن لە عەدەن هاتووە سەر ئاب و هەواکەی
ڕووحی منە گازی دەمە ئەم گازە کە ئەڕوا
کەرکووکی زەلیلم چییە ئەم زیللەتە تاکەی
بەم داغە ئەسەف دەستم و هەردەم کە لە شینم
بۆ بیدعەتی لبنانیی و هەم سەیر و سەفاکەی

مەعلوومە قوبایی غەزەلت دوو شتە ئیمڕۆ
(دەشتی) وەرە وا چاترە دوو باسی تیاکەی

لەو ڕۆژەوە دەوڵەتی عیراق دامەزراوە داگیرکەری ئینگلیز و قەومییە شۆڤێنییەکانی عەرەب لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان کەرکووکیان بەکوردستان نەزانیوە. کوردیش لەو ڕۆژەوە ئەو شارەی بەکوردستان زانیوە، بەمەڵبەندی هەموو دانیشتوانی لە کەمە نەتەوایەتییەکان حسێب کردووە. شاعیر ڕۆمانتیکییانە کەرکووکی کردووە بەدلبەرە جوانەکە. دڵدارانی کوردن و عیراقین بەڵام عەرەب بۆچ زێڕ و قەڵای ئەم بووکە جوانە داگیر بکا! زێڕی بووک نەوتەکەیە، قەڵاکەش کۆشک و باڵەخانەیەتی. لە لایێکی دیکەوە دەشتی پەنجە بۆ ئینگلیز درێژ دەکا، ئەوەی تەنیا لە چاکەی خۆی دەگەڕێ و گوێی لە خەڵکی عیراق نییە. ئینگلیز مەعدەن و ئامێری پیشەسازی لە شاری عەدەنی جزیرەی عەرەبەوە دێنێ بۆ ئەوەی نەوتی لێ دەربێنێ. لەم شیعرەدا دەشتی بەشێوازێکی سیمبۆلییانە باس لە هەندێ دیاردەی زانستی و پیشەسازی دەکا، کەچی لە ڕووی جوانکارییەوە داهێنانی دەست خستووە.

***

خدری کوڕی ئەحمەد ناسراو بەدەشتی شاعیرێکە لە دەشتی هەولێر پەیدا بووە، لەبەرئەوە نازناوی کردووە بە«دەشتی» ، بەمە ژیرانە بۆ مەسەلەی شیعرییەتەکەی چووە کە ئەم ناوەی لە خۆی ناوە. زۆر نەژیاوە لەبەرئەوە شیعری کەمە. بەرهەمی لاسایی شیعری کلاسیکی کوردستانی باشووری ناوچەی سلێمانییە، بەلای شیعری سیلابی خۆماڵی نەچووە، لەگەڵ ئەوەشدا توانیویەتی وەستایانە مەبەس و بابەتی نوێ لەگەڵ ئەو قاڵبە کۆنە بگونجێنێ. دەشتی شاعیرێک بووە ڕێزی لە بیر و خەیاڵی خۆی گرتووە، شتێکی بەدڵی نەبووبێ نەینووسیوە. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شیعری لە خانەی وەسف و دڵداری و کوردایەتی نەچۆتە دەرەوە. وەسفی جوانی و دڵداری لە ڕووی سۆزەوە گەلێ قووڵ و زۆر گەرم نییە، بەڵام توانیویەتی وێنەی جوانی لێ دروست بکا. دەشتی هەموو ژیانی لە حوجرەی مزگەوت بردۆتە سەر و مامۆستای زانستییەکانی شەریعەتی ئیسلام و زمانی عەرەبی بووە، کەچی هەندێ لە شیعرەکانی بەڵگەی ئەوەن ئاگاداری لە زانستیی دەرەوەی حوجرەی مزگەوت بووە و هوشیارانە و مۆدێرنیزمیانە بیری لە مەسەلەی ڕزگاریی نەتەوەی کورد کردووە.

# بەشی دەیەم

## حیلمی

## ١٩٠٩ – ١٩٨٥

### ژیانی

محەمەد کوڕی شێخ حوسێن لە ساڵی ١٩٠٩ لە هەڵەبجە لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی هەندێ لە مزگەوتەکانی دێهاتی شارەزوور بووە. لە دوایی ڕووی کردۆتە قوتابخانەی سەرەتایی و باوەڕنامەی پۆلی شەشەمی ئەو قۆناغەی وەرگرتووە. لە پاشانا لە خولێکدا خوێندنی برینپێچی تەواو کردووە و ماوەییێک لە نەخۆشخانەکانی خورماڵ و سووررداش برینپێچ بووە. لە ساڵی ١٩٤٤ وازی لەم کارە هێناوە و خەریکی پیشەی سەعاتچیەتی و مۆر هەڵکەندن و نووسینی ئەرزوحاڵ بووە لە ڕانیە، ئینجا چووە بۆ هەڵەبجە تا ساڵی ١٩٥٧ لەوێ ماوەتەوە. لە دواییدا هاتۆتەوە سەر پیشەی برینپێچی و لە کۆمپانیای دروستکردنی بەنداوی دەربەندیخان کاری کردووە تا ساڵی ١٩٧٥. لەو ساڵەدا تووشی نەخۆشیی چاوئێشەییێکی دژوار بوو، ناچار چووە خۆی خستۆتە ژێر دەست و پلی پزیشکی نەشتەرگەری، بەڵام بێ ئەنجام سوودی نەبووە. بەو جۆرە کوێر بووە و لە ماڵ نەهاتۆتە دەرەوە تا ڕۆژی ١٠ی مارتی ١٩٨٥ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گولانی هەڵەبجە نێژراوە.

محەمەد شێخ حوسێن ناوی «حیلمی» بۆ خۆی هەڵبژاردووە وەکو نازناوی شاعیری و لە نێوەندی ئەدەبی بەم نازناوە ناسراوە.

### شیعری

#### لە ڕووی ڕوخسارەوە

بەرهەمی شیعری حیلمی دەچێتە خانەی ئەدەبی میللیی نووسراوەوە لە ئەدەبی سەرزارەوە (فۆلکلۆرەوە) نزیکە. بەم پێیە وشەی شیعری سادە و کوردی پەتییە، تەعبیری ئاسان و مانا لە ڕووە. لە بەکارهێنانی کێشی بەحری عەرووز دوورەپەرێزە. کێشی سیلابی خۆماڵی لە شیعریدا بەکارهێناوە. زۆربەی کێشی دە بڕگەییە، هەروەها کێشەکانی حەوت بڕگەیی



و هەشت بڕگەیی لە بەرهەمیدا بەرچاو دەکەون. هەندێ جار لە نیوە دێڕە شیعرێکدا دوو ڕستەی حەوت بڕگەیی لە یەکتری دەدا و نیوە دێڕەکە دەبێتە چواردە بڕگە.

لە بابەت قافیەوە زۆربەی جووت قافیەیە (مەسنەوی)، لەگەڵ ئەوەشدا چەند پارچە شیعرێکی هەیە لەسەر کێشی خۆماڵین بەڵام یەکێتیی قافیەیان تێدایە. ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە یەکێتیی قافیە لەگەڵ کێشی بەحرەکانی عەرووز دەگونجێ، لەبەرئەوە ئەم دیاردەیەی لای حیلمی بەنوێکردنەوە لەقەڵەم دەدرێ.

بەزۆری بەرهەمی شیعری لە بابەتی لیریکی کورت دەژمێررێ. لە ژانرەکانی دیکەی شیعری کلاسیکی هەندێ موستەزادی هەیە، ئەمانە هەموویان لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی هۆنراونەتەوە. جگە لەمە لە لایەن ژانرەکانی ئەدەبی خۆماڵییەوە دوو چیرۆکە شیعری (پۆییێمی) هەیە ئەوەی لە ئەدەبی میللی سەرزاردا «بەیت»ی پێ دەڵێن.

#### لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

حیلمی شیعری زۆر نییە، وا دەردەکەوێ شاعیری نەکردووە بەپیشە، لەگەڵ ئەوەشدا شیعری جێگەی دیاری هەیە لە ئەدەبی کوردیدا چونکە زۆربەی شیعری دەچێتە خانەی داشۆرینی قانگدراو بەشیعری کراوەی بێ پەردە (ئیرۆتیک)، خەریکی وێنە و مانای سێکسی نێرینە و مێیینەیە. هەندێ کەس بەقوتابی سەرکەوتووی شێخ ڕەزای دادەنێن لەم بابەتە شیعرەدا. لەگەڵ ئەوەشدا شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و ماتەمنامە و هی دیکە بەرچاو دەکەون.

جگە لەوە دیوانی حیلمی دوو چیرۆکە شیعری میللی دەور دەکاتەوە، یەکەمیان بەناوی «ماڵی نەخۆر بۆ چەکمە بۆر»، دووەمیان «چیرۆکی ورچ و مەیموون». لە بنجدا ئەم دوو چیرۆکە لە ناو ئەدەبی میللیی سەرزاری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەڕاست بڵاوە. ناوەڕۆکی چیرۆکەکان لە چاوچنۆکی ئادەمزاد دەدوێن. هەروەها باس لە ژیری و وردبوونەوە و بەرنامە دانان دەکەن بەتایبەتی لەو کۆمەڵانەی ئادەمزاد تیایاندا دەچەوسێنرێنەوە. لە حیکایەتەکان ئەوە هاتووە پیلان دانان بەهێمنی و لەسەرخۆ لە هەموو مەینەتییێک ڕزگاریان دەکا، نەک بەهەڵەوەڕی و تووڕەبوون و هێرشبردن.

## شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

حیلمی لە شیعرێکیدا دەڵێ:

دوو منداڵی ژیرکەلە<br>
هاتنە لام بەپەلە<br>
ئەیان گێڕایۆ ورد ورد<br>
سەرکەوتنی گەلی کورد<br>
ئەیان وت ڕۆڵەی گەلین<br>
هەوڵ ئەدەین لەسەر هەلین<br>
بۆ ڕزگاری نیشتمان<br>
هەموو بەخت ئەکەین گیان<br>
تا ئەمرین شان بەشان<br>
ڕزگار ئەکەین کوردستان

بەهەناسەیێکی شیعری میللییانە شاعیر باس لە دوو منداڵی کورد دەکا، شانازی بەوەوە دەکەن کە کوردن و بۆ ڕزگاری کوردستان تێدەکۆشن. وشە و تەعبیر ساکارە، مانا لە ئامۆژگاری دەکا بۆ منداڵان و لاوان ئەوانەی لە قۆناغێکدا دەژین پێویستە خەبات بکەن لە پێناوی هێنانە دی هیوا و ئامانجەکانی گەلی کورد.

٢

لە چوارینێکیدا حیلمی دەڵێ:

ئەزانی خۆشە ئەم نیشتمانە<br>
بەڕاستی ئەڵێم شوێنی سەیرانە<br>
ئەم کەژ و کێو و دەشت و دیمەنە<br>
هەمووی وەک زێڕە خاکی کوردانە

شاعیر ئاماژە بۆ خۆشی سروشتی کوردستان دەکا. بۆیە بووە بەسەیرانگا. خاکی کوردان ئەوەندە دەوڵەمەندە خۆی لە زێڕدا دەنوێنێ بۆیە دەبێ بپارێزرێ.



## شیعری شین و ماتەم

١

بۆ کۆچی دوایی شاهۆی شاعیر حیلمی دەڵێ:

گڕەی حوزەیران ئیمساڵ بۆ گەرمە    جەرگ ئەکا بەئاو<br>
پێچ و خولیەتی ئێجگار بێ شەرمە    هەڵئەکا تاو تاو<br>
قەڵەمی لە دەست شاهۆ خستە خوار    شاعیری کوردان<br>
لە شیعری کۆنا تاوییە دا بەغار    باسی نیشتمان<br>
فەلەک ڕیسوا بی داڕزێی وورد وورد    لە ڕووی جیهانا<br>
بسووتێ گیانت ئازا و دەست و برد    لە کوردستانا<br>
کێ بێ بنووسێ باسی هەورامان    لانەی شاعیران<br>
خوڕەی ناو چەمی لای لایەی شەوان    وا بەشیعری جوان<br>
کێ یادی شاعیر بکا ئەحمەد جاف    بە قسەی شیرین<br>
بە هەڵبەستی جوان بێ گرێ و ساف    بەیادی دێرین<br>
قەڵەم نۆبەتە بێرەوە مەیدان    بۆ مەلا حەسەن<br>
بەشاهۆ مەشهوور لە ناوچەی کوردان    خاوەن عیلم و فەن<br>
حەقە گەر بگری کوردی مەینەت بار    بۆ ڕۆشتنی تۆ<br>
بدا بەسەریا نەک جارێ سەد جار    شاعیری کورد ڕۆ

شاهۆ شاعیرێکی ڕەند و نیشتمانپەروەرێکی کورد بوو. حیلمی لەو شینەیدا هەندێ ڕاستی لە بابەت ئەم شاعیرەوە دەخاتە ڕوو وەکو ئەوەی شاهۆ بەشێوازی کۆنی کلاسیکی باسی مەسەلەی نوێی کوردی کردووە، واتە نیشتمانپەروەری بەمانای تازە خستوویەتییە ناو قاڵبی کلاسیکی کۆنی شیعرەوە، هەروەها لە شیعریدا جوانی هەورامانی دەربڕیوە و باسی ئەحمەد موختاری شاعیری کردووە.

٢

بۆ کۆچی دوایی حەسەن فەهمی جاف دەڵێ:

حوزەیران تاکەی بێ سەلیقە و فەن    بۆ وا ئەکەی تۆ<br>
ئیمساڵ فەهمی جاف یا مەلا حەسەن    وا بووین ڕەنجەڕۆ

بۆچی بووی بەداخ بۆ هەموو ساڵێ | لای گەلی کوردان
شاعیرێ ئەبەی ئەیخەیتە حاڵێ | نابی پەشیمان
مێژوونووسەکەی ناو کوردستانم | پاش ئەمین زەکی
دڵسۆزی گەلی زۆر میهرەبانم | قەڵەم بوو چەکی
هەڵگری دیوان شاعیری خالۆی | کاک ئەحمەدی جاف
تەئریخی کۆچی لە ڕۆژانی ساڵ | نۆسە و حەفتا و سێ
لە حوزەیرانا دای لە شەقەی باڵ | هیچ کەس نەپرسێ

لە حوزەیرانی پار مەلا حەسەنی شاهۆ کۆچی دوایی کرد، لە حوزەیرانی ئەمساڵ حەسەن فەهمی جاف. بەلای حیلمییەوە حەسەن فەهمی مێژوونووسێکی گەورە بووە لە دوای ئەمین زەکی. تەنیا مێژوونووس نەبووە، بەڵکو پارێزەری دیوانی شیعری خالۆی خۆیەتی کە ئەحمەد موختار جافە. نووسەر ئەدەب دۆست بووە، ماڵی دیوەخانەی شاعیران بوو، ئەوجا لە دواییدا بەحسێبی ئەبجەد ساڵی مردنی دیاری دەکا کە ساڵی ١٩٧٣یە.

## شیعری داشۆرین و کراوەی بێ پەردە (ئیرۆتیک)

١

بەناوی «ڕەش بەڵەک»ەوە حیلمی لیریکێک دەهۆنێتەوە:

خەڵقینە ئەمڕۆ هەڵەبجە خۆشە
ژن و پیاو سەرمەست هەموو بێ هۆشە
ئەم مەستیانە هی شەراب نییە
گەر ئەتانەوێ عەرزتان کەم چییە
جاهێڵانی قیت ژنانی پڕ جۆش
بەجاڕێ هەموو هاتوونە خڕۆش
دەست وەشاردن و مەمک هەڵگوشین
ماچ و مووچ کردن سەر گۆنا گەزین
دوو لێوی کاڵی مەمک بۆن کردن
دەست فلیقان و چپە بۆ کردن
وەلحاسڵ هەریەک بەئارەزووی خۆی
خەریکە یەکێک تەفرەدا بۆ خۆی



هیچ فەرق نییە لە قەوم و لە خوێش
نێر بێ یا مێ بێ هەر ئەیداتە پێش

وەرامی ژن:

گوێ بگرە شاعیر ئەمە جوابمانە
لۆمەمان مەکەن گونای مێردمانە
ئێمە جڵەومان بەدەس پیاومانە
هەرچی ئەفەرمووی لە بەرچاومانە
ئیزنمان ئەدەن ئەچین هەڵپەڕین
لە ناو ڕەش بەڵەک خۆش خۆش دەسگرین
تەماشا بکەن بڵێن جوانە
ژنی فلان کەس خاسی هەمووانە
چەند زەریفە هەم نازەنینە
جوان و بەشەوکەت زولف عەنبەرینە
ئەگریجە قرتاو برۆ کەوانی
بەشەوکەت ڕوخسار ماهی تابانی

ئەحمەد موختاری شاعیر ئاهەنگی شایی و هەڵپەڕکێی گێڕاوە بەهۆی خەتەنەکردنی ئەفراسیابی کوڕیەوە. لە ناو شاییکەراندا کچ و ژنی جوولەکەی هەڵەبجە هەبوون. حیلمی ئیلهامی ئەم شیعرەی لەو شاییە وەرگرتووە. کوڕانی تینووی دەسبازی، دەمیان لە کچان نزیک دەکردەوە و ماچیان دەکردن، مەمکیان دەگوشین، خۆیان پێیانەوە دەنووساند.

حیلمی شیعرەکەی کردووە بەدوو بەش. یەکەمیان کردەوەی پیاوانە و جڵەو بەدەست ئەوانەوەیە. لە دووەمینیاندا ژن دێتە وەرام و دەڵێ: ئێمە هەرچی بکەین، لە فەرمانی مێردمان دەرناچین. هەرچی لەگەڵمانا دەکرێ بەڕەزامەندی پیاوەکانەوەیە، ئیتر دەسنیشانکردنی ژنی جوانیش بەدەس پیاوانەوەیە.

٢

لە چوارینێکیدا بەشێوازی داشۆرین وەسفی قوونی کەسێک دەکا:

گەر تەماشای مەقعەدی کەیت ناوسکی دیارە لە لات
هێندە وازە هەر لە ناو ئەشکەوتی چل میران ئەکا

دەسکەدن لای یارۆ تاڵە موویێکە گەر پیا بچێ
قەت خرووری ناشکێ بەمانە ڕوو لە کونجی خان ئەکا

لەگەڵ ئەوەی حیلمی لەم شیعرەدا ناوی کەس نابا، بەپێی شیعرێکی دیکەی لەوانەیە مەبەسی کەمالی شاعیری هاوڕێ و دۆستی بێ.

٣

لە چوارینێکی دیکەیدا لەم بابەتەوە دەڵێ:

کێری کەر بۆیە هەمیشە زیاد ئەکا و ئەخولێتەوە
تا لە دۆڵی عەلییە فەندی ئاوی خۆی بێنێتەوە
کاتێ گەییە ناوگەڵی ئەو تێدەگا نارِوا هەمووی
جا لە داخا وردە وردە سیس ئەبێ و ئەکشێتەوە

لەو شیعرەدا مەبەسی لە عەلی ئەفەندی کەمالی شاعیرە. مانای ئەم شیعرە هەرچی بێ لە ڕووی ڕەوشت و نەریتی کۆمەڵایەتییەوە، لە بابەت داهێنانی هونەرییەوە جوانکاری تێدایە. شاعیر توانیویەتی وێنەی کردەوەییێک بەشێوازێکی هونەری و کۆمیدییانە بکێشێ.

٤

لە داشۆرینی کەسێکی سوورفلەدا دەڵێ:

سوورە وەک مەیموون ناوچاوی چرچە
لە سەما کردن عەینی وەک ورچە
سەر خڕ گوێ قەوی زمان شەق و شڕ
خۆی خڕ هەڵاڵە عەینی وەکو تڕ
بەدەم شیعرەوە کە دێتە سەما
مەیموون لە چاویا بەشەرمە و حەیا
بەجرت و فرتی جەهالەتەوە
گۆی هونەر لە دەست کەر ئەباتەوە
جێ کونی نییە بەچاویا دیارە
لە کەیوان بۆیان بڕی ئەمجارە



لەم شیعرەدا حیلمی وەسفی کەسێکی سوورفلی لەش تێکشکاوی دەعەجانیی شێوە مەیموون دەکا. وەک ورچێکی بێ ئابڕووە لە کاتی سەماکردندا لەباتی ئەوەی خۆشیی گیانی بگەیەنێتە تەماشاکەر دەیخاتە پێکەنینی قەشمەری ئامێزەوە.

٥

حیلمی لە لیریکێکیدا باس لە دوو غولام و پێشخزمەتی ماڵە گەوران دەکا:

ئەستێرەت کز بوو لە ئاسمانا — گەووادی شاران
کلکت تۆز ناکا لە دیوەخانا — وەک جاری جاران
خۆ تۆ شەرتت کرد جاری تر نەچی — هەی سەر قوڕاوی
کاتێکمان زانی ئێوارە چوویتۆ — تەڵاق گاوی
نازانی ئەلە زۆر بێ حەیایە — هەروەک ئەسپی نۆڕ
با شقارتەکەت تۆ لێ نەدایە — کوڕی گای سەرشۆڕ
گێژی بادەی یەنگ وەک وەستا هاشم — هەی قەرەچەناغ
سمێڵ و ڕیش و بڕۆت بتاشم — سەرسەری ئاڵچاغ

لەم لیریکەدا حیلمی باس لە دوو خزمەتکاری ئاغاییێک دەکا، دژی یەکترین و بەربەرەکانی یەکتری دەکەن. یەکەمیان لە سەرەتادا لە پێشەوە دەبێ و ڕێز لە میوانان دەنێ، جیگەرەیان پێشکێش دەکا و بۆشیان دادەگیرسێنێ. دووەمیان ئەلە کەچەڵ بەربەرەکانی دەکا، تا لە دواییدا جێی پێ لەق دەکا و خۆی دەکەوێتە پێش ئەوەوە لە خزمەتکردندا.

٦

جارێکیان وسوو ئاغا لە گوندی داریکەلی میوانی شێخ مەحموود دەبێ. لەو کاتەدا ددانی ژان دەکا. ئیتر داوا لە شێخ دەکا نامەیێکی بۆ بنووسێ بۆ لەتیفی دانساز لە سلێمانی. لەو کاتەدا ناریی شاعیر میوانی شێخ بووە. شێخ داوا لە ناری دەکا لەم بابەتەوە نامەیێک بنووسێ ئەویش ئەم تاکە شیعرەی بۆ دادەنێ:

وسوو موحتاجی دانە وا هاتە لاتان
کە دەستێکتان هەیە ئێوەش لە دانا

لەو کاتەی ئەم شیعرە وەک نامە دەگاتە دەست شێخ لەتیفی دانساز حیلمی خوشکەزای

لەوێ دەبێ، شیعرەکە دەخوێنێتەوە و بەدیێ شیعرێک لەسەر کێش و قافیەی شیعرەکەی پێشوو وەرامی دەداتەوە:

وسوو هات ددان بکا یاشێخ لە لامان
بەمەرگی تۆ قەسەم پێنج دەفعە گامان

شێخ لەتیف ئەم شیعرە بەدەستی وسوو ئاغا وەک وەرامدانەوەی شیعرەکەی ناری بۆ شێخ مەحموودی دەنێرێ. بێ گومان شێخ دەیداتە قاقای پێکەنین و دەزانێ ئەمە کاری حیلمییە.

٧

کۆمەڵێک شاعیرانی هاوڕێی حیلمی بڕیار دەدەن پێکەوە شیعرێکی داشۆرین لە دژی شاعیر بهۆننەوە. شاعیرەکان ئەمانە بوون: ناتیق، کەمالی، شێخ سەلام، سەعید فەوزی، میرزا مارف، فەرامەرز (ڕەشید نەجیب) و ئەحمەد موختار.

چۆنیەتی دانانی شیعرەکە بێ گومان ئەوە بوو یەکێکیان چەند دێڕێکی داناوە، ئەمەیان کەوتۆتە دەست شاعیرێکی دیکە، ئەویش دێڕێک یا زیاتری خستۆتە سەر شیعرەکەی پێشوو. بەم جۆرە حەوت کەس لە دانانی شیعرەکە بەشدارییان کردووە:

فیکرم ئەمەیە خامە مەدەد نامەوەری کەم
بۆ کاکە حەمەی شێخ حوسێن مەدحی کەری کەم
هەروەکو ژنی فاحیشە سەر و زولفی بتاشم
سواری کەرەدێزی بکەم و شار بەدەری کەم
«ناتیق»

وەک مورشیدی کامیل لە خەیاڵم بەشەو و ڕۆژ
زەرکێ لە سکی ڕۆ بکەم و بەهرەوەری کەم
«کەمالی»

هێندە جۆش و خرۆشی هەیە ناوەستێ هەتاکو
پاڵی بخەم و پیایا بکەم و دیوە دەری کەم
«شێخ سەلام»

سەلک و سەکوتی باشە فەقەت قێزم ئەشێوێ
هەر وەختی هەوای پاش و سورینی لە جەڕی کەم
«سەعید فەوزی»



واز بێنە کەماڵ مرقی لەسەر لادە بەری دە
وا چاکە لەبەر ویز و لەڕی پاشەدەری کەم
«میرزا مارف»

موحتاجی شرینقەی قووەت و حەببی حەیاتە
دوکتۆرە کە بشکێنی خرووی چارەسەری کەم
تێر ناخوا بەمن هێندە بەئاڵووش و بەفاڵە
وا چاکە حەواڵەی ڕەپی کاپتان میللەری کەم
«فەرامەرز»

بۆ تۆزێ خەنە بۆ تنی بێژنی خەریکم
تەعلیمی بەئەخلاق بەئەرسی پدەری کەم
چونکە سنەیی نەسلی تەمامی بەفروفێڵ
وا حیزە پەنابات و قران و قەمەری کەم
چەند حیزە کە جاشولکەی یابووی عەجەمی ڕەنگ
تەزبینی بەزین و بەڕە وو جل قەجەری کەم
ئەم حیزە ئەمە چەند ساڵە لە من بەفاڵە
وا چاکە حەواڵەی مەفرەشی ئامەی بەشەری کەم
«ئەحمەد موختار جاف»

ئەم شیعرە بەڕاستی شێوازی تایبەتی ئەم شاعیرانە ناخاتە ڕوو. بەڵکو ئەو بەشەی شاعیری یەکەم دایناوە ئەوانی دیکە هەموویان پێڕەوی ئەویان کردووە. شاعیرە یەکەمەکەش شیعرەکەی ڕەنگدانەوەی شێوازی تایبەتی خۆی نییە، چونکە ئەو شاعیرانەی بەشدارییان لە هۆنینەوەی ئەم شیعرە کردووە لە شیعری داشۆرین و کراوەی بێ پەردە (ئیرۆتیک) دەستیان درێژ نەبووە. هەرچۆنێ بێ لە گێتیی ئەدەبدا بەرهەمی لەم جۆرە لە نێوان شاعیرانی دۆست و برادەری یەکتری دەبێتە مایەی دەوڵەمەندبوونی ئەدەب، چونکە هونەر پێویستە هەموو لایەنێکی ژیانی ئادەمزاد بگرێتەوە.

لە شیعرەکەدا ئاماژە هەیە بۆ کاپیتان میللەر ئەمەیان حاکمی سیاسی ئینگلیز بووە لە هەڵەبجە. هەروەها ناوی ئامەی بەشەر هاتووە، ئەمەشیان ئامە یا ئامینەی بەشەر مامانی ناسراو بووە لە هەڵەبجە.

## ٨

هەواڵ لە ناوەوەیە لە سەردەمی خۆیدا شاعیر و ئەدەب دۆست لە هەڵەبجە لە چایخانەی مەلا ئەمین کۆدەبوونەوە. دانیشتنیان گفتوگۆ و باسی ئەدەب و ڕاز و نیاز و گاڵتەوگەپ و پێکەنین بووە. ڕۆژێکیان ڕەشید سدقی مووچەخۆری میری بووە لە هەڵەبجە. ماییینێکی بۆری بووە، خۆشی ویستووە لەبەرئەوە زۆر باسی کردووە. لە کاتێکدا شاعیران حیلمی و میرزا مارف و ئەحمەد موختار و فەرامەرز و کەمالی لەوێ دەبن، حیلمی دێڕە شیعرێک لە بابەت ماییینەکەوە دەڵێ. ئیتر شاعیران هەریەکەی بەدێڕێک بەشداری لە هۆنینەوەی شیعرەکە دەکا:

کاکە سدقی لێی ئەچێ کاتی تەڵەب
هەر ئەڵێی دێڵە بەبایە ماینە بۆر
«حیلمی»

هەر لە زێی تا ئاردەبایە ماینە بۆر
مەفرەشی حەوشی سەرایە ماینە بۆر
«میرزا مارف»

هەر بەڕەوت ڕەمزی هەویر شێلان ئەکا
وا ئەزانی نانەوایە ماینە بۆر
«ئەحمەد موختار جاف»

سەر کەللەی زیوە پەڕەی سەوزی هەیە
شێخەکەی چرچە قەڵایە ماینە بۆر
«فەرامەرز»

دائیما بێ نان و کا وو ئالیکە
خواردنی پووش و پەڵاشە ماینە بۆر
«کەمالی»

سەر بەرەو ژوورییە وەختێ بێتە بەر
وەکو قوڕ قوڕە ئەقوڕێنی ماینە بۆر
هێندە تەعریفی ئەکەم ڕاست و بەجێیە مەقسەدم
چەشنی سولفاتە پەنا ئەبرێ ماینە بۆر
«حیلمی»



لێرەدا وا ڕێک کەوتووە ئەم شاعیرانە لە کۆڕێک یا دانیشتنێکدا لەگەڵ یەک بووبن. ئەگەر نا کارێکی بەجێیە شیعرێک زادەی خەیاڵی شاعیرێک بێ، لە پاشانا شاعیرانی دیکە بەشداری تێدا بکەن. ئەم دیاردەیە بەڕوونی لە ئەدەبی کوردیدا لە پێنج خشتەکی دەکەوێتە بەرچاو، چونکە زادەی خەیاڵی دوو شاعیرە.

***

محەمەد کوڕی شێخ حوسێن نازناوی شیعری حیلمی شاعیرێکە جێگەی تایبەتی هەیە لە مێژووی ئەدەبدا چونکە خانەیێکی گرنگی پڕکردۆتەوە لەو بابەتە شیعرەی نموونەی لە ئەدەبی کوردیدا زۆر نییە. لێرەدا شیعری داشۆرینی تێکەڵ بەشیعری کراوەی بێ پەردە (ئیرۆتیکی) کردووە.

زمانی شیعری ئاسان و میللییانەیە، کێش و قافیەی خۆماڵییە. لە شیعری میللیی سەرزارەوە (فۆلکلۆرەوە) نزیکە. ئەم بابەتە شیعرە هیچ جۆرە تەنگوچەڵەمە و ناخۆشییێکی کۆمەڵایەتی دروست نەکردووە، چونکە داشۆرینە کە هەمووی پێوەندی بەو شاعیرانەوە بووە دۆست و هاوڕێی یەکتری بوون، لەبەرئەوە قازانجیان بووە نەک زیان، چونکە مێژووی ئەدەبیان دەوڵەمەند کردووە.

## بەشی یازدەم

# ئاری

**١٩١٠ - ١٩٦٨**

### ژیانی

نەجمەدین کوڕی مەلا ڕەسوولّی دێلێژە لە ساڵی ١٩١٠ لە سلێمانی لە دایک بووە. ناوی «ئاری» هەڵبژاردووە وەک نازناو و لە شیعریدا بەکاری هێناوە. بەناوی «ئاری» و «ن. ئاری» شیعر و نووسینی بڵاوکردۆتەوە. سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت بووە. لە پاشانا ڕووی کردۆتە قوتابخانەی سەرەتایی و شەش ساڵ خوێندنی لەوێ تەواو کردووە. لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا ژنی هێناوە و لە «کارگێڕی نەخۆشی ئاژەڵ و کشتوکاڵ» بەمووچەخۆر دامەزراوە، ماوەیێک لەم کارەیدا بووە لە ئاکرێ و لە چلەکاندا گەڕاوەتەوە سلێمانی و ئینجا گوێزراوەتەوە هەڵەبجە. لە ساڵی ١٩٤٦ لەگەڵ بووژانەوەی گیانی کوردایەتی بەهۆی دامەزرانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد ئاری یەکێک بوو لەوانەی لە کوردستانی عیراق دەسگیر کران. ماوەیێک لە گرتووخانەی سلێمانی مایەوە، ئینجا ڕەوانەی بەغدا کرا، لەگەڵ ئەوەی لە دادگا تاوانبار نەکرا، بەڵام بۆ باشووری عیراق دوورخرایەوە ماوەی سێ ساڵ بەدەسبەسەری لە شارانی حیللە و کەربەلا مایەوە.

لە دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان لە ساڵی ١٩٤٩ لە کەرکووک لە «کارگێڕی کشتوکاڵ» بوو بەمووچەخۆر و لەم کارەیدا مایەوە تا ساڵی ١٩٥٩ خانەنشین کرا. لە پاش چەند ساڵێک لە سلێمانی گەڕایەوە سەر ژیانی مووچەخۆری و لە «کارگێڕی ئیسکانی پارێزگای سلێمانی» دامەزرا. لەو ڕۆژگارەدا تووشی نەخۆشی دڵ بوو، ئازاری پێوە دەچەشت، ماوەی نەخۆشییەکە درێژ نەبوو، لە ڕۆژی ٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٨ لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد.

### شیعری

ئاری شیعری زۆر نییە، ئەوەی بڵاوکراوەتەوە بەشێکە لە بەرهەمی. لە ناو ئەمانەدا شیعری وای هەیە دەچنە ناو دیوانی هەڵبژاردەی شیعری کوردییەوە. شاعیرێکی خۆڕسک



و بەسەلیقە بوو، لە نێوەندێکی خێزانیدا ژیاوە باوک و هەندێ لە براکانی دەستی شیعریان هەبووە، لەوە گرنگتر ئارەزووی ناوەوەی دەروونی هانی داوە بۆ شیعر وتن لە پێشانا دڵداری وەک هەوێنی هەموو جۆرە شیعرێکی دیکە. لە تەمەنی لاویەتیدا دەستی بەشیعر وتن کردووە، لە کۆواری «گەلاوێژ» (١٩٣٩ - ١٩٤٩) شیعر و نووسینی بڵاوکردۆتەوە.

بەرهەمی شیعری ئاری لە ڕووی کێشەوە هەردوو بابەتی بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی تێیدا دەدۆزرێتەوە. لە بەحرەکانی عەرووز هەزەج و ڕەمەلی بەکارهێناوە، وەک پێویست لەسەر یەکێتیی قافیە بەڕێوە دەچن. لە کێشی سیلابی خۆماڵیدا بەزۆری شیعری لەسەر بابەتی دە بڕگەییە، وەستان لە ناوەڕاست دایە (٥ + ٥)، جگە لەوە کێشی هەشت بڕگەییش بەکار دێنێ، لە هەموو حاڵەتێکدا ئەم جۆرە شیعرەی بەجووت قافیە (مەسنەوی) (ا ا، ب ب، جـ جـ...) دەهۆنێتەوە. بەم پێیە ئاری بابەتی «شیعری نوێ»ی نییە، ئەو جۆرە شیعرەی لە لیریکێکدا زیاتر لە کێشێکی خۆماڵی و فرە قافیەیی تێدا بەکار دەهێنرێ.

ئاری یەکێکە لەو شاعیرانەی لە قاڵبی کۆنی شیعری کلاسیکی لە ڕووی ڕوخسارەوە ناوەڕۆکی پێویستی سەدەی بیستەم و سەردەمی ژیانی خۆی پاراستووە. سەرکەوتنی لەوەدایە بابەتی سەرەکی لە شیعریدا دڵداری و وەسفە، ئینجا مەبەسە نیشتمانی و کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی ڕەچاو کردووە، بەمە لیریکە کورتەکانی بوون بەنموونەی جوانی شیعری لیریکی سەردەم کە لە ناو هەموو میللەتاندا باوە. شاعیر لە شیعریدا ڕاستگۆ بووە، ئەوەی وتوویەتی لە دڵسۆزییەوە بووە و مەرایی تێدا نییە. پێنج خشتەکی لە سەردەمی ئەودا باو بووە، ئاری شیعری هەردی کردووە بەپێنج خشتەکی، فرمێسکی بۆ دوو کوڕی جوانەمەرگی خۆی بەشیعر ڕشتووە. سروودی بۆ نیشتمانی کورد و بیری کوردایەتی وتووە، لەسەر هەژار و زەحمەتکێش و پاڵە و جووتیاری کردۆتەوە. شیعری بووە بەمایەی هەست بزوێنی توێژێکی فراوانی ناو جەماوەر بەخوێندەوار و نیمچە خوێندەوار و نەخوێندەوارانەوە، زیاتر لەبەر ئاسانی و سووکی زمان و ڕوونی و ئاشکرایی مانا و وێنەی شیعری کە شاعیر لە بەرهەمیدا بەرجەستەیان دەکا. جگە لەمە و لەگەڵ ئەمەشدا ئاری هەندێ نموونەی شیعری دانایانە و ئامۆژگاری ژیرانەی ڕۆژهەڵاتییانەی هەیە.

## پەخشانی

بەرهەمی ئەدەبی ئاری دوو چیرۆک دەور دەکاتەوە، هەردووکیان پێوەندییان بەئازایی و قارەمانیەتی لاوی کوردەوە هەیە، سۆزی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی دەپژێنن لە مەبەستێکی سەرەکیدا کە دڵدارییە لە نێوان کچێکی جوان و کوڕێکی ئازا. بۆ ناسینی چیرۆکەکان ئەم دوو وتەیە پێویستە.

١- قارەمانی هەڵکەوتوو نەریمان یا دڵداری گوڵچین و نەریمان: نەریمان لاوێکی ئازا و ڕاوچییێکی بێ هاوتا و کوڕی کابرایێکی بۆرەپیاو و هەژاری ناوچەی مەریوانە. گوڵچینی جوان کچی بەگ و کاربەدەستی ئەو ناوچەیەیە. پاشای بابان لە قەلاچۆلان ناوبانگی ئازایەتی نەریمان دەبیستێ. داوا لە بەگی مەریوان دەکا بەمیوانی بۆی بنێرێتە قەلاچۆلان. پاشای بابان لەگەڵ نەریمان و دەستە و دایەرەی خۆی دەچن بۆ ڕاو، لە ڕاودا پاشا کە دەکەوێتە زۆرانبازی لەگەڵ یەکانەبێک، مەرگ لە پاشا نزیک دەبێتەوە، نەریمان بەئازایی خۆی ڕزگاری دەکا. لەو کاتەدا پاشا ئاواتەخواز بوو کچێکی بوایە و بیدایە نەریمان و بیکردایە بەکوڕی خۆی. بەڵام لە دواییدا کە دەزانێ نەریمان پەیمانی دڵدار و دلبەریەتی لەگەڵ گوڵچیندا هەیە، پاشای بابان ڕوو دەکاتە وولاتی بەگی مەریوان بۆ خوازبێنی گوڵچین بۆ نەریمان. بەگی مەریوان شایی و زەماوەندێکی گەورە دەگێڕێ بەهۆی میوانداری پاشای بابان و مارەکردنی گوڵچین و نەریمانەوە.

٢- شەڕی بابان و ڕۆم یا دڵداری نازەنین و بارام: نازەنین کچی پاشای بابان بووە لە قەلاچۆلان. نەریمان کوڕی سەرعەسکەری پاشا بووە. لە منداڵییەوە پێکەوە پەروەردە بوون و مامۆستا فێری خوێندن و نووسینی کردوون. هەر لە منداڵییەوە مەیلیان بۆ یەکتری بووە، کە گەورە بوون لە یەکترییان جیا کردوونەتەوە. پایتەخت قەلاچۆلان بووە و سلێمانی نەبووە، گوندی مڵکەندی لە جێی گەڕەکی ئێستای مڵکەندی بووە. شەڕێک لە نێوان لەشکری بابان و عوسمانی لە دەربەندی بازیان دەست پێ دەکا. ئێوارە لەشکری بابان خەریکی تێکشکان دەبێ، تاریکایی بەسەردا دێ و شەڕ دەوەستێ. شەو بەدزییەوە بارام پیلانێک دادەنێ لەگەڵ دووسێ جەنگاوەر دەکشێنە قەد شاخی دەروازەی بازیان و تۆپی عوسمانی داگیر دەکەن. بەهۆی داگیرکردنی تۆپی سوپایی لەشکری بابان سەردەکەوێ و دەگەڕێنەوە گوندی مڵکەندی کە لە دواییدا دەبێ بەشاری سلێمانی و دەیکەنە ئاهەنگی سەرکەوتن و شایی بەبووک بردنی نازەنین بۆ بارام.



ناوەڕۆکی ئەم دوو چیرۆکە لە یەکتری دەکەن، نزیکن لە ئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر). ئەگەر نووسەر ئیلهامی لە حیکایەتی بەرگوێی ئاگردان وەرنەگرتبێ، بەرهەمەکە خۆی بووە بەئەدەبێکی میللی، بەڵام بەزمانێکی پاراوی ڕۆشنبیرییانە نووسراوەتەوە، کەڵکی ئەوەی هەیە بکرێ بەدراما لەسەر شانۆدا.

## نموونەی شیعری

١

### وێژەی دڵدار

لە لیریکێکیدا ئاری دەڵێ:

وا تەوژم و تاڤگەیی فرمێسکی چاوم هاتە خوار
ماڵی سەبری ڕاڕفاند و حەقیەتی نەگرێ قەرار
نێو نیگاهێکی بەعیشوە سەبر و هۆشی لێ بریم
دین و ئیمانی لەگەڵدا برد و خۆی کردی فیرار
قازی و موفتی مەلا و دەروێش و شێخی قادری
سوننی و سالیک لە خەڵوە دێنە دەر وەک شێت و هار
دڵ ڕفێنە سەف شکێنە دلبەرەی قەد عەرعەرە
ماه جەبینە نازەنینە زۆر بە تەمکین و ویقار
سەرگەلی عێلاتی کوردە شۆخی ڕۆم و ئەرمەنە
ئافەتی جان و دڵە کاتێ لەسەردا دێتە خوار
(ئاری) دلبەر شاهیدە بۆ شیعرەکانت ناسکن
وەرگرە حەقت بەماچی خاڵی لێوی گوڵبەهار

شاعیر ئەم هەموو وەسفەی بۆ دلبەر مەبەسی ئەوەیە خۆی وەک شاعیرێکی گەورە بخاتە ڕوو. ئەو دلبەرەی کە پێیدا هەڵدەڵێ و جوانی گەیشتۆتە ڕادەیێک کەس لەسەر ڕووی زەوی نییە بۆی شێت نەبێ، ئاوڕ لە کەس ناداتەوە، لە شاعیریش ناداتەوە، بەڵام ئەوە هەیە شیعری ئاری بەلای ئەوەوە ناسکن، پاداشی ئەوە دەبێ ماچێک نەبێ لەو جوانەوە!.

٢

## دڵداری

له لیریکێکیدا دیسانەوە بە مەبەسی دڵداری بەدلبەر دەڵێ:

گیـانه! نووسـیـبـووت ئاواتت دووره
هەندێ بەزەیی مـن ڕەنگم سـووره
ئەزانی گیانه ڕەنـگ سووریەکەی من
هەر له بەیـانـی تـا کـاتـی نوستن
فرمـێسک ئەڕێژم له دوو دیدەی زار
بەتاڤگه و بەخوڕ وا دێ سەرەوخوار
بڕۆ سـەر دیجله و تـۆ سـەبرێ بگره
سـەلامی منـی تـۆ لـێ وەربگـره
هەر کاتێ که دیت دیجله هەستاوه
بەغـدا بەجـارێ وا خـرۆشـاوه
بزانه ئەوه فـرمـێـسکی منه
له دووریت ئازیز جـەرگم کـون کـونه
مـەرجی پەیمانم بەکـوڵ و بەدڵ
مـەرج بێ پەیمانم بەرم بۆ ژێر گڵ
ئەو مـەرجه کـەوا لـەگـەڵ تۆ بەستم
کـاتێ کـه دەستت نایه ناو دەستم
ئەو دڵه ئیـتـر بۆ کـەس لێ نادا
پەیمان نەشکێنه مـەرجی تێک نادا

لەم شیـعرەدا ئاری باس له دڵدارییێک دەکا بەشێوەییێک له دڵیدا چەسپاوه بەهیچ جۆرێ لێی نابێتـەوه، دیاره بۆ یەکێکه و هەر بۆ ئەو دەمێنێتـەوه. دیجله بووه بەڕەمز، بەڕاسـتی مـەسـەلەکـه تەنیـا ئەوه نییـه ئەم ڕووباره پیـرۆزه ئاوی زۆره بەڵکو ژیان و شارستانییەتی ڕەخساندووه بۆ کۆمەڵێکی زۆر له خەڵکی میزۆپۆتامیا (خاکی نێوان دوو ڕووبار)، له ناوجەرگەی خاکی کوردەواریدا هەڵدەقوڵێ، هەندێ له خاکی تورک تێپـەڕ دەکا، له دواییدا تێنوویەتی هەندێ عەرەب دەشکێنێ. ڕەنگه دلبەری ئاری له بەغدا بژی،



یا بەغـدا دەکـاته ڕەمـزی دووری و لەوێ دایدەنێ، بۆیه دیجله وەکـو تەتەرێک دەتوانێ سلاوی شاعیـر به دلبەر بگەیەنێ. ئەستووری هەست و نەستی شاعیـر ئەوەیه ڕێز له دڵداریی پیرۆز دەنێ و قەت فێڵی لێ ناکا.

٣

## خۆشەویستی وڵات

له بابەت خۆشەویستی خاکی کوردستانەوە ئاری دەڵێ:

له هـێـــــــلانـەی دڵا تـۆوی ڕواوه
ڕەگ و ڕیشـەی له گشت گیـانا بڵاوه
له قـووڵـی تۆی دەروون و نـاخی گیـانم
بەجـۆرێ بنج و بێـخی داکـوتاوه
کـەوا ئەو تۆی دەروون و نـاخی گیـانه
ئیـتـر جێگەی شـتی کەی تیـا نەماوه
ئەویش بەرزی سـەرئەفـرازی وولاته
کـه چەن هەوڵ و خـەباتی بۆ دراوه
له ڕێی ئازادییـا ئەم کـورده مـەرده
هـەزاران خـــــوێـنـی لاوانـی ڕژاوه
هەموو بەردێ بەخوێنی خۆی و دوژمن
چیا و دەشـتی ئەڵێی گوڵ گوڵ کراوه
بەهەر لادا ئەڕۆی جـــوانـێ ئەبینی
له هەر لایێک شـەهیـدێ نێـژراوه
هەزاران قـارەمـانانی گـەلی کـورد
بەنامـــەردی له ســـێـــداره دراوه
له ئاگـری داغ له زمناکـۆ له ئەزمـڕ
وەکـو تارا بەخوێن سـوور هەڵگەڕاوه
هەمـوو ناکـۆکـیـیـه وا تاکـو ئێـسـتـا
بەدیلی مـاوه مـافـیـشی خـوراوه

خودا! ناکۆکی ئەم هۆزە هەتاکەی
بەسە ئیتر هەتا ڕێی چارە ماوە
ئیتر (ئاری) لە ڕێگەی ئاو و خاکی
ئەبێ سەر دابنێی ڕێگەی نەماوە

ئاری وەکو چۆن لە دڵداریدا دڵسۆزە و ئەڤین یەکێکە نابی بەدوو، لە کوردایەتیشدا سوورە لەسەر ئەوەی لە ناودڵیدا جگە لە کوردستان هیچی دیکەی تێدا نییە. بە خودا ئەگەر ئەمەی لە ڕابیعەی عەدەویش وەرگرتبێ هەر جوانە! شاعیر بەنەرمی و لەسەرخۆ بەسەر ئازایەتی کورد هەڵدەڵێ، هەروەها باس لە چارەڕەشی دەکا و قەدپاڵی شاخ و بن داروبار و بەرد و دەوەن نابینی بەخوێنی کورد سواغ نەدرا بێ، بەڵام شاعیر کۆڵ نادا.

٤

**بۆ تەرزە**

لە لیریکێکیدا ئاری لە زیانی تەرزە دەدوێ:

تەرزەی دڵتەزێن لە هیچ نەکردوو
وەیشوومەی بەهار چرۆی دار بردوو
دوژمنی میوە چرۆ و گوڵ و دار
گێرشێوێنی سەیران و بەهار
هەر دانەییێکت ئەیدا لە گوڵێ
گەڵا ئەوەرێ و ئەشکێنێ چڵێ
خەزانی بەهار دوژمنی گوڵان
پیت و بەرەکەت بردوو بەتاڵان
خەلە و دەغڵ و دان هەموو ئەشکێنێ
یەک بەسەر یەکا دائەرزێنێ
کە هیچ باشیت تۆ تیا نەخولقاوە
نازانم سروشت تۆی بۆ داناوە!
لەگەڵ هەوادا کردووتە پەیمان
یەکتان گرتووە هەردوو لە ئاسمان



دڵۆپە ئاوێ ئەبێ بەباران
هۆی بووژانەوەی خەلە و دەغڵ و دان
بیکەن بەتەرزە تەرزەی دڵتەزێن
ڕەنجی هەژاران تێک و پێک شکێن
لە خوام داوایە نەتبینم بەچاو
هەر لە بەرزیدا بیتەوە بەئاو
ئیتر نەتبینم ببی بەتەرزە
لقی گوڵاڵە بێنیتە لەرزە

تەرزە و باران و بەفر وەکو دیاردەییێکی سروشت سەرچاوەی ئیلهامی شاعیرانن لە بابەتی وەسفدا بۆ جوانی. ئەم ڕووداوانە هەندێ جار زیانبەخش دەبن. ئاری لەم شیعرەیدا بەرهەمێکی نوێ لە ئەدەبی کوردیدا دروست دەکا، بەدەگمەن شیعر لە وەسفی مەتریالی و ڕووکەشی تەرزە وتراوە، ئەو وەسفە پەیکەرییەی ئاری بۆ تەرزە بەرهەمێکی نوێیە. شاعیر لە خودا دەخوازێ ئەو دڵۆپە ئاوەی ژێر هەور نەبێ بەکڵۆ چونکە چرۆ و گوڵ دەوەرێنێ، سەیرانی بەهار دەشێوێنێ، دەغڵ و دان دەشکێنێ. ئەم لیریکە لەو کاتەی جەوهەری جوانکاری جووڵەی تێدا دەکا، وەک شیعرێکی پەروەردەییش دەکەوێتە بەرچاو. سەرچاوەییێکە بۆ فێرکردن و پەروەردەی منداڵان.

٥

لە وەسفی کاسەسەرێک ئاری دەڵێ:

ڕۆژێ لە ڕۆژان دیم کاسەسەرێ
لە گۆڕێکی کۆن هاتبووە دەرێ
مووچڕکێکی سەخت لەشی داگرتم
بیرکردنەوە لەوێ ڕایگرتم
ئەم کاسەسەرە ڕۆژێ لە ڕۆژان
خاوەن بیر و هۆش لە چەرخ و دەوران
ئاخۆ چ لاوێ چ کچە جوانێ
یا پیر یا جەوان چەرخ و دەورانێ

ئەو مێشکەی لە ناو ئەو کاسەسەرە
پڕ هیوا ئاوات کام دەوروبەرە
ئەم خاکەی کەوا بەسەریا ئەڕۆین
دڵی کام جوانە و هی کام جێگە و شوێن
دوارۆژی ئێمەش بەڕاستی وایە
بۆ دڵ خۆش بکەین ئا بەم دنیایە

ئەم وەسفەی ئاری بۆ کاسەسەری مردوو بابەتێکی باوە و وێنەی لە بەرهەمی ئەدەبی گێتیدا هەیە. شاعیران لە ڕووی دانایی و فەلسەفییەوە تەماشای ئێسقانی کاسەسەریان کردووە. لەوانە ڕەنگە بابەتەکانی عومەر خەیام باشترین بەڵگە بن لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا. نرخی جوانکاری ئەم لیریکە لەوەدایە شاعیر ئەدەبی کوردی پێ ڕەنگین و دەوڵەمەند کردووە.

٦

**دەوران**

لە پارچەیێکیدا ئاری دەڵێ:

چاوی سەرسامی ئەگێڕم من لە دنیای بێ بەها
نەم دی کاتێ ڕوو نەچەرخێنێ لە پیاوی با وەفا
ڕووی لە نامەردە هەمیشە ڕاست بە ئاواتی ئەوان
چەرخی پشتی هەر لە مەردان ڕوو لە نامەردان ئەکا
جێیێ ئاوادارە کەچی پارچە زەمینێکی نییە
جێی زەوی و زار ماوە نابینن کە ئاو ڕووی تێبکا
وا مەزانە چەرخی تۆش هەر وا ئەمێنێ تا ئەبەد
باش بزانە چەرخی تۆش کاتێ ئەبینی تێک شکا
ڕۆژی مەردانیش لە پێشە و کاتی دێ
هەر بزانە ئابڕووی نامەرد تکا

لەم لیریکەدا شاعیر بەهەناسەی دانایی و ئامۆژگاری و پەندی ڕۆژهەڵاتییانە تەماشای هەڵسوکەوتی کۆمەڵ دەکا. ئەو کۆمەڵەی لەسەر بنج و بناوانی گیروگرفت و تەنگوچەڵەمە



دامەزراوە. جەنگێکی تیژ لە ئارادایە لە نێوان چاکە و خراپە، شاعیران بەزاراوەی مەردی و نامەردی دەری دەبڕن.

ئەم شیعرە زیاتر لە لێکدانەوەییێک هەڵدەگرێ، گومان لەوەدا نییە مەبەسی شاعیر ئەوەیە بڵێ خراپە، یا نامەردی هەمووی بەسەر چارەنووسی کورد شکاوەتەوە. جگە لەوە شاعیر لە ژیانی خۆیدا دوور نەبووە لە چەوساندنەوە لە ڕووی بیروباوەڕەوە، ئەمە ئەگەر لەگەڵ دەست کورتی و هەژاریش یەکی گرتبێتەوە و تووشی ڕەشبینی بووبێ، دیاردەییێکی کاتی بووە تا دوا هەناسەی کۆڵی نەداوە.

***

نەجمەدین ئاری شاعیرێک بوو دڵسۆز، زۆر ئاسایی و بەبێ زۆرکردن لە خۆی شیعری بۆ هاتووە. شیعری بۆ خۆی وتووە بۆ کەسی دیکەی نەوتووە، لەبەرئەوە لە دواییدا ئەو شیعرە بووە بەهی هەموو کەسێک. شیعری ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردەوارییە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا، شیعری ئاسایی بۆ ئەو سەردەمە وتووە لەسەر بەحری عەرووز و کێشی سیلابی خۆماڵی، یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی) بەکارهێناوە. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە بابەتە بنچینەییەکانی ڕۆژگاری خۆی نووسیوە. دڵداری و وەسفی سروشت و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و بیری دانایی مرۆڤایەتی لە شیعریدا دەدۆزرێنەوە.

# بەشی دوازدەم

## فانی

## ١٩١٠ – ١٩٧٣

### ژیانی

مەمەند کوڕی ڕەسووڵ ئاغا لە تیرەی میراودەلیی ناوچەی پشدەرە. لە ساڵی ١٩١٠ لە گوندی مەرگە لە دایک بووە. بەمەمەند ئاغای قایمەقام ناوبانگی دەرکردووە. ئەم ناوەی لە باوکیەوە بۆی ماوەتەوە لە کاتی خۆیدا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی دەسەڵاتی عوسمانی ماوەیێک قایمەقامی چەمچەماڵ بووە. خوێندنی بەرایی لە حوجرەی مزگەوت بردۆتە سەر، زۆری نەخوێندووە، ئەوەندە هەیە لە منداڵییەوە مەیلی لە خوێندن و نووسین بووە و بەبێ مامۆستا خۆی پێگەیاندووە. گوزەرانی لەسەر دەسکەوتی زەویوزار بووە و خۆی بەکشتوکاڵەوە خەریک کردووە و ماڵ و منداڵی پێ بەڕێوە بردووە. لە کاری میری و مووچەخۆری بەدوور بووە، تەنیا حەوت هەشت ساڵێک نەبێ لە ساڵی ١٩٥٧ەوە تا ساڵی ١٩٦٤ بەسەرۆکی شارەوانی مەرگە هەڵبژێرراوە. لەو کاتەی هەستی بەوە کردووە دەتوانێ شیعر بنووسی ناوی «فانی» هەڵبژاردووە وەک نازناو لە شیعریدا بەکاری هێناوە.

لە ساڵی ١٩٤١ لە مەرگە ڕێکخراوێکی دامەزراندووە بەناوی «قۆمیتە» واتە کۆمیتە بۆ ڕێکخستن و سەرپەرشتی هەندێ لە کاری کۆمەڵایەتی. ئەو کۆمەڵەیە نزیکەی شەش مانگێک لە ناوەوە بووە. چەند ئاغاییێکی نەخوێندەوار و کۆنەپەرست لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان بوون بەدژی و بەربەرەکانییان کرد، ئەمە بوو بەهۆی ڕووخانی ڕێکخراوەکە.

هەموو کردەوەی فانی کۆشش بوو بەقەڵەم لە دژی دواکەوتوویی کۆمەڵ. هێرشی دەبردە سەر ئاغا و سەرۆکە ناشایستەکانی کۆمەڵی کوردەواری. لە دژی کردەوەی خراپی دەرەبەگ و دەسەڵاتی دەوڵەتی عیراق و ئەمپریالیستی ئەوروپا بوو، ڕەشبین بوو بەرامبەر بەکردەوە ناهەموارەکانی شێخانی تەریقەت و مەلای شەریعەت. کردەوە نابەجێکانی دەسەڵاتی میری و ئاغایانی دەرەبەگی ڕیسوا دەکرد. لە ساڵی ١٩٤٢ بەهۆی جەنگی دووەمی



گێتییەوە دانەوێڵە بەتایبەتی جۆ بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرا وەک ئازووقە، زۆری لە لایەن ئاغایان و مووچەخۆرە گەورەکانەوە دەدزرا. فانی دزییەکەی ئاشکرا دەکرد. ناحەزانی فانی لە ناو ئاغایاندا زۆر بوون، خوێندەوار لە کۆمەڵی مەرگە کەم بوو، ئەوەی هەبوو لە ناو مەلا و شێخەکان فانییان خۆش نەدەویست. تەنیا مەلا حەسەنێکی مەرگەیی هەبوو لە هاوڕێ نزیکەکانی بوو، یەکێک بوو لەو ڕۆشنبیرە دەگمەنانەی بیروڕایان لەگەڵ فانی یەکترییان گرتبووەوە. شاعیر شێخ مەحموودی خۆش ویستووە، بەتایبەتی لە کاتی تەنگانەدا بەشیعر بەسەری کردۆتەوە. بۆ لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرە کوردەکە ماتەمنامەی نووسیوە. لە ڕۆژی ٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣ لە گوندی مەرگە کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

فانی لە هەردوو بابەتە شیعری بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی وتووە. لە شیعرە عەرووزییەکانیدا ئەم بەحرانەی بەکارهێناوە: ڕەمەل، هەزەج، موزاریع، بەسیت، سەریع. دەوروبەری بیست پارچە شیعری لەم بابەتەی هەیە. بەپێی کەمی ئەم جۆرە شیعرەی ئەو دەنگانەی بۆ قافیە بەکاری هێناون زۆر نین: ا ت د ر س ش ق ک ل م ن و وو (ـە – ە) ی ێ. وەک لەم دەنگانە دەردەکەوێ شاعیر تیپە تایبەتییەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی بەکار نەهێناوە تەنیا «ێ» نەبێ. بەپێی کەمی ئەم بابەتە شیعرەی پاش قافیەی زۆرە. ئەم وشانە بەرچاو دەکەون: نیم، چی بوو، دڵ، نییە، کە (بکە)، نیفاق، تۆن (هی تۆن)، تۆ، دەکەی، دەکەن، دەکا، من، نیشتمان، گرت، گەلاوێژ، ئاشتی، لێ نییە، ئەدەن، با نەبێ، ئیشتیراکی، دەڵێم بیڵێم و ناوێرم، تۆبە، ئۆف، دەکەی، کوا، تەلا.

لە شیعری خۆماڵیدا نموونەی هەموو کێشە خۆماڵییەکانی هەیە و قافیەیان مەسنەوییە. دیاردەی هەرە گرنگ لە شیعری فانیدا ئەوەیە قەسیدە بەندی پێنجین (ا ا ا ا ب) و بەندی شەشینی (ا ا ا ا ا ب) زۆرە ژمارەی بەندەکانیان لە هەندێ شیعردا دەگاتە ٣٥ بەند واتە دەوروبەری ٢٣٠ نیوە دێڕ شیعر.

یەکێ لە خاسیەتە گرنگەکانی شیعری فانی ئەوەیە بەژمارەی دێڕی شیعر درێژن،

لەبەرئەوە دەکرێ عەرووزییەکان بەقەسیدە و خۆماڵییەکان بەبەیت بژمێررێن. لە رووی زمانەوە سادەیە، لە شیعری میللیی سەرزارەوە نزیکە. بایەخی زۆری بەڕەوانبێژی نەداوە.

فانی کۆمەڵێک چیرۆکی میللیی سەرزاری کردووە بەشیعر، لە شێوەی بەیتی میللیی فۆلکلۆری و پۆێمی ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپا خۆیان دەنوێنن. هەندێکیان بەم ناوانەن: کەر لە پێستی شێردا، بزن فرۆش، گفتوگۆی پاشای کوللە و پاشای ماران، هەرای پیاوی پیر و کچی جوان.

## شیعری لە رووی ناوەرۆکەوە

شیعری فانی لە بابەت مەبەسەکانی شیعرەوە فراوانە، لە هەموو چەشنەکانی هەیە. ناوەرۆکی تازەی لە گیروگرفتەکانی ناو کۆمەڵی هێناوەتە ناو شیعرەوە. هەندێ جار مەسەلەکانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، لە شیعرێکدا باس لە چەند مەسەلەیێک دەکا. لە هەموو ئەو بابەتانەی نووسیویەتی نەترس بووە. لەسەر ئەو باوەڕە هەرچی لە کۆمەڵی ئادەمزاددا رووددا پێویستە بچێتە ناو شیعرەوە. نووسەر بەبێ سڵەمینەوە پێویستە هەموو رووداوێک بکا بەسەرچاوە، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە رەوشت و نەریتی دواکەوتوو. ئەدگاری ئەم جۆرە بۆچوونانە ئاشکرایە لە بەرهەمی فانی، بۆیە بووە بەئاوێنەی راستەقینە، کەموکووڕی کۆمەڵایەتی رەنگیان تیایدا داوەتەوە. لە شیعرە دڵدارییەکانیدا لە مەرجەکانی قوتابخانەی نالی نەچۆتە دەرەوە، لەگەڵ ئەمەشدا مۆری سەدەی بیستەمیان پێوەیە هیچ نەبێ لە رووی وشەی فەرهەنگی زمانی ستانداردی تازە و لێکسیکۆنی شاعیرانی دیکەی هاوچەرخی فانی.

## نموونەی شیعری فانی

### وەسف و دڵداری

١

لە پارچەیێکیدا فانی روو دەکاتە دلبەر و دەڵێ:

دادی عاشق نادەی و تەعلیمی بێ دادی دەکەی
هەر بەناشادی و بەناڵەی عاشقان شادی دەکەی
کەی ئەبێ بۆ من مویەسسەر دەست لە گەردەن کردنت
وەک غەزالی گەرمیانی رەم لە ئابادی دەکەی



یا لە ناو زیندانی دووری بەس بناڵێنم بەسە
نازەنینێکی وەکو تۆ حەیفە جەللادی دەکەی
سەلبی ئازادی منی دڵ خەستە تاکەی گیانەکەم
تۆ لە قەرنی بیستەمای و حەز بەئازادی دەکەی
یاری شیرینت لەگەڵ تۆ (فانی)یا رەحمی نییە
گەرچی عیشقت بەرزە ئێستا کاری فەرهادی دەکەی

لەم شیعرەدا ئەگەر رستەی «قەرنی بیستەم»ی لێ لاببرێ، شیعرێکە لە ناو دیوانی شیعری کوردی سەدەی نۆزدەمدا نەبێ لە جێییێکی دیکە نادۆزرێتەوە. ئەم جۆرە شیعرە بەڵگەی هێزی شاعیرییەتی فانی دەخاتە روو، ناوەرۆکی شیعری کلاسیکی بەوتەی نوێ رەنگرێژی کردووە.

٢

لە شیعرێکیدا فانی وەسفی خەت و خاڵ و وردە ئەندامەکانی دلبەر دەکا:

برۆ قەیتانی لێو مەرجانی مەم فنجانی پەرچەم رەش
لە ماچی لێوی شیرینت دەبێ لێوم نەکەی بێبەش
لە گێتی خۆشترین کاتی ژیانم کامە ئەو کاتە
کە وەک خەرمانی گوڵ دێی و بەخۆشی دێیە ناو باوەش
چ خۆشە روومەتی ئاڵت کە وەختێ ئارەق دەمێنێ
دەڵێی وا شەونمە و دەتکێ لەسەر دوو بەلکی لالەی گەش
هەتا ئەو چاوە مەستانەت بە ناز و عیشوە هەڵدێنی
نە تاب و تاقەتم دێڵی نە سەبری دڵ نە هێزی لەش
مەحاڵی عەقڵە پەیدا بێ بە وێنەی تۆ پەری پەیکەر
لە کۆدا یا لە ئاکۆدا لە گاگەش یا لە ناو مامەش
کچۆڵەی هیند و کشمیر و فەرەنسە و میسر و رۆم و چین
خەجاڵەت بار و حەیرانن بەرابەر حوسنی تۆ هەر شەش
لە بەینی زولف و روو چاوت کرا بەش بەش حەواسی من
وەکو خاکی گەلی کوردی کە زاڵم کردیان بەش بەش

وەرە دەستم لە ئەستۆ کە بەکوێری چاوی بەدخواهان
نەیاری بێ هونەر با هەر بگرمێنێ وەکو بارەش
لە دەستەی عیشقبازانا نییە باوەڕ کە پەیدا بێ
دڵێکی وەک دڵی (فانی) بەیادی عیشقی تۆ بێ غەش

لەم شیعرەدا فانی خەریکی بەراوردە لە نێوان ئەندامە وردەکانی دلبەر و دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سروشتی بەهار. لە لایێکی دیکەوە پەیکەری ئەو خۆشەویستە بەراوورد دەکا لەگەڵ کچانی ناو عەشرەتە جیاوازەکانی کورد وەکو ئاکۆ و گاگەش و مامەش. ناوی «کۆ» دەبا، مەبەسی شاری کۆییێیە. تەنیا بەوە ناوەستێ بەڵکو لە ناو کچۆڵەکانی هیندستان و کشمیر و فرەنسا و میسر و ڕۆم و چینیش دەگەڕێ، لە ناو ئەم هەموو جوانانە نیگارینێکی وەکو دلبەرە کوردەکەی خۆی نادۆزێتەوە.

٣

فانی دیالۆجێکی دلّداری بەشیعر هۆنیوەتەوە لە نێوان «مەم و زین»دا:

مەم: ئەی زین ئەی خۆشی و ئارامی گیانم
پڕشنگی ڕووی تۆ جەرگی سووتانم
زین: ئەی مەم ئەی هیوای ڕۆژانی ژینم
پێشکەش بە تۆ بێ ڕووی نازەنینم
مەم: ئەی زین پێم خۆشە گەردن بەندت بم
میوانی سینەی دڵ پەسەندت بم
زین: ئەی مەم پێم خۆشە فیشەکدانت بم
لە چیا بەرزەکان لەسەر شانت بم
مەم: ئەی زین پێم خۆشە گوێ گوارەی گوێت بم
تا تێر لە ماچی گەردنی بەهێت بم
زین: ئەی مەم پێم خۆشە کۆتری ماڵت بم
لە یار دەربچم بە حەڵاڵت بم

لەسەر شێوەی ئەدەبی میللی فانی دیالۆجێکی لە نێوان دلّدار و دلبەر، مەم و زین بەشیعر داناوە. ئەم بەرهەمە لە شیعری میللییەوە نزیکە، بەتایبەتی لە ڕووی ڕوخسارەوە بەڵام شاعیر دلّدارییەکەی لە گێتیی درامای ڕۆمانتیکی و سۆفیزم دەرهێناوە و



خستوویەتییە قالّبی دلّداریی زەمینییەوە. لە دوا دێڕی شیعرەکەدا زین ئاواتەخوازی ئەوەیە ئەنجامی ئەو دلّدارییە بگاتە ئەوەی ببێ بەخێزانی، مەم هان دەدا بچێ بۆ خوازبێنی. ئەم تابلۆیەی فانی وێنەییێکی گەشبینییە لە تراجیدیای مەمی ئالانی میللی و مەم و زینی ئەحمەدی خانی دروستی کردووە.

٤

لە لیریکێکیدا فانی بەناوی «دەردی عیشق»ەوە دەڵێ:

شەو خەوم نایە لەبەر خێڵی خەیاڵی خاڵی تۆ
تا سەحەر مەستم بەیادی جووتە لیمۆی کاڵی تۆ
ئەی پەری ڕوخساری کەو ڕەفتاری جادووکاری من
ئاوی لێ دەتکێ دەمم بۆ ماچی لێوی ئاڵی تۆ
ئاسکی وەحشی بە لەنجە و گوڵ بە ڕەنگ و بۆنەوە
هیچیان بۆ دڵ فڕێنی نابنە هاواڵی تۆ
نەک ووجوودی ناسکت بڕنێ حەریری ئەورووپا
لازمە بکرێ لە پەلکی غونچە گوڵ شەرواڵی تۆ
کێیە بتوانێ لە ڕووتا ڕووبەڕوو بێکەس نییە
وەک هیمالا بەرزە پایەی جوانی و ئیقبالی تۆ
چی بکەم بێ تۆ ژیانم ژانە ئارامم نییە
وای چ خۆشە ببمە کۆتر بێمە تاقی ماڵی تۆ
گەرچی هەر موویێکی زولفت سەد دڵی بەستۆتەوە
کەس نییە وەک من لە ڕیزی عاشقان عەوداڵی تۆ
شەو نییە نەتکێ لە دیدەم تا بەیانی خوێنی دڵ
غەرقە سەرتاپا لە خوێنا عاشقی بێ حاڵی تۆ
موشتەریم بۆ گیانی شیرین گەر عەدوو ڕێگەم بدا
شەو بەتەنیایی سەعات و نیوێ بێمە پاڵی تۆ
(فانی)ا تەعریفی جوانی و جەوری دلبەر ناکرێ
بەو دڵەی پڕ دەردی دووری و بەو زمانەی لاڵی تۆ

لەم شیعرە ڕەنگینەدا فانی لەگەڵ دلبەر گفتوگۆ دەکا. بۆ بەهێزکردنی لایەنی ڕەوانبێژی شیعرەکە وشەی «تۆ»ی کردووە بەپاش قافیە. شیعرێکی دڵداری ئاسایییە. لە ڕووی زمانەوە ئەگەر نوێگەری هەبێ لەوانەیە وشەی هیمالایا سەرنج ڕاکێش بێ وەک ڕەمزێکی بڵندی شاعیر بۆ بەرزی باڵای دلبەر بەکاری هێناوە. ئاوڕدانەوەییێکی جوانی دیکەی شاعیر لەوەدایە کە دەڵێ لەشی دلبەر ئەوەندە ناسکە پێویستە دەرپێی لە بەرگی گوڵ بێ، ئەگەر لە قوماشی قەنەوزی ئاوریشەمینی ئەورووپاش بدوورێ هێشتا زبرە بۆ ئەو لەشە ناسکە.

٥

فانی لە وەسفی خەجیجەی دۆستیدا دەڵێ:

خەجیجەی خۆشەویستم هاتە کانی
بەسەر ئاوا تکا تک تک جوانی
لە تاو یاقووتی لێوانی دەناڵم
هەموو ڕۆژ و هەموو شەو تا بەیانی
دەڵێن فەرموویە پێویستە لەسەر ئەو
کە ئاشکرا نەکا دەردی نیهانی
ئەرێ چۆن چۆن بەڕاشکاوی نەناڵم
دڵێکم بوو بەدڵ سەختی شکانی
نییە سەروێ لە ناو باغی جیهانا
وەکو باڵای نەمامی بۆ ڕەوانی
شەمامەی تازە خڕ بووی باغی سینەی
ئەبەد ناداتە دەستی عاشقانی
بەئەستووری دوو سمتی بێ نەزیرە
بەباریکی وەکو موویە میانی
برا وەی وەی لەگەڵ عاشق چ خۆشە
شەوی پاییز بەتەنیا ڕاکشانی
لە ناو چاوانی مەستی خوێن دەرێژێ
بە غەمناکی دوو چاوەی چاوی (فانی)



شاعیر لە خەجیجە یا خەجێی بووکی جوانی ئەدەبی میللی دلبەرێک دروست دەکا. پەریزادێکی زەمینییە، ئارامی گیان و دڵە، بەهەناسەییێکی دڵدارییی نێرینە و مێیینەی ناو نوێن وەسفی ئەندامی لەشی دەکا. مەمکی تازە خڕ بوو، ئەستووری دوو پۆپەی سمتی، ناوقەد باریکی وەک موو. فانی هیوای ئەوەیە لە شەوی پاییزدا لەگەڵ خەجێدا ڕابکشێ و خەریکی ماچ و مووچ بێ، چونکە شەوی پاییز درێژترین شەوانی ساڵە.

**ئامۆژگاری بۆ لاوانی نیشتمان**

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «پەندێک بۆ لاوان» لە ساڵی ١٩٥١ نووسیویەتییەوە دەڵێ:

لاوانی وەتەنپەروەری زانا لە خەوی خۆش
هەستن کە نەما هەزەلییات و قسەی بۆش
ئەم عەسرەیە عەسرێکە کە لافاوی سیاسەت
بۆ فەوتی نەزانان لە هەموو لاوە ئەدا جۆش
ڕێکیخە لە زانست و عەمەل کەشتیی و پاپۆڕ
خۆ دەربەرە لەم گێژە وەکو عالەمی تر تۆش
ڕێی شاری زەکا بگرە لە ڕێکی مەکە سستی
ئیقبال و زەفەر ئەو دەمەیە هاودەم و هاودۆش
لاوێکی شوان زادەیی هوشیار و بەغیرەت
قوربانی ئەکەم سەد بەگ و ئاغالەری بێهۆش
جاهیل بەقسەی دوژمنی خوێنخۆرە تەراشی
زەینی بەغەڵەت ڕۆیشتووە بەو شتە بلێن تۆش
بۆ چاکە نییە چاکەیی بێگانە خەڵاتی
دووپشکە لە ناو باغەڵ و حەزیایە لەسەر کۆش
بووکی ئەمەلی (فانی) لەبەر جەوری نەزانان
وەک باڵی قەل و تالیعی کوردانە سپاپۆش

لەم شیعرەدا فانی ڕوو دەکاتە لاوان و دەکەوێتە ئامۆژگارییان، داوایان لێ دەکا خەریکی سیاسەت بن لە پێناوی چاک کردنی باری ژیانی کۆمەڵ. بەلای ئەوەوە

دواکەوتوویی لە سستی دایە، کۆمەڵ بەکۆشش و ڕەنج و تەقەلا پێش دەکەوێ، ئەو کۆششە ئەگەر لە کوڕە شوانێک ببینێ سەد کوڕە بەگ و ئاغای بەقوربان دەکا.

٢

لە لیریکێکیدا بەناوی «ڕۆڵەی نەبەز» لاوان هان دەدا ئاگاداری کردەوەی دوژمنان بن بەرامبەر بەنەتەوە:

ڕۆڵەی نەبەزی کورد و پڵنگی ڕەوەزی کورد
ڕۆژانی هەرا هەر وەکو پۆڵایە جگەریان
ئەو ڕێوی ڕەوشتانە کەوا دوژمنی کوردن
وا دەردەکەوێ هەر نییە لەو هۆزە خەبەریان
ئەو شێر و پڵنگانە لە ناو لانە خزاون
بۆ کەس نییە هەرگیز نە زیان و نە زەرەریان
دوژمن لە خەوی غەفڵەتیان ڕائەپەڕێنێ
هەڵدێ بەغەزەب دیدەیی پڕ کینەیی شەڕیان
دەڕژێنە سەر و پۆپی نەیارانی دڕندە
خاکی هەموو عالەم دەکەن ئەو ساتە بەسەریان
ئەم خاکی گەلی کوردە کەوا بەش بەشە ئەمڕۆ
وەک دۆزەخی لێ دێت و دەگۆڕێ بەسەقەریان
هەق دێتەوە دەس خاوەنی هەق عاقیبەتی کار
ئەڕوا بەسەمادا عەلەمی فەتح و زەفەریان

لەم شیعرەدا فانی داوا لە لاوی کورد دەکا لە ناو سەنگەر دابنیشن و خۆیان لە مارغە بنێن بۆ ئەوەی چاویان لە هەموو خراپەیێکی دوژمن بێ تا لە کاتی خۆیدا بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن و پیلانی دوژمن لە دژیان پووچ بکەنەوە، چونکە ئەو دوژمنە بوو بەهۆی لەت کردنی خاک و ئەنجام لەباتی کوردستانێک بوو بەچەند کوردستان. لاوان هان دەدا ئەو ولاتە بکەن بەدۆزەخ و دوژمنی لێ دوور بخەنەوە، لەو کاتەدا ڕۆژی سەرکەوتنی ڕاستەقینەی کورد هەڵدێ.



## دژی دواکەوتوویی و چەوسانەوە

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «دەرەبەگی و نەزانی» فانی دەڵێ:

هەتا چەرخی مشەعبەد بوو جەفا لانی نەزانی گرت
غوباری وەحشەت ئەنگێزی خەفەت ڕووی ئاسمانی گرت
بەڕۆژ جەوری نەزان و شەو جەفای دز هەروەکو ئاگر
بڵێسەی ناحیەی ژینی تەواوی کوردەکانی گرت
نیفاق و دوودڵی و حیرسی نەزان ئەمڕۆ بەیەکجاری
وولاتی کردە کاولگە و هەموو ڕێگەی ژیانی گرت
تەماشا جاهیلی بێ فەڕ بەمەحزی قەولی بێگانە
لە بۆ کێشانی باری زل جل و جۆری کەرانی گرت
بڕۆ بخوێنە بێ خوێندن دەبیتە مایەیی پەستی
ئەگەر قەومێکی بێ مەعنا هەموو قوڕنەی جیهانی گرت
لە فەیزی عیلم و ڕێکی بوو کە هێزی سووری ئەستالین
وەکو شێری ژیان هەستا هەناسەی ئالمانی گرت
خەریکی گرتنی قوتبی شیمالین ئەجنەبی ئاغا
ئەتۆش لات شێرە ئەو خوبزەی بەزۆر گیسکی شوانی گرت
خودا (فانی) بژی تاکو زەمانێ دێ بەئاشکرا
ئەڵێن کوردیش بەزانایی ڕەوشتی میللەتانی گرت

شاعیر لەو هۆیە سەرەکییانە دەدوێ کە کوردیان دواخستووە، لەوانە: نەزانین، دزی، دووڕوویی، پێویستە ئەم ڕەوشتانە لە ناو ببرێن، ئەمە بەخوێندن و خوێندەواری نەبێ چار ناکرێ، ئەمەی هەبێ دەتوانێ سەربکەوێ. بەڵگەی شاعیر ئەوەیە ئەگەر زانستی نەبوایە لە جەنگی دووەمی گێتیی سەدەی بیستەم ستالین نەیدەتوانی ئەڵمان برووخێنێ. بەڵگە و وێنەیێکی جوانی دیکەی شاعیر ئەوەیە بێگانە خەریکە قوتبی باکوور دەدۆزێتەوە، کەچی خوبزەی ئاغای کورد ئەگەر گیسکی شوان بگرێ، واتە بۆی داگیر بکا، ئەو کابرایە کاری شێرانەی کردووە.

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «داد و دەردی کۆمەڵ»ەوە فانی دەڵێ:

هێرشی هێنا خەفەت بۆ سەر دڵی داماوی من
دێتە دەر فرمێسکی ناشادی لە گۆشەی چاوی من
هەروەکو ڕۆژووگرم کردوومە تەرکی نان و ئاو
دەرد و غوسسە و ڕەنجی بێ پایانە نان و ئاوی من
نەقدی خۆش بەختی ژیانم کەوتە ئاگردانی غەم
هەقیەتی وەک نەی بسووتێ جەرگی هەڵقرچاوی من
داستانی میحنەتم ببیەن ئەگەر لاوانی ژیر
یەک بەیەک سەریان دەشێوێ بۆ سەری شێواوی من
هەروەکو ڕیشی درێژی جاهیلی تەقوا فرۆش
گرژ و ناشیرینە ئەمڕۆ بەختی ئاڵۆزاوی من
هاشە هاشی بای جەفا ئەیخاتە ناو ئامێزی خاک
غونچەیی ڕەنگینی هیوای گوڵشەنی پاراوی من
زاڵمی بێگانە پەروەر بۆتە پیشە و عادەتی
کوشتنی لاوانی ژیر و قەومی لێ قەوماوی من
ڕەجعیا! پێت وا نەبێ ئەم ناڵە تەئسیری نەبێ
ئەو زەمانەش دێ وەکو کەو تۆش بکەویە داوی من
خۆشەویستی نیشتمانە و بەس لە گێتی سووچی کورد
هەر لەبەر ئەم مووچە ئەچنە ژێر قەنارە لاوی من

شاعیر لە سەرەتای ئەم شیعرەدا باس لە ئاژاوەی ناو دەروونی خۆی دەکا، فرمێسک و غەم و پەژارە ناخی دڵیان تەنیوە، وێنەی شیعری جوان دادەهێنێ لەو کاتەی بەختی ئاڵۆزی بەڕیشی ئەو جاهیلە دەچوێنێ کە خۆی بەئیماندار و خاوەن بیروباوەڕ دەزانێ، ئەوجا باس لە دەستدرێژی دەسەڵات و کاربەدەستان دەکا، لە دواییدا دەڵێ: ئەی ڕجعی پێت وا نەبێ ناڵەی من بێ سوودە، ڕۆژێ لە ڕۆژان تۆ دەبەزی و من بەسەرتا زاڵ دەبم. وشەی «ڕجعی» لەو سەردەمەدا بەمانای کۆنەپەرست و ئەو کەسانەی لایەنی دەسەڵات بوون بەکار دەهێنرا.





لە شیعرێکیدا بەناوی «داخی نەزانی و قەبیلایەتی» دەڵێ:

ڕێکیی و زانین و کار ئاساری بەرزی کۆمەڵە
ئەی خودا لەم سێ شتانە ئێمە بۆ وا بێبەشین
موکریی و پیران و مامەش سوێسنی و ئاکۆ و ڕەمەک
تەن بەتەن کوردین لەگەڵ یەک دوژمنی دڵ پڕ غەشین
کەوتە ژێر هەوری نەزانی ڕۆژی زانین ئەی درێغ
بۆیە گەورە و گچکە سەرگەردانی ڕۆژانی ڕەشین
بۆ نەمانی یەکتری ئامادەین شەش سەد هەزار
بۆ شەڕی بێگانە چ بلێم چەندە زۆرین هەر شەشین
ئەم قەبیلایەتیە تێکی دا بناغەی کوردییەت
یەک دەبێژێ سوێسنیم و یەک دەبێژێ مامەشین
لەم ڕەفیقانە ئەگەر یەکیان نەهێڵن دوژمنان
جەژنی شادیمانە یەک یەک وەک درەختی بێ گەشین
وا لە سایەی تەربییەت بێگانە چوون بۆ ئاسمان
ئێمە ئێستەش بێ خەبەر وەک کۆرپە ساوای باوەشین
وا لە بەینی عوعوتادا لەبەر زۆری نیفاق
ئێستە سەرگەردان و بێ دەرمان و دابەش دابەشین

لەم شیعرەدا فانی هەندێ لایەنی نەریتی عەشرەتگەری دەخاتە ڕوو. ئەم ڕەوشتە بەدرێژایی مێژوو هۆیێکی گرنگ بووە لە دواکەوتنی میللەتی کورد. بۆ بەڵگە شاعیر ناوی هەندێ عەشرەتی کورد دەبا وەکو موکری و پیران و مامەش و سوێسنی و ئاکۆ و ڕەمەک، ئەمانە هەریەکێ خۆی بەشت بزانێ و دان بەئەوی دیکە نەنێ، مانای ئەوەیە میللەتێک نییە ناوی کورد بێ. یا وەکو شاعیر دەڵێ ئەمە بناغەی کوردایەتی (ئەو بەکوردییەت ناوی دەبا) دەڕووخێنێ. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی سەرگەردان و بەشکراو بمێنێتەوە.

## دەڵێم بیلێم و ناوێرم

«دەڵێم بیلێم و ناوێرم» ناوی پۆیێمێک یا مەلحەمەییێکە کە زیاتر لە ١٦٠ دێڕە شیعر پێکهاتووە، فانی لە ساڵی ١٩٣١ هۆنیویەتییەوە و لە سەردەمی خۆیدا دەنگی داوەتەوە. لەم ماوەیەدا گوڵبژێرێکی لێ بڵاو دەکرێتەوە:

قسێکم دێتە سەرزاری
دەڵێم بیلێم و ناوێرم
لە باسی کورد و کرداری
دەڵێم بیلێم و ناوێرم
دز و جەردە و ڕیاکارن
نەزان و گێژ و بێعارن
لەگەڵ یەکتر ئەڵێی مارن
دەڵێم بیلێم و ناوێرم

لەم دێڕانەدا شاعیر هەرچی ڕەوشتی دواکەوتوو و خراپ هەیە لە کۆمەڵدا کۆی دەکاتەوە، بەتایبەتی دووڕوویی، بۆ ئەوەی بڵێ:

مەلا کەستانە گەر ئێستا
نەبایە بێ پلاو و چای
هەموو خەڵکی ئەچوو بۆ لای
دەڵێم بیلێم و ناوێرم
بەڵام ئێستاکە بێ چاوە
پلاو و چاشی فەوتاوە
کەسێ ناڵێ چ قەوماوە
دەڵێم بیلێم و ناوێرم
مەلاکەستانە نازانی
ئەحیببا گەر نەبێ گیانی
نەمانی چاکە نە مانی
دەڵێم بیلێم و ناوێرم



مەلا کەستانە مەلایێک بووە لە مەرگە ناوی مەلا ئەحمەد بووە. لە سەرەتادا دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوو بووە. خەڵکی لە دەوریدا کۆبوونەتەوە. لە کاتێکدا لە دەوڵەمەندی کەوتووە کەس لە دەوری نەماوەتەوە. ئەمەیە دووڕوویی خەڵکی. ئینجا فانی دەست دەکا بەباسکردنی کەموکووڕی ناو کۆمەڵ:

گەلی کوردیش دەواب ئاسا
لە ژێر باری جەفا تاسا
سەری دانا ئەوەی ڕاسا
دەڵێم بیلێم و ناوێرم
لەبەر جەهلی سەرۆک و گەل
کرا پێی ئەسپی هیوا شەل
نەما فەرقی گەل و مێگەل
دەڵێم بیلێم و ناوێرم
ئەوانەی عەشرەتی جافن
ترێ خۆر و قەوی لافن
دەڵێی عفریتی پاش قافن
دەڵێم بیلێم و ناوێرم

بەلای شاعیرەوە کورد سەری لێ شێواوە چونکە سەرۆکە نەخوێندەوار و بێهۆشەکانی هیچ جیاوازییێک لە نێوان خەڵکی ناو گەل و مێگەلی مەڕ ناکەن. ئینجا وەک بەڵگەییێک هێرش دەباتە سەر عەشرەتی جاف و مەبەسی هەموو عەشرەتەکانی دیکەیە نەوەکو تەنیا جاف.

ئینجا شاعیر دەکەوێتە ئامۆژگاری و ڕوو دەکاتە لاوی کورد:

بەسە ئەی لاوی کوردی بەس
مەکێشە باری هەر ناکەس
بەرە بۆ شیری زانین دەس
دەڵێم بیلێم و ناوێرم
بەشیری عەزم و عیرفانت
کە چوویە ڕەزمی خەسمانت

هەموو ئەشکێن لە مەیدانت
دەڵێم بیڵێم و ناوێرم

دەرمانی دەردی کورد لای شاعیر و هەموو کەسێک زانیاری و زانستییە ڕێگەی پێشکەوتن ڕووناک دەکاتەوە، مێشک دەبووژێنێتەوە، بۆ ئەوەی بیر لە چاکە بکاتەوە و واقیعییانە تەماشای ژیان بکا.

فانی بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

مەکەن چیدی ڕیاکاری
فڕێ دەن شێوەیی ماری
بکەن تەرکی بەدی و خواری
دەڵێم بیڵێم و ناوێرم
ئەتۆش (فانی) هەتا ماوی
خودا نوتقێکی پێ داوی
لە چاکەی گەل نەکەی خاوی
دەڵێم بیڵێم و ناوێرم

نویشکی بیروڕای شاعیر ئەوەیە پێویستە خەڵکی لە ڕیایی دوور بکەونەوە، ئەو کارە بکەن کە چاکەی زۆربەی خەڵکی تێدایە. دووبارەکردنەوەی نیوە دێڕی «دەڵێم بیڵێم و ناوێرم» ئاسۆییێکی ڕیتمی بۆ گوێی خوێنەر ساز کردووە مانا نزیک دەکاتەوە لە مێشک.

## کۆمیتەی ساڵی ١٩٤١ لە مەرگە

لە سەردەمی جەنگی دووەمی گیتی لە ساڵی ١٩٤١ ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی بەسەرپەرشتی باپیر ئاغای نوورەدین بەناوی «قۆمیتە» (کۆمیتە) لە مەرگە دروست دەکرێ، بەمەبەسی ڕێکخستنی کاروباری ناوچەکە بەڕێکوپێکی و یەکسانی. فانی پشتگیری ڕێکخراوەکەی کرد و بوو بەئەندام تێیدا. کۆمیتە زۆر بری نەکرد لە دوای شەش مانگ هەندێ ئاغای نەخوێندەوار لە بەرژەوەندییان نەبوو کۆمیتە بمێنێ، ڕێکخراوەکەیان تێکدا.

فانی بەشیعر پێشوازی لە کۆمیتە کردووە:

ئەم دلێرانە وەفاپەروەر بەسەر پەنجەی شەرەف
سیلسیلەی سەد لای ناکۆکی و خەتا یەکلا دەکەن



یەعنی هەروەک میللەتان یەکجارە گیانی یەکێتی
مەرتەبەی ئەدنایی ئێستەی دەم بەدەم ئیعلا دەکەن
هەر بمێنن هەر بژین ئەم دەستە تا ڕۆژی جەزا
موسلیحن موستەقبەلی میللەت بەجارێ چا دەکەن
گیانی کۆمەڵ ڕێکییە و فەوتانی هەر ناکۆکییە
ئەم گەلە ڕێکی دەوێ ناکۆکی بێ جێگا دەکەن
غایەیی ئەم حیزبە فەوتی حیرس و بێ مەعناییيە
تف لە چارەی پیسی تەمماعانی بێ مەعنا دەکەن

فانی ستایشی ئەو کەسانە دەکا کە کۆمیتەیان دامەزراند، بەوە شادە کورد گەیشتۆتە ئەو پلەیەی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و سیاسی دامەزرێنێ. باوەڕی بەوە هەیە کاری چاک دەکەن، هەندێ کەموکوڕی ناو کۆمەڵ جێبەجێ دەکەن. ئینجا دەکەوێتە داشۆرین و هێرش بردن بۆ سەر ئەو کەسانەی هەوڵی ڕووخانیان دەدا:

ئەم نەزانانە کە سوودی شەخسییە ئامانجیان
زددی ئەم ئەحواڵەن و لەم ڕێکییە حاشا دەکەن
هیچیان پێ ناکرێ ئەمما لەبەر دەردی دەروون
هەڵدەتیزێنن وەکو گا بۆڕەیی بێ جا دەکەن
ئەو کەسانەی هەوڵیان هەر بۆ ڕەفاهی شەخسییە
ناپیاون ئەحمەقن گێژن هەرا بەرپا دەکەن

شاعیر ئەو کەسانەی دژی کۆمیتە بوون بە نەزان و یەک ئاخوڕە و خۆپەرستیان دادەنێ، بەڵام باوەڕی بەوە هەیە خراپەیان پێ ناکرێ، ئیتر دەکەوێتە ناو جنێوی بازاڕی بەو کەسانە، بەگێژ و گێل و ناپیاو ناویان دەبا. لە دواییدا بەم دێڕانە کۆتایی بەلیریکەکەی دێنێ:

خۆشە ئەحواڵی ئەهالی با خەریکی کار بێ
تاقمی قۆمیتە ئازان و وەتەن ئاوا دەکەن
فرسەتە کوردینە هەستن با بچینە کوێستان
گەر وەکو من حەز لە سەیری لەشکری ئازا دەکەن

رۆژی عەزم و ڕەزم و خوێن ڕێژی و تەمکین و سەبات
هەر لە بەرقی ئاسمان و پایەیی پۆلا دەکەن
هەر وەکو نەوشیروان ئەمرۆ بەدەستی مەعدەلەت
یەک بەیەک شیرازەیی جەمعییەتی دڵ چا دەکەن
(فانی)ا ناحەز بەرامبەر شیعرەکانی ساغی تۆ
وەک شەیاتین کەوا نەفرەت لە بیسمیللا دەکەن

شاعیر بەختیارە بەکار و کردەوەکانی کۆمیتە، چونکە کەڵکیان بۆ کۆمەڵ هەبوو، لە دوارۆژدا ڕەنجیان پڕ سوود دەبوو بۆ میللەت. شاعیر بەوتەی جوان کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ و دەڵێ ناحەزانی شیعری وەک شەیتانن چۆن ئەمە نەفرەت لە «بیسمیللا» دەکا، ئەوانیش شیعرە ڕەنگینەکانی فانی ڕەت دەکەنەوە. ئەنجامی ئەو ڕێکخراوەی لێرە باسی لێوە کرا، لە لایەن هەندێ لە ئاغا و دەرەبەگە نەخوێندەوار و چاوچنۆکەکانی مەرگە بەربەرەکانی کرا و کۆتایی پێ هات.

**بەسەرهاتی گوندی مەرگە**

فانی قەسیدەییێکی درێژی هۆنیوەتەوە لە وەسفی ژیانی نالەباری گوندی مەرگە لە ساڵانی ١٩٥٢ – ١٩٥٤. سکاڵا و گفتوگۆییێکە لەگەڵ مەلا حەسەنی هاوڕێی، بەم جۆرە دەست بەشیعرەکە دەکا:

مەلا شەو مەرگە غەرقی ماجەرایە
هەموو شەخسێ دوچاری شەو بەلایە
لە ساعەت سێوە تا کاتی بەیانی
هەموو کۆلانە یەکسەر پڕ لە جانی

لە دوای ڕۆژ ئاوا مەرگە لە خەڵکی دەپچڕێ، هەر کەسێکی بێتە دەرەوە تووشی دەردی سەری دەبێ چونکە دز و جەردە و ڕێگر ئەوەی بیانەوێ بەئاواییبیەکە دەکەن. ئینجا دەڵێ:

فەللاحی قوڕبەسەر مانەندی بەرداش
ئەگرمێنێ و ئەکا دەردی دڵی قاش
دەڵێ ئەمشۆ نەماوە دەغڵ و دانم
مەحاڵی عەقڵە بەم شێوە ژیانم

***



نەجاڕی قوڕبەسەر مانەندی سەگسار
ئەناڵێت و ئەکا بەم جۆرە هاوار
دەڵێ بردوویە دز تەشوێ و مشارم
بە بێ کاری هەژار و خاکەسارم

***

جەنابی زاریعیشمان کەوتە شیوەن
دەڵێ جەرگم بڕا ڕەحمێ بەمن کەن
لە ژوورمدا هەبوو تووتن بەفەردە
ئەوا دز هات و بردی میسلی جەردە

***

کە ئاسنگەر لە خەو هەستا ئەزانێ
لە ژووریدا نەماوە تاقە نانێ
دەڵێ ئای قوڕبەسەر خۆم و مناڵم
بە بێ نانی شکاوە هەردوو باڵم

بەشەو دزی لە هەموو لایێک دەکرێ، بۆ نموونە شاعیر باس لە جووتیار و دارتاش و خاوەن زەوی و ئاسنگەر دەکا وەک نموونەییێک. بەشەو دز دوکان و جێگەی کاریان تاڵان دەکەن. تەنیا ئەمانە زیانیان لێ ناکەوێ، ئاژاوەییێکە هەموو کەسێکی تووشی ماڵوێرانی کردووە، لەم لایەنەوە دەڵێ:

ئەهالی عاجز و حەیرانە یەکسەر
وەتەن پڕ خەوفە وەک گێژی سکەندەر
قوڕاوی جەهل و بەدبەختی بە باوە
ئەکا هاژە و بە ڕوومان هەڵپژاوە
مەلا و دەروێش و ئاغا و شێخ و مسکێن
لە جێگادا خەریکی فیکری بێ جێن

خەڵکی هەموویان بێ ئومێدن و لە ترسستانی پڕ لە ڕاچەنین و دڵەکوتێدا دەژین، هەموو توێژەکانی ناو کۆمەڵ لە هێمن و ئارامی بەدوورن. شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

مەلا ئیسمت حەسەن خولقت حەسەن بێ
هەموو هەوڵت لە بۆ چاکەی وەتەن بێ
لەسەر ئاو و هەوای ئەم خاکە پاکە
وەکو پەروانە گیانی خۆت فیداکە
بەقەولی (فانی)ی و فەتوایی ئەحرار
شەرەف ئازادییە و نەفرەت لە ئەغیار

لەم دێڕانەدا فانی دەکەوێتە ئامۆژگاری کردنی مەلا حەسەن، چونکە لە سەرەتادا سکاڵای بۆ ئەو بووە. ئینجا تێی دەگەیەنی پێویستە کاری چاک بکا، ئەو ئاژاوەیەی لە مەرگەدا لە ناوەوەیە بەکردەوەی چاک نەبێ لە ناو نابرێ.

## شیعری بەهەوای دیالێکتی ناوچەیی پشدەر

فانی قەسیدەیێکی شەشین بەندی هەیە لە زیاتر لە سی بەند پێکهاتووە. لەو شیعرەدا هەندێ تەعبیری دیالێکتی بچووکی ناوچەیی پشدەری بەکارهێناوە. ئەم دیاردەیە جۆرە هونەرێکی داوەتە شیعرەکە لە ڕووی ڕیتم و مۆسیقاوە. بۆ نموونە لە هەندێ لە شەشینەکانیدا دەڵێ:

هەر ناحەزێکی ناوتان لێو بۆتە عوزوی فاسید
بۆ جەلبی سوودی شەخسی بۆ سەندنی مەقاسید
گوفتاری ئەو بەجێیە بازاڕی ئێوە کاسید
مەردانە تێبکۆشن بگرن زمانی حاسید
هەستن ئەگەر هەتانە یەک زەڕڕە بەش لە ژیری
دەستی برایەتیتان وێکدەن بەبێ زویری
گەر من بکەم وەکو هەن تەشریحی عەیب و عاروو
نەفرەت ئەکا هەموو کەس تا سەر لە ئیش و کاروو
ئەی هێنەری هەژاری کرداری نالەباروو
بۆ بەرهەڵستی دوژمن کوا ئەسلەحە و سواروو
هەستن ئەگەر هەتانە یەک زەڕڕە بەش لە ژیری
دەستی برایەتیتان وێکدەن بەبێ زویری



لەم شیعرەدا فانی لە خاسیەتەکانی دیالێکتی ناوچەیی مەرگە هەندێ تەعبیری بەکارهێناوە وەکو: لێو (لێتان)، عاروو (عارتان)، کاروو (کارتان)، نالەباروو (نالەبارتان)، سواروو (سوارتان)، هێندەو (هێندەتان)، کردن (کردتان)، خۆو (خۆتان)، نەمانوو (نەمانتان). جگە لەمە دوو نیوە دێڕی دوایی هەموو شەشینەکان دووبارە و سێبارە دەبێتەوە. ئەم دیاردەیە قەسیدە شەشینە بەندییەکە وەکو جۆرە تەرجیع بەندێک دەخاتە ڕوو.

## پیر و کچ خواستن

لە کۆمەڵی ئێمەدا هەندێ جار ئاساییە کیژێکی چواردە پازدە ساڵی بدرێ بەپیرێکی حەفتا هەشتا ساڵی. ئەم کردەوەیە زۆر جار کارەساتی لێ دەبێتەوە. بۆ ئەم مەبەسە فانی پۆیێمێکی نزیکەی سەد دێڕە شیعری هۆنیوەتەوە، وەک دیالۆجێک لە نێوان بووکێکی تەمەن چواردە پازدە ساڵی و زاواییێکی تەمەن حەفتا هەشتا ساڵی. لەم ماوەیەدا گوڵبژێرێکی ئەو قەسیدەیە دەخرێتە ڕوو.

لە سەرەتادا بەگشتی فانی ڕوو دەکاتە پیران و پێیان دەڵێ:

وەرە خالۆ بەپیری ژن مەهێنە
هەتا نەتکا بەکوندی ناو کولێنە
دەسا گوێ ڕاگرە لەم داستانە
لە ژن هێنانی مامەی پیر بزانە

لە دوای ئەمە دیالۆج لە نێوان کچ و پیرەمێردەوە دەست پێ دەکا:

پیرەمێرد: وەرە ئەی نادیرە کچ ڕووحی ڕەوان قوربانت
بۆم لادە سونبولی ئەگریجە لەسەر کولمانت
تا لە ئەو لێوە وەکو لەعلە بکەم من ماچێ
هێندە موشتاقە ڕەوان هەر ئەوەتا دەرناچێ
دەست لە مل کردنی تۆ غایە وو ئامالی منە
ماچی ئەو ڕوومەتە بەشەهدی دەمی تاڵی منە
کچ: پیرە جا تۆ بە چ ڕوو ماچی منت پێ خۆشە
مووت وەکو بەفری سپی وایە دڵت پێ جۆشە

وەکو قامیشی لە دەم جۆگە سەرت لەرزانە
پشتەکەت خیسە تەماشاکە ئەڵێی گۆچانە
من لەم ژوورە لەگەڵ تۆ ئەبەدا هەڵناکەم
تا زووە مەسڵەحەتم وایە لە دەستت ڕاکەم

پیرەمێرد لە کچ دەپاڕێتەوە، خۆی بەقوربانی دەکا، نیازی ئەوەیە ماچی بکا و دەست لە ملی بئاڵێنێ. کچ لە وەرامدا دەڵێ یەکێ مووی وەکو بەفر و لەشی وەکو قامیش بێ، چۆن ڕووی دێ داوای ماچ بکا!.

پیرەمێرد: شۆڕەژن ئاخر ئەمن بۆیە تۆم هێناوە
تا بەخۆشحاڵی بژین هەردوو بەسەر دنیاوە
تۆ حەلاڵی منی خۆشیم مەکە بەم باسە حەرام
هەوەسم لێتە چەتیو تۆ سەری بابت وەرە لام
با مەلا بێت و بکا نوشتە هەتاکو چابی
لەو تەلیسمانە کە تێی کەوتووی بەرهەڵدا بی
کچ: گەر مەلا بێت و بکا نوشتە منیش مەمنوونم
دیارە ئێستا لە تەلیسمام و بەگیان مەجنوونم
تۆ ئەگەر تالیبی لەم سیحرە بکەی ڕزگارم
نوشتە سێ بەردەیە و تۆش دێوەزمەی نەک یارم

پیرەمێرد بەکچە دەڵێ تۆ ژنی منی حەلاڵی منی، داوا لە مەلا دەکەم بەنوشتە ئەم تەلیسمە بکاتەوە. کچ دەڵێ ئەگەر مەلا نوشتە بکا بۆ من باشە، ئەگەر من لە تەلیسما بم دیارە شێتم، تۆ باشترە تەلاقم بدەی لەم جادووە ڕزگاریم دەبێ. ئیتر پیرەمێرد دەڵێ:

پیرەمێرد: کچە ئەم فیکرە مەکە دەستی من و دامانت
بەس موعەززەب کە بەئەم باسە من و ویژدانت
خۆشە ئەو ڕۆژە کە تۆ بێی و بەدڵ یارم بی
مونیسی گیانی حەزین و دڵی غەمبارم بی
کچ: پیرە! لا لا مەچەنە تەرکی زمان داری کە
بەس دڵم تووشی غەم و مەینەت و بێزاری کە



ژینی من تاڵە وەکو ژاڵە لەگەڵ تۆ پیرێ
مەمکی قنجم بەدەستی لەرزۆکی تۆ ناگیرێ
غونچەیێکی وەکو من تازە هەزارێکی ئەوێ
کونەیێکی وەکو تۆ کۆنە عەمارێکی ئەوێ

پیرەمێرد دەپاڕێتەوە و دەڵێ باسی تەلاق مەکە، ئازارم مەدە، تۆ پێویستە یاری من بی. کچ دەڵێ پیرە بەس زمان لووسی بکە، ژینی من لەگەڵ تۆ نابێ، مەمکی قنجی من بەدەستی لەرزۆکی تۆ ناگیرێ، من غونچەم بلبل هەزارێکی تازەم گەرەکە، فلقە کۆنەیێک شایانی پیری وەکو تۆیە.

پیرەمێرد: کچە لەم حاڵە ئەبێ باوکە سەگت ئاگاکەم
بێ حەیا من بەتەنێ چارەیی تۆ قەت ناکەم
یا ئەبێ ئێستە ببی مل کەچی تەسلیم و ڕەزا
یا ئەبێ لێت بدرێ خەنجەری دڵ دۆزی قەزا
کچ: پیرە! باوکم نیەتی ڕێگە ئەمن ڕازی کا
گەر دەخالەت بەهەموو شێخ و مەلا و قازی کا
وەکو تۆ ئەحمەق و بێکارەیە ویژدانی نییە
خۆی بژی باکی غەمی گیانی ئەسیرانی نییە

پیرەمێرد توورە دەبێ و دەڵێ شکات لای باوکت دەکەم، ئەگەر خۆت نەدەی بەدەستمەوە بەخەنجەر لەت و پەتت دەکەم. کچ دەڵێ باوکم ناتوانێ من ڕازی بکا، ئەگەر ئەویش وەکو تۆ بیر بکاتەوە دیارە گێل و بێکارەیە.

مەسەلە دەچێتە لای خەزووری پیرەمێرد. ئەمە بە باوکی کچە دەڵێ:

پیرەمێرد: ئەی خەزووری بەوەفا خۆ کچەکەت بێعارە
ڕووی وەکو سرکەیە لاسارە لە من بێزارە
نایەڵی دەس کەمە ئەستۆیی و دەڵێ مووت سپییە
هەر دەگریا وو دەڵێ مردنە ئەم زیندە نییە
وەرە ڕازی کە هەتا چیدی نەدا دەردی سەرم
لە غەم و غوسسە ڕزیوە دڵ و گیان و جگەرم

ئینجا خەزوور ڕوو دەکاتە کچی و دەڵێ:

ڕۆڵە ئەم شەخسە کە شووت کردووە پێی زۆر چاکە
وەکو ئاوێنە دڵی بێ کەدەر و ڕووناکە
خاوەنی تەجرەبەیە عەقڵ و کەمالی زۆرە
سەرەڕای عەقڵ و زەکا سەروەت و ماڵی زۆرە

ئەوجا کچەکە وەرامی باوکی دەداتەوە:

باوکە موفتی دڵەکەم دوورە لە ئەم فەتوایە
بەم ژیانەی منی بێچارە دەڵێ بێ جایە
هانشینم لەگەڵ ئەو کۆنەیە سەخت و سەقەتە
سوحبەتی بلبل و قەل پێکەوە عەینی غەڵەتە
باوکە ڕەحمێ کە لە ئەم داوە بکە ڕزگارم
بەسیەتی بەسیەتی چیدی کە مەدەن ئازارم

بەم قسانە پیرەمێرد هەندێ ڕاستی دەدۆزێتەوە و دەڵێ:

تف لە پیری لە هەموو لاوە سەری لێ داوم
هێزی گەنجی و ئەمەلی ژینی لە دەس باداوم
دەردی پیری چ بەلایێکە دەوای نایە بەکەس
ئاخ و سەد ئاخ کە ئەم دەردە دەوای مەرگە و بەس

لە دواییدا فانی بەناوی «سەرمەشقی پیرە ژیرەکان» کۆتایی بەقەسیدە جوانەکەی دێنێ:

چاکە پیرانی وەتەن لە قسە عەیبەت بگرن
پەردەی حورمەتی خۆیان بەلەقەی کچ نەدڕن
گەنجی گەنجیت کە نەما لادە لە گەنجینەیی گەنج
گەنجی لیرەت لە کن ئەو گەنجەیە گەنجێکە لە ڕەنج
کچ لەگەڵ پیر کەچە گەر هەموو دنیاشی هەیە
دێتە ژێر باری کوڕی لاتەوە گەر کاشی هەیە
بەسیەتی (فانی) ئیتر عەیبە قسەت کۆتاکە
خۆت کە پیر بووی لە کچ و سوحبەتی کچ حاشاکە



ئەم دێڕانە ئامۆژگارییە لە شاعیرانەوە بۆ پیران، پێوەندییان بەدڵداری زەمینی و چوونە ناو یەکی کوڕ و کچ و پیاو و ژنەوە هەیە. هەرچی دڵدارییە گیانییەکەی دیکەشە، ئەمەیان لە گۆڕییە و نەمر و هەمیشەییە، نووسەر و شاعیر و هونەروەر و خاوەن هەست هەتا لێواری گۆڕ مافی ئەوەیان هەیە کچە چواردە ساڵییەکەیان خۆش بوێ، چونکە وێنەی جوانییە، جوانیش ڕەنگدانەوەی کردگارە.

**سیاسەت و دانایی**

فانی کۆمەڵێک چوارینی هەیە ناوەڕۆکیان لە بابەت سیاسەت و کۆمەڵایەتی و هەندێ بیری وردی داناییە. ئەم بۆچوونانەی تەعریف نین، بەڵکو بیروڕاییێکە شاعیر لە قالبێکی جوانکاریدا دایڕشتووە.

لە داناییدا فانی بەم جۆرە وەسفی کەسی بێبار و هەلپەرست دەکا:

چ فیرعەونە و چ هامان و چ قاروون
لەگەڵ گورگی زەمانە موتتەفیق بوون
لەسەر ئەو تەرکی دنیایان کرد و ئاخیر
کە برسی بوو وەکو پاروو هەموو چوون

فانی پەندێکی پێشینانیش لە قالبی چوارینێکی دیکەدا دادەڕێژێتەوە:

بەسەد تەوقێ تەلا و کورتانی ئەتڵەس
کەری بێچارە چی بکا هەر کەرە و بەس
کوڕی سوڵتانە یا ڕۆڵەی شوانە
بەگێلی ناکەسە ژێری هەبێ کەس

هەندێ لە چوارینەکانی هەڵوێستی فانی دەخەنە ڕوو لە بابەت سیاسەتەوە، لە چوارینێکیدا دەڵێ:

بەقەولی زومرەیی ئەربابی حیکمەت
سیاسەت حامییە بۆ مولک و میللەت
لە ناو کوردیش برا دەستی برای خۆی
ئەگەر ببڕێ دەڵێ کردم سیاسەت

لە یەکێکی دیکەدا دەڵێ:

سیاسەت نوور دەبەخشێ وەک ئەلەتریک
ئەوەی بیـــبێ دەبینێ دوور و نێـــزیک
ئەگـەر کـوردیش سـیـاسی بایە بۆچی
وەها لـێی وون دەبوو ڕێـی پان و بـاریک

لە چوارینێکی دیکەدا دەڵێ:

سـیـاسـەت ئاشـە لاکین عـەقـڵـە ئاوی
دەهاڕێ تۆوی کـینە و جـەهل و خـاوی
ئەگـەر بیـبـایە کـورد ئاشـێکی ئاوا
لـە بـۆ دەڕژا لـەبـەر دوژمـن زراوی

لەم بۆچوونانەی فانی ئەوە دەردەکەوێ سیاسەت زانستییە، ژیرییە لە پیلان دانان بۆ سەرگرتن و سەرکەوتنی هەموو کێشە و مەسەلەیێک. لەوەدا باش بۆی چووە کورد سیاسەتی هەبوایە تا ئێستا لە هەڵسوکەوتی وەک ئێستای نەدەمایەوە.

***

مامەند کوڕی ڕەسووڵ ئاغای میراودەلی مەرگەیی پشدەری ناسراو بەفانی یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی سەرنج ڕادەکێشێ لە ڕووی ناوەڕۆکی شیعرییەوە. بەرهەڵستی کردەوەی دەرەبەگی کردووە بەهەر ناوێکەوە بووبێ، ئاغا و بەگ و پاشا. تا کۆتایی ژیانی سوور بووە لەسەر ئەمە و ئیدیۆلۆجییەتی خۆی نەگۆڕیوە. شاعیر هەیە لە چینەکانی سەرەوە بوون، بەدڵسۆزییەوە کوردایەتییان کردووە، دژی دەسەڵاتی میری و ئەمپریالیست بوون بەتایبەتی ئینگلیز، بەڵام ئەو جۆرە شاعیرە لای ئێمە بەدەگمەن دەست دەکەوێ خۆی لە چینی دەرەبەگ ژماردبێ و لەقەبی ئاغای هەڵگرتبێ و بەڕاستی بەردەوام تا کۆچی دوایی لە دژی کردەوەی ئەو چینە بووبێ.

فانی زۆری نەخوێندووە، لە سەرەتادا هەر ئەوەندە کۆششی کردووە بۆ ئەوەی فێری خوێندن و نووسین بێ، لە پاشانا خۆی بووە بەمامۆستای خۆی و سەلیقەی بەهێزی خەیاڵی شیعری توانیویەتی قسەیێک بێنێتە بەرهەم بەشیعری بەرز بکەوێتە بەرچاو. فانی لە زۆربەی بابەتەکانی شیعری وتووە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە. شیعری دڵداری بەقەوارە لای شاعیر زۆر نییە، ئەوەی هەیە بەڵگەیێکە فانی دەکاتە هونەرمەندێکی دیار لە ناو کۆمەڵدا.



شاعیر شارەزایی بووە لەو وردە مەرجانەی کۆمەڵی کوردیان دروست کردووە و بووە بەنەتەوە. هەروەها ئاگاداری ڕەوشت و نەریتی بنەماڵەیی و خزمایەتی و عەشرەتی لە نێوان توێژەکانی کۆمەڵدا بووە. باوەڕی بەهەرەوەزی بووە لە نێوان خەڵکیدا بۆ ئاسانکردنی باری ژیانی چینەکانی خوارەوە لە ڕەنجبەر و پاڵە و هەژار. لە ئەوپەڕی کێشەی ناگزووری کۆمەڵایەتی و پێوەندی سۆسیۆپۆلیتیکی لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتەوە بازی داوەتە دڵداری و ماچ و مووچ و هەندێ جاری شیعری کراوە (ئیرۆتیکی) کە وێنەی پێوەندی سێکسی ژن و پیاو دەگرێ. لە جاری دیکەدا ئەم وێنانە لە قاڵبی دراما دەردەبڕێ، بەم پێیە دیمەنی تراجیدی و کۆمیدی دەکەونە ناو بەرهەمی شیعرییەوە.

فانی شاعیرێکە کەسێتییێکی دیارکراوی هەیە لە شیعری کوردیدا لە سەدەی بیستەم و بەڕاستی نوێنەری هیوا و ئامانجی میللەت و بەرهەمی شیعری ڕەسەن بووە.

## بەشی سێزدەم

# موخلیس

### ١٩١٠ - ١٩٨٥

### ژیانی

خەلیل کوڕی ڕەسووڵ کوڕی مستەفا لە عەشرەتی سنجاوییە، لە بابەت خۆیەوە دەڵێ:

کوردم و سنجاوی تیرەم هەم لە سەنعەتدا مەلام
نیشتمانمانە عیراق و شاری هەولێرە لیوام

خەلیل لە ساڵی ١٩١٠ لە هەواری گوندی شۆڕەزەرتکەی ناوچەی دەشتی کەندیناوەی هەولێر لە دایک بووە. لە تەمەنی پێنج ساڵیدا باوکی مردووە. دایکی پەروەردەی کردووە. سەرەتای خوێندنی لای مامی بووە لە گوندی دووسەرە، لە پاشانا قۆناغی فەقێیەتی لە زۆر جێگە بردۆتە سەر. لە ساڵانی ١٩٣٢ - ١٩٤٣ لە گوندی کەنداڵ نزیک مەخموور و گوندی سوورێژەی سەر بەقوشتەپە و گوندی پیرداود خوێندوویەتی. لە دواییدا لە قۆناغی مستەعیدیدا لای مەلا شێخ جەلالی بەرزنجی کانی کوردەیی لە گوندی ترپەسپیان خوێندنی بردۆتە سەر، ماوەیێکیش لە گوندی چەغەمیرەی ناوچەی کەندیناوە بووە، ئەوجا خۆی گەیاندۆتە لای مەلا ساڵحی کۆزەپانکە لە هەولێر و لە ساڵانی ١٩٤٣ - ١٩٤٤ لای ئەو خوێندوویەتی و ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرتووە.

لە سەرەتای شیعر نووسینیدا نازناوی شیعری «وافی» بووە، لە هەندێ بەرهەمیدا بەکاری هێناوە تا ساڵی ١٩٤٣. لە ساڵی ١٩٤٤ نازناوی «موخلیس»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و بووە بەسۆفیی نەقشبەندی و تەریقەتی لەسەر دەستی شێخ مستەفای هەرشەمی نەقشبەندی وەرگرتووە، تا مردنی دڵسۆزی ئەو تەریقەتە بووە.

لە دوای ئیجازە وەرگرتنی مەلایەتی لە هەولێر گەڕاوەتەوە گوندی دووسەرە و لە جێی مامی بووە بەمەلای گوند، فەتاح ئاغای دزەیی چاودێری باشی موخلیس و حوجرە و قوتابیانی مەدرەسەی کردووە. شاعیر لە هەستی دەروونی ناوەوەی ناسک بووە، پێوەندی لەگەڵ ماڵ و منداڵی ڕێک نەبووە، لەبەرئەوە هەندێ کردەوەی نائاسایی لێی ڕووی داوە.



لە ساڵی ١٩٥٢ لە ماڵ زویر دەبێ، بەبێ ئەوەی کەس بزانێ لە گوند دەچێتە دەرەوە و چەند مانگێک لە قزرابات و کفری دەمێنێتەوە لە دواییدا دەگەڕێتەوە زێدی خۆی.

لەسەر ڕەوشتە تایبەتییەکەی خۆی لە ساڵی ١٩٦٤ گوندی دووسەرە بەجێ دێڵێ و ڕوو دەکاتە هەولێر، ماوەیێک مەلایەتی دەکا، زۆری پێ ناچێ بار دەکاتە فەلووجە و دەبێتە مەلا لە مزگەوتی گەورەی شار و زانستی مەنتیق (لۆجیک) دەڵێتەوە. لەو ماوەیەدا هەوەسی گەشتی سووریا و حیجاز دەکەوێتە سەری، بەڵام پەشیمان دەبێتەوە. ئیتر ناچار دەبێ ڕوو دەکاتە هەولێر و لەوێوە دەگەڕێتەوە دووسەرە و خەریکی مەلایەتی دەبێ تا ساڵی ١٩٧٥. لەو ساڵەدا بەیەکجاری ئەو ئاواییە بەجێ دێڵێ و ڕوو دەکاتە شەقڵاوە و لە خانەقای شێخ مستەفای هەرشەمی نەقشبەندیدا ژیانی داهاتووی دەباتە سەر. بەشێکی زۆری ژیانی شەقڵاوەی بەنەخۆشی دەگەیەنێتە ئەنجام، کە نەخۆشی تەنگی پێ هەڵدەچنێ و دەیگوێزنەوە نەخۆشخانەی هەولێر. مەرگ بەهێزتر دەبێ و لە ڕۆژی ٥ی حوزەیرانی ١٩٨٥ کۆچی دوایی دەکا، تەرمەکەی دەبەنە گوندی پیرداود و لە گۆڕستانی ئەوێ بەخاکی دەسپێرن.

### شیعری

ئیلهامی شیعری و هەوەسی نووسین لەم مەیدانەدا لە ساڵی ١٩٣٠ لای موخلیس دروست بووە، دیوانی شاعیرانی کلاسیکی خوێندۆتەوە، چێژی لە بەرهەمی گەورە شاعیرانی کۆن و نوێ وەرگرتووە. کاری هەندێکیان بەسەر شیعرییەوە دیارە، هی دیکەیان خۆی سەر بەو شێوازەیە کە ئەوان لە شیعر داناندا لەسەر ڕۆیشتوون. تارمایی نالی و حاجی و حەمدی و سافی و بێخود لە شیعریدا دەکەوێتە بەرچاو. لە نێوەندی ئەدەبی سەردەمی خۆی نزیک بووە. خزمایەتی لەگەڵ شاعیری هەولێری «دەشتی»دا بووە.

دیوانی شیعری موخلیس تا ئێستا چاپ نەکراوە. دەسنووسی دیوانەکە لای کەسوکاری و ئیبراهیم ئەحمەد شوانی پارێزراوە، هەروەها نامەی ماجستێری ئەو لە بابەت ژیان و شیعری ئەو شاعیرە بوو (١٩٨٩)، ئەمەش تا ئێستا چاپ نەکراوە. جگە لە شیعر، موخلیس نامەی شیعری هەیە وەکو «مەولوودنامەی کوردی» لە ساڵی ١٩٦٨ لە هەولێر چاپ کراوە. نامەیێکی شیعری دیکەی هەیە بەناوی «هیجرەتنامەی کوردی» ئەمەیان هێشتا هەر دەسنووسە.

## شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

هەندێ لایەنی شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە بەپێی زانیاریی ئەم خاڵانە ڕوون دەبێتەوە:

١- بەگشتی بابەتی شیعری غەزەل (لیریک) و قەسیدەیە، لە ڕووی کورتی و درێژی شیعرەوە.

٢- بایەخی بەپێنجین داوە، هەروەها قەسیدەی چواربنیش لە دیوانیدا بەرچاو دەکەوێ.

٣- کۆمەڵێک چوارین و تاکی داناوە. هەندێ بیری دانایی و کۆمەڵایەتی و دڵداری و ئایینی تیایاندا کۆکردۆتەوە.

٤- بەهۆی ئاگاداری شاعیر لە زمانی هاوسێیانی کورد لە هەندێ شیعریدا ئەو زمانانەی لەگەڵ کوردی بەکارهێناوە، ئیتر بابەتی مولەممەع دروست بووە.

٥- هەموو شیعری موخلیس لە ڕووی کێشەوە دەچنەوە سەر بەحری عەرووز. زۆربەی شیعری لەسەر بەحری ڕەمەلن، لەو کەمتر لەسەر بەحری هەزەج دایناون. لەسەر بەحری موزاریعیشی هەیە، لەو کەمتر ڕەجەزی بەکارهێناوە. لە قافیە لە سیستێمی یەکێتیی قافیە لای نەداوە، چونکە سروشتی کێشە عەرووزییەکانی ئەو جۆرە قافیەیە دەخوازن.

٦- بەشێکی زۆری دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی لە قافیەی شیعریدا بەکارهێناوە، ئەم دەنگانە دەکەونە بەرچاو: ا ب ت ج خ د ر س ف ل م ن (ە – ـە) و وو ی ێ.

٧- لە پاش قافیە دەولەمەندە، ئەم وشە و ڕستانەی بەکارهێناوە: تووە (تۆیە)، تەیە (تۆیە – کرمانجیی باکوور)، نایێ، دەکەی، دەکەم، دەکرد، ناکەوێ، مەکە، دەکا، خودا، هەبێ، دزەیی، ئەو شەو، بکەم، ئەوە، دۆست، منە، بۆچییە، نییە، ڕۆیی، دەبیتن، چوو، تێ بگا، ئەوڕۆکە، دەگەڕا، هێشتا، چەند، لەمێژە، هەموو، نەدا، مەبە، نەبا (نەبوایە)، دەوێ، بی، مەکە، چبکەم، دەکەم، نەماوە، ما (ئێمە)، بووە، مەکە، بەقسە، دەڕوا، بێتن (ببیتن)، دەکا، منە، ئەمن، باببێ، دڵم، ڕۆخ، لێم، نادا، ببیێ (ببیستە).

٨- زمانی شیعری ئاسان و ڕەوانە. بەزەقی شەقڵی دیالێکتی ناوچەیی هەولێر (سۆرانی) بەشیعرییەوە دیارە. لەو کاتەی شاعیر سوورە لەسەر بەجێهێنانی هەموو مەرجەکانی شیعری کلاسیکی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە، ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ناوی بۆ شیعرەکان داناوە، بەپێچەوانەی شاعیرە کۆنە کلاسیکییەکان.



٩- بایەخی بەرەوانبێژی کلاسیکی داوە بەهەموو بابەتەکانیەوە، نەک تەنیا بەرستەی کورتی وێنەی شیعری بەڵکو شیعری بەتایبەتی داناوە بۆ گەمەکردنی هونەری لە ڕیتم و مۆسیقاوە، هەروەها کەرت کردنی تەفعیلە عەرووزییەکان بۆ ئەوەی لە کێشە سیلابییە خۆماڵییەکان نزیک ببنەوە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

موخلیس هەوەسی لەگەڵ «شیعری نوێ»دا نەبووە، پێی خۆش نەبووە و چێژی لێ وەرنەگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی شارەزایی لە نەریت و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی فۆلکلۆری و ئەتنۆگرافی ئەوەی پێوەندی بەژیانی دەشتی هەولێرەوە هەیە، سەرانسەری شیعری ئەدگاری وێنەی ژیانی کوردەواری پێوەیە. بەلای ئەوەوە هەموو گیان لەبەر و بێ گیانی ئەو دەشتە لە ناو بۆدقەی کوردەواری تواوەتەوە و لە کورد زیاتر هیچی دیکە نییە. ڕاستییەکەش هەر ئەمەیە.

لە شیعری موخلیس لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ئەم هونەر و بابەتانە دەکەوێتە بەرچاو:

١- شیعری ئایینی: شیعری ئایینی لای شاعیر تێکەڵاوە، بەگشتی هەموو ڕەمزەکانی ئایینی ئیسلام لە خودا و پێغەمبەر و ئەولیا و شێخانی تەریقەتی سۆفیزم دەگرێتەوە. هەندێ جار مەبەسی کۆمەڵایەتیش دەئاخنێتە ناو ئەم جۆرە شیعرانەیەوە.

٢- شیعری دڵداری: لە دڵداریدا شاعیر دلبەری تایبەتی نییە، ئەو جوانەی وا دەزانی خۆشی دەوێ لە ناو جوانانی شیعری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات تواوەتەوە.

٣- شیعری وەسف: شاعیر لە وەسفیدا سەرکەوتووە، شیعری لەم بابەتەی زۆرە، بەهەردوو بەشیەوە، وەسفی کچی جوانی دەشتی هەولێر و وەسفی سروشتی ڕەنگینی ئەو دەشتە، بەتایبەتی کەژی بەهار.

٤- شیعری نیشتمانی و کۆمەڵایەتی: شاعیر بیری لە ژیانی ئازادی کورد و گوزەرانی کورد کردۆتەوە. ئازادی و سەربەستی بۆ خواستووە و داوای لەناوبردنی هەژاری و زوڵم و زۆری کردووە. هەندێ جار ئەم دوو مەبەسەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، لە جاری دیکەدا بەتەنیا باسی لێیانەوە کردووە.

٥- شیعری لاواندنەوە: شاعیر بایەخی بەشیوەن و ماتەمنامە داوە، لە شێوازی کلاسیکی ئەم جۆرە شیعرە نەچۆتە دەرەوە. لەم بابەتە شیعرەدا ستایش و پێداهەڵدان دەوری گرنگی دەبێ، چونکە شیعر کە بۆ مردوو دەوترێ شاعیر تەنیا لایەنی چاکەی دەگرێ و

سیفەتە باشەکانی ئادەمزادی بۆ بەکار دەهێنێ.

٦- شیعری پێداهەڵدان و داشۆرین: شیعری پێداهەڵدان لە بەرهەمی شاعیردا دەبینرێ، وەکو مەرجێک هەندێ جار لەگەڵ وەسف تێکەڵ دەبێ. هەرچی شیعری داشۆرینیشە، ئەو سەرچاوانەی لە بەردەست دان ئەوە دەگەیەنن موخلیس لەم جۆرە شیعرەی هۆنیوەتەوە، لەبەر هەر هۆیێک بێ لە دواییدا لەناوی بردوون.

موخلیس یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی ناوەڕاست و نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لە ناوچەی سۆرانی کوردستانی باشوور.

## نموونەی شیعری

### دڵداری

١

لە لیریکێکیدا بەناوی «سێو و خۆخ» موخلیس دەڵێ:

گەر گوڵی من بولبولم وەر ئاتەشی پەروانەمە
خۆ ئەگەر لەیلای منیش مەجنوونی ئەو چاوانەمە
لێم گەرێ با بێم تەماشای باغەکەت کەم پڕ بەچاو
چەند دەمێکە ئارەزووی ئەو سێو وو ئەو خۆخانەمە
ڕۆژی ئیحسان و خەڵات بەخشینە ئەوڕۆ جەژنەیە
وەک هەتیو هاتوومە دەرگا چاوەڕێی جەژنانەمە
شار بەشار و دێ بەدێ و کووچە بەکووچە دەربەدەر
ڕۆژ و شەو دێم و دەچم وەک تەیری بێ هێلانەمە
(موخلیس)ی بێکەس شەهیدی عیشقە دەستی لێ مەدەن
خوونی گەش بۆ ڕۆژی دەعوا شاهێد و نیشانەمە

لەم وەسفە دڵدارییەدا موخلیس چەند وێنەیێکی ئامادەکراوی شیعری کلاسیکی کۆ دەکاتەوە، وەکو گوڵ و بلبل، ئاگر و پەپوولە، لەیلا و مەجنوون، خۆی و دلبەرەکەی لەگەڵ ئەواندا بەراوورد دەکا. مەمکەکانی خۆشەویست بەسێو و خۆخ دەچوێنێ، تکا دەکا ڕێگەی بدرێ تەماشایان بکا. لێی دەپاڕێتەوە وەک هەتیوێکی بێ باوکی دەرۆزەکەر مامەڵەی لەگەڵدا بکا و جەژنانەی بداتێ، دیارە جەژنانەکەش پووڵ و پارە نییە و ماچی دەمیەتی.



٢

لە لیریکێکی دیکەیدا بە«کۆخە کۆخ»ەوە موخلیس دەڵێ:

کەی دەگا دەستم بەباڵای بەرزی یاری شەنگ و شۆخ
دەفعەیێ لەو باغە نەمدیوە هەنار و سێو و خۆخ
هەر کەسێکی بوو بەعاشق یاری دڵ نەرمی نەبێ
عومری گەنجی و عومری پیری هەر دەبێتە ئاخ و ئۆخ
دەستی خۆم دانا لەسەر ڕووم لێوی خۆم جووڵاندەوە
زاڵمەی سۆر هەڵگەڕا ئەبرۆی بزاوتن یانی یۆخ
بەزمە ئەوشۆ وا مەکە زایەع ببێتن هاتنم
ڕووحەکەم بۆ تۆ بێ بەس مەنعم مەکە بتیێمە ڕۆخ
(موخلیس)ا دانیشە تازە تۆ دزیت پێ ناکرێ
باغەوان دائیم بەهۆش و تۆش پیر و ساحیب کۆخە کۆخ

وێنەیێکی ئاساییە لە وەسفی لاساییکردنەوەی شیعری کلاسیکی. ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێ شاعیر سێو و خۆخ بۆ مەمکی دلبەر بەکار دێنێ، ئەگەر تا پلەیێک سێو بیسترا بێ بۆ ئەم مەبەسە خۆخ بەکار نەهاتووە، دەکرێ بەداهێنان بۆ شاعیر حسێب بکرێ، بەتایبەتی سوورە لەسەر ئەم کارەی و لە لیریکەکەی پێشوودا خۆخی لەگەڵ مەمکی دلبەر بەراوورد کردووە. ئەمە و ئاوڕدانەوەیێکی دیکە لەم شیعرەدا هەیە، لەو کاتەی شاعیر دەیەوێ دەمی بۆ ببا و ماچی بکا پێی دەڵێ «یۆخ»، ئەم وشەیە تورکییە بەمانای (نا) هاتووە! ئیتر نازانرێ مەبەسی شاعیر لەمەدا چییە! دەیەوێ وا لە خەڵکی بگەیەنی خۆی زمانی تورکی دەزانێ، یا شانازی بەوەوە دەکا دلبەری کچە تورکێکی جوانە!؟ دیارە وشەی «تورک» جگە لە مانای فەرهەنگی خۆی بەمانای کچی جوانیش هاتووە.

٣

لە لیریکی «شازادەی جافان»دا موخلیس دەڵێ:

بەمەیخانە گوزەر ناکەم لە حەسرەت بادەیی چاوی
سەفا و سەیری چەمەن ناکەم لە داخی باغی خۆشناوی

له شەنگ و شۆخییا ئەلحەق له شازادانی جافانی
له جەور و ناموسوڵمانیت ڕەئیسی عێلی سنجاوی
له دەور و سیلسیلەی زولفی سەرم شێواوە دەرناچێ
دڵ و دینم بەتاڵان چوو بەتاتای پەرچەمی خاوی
برینم کۆن و پڕ ئێشە مەفەرموو تازە بیماری
ئەمن کوژراوی ئەو ڕۆژەم سەبا زولفەینی لاداوی
که (موخلیس) هاته جەژنانەت له عادەت مەچووە دەر ئەمرۆ
گوتی هەی هەی تو هەر ماوی له بۆ خۆت چەنده پاراوی

لەم لیریکەدا شاعیر بۆ وەسفی جوانی هەندێ له ئەندامانی لەشی دلبەر و شۆخ و شەنگی و دەربڕینی خوو و ڕەوشت و ئەخلاق و بیروباوەڕی چەند دیاردەیێکی پێوەندی بەسروشتەوە هەیە بەکار دێنێ. وەکو ئەوەی سنگ و مەمکی بەڕەز و باغەکانی خۆشناوەتی دەچوێنێ. شۆخ و شەنگی و جوانی له کەنیشکانی جافدا دەبینێ. کە مەسەلەی ئەو دلبەرە دێتە سەر ئەوەی بێ ئایینە و ناموسوڵمانە و بەزەیی بەشاعیر نایێتەوە و ماچێکی ناداتێ دەیکا بەسەرۆکی عەشرەتی سنجاوی، واتە عێلی شاعیر خۆی. دەبێ ئەو سیفەتە خراپەی شاعیر داویەتییە پاڵ عەشرەتەکەی خۆی لەبەرئەوە نەبێ عەشرەتی خۆیەتی و کەس گلەیی لێ ناکا؟ یا بەڕاستی سنجاوییەکان گوێ بەئایین نادەن!؟ ئەوەش هەیە له دەوروبەری کرماشان بەسنجاویان دەڵێن «بەرازخۆر».

**خدری زینده**

بەم ناوەوە موخلیس له لیریکێکیدا دەڵێ:

مەی ئەگەر ئاوی حەیات و ساقی خدری زینده بی
چۆن ئەقڵ بڕوا دەکا دڵ ئارەزووی تەوبەی هەبی
بەر له خەڵوەت زاهیدا سەیرێکی مەیخانه بکە
گوڵ له باغا ناڕوێ تا خاکەکەی تێر ئاو نەبی
بۆ خەریک نابی بەڕاو ئەی تازە لاوی کەچ کولاه
تۆ کە بازێکی وەها سووک و له ڕاو خۆشت هەبی
گوڵ چنین لەو باغە لام وایە بەتوو قەت ناکرێ
هەرچی گوڵ چین بێ دەبێ ترسی له خار و مار نەبی



لەو شوێنەی کە گەدا جاه و جەلال وەردەگرن
گەر دڵا تۆ له گەدایی یەکەمین بی چ دەبی
گەر ئەتوو تالیبی یاری له سەرومال وەرە دەر
یار ئەگەر بوو بەسە یار، یار کە نەبوو با چ نەبی
(موخلیس)! تۆ له ویساڵ و له فیراق وەک دەدوێی
هەر بە ئاداب بدوێ سوودی نییە بێ ئەدەبی

ئەم شیعرە بەڕووکەش له غەزەلێکی دڵداری دەکا، شاعیر هەوڵی داوە بە وتەی دانایی و تیۆریی لۆجیکی قانگی بدا. شیعرەکە بەم لێکدانەوەیە جوانی دەگەیەنێ، بەڵام جوانییەکەی زیاتر دەبێ ئەگەر بەلێکدانەوەیێکی سیمبۆلییانە تەماشا بکرێ، ئەوەی ڕاستی بێ شاعیریش مەبەسی ئەم لایەنەی شیعرەکەیە، لەبەرئەوە بەکۆمەڵێک زاراوەی سۆفیزم ڕازاندوویەتییەوە، ئەو زاراوانە پێویستە له فەرهەنگی سۆفیزم دەربهێنرێن نەک له فەرهەنگی گشتیی هەر زمانێک. هەندێ لەم زاراوانە لەم شیعرەدا بەم مانایانە هاتوون: خەڵوەت، گۆشەگیری؛ مەیخانە، پەرستگا، باز، شێخ و پیری تەریقەت؛ جەلال، سیفەتی خودایە؛ یار، خودایە؛ ئەم لیریکە بەگشتی لەو شیعرانەیە وەسفی دڵداری دەنوێنێ بەهەردوو مانایەوە حەقیقی و مەجازی، بەوێنەی هونەری وا ڕازاوەتەوە له دانایی و لۆجیک وەرگیراوە.

**گەمەی ڕەوانبێژی**

له شیعرێکیدا موخلیس دەڵێ:

قوربان له غەما فەوتام له غەما قوربان
زیندان بووەتە قەسرم قەسرم بووەتە زیندان
تاکەی وەکو نەی ناڵێن ناڵێن وەکو نەی تاکەی
هیجران بەخودا بەسیە بەسیە بەخودا هیجران
بێ دەر له دەرت کەوتووم کەوتووم له دەرت بێ دەر
ئیحسان چییە سا بیکە بیکە سا چییە ئیحسان
چارم کە بکا وەسڵە وەسڵە کە بکا چارم
دەرمان بەچ کل نابێ نابێ بەچ کل دەرمان

گەورەی کە بڵێی هەرچەند کە بڵێی گەورەی
سوڵتان لە دەرت بەندە بەندە لە دەرت سوڵتان
موخلیس غەرەزی وەسڵە وەسڵە غەرەزی موخلیس
نیشان بدە پێی ڕووی خۆت ڕووی خۆت بدە پێی نیشان

بەڕوخسار ئەم شیعرە گەمەیێکی ڕەوانبێژییە، موخلیس هەموو نیوە دێڕە شیعرەکانی کەرت کردووە بەپێی سیستێمێک، وشەی دوایی کەرتی یەکەم، دەبێتە وشەی یەکەمی کەرتی دووەم، وشەی دوایی ئەم کەرتەش لەگەڵ وشەی کەرتی یەکەم یەک وشەیە. شیعرەکەش وەک دیارە لەسەر بەحری هەزەج ڕێک خراوە، کە نیوە دێڕەکانی کەرت کردووە، هەر کەرتێک لەم تازانە بەکێشی سیلابی خۆماڵی حەوت بڕگەییش دەکێشرێ. قافیەی شیعرەکەش بەگشتی یەکێتیی قافیەی ئاساییە لەسەر دەنگی «ان» دامەزراوە. لێرەدا پێویستە بۆ بەڵگە دوو دێڕی یەکەمی شیعرەکە بەو ئەندازیارییە بیناسازییە بنووسرێتەوە کە شاعیر مەبەسیەتی:

قوربان لە غەما فەوتام
فەوتام لە غەما قوربان
زیندان بووەتە قەسرم
قەسرم بووەتە زیندان
تاکەی وەکو نەی ناڵێن
ناڵێن وەکو نەی تاکەی
هیجران بەخودا بەسیە
بەسیە بەخودا هیجران...

ئەم شیعرە بەڕیتم و مۆسیقا قسە لەگەڵ گوێدا دەکا، هەرچی ناوەڕۆکیشە ئایینی و خواپەرستییە شاعیر لە چوارچێوەی ئاسۆی تەریقەتی سۆفیزم دەیسووڕێنێتەوە.

### کوردایەتی

لە شیعرێکیدا بەناوی «کورد» موخلیس دەڵێ:

قەومی کورد بۆچ ئێوە قەت نابنە برا
بەسیەتی پشتتان لە دونیادا برا



کوردی ئێران و عیراق و تورک و شام
بۆ لە وەختی خۆی وەها جێ جێ کرا
بۆچی یەک ناگرنەوە یەک پارچە بن
چەنگەباز بن بۆ هەموو لا ئاشکرا
بێ سیاسەت کەس نییە هەر ئێوەنە
وا لە تاریکی دەسووڕێن بێ چرا
چاوەڕێم ئاڵایی کوردان هەڵکرێ
هەرچی هات پێشکەوت و ئاڵای هەڵکرا
ناتەبایی پشتی کوردانی شکاند
بۆ سەرۆکی کەس بەکەس نایێتە ڕا
هەر دەیانوێ باری خەڵکی هەڵگرن
تا وەها بن نابنە خاوەن سەرا
قەت مەڵێ بێ دینە کوردی وا نەزان
کورد لە بێ دینیشەوە هەر پاش خرا
چۆن سەرۆکی کورد دەبێ بێگانە بێ
بۆ پشیلە قەت بەزی پێ نەسپێرا
با سەرۆک کورد بێت خوێنت هەڵمژی
نەک بەبێگانە بڵێن کورد لێی درا
(موخلیس)ا نێزیک بووە گوێت لێ بێ
سەربەخۆیی وا بەکوردستان درا

لەم شیعرە ئاسان و ساکار و پڕ لە سۆزەدا شاعیر ئامۆژگاری کورد دەکا، قسە و گازاندەی ڕۆژانەیە، ئەگەر مانای ڕستەکانی نەخرابانایە ناو چوارچێوەی شیعرەوە قسەیێکی ڕووتیان لێ دەردەچوو، بەڵام هەمووی لە سۆزەوە هەڵقوڵاوە چونکە شاعیر ئەو هۆیانە بەرەو ڕووی کورد دەکاتەوە کە بوون بەلەت و پەتکردنی خاک، ئەمەش دیارە لە ئەنجامی کردەوەی کاربەدەستانە، ئەوانەی لە بەرژەوەندی خۆیان بەولاوە هیچی دیکە لە گۆڕێ نەبووە. شاعیر ئەوەندە دڵسۆزە بەخەونیش بێ و هەڵسوکەوت هەرچۆنێک بووبێ کوردستانە و سەربەخۆ بووە.

لەم شیعرەدا بۆچوونێک سەرنج ڕادەکێشێ، شاعیر دەڵێ سەرۆکی کورد نابێ بێگانە

بێ، ئەگەر خوێنیشت هەڵمژی کورد بێ باشترە. هەرچەندە بۆ کەس نییە تێببینێ لەسەر کاری هونەری داهێنراو هەبێ لە جوانکاری بەولاوە، بەڵام بۆ ڕوونکردنەوە لە ڕێ ڕاستی و لۆجیکەوە سەرۆکی کورد نابێ خوێنمژ بێ، شاعیر ڕاستە کە دەڵێ سەرۆک نابێ بێگانە بێ، بەڵام ڕاست نییە کە دەڵێ خوێنمژیش بێ لە بێگانە باشترە، بەپێچەوانەوە لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە ئەگەر دوژمن خراپەت لەگەڵدا بکا ئێشی دەروونی کەمترە لەوەی هاوخوێنت دوژمنایەتیت لەگەڵدا بکا.

### شەنگەبێری

پێنجینە جوانەکەی وەفایی«شیرین تەشی دەرێسێ»ئیلهامی داوەتە هەندێ لە شاعیرانی کورد، یەکێک لەوان موخلیسە، لەسەر کێش و قافیەی شیعرەکەی وەفایی نۆ بەند پێنجینی هۆنیوەتەوە لە مەبەسی وەسف و دڵداری. بەم جۆرە دەست بەشیعرەکەی دەکا:

کە قارە قاری مەڕ هات وەکو هەوری بەهاری
هێنایە خوار لەسەر سەر ئەو شۆخە کۆفی لاری
بەهەوری سۆری پۆشی زولف و کەزی ڕەشماری
پشت بەستی بەستە پشتی لە ژێر مەمکی هەناری
ناوی خوای خستە زاری دەچتە بێر شەنگەبێری
لەسەر قۆڵی کە لابرد کلەنگوچکی کەتانی
پارچە زیوێ وەدەرکەوت لە ژێر بەفری بەیانی
لە دونیادا حەرامە لە پاش ئەو نەوجەوانی
خودا حیفزی بکاتن لە چاوی دوژمنانی
دەڕوا بەخان و مانی دەچتە بێر شەنگەبێری
بەینی خەزێم و گوارە نە زێڕ نە کارەبایە
لە شەرمەزاری هەردوو ڕوویان زەرد هەڵگەڕایە
قەلبی لە قەلبە هەرکەس بڵێ ڕۆژ یا چرایە
هەرکەس کە دیتنبێتی هۆشی لەسەر نەمایە
بۆ دینی هەر بەڵایە دەچتە بێر شەنگەبێری

وەفایی شیرینی هەڵبژاردووە بۆ وەسفی لەنجەولاری لە کاتی تەشی ڕستندا، وەسفی بزووتنەوەی ئەندامە جوانەکانی لە دەست و پەنجە و مەمک و زگ و ناو ڕانی دەکا. بەڵام



موخلیس کچێکی شۆخ و شەنگی دەشتی هەولێری هەڵبژاردووە لە بەهار و سەرەتای هاویندا خۆی ئامادە دەکا بۆ مەڕ دۆشین. ڕستەی «دەچتە بیر شەنگەبێری» لە دوایی نیوە دێڕی پێنجەمی هەموو بەندێک دووبارە دەکاتەوە.

لەو دێڕانەدا شاعیر وەسفی بەهار و هەندێ لە ئەندامە جوانەکانی ئەو کچە مەڕدۆشە دەکا لەو کاتەی بەرەو جێگەی مەڕدۆشین دەچێ، واتە بێرێ. باس لە شەدە و پشتێندی جوان و فەقێیانەی کەتان و خەزێمە و گوارەی زێڕین دەکا کە کوڵمی سووری لە نێوانیاندا دەدرەوشێتەوە.

شاعیر لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و دەڵێ:

بەقەددی شەنگ و شۆخی سوڵتانی نەونەمامان
وا کەوتە ڕێ بەلەنجە وەک کەبکی پڕ خەرامان
لەتافەتی لێ دەچکا لەسەر هەتاکو دامان
کەس نەبوو کاس نەبێتن لەبەر بۆنی شەمامان
کەی خوایە دێتە لامان دەچتە بێر شەنگەبێری
نەسرین و سەرو و لالە گیابەند و خاو و بەیبوون
شمشاد و عەرعەر و گوڵ چناری دەستی مەجنوون
چاوشۆڕی ئەم نیگارەن هەموو وا بووینە مەفتوون
یەک یەک وەکو غولامان بۆ پایە بۆسی هاتوون
لە پێشی خاک و پا بوون دەچتە بیر شەنگەبێری
کە هاتە دەر لە ڕەشماڵ ڕۆژ بوو لە هەوری دەرهات
بەحوسنی خۆی دەنازی سەرخۆشە و بێ موبالات
غەوغا دەکەوتە عەردی کەوتە سەما سەماوات
عالەمی کوشت بەجارێ دوو چاوی پڕ ئیشارات
ئەم فیتنەیە لە کێ هات دەچتە بێر شەنگەبێری

لەگەڵ وەسفی بزووتنەوە و لەنجەولاری کچە جوانی مەڕدۆش شاعیر خەریکی سروشتی بەهاری دەشتی هەولێرە، ناوی ئەو گوڵ و گوڵاڵانە دەبا کە لەو دەشتەدا شین دەبن، هەموویان سەر دادەنوێن لە ژێر پێی ئەو جوانەی دەچێتە بێرێ. شاعیر ئاماژەی بۆ ئەو دەوەنە باڵا بەرزانە هەیە و لەگەڵ باڵای لەیلای مەجنوون بەراووردیان دەکا. ئەو کچە

جوانەی دەچێتە بیرێ دیارە لەو بەهارەدا لە هەواری ڕەشماڵان لەگەڵ کەسوکاری دەژی. شاعیر کە دەڵێ ئەو کاتەی لە ڕەشماڵ هاتە دەرێ بەرەو بیر بچێ وەکو ڕۆژ وا بوو لە هەور بێتە دەرێ، ئەم وێنە هونەرییەی لە ئەدەبی میللی نەتەوە کۆچەرەکان وەرگرتووە.

موخلیس قەسیدە پێنجینەکەی بەم بەندانە کۆتایی پێ دێنێ:

بۆ پاسەوانی باغی زابیتی چاوی مەستی
تیروکەوانی هێنا ئازانە گرتیە دەستی
لەم باغە نەک دزێ بێ باقە گوڵەک ببەستی
ئەمری دەکردە عەسکەر هەرکەس لە جێی هەڵستی
بۆ سەلاملغ ڕاوەستی دەچتە بیر شەنگەبیری

دەشتی قەراج بەهەشتە ئەو حۆرییە بەتەنیا
بۆ دڵ گوشادی جار جار مەیلی دەکاتە هەر لا
قاز و قولینگ و سینە هاتوونە بۆ تەمەننا
بنوارنە کار غەزلان چۆن بووینە شێت و شەیدا
کەوتوونە چۆڵ و سەحرا دەچنە بیر شەنگەبیری

(موخلیس) ئەگەرچی پیرە قامەتی وا چەماوە
ئەممان لە دڵ جەوان و لاوچاک و تازە لاوە
بۆ گرتنی غەزالان کەیفی لە سەیر و ڕاوە
بەتیری کچە کوردێک جەرگ و دڵی پساوە
یەقین کاری کراوە دەچتە بیر شەنگەبیری

لەم دێڕانەدا موخلیس وێنەی جوانی ڕۆمانتیکییانە دروست دەکا بۆ ڕێزگرتن لەو کچە جوانە مەڕدۆشە. دەیکا بەحۆری، کە ئەو حۆری بێ دەشتی قەراج لە خوارووی ڕۆژئاوای هەولێر دەبێتە بەهەشت. لە چاو و برۆ و برژانگی کچە جوانی شەنگەبیری لەشکرێک دروست دەکا بۆ پاراستنی جوانی ئەو بەهەشتە. باڵندە و فڕندە و قاز و قولینگ و مامزە چاو ڕەشەکانی دەشتی قەراج هەموویان لە خزمەت شەنگەبیری حۆرین. دیارە شاعیریش هەرچەندە پیر بێ، هەر دڵدارە و لە دڵداری ناکەوێ، دلبەری یا شەنگەبیرییە، یا هەر کچێکی دیکەی کورد، چونکە لە ناو کورداندا کچی جوان زۆرە.

***



مەلا خەلیلی موخلیس یەکێکە لە شاعیرە ڕەندەکانی ناوچەی سۆران. بێ گومان مەڵبەندی ژیانی لە دەشتی هەولێر هۆیێکی گرنگ بووە خەیاڵی شیعری بتەقێنێتەوە. پێوەندی کۆمەڵایەتی یارمەتیی ئەوەی داوە لەگەڵ شارەزایی لە زانستییەکانی ئایینی ئیسلامی و ئاشنایی لە زانستییەکانی تازە بابەتدا هەبێ. لە ئەنجامی خوێندنەوەی شیعری کلاسیکی قوتابخانەی نالی گوێی مۆسیقی بەهێز بووە. لە زمانی شیعریدا لاسایی کەسی نەکردۆتەوە. دیالێکتی ناوچەیی سۆران (هەولێر) بەسەر شیعرییەوە دیارە. شیعری لەسەر کێشی عەرووزی وتووە، بەڵام ناوەڕۆکی ناوچەییبیە. لە هەموو بابەتەکانی شیعری کلاسیکی وتووە، لە وەسفی سروشت و بەکارهێنانی زاراوەی سۆفیزم و گێڕانەوەی مێژووی سۆفیزم زانیاری هەیە، ئەمە لە بەرهەمیدا ڕەنگی داوەتەوە.

## بەشی چواردەم

## وەزیری نادری

### ١٩١١ – ١٩٤٦

### ژیانی

وەزیر کوڕی جەبار کوڕی نادر لە ١٠ی مایسی ١٩١١ لە گوندی بۆرالان لە ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی لە دایک بووە. بەپێی دەستووری کوردەواری بە وەزیری نادری لە ناو خەڵکیدا ناسراوە. باوک و دایکی لە خێزانێکی کوردی کۆچەر بوون. تەمەنی سێ ساڵی بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە. بەمە گوزەرانی دارایی ماڵیان تێک دەچێ. نوورای دایکی ژنێکی بەکار بووە لە ماڵە دەوڵەمەندان کاری کردووە بۆ ئەوەی منداڵی پێ بگەیەنێ. ساڵح و یووسفی برای شوانکارە بوون، بەڵام شەرۆ بچووک بوو. دایکی وەزیر لە بەرخوێندن دادەنێ لە حوجرەی مزگەوت، ماوەیێک دەخوێنێ فێری تورکی و فارسی دەبێ. لە خوێندندا زیرەک بووە، لە فێرکردن یارمەتی هاوڕێکانی داوە لە شاگردانی حوجرە. وەزیر لە لای مامۆستا خۆشەویست بووە، لێیەوە نزیک بووە. کتێبی ئەدەبی و دیوانی شیعری خستۆتە بەردەستی. لە سەردەمی قوتابیەتییەوە هەوەسی خوێندنەوەی شیعر و لە دواییدا مەشقی نووسینی بووە.

لە ساڵی ١٩٢٥ لە دوای کارەساتەکەی لە سێدارەدانی شێخ سەعیدی پیران و هاوڕێکانی قەلاچۆکردنی کورد لە لایەن کەمالییەکانەوە بەردەوام بوو. لەو ڕۆژگارە شوومەدا لە ساڵی ١٩٢٦ هەزار و حەوسەد ماڵی عەشرەتەکانی برووکی و شاولیک و بەشک و بانۆکی کورد و هی دیکە لە دەست دڕندەیی تورکە کەمالییەکان ئاوارە بوون و خاکیان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە قەفقاسی ڕووسیا و پەنایان بردە بەر دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان. ماڵی وەزیر یەکێک بوو لەو ئاوارانە.

لە ساڵی ١٩٢٨ وەزیر بووە بەقوتابیی قۆناغی ناوەندی لە گوندی سێردەرەک لە ناوچەی نەخچەوان. ئەم ناوچەیە کۆماری ئەفتۆنۆمی بوو سەر بەئازربێجان و دانیشتوانی بەزۆری ئازەری و ئەرمەن و کەمێکیش کورد بوون. ساڵێک لەو قوتابخانەیەی خوێندووە و ئەوجا بووە بەمامۆستای قوتابخانەی گوندی شاولێک لەو ناوچەیەدا، لە پاشانا لە ساڵی



١٩٣٣ کارگێڕی ئەو قوتابخانەیەی پێ سپێرراوە. لەم کارەیدا زۆر نەماوەتەوە لە پاییزی ئەو ساڵەدا ماڵی گواستۆتەوە یەریڤان و بووە بەمامۆستای تێکنیکۆم و وانەی زمانی کوردی وتۆتەوە. هەر لەو کاتەشدا بۆتەوە بەقوتابی. لە ساڵی ١٩٣٥دا لە ئامۆژگای پەروەردەی ئەرمەنی و ئامۆژگای پەروەردەی ڕووسی بۆتەوە بەقوتابی و لە ساڵی ١٩٣٩دا هەردووکیانی تەواو کردووە.

لە ساڵی ١٩٤٠ لە زانستگای یەریڤان وتنەوەی زمانی فارسی پێ سپێررا. لەو کاتەی مامۆستا بوو لە زانستگا لە بەشی خوێندنی باڵا خۆی ناونووس کرد و بوو بەقوتابی دوکتۆرا.

نامەی خوێندنی باڵای ئامادە کرد، لەسەر بەرگری کردن بوو لە نامەکەی بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەدا لە ڕۆژی ٢٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ بەدەستی نەیارانی دەسەڵاتی سۆڤیەتی و دوژمنانی کوردەوە کوژرا و کورد فرزەندێکی دیکەی گۆڕەپانی ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە دەست چوو.

### وەزیری مامۆستا و ڕۆشنبیر

وەزیر جگە لە زمانی دایکی زمانانی تورکی (ئازەری) و فارسی و ڕووسی و ئەرمەنی و گورجی زانیوە. بەشی زۆری ژیانی بەمامۆستای خوێندنی قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەنجی و ئامادەیی و زانستگا بردۆتە سەر. لە کاروباری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری چالاک بووە. لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا کۆمەڵێک وتار و نووسینی هەمەڕەنگی لە ڕۆژنامەی «ریاتازە»ی کوردی لە یەریڤان بەزمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە. وەزیر دەوری گرنگی بووە لە ناساندنی کورد لە هەموو ڕوویێکەوە بەخوێنەری ئازربێجانی و ئەرمەن بۆ ئەم مەبەسە گەلێ وتاری بەزمانی ئەرمەنی لە ڕۆژنامەی «ئەرمەنستانی سۆڤیەت» و بەزمانی ئازربێجانی لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی ئازربێجان بڵاوکردۆتەوە.

گرنگترین کتێبێکی پەروەردەیی ئەوەیە کە وەزیر بۆ قوتابیانی داناوە و لە لایەن وەزارەتی پەروەردەی ئەرمەنستانەوە بڕیاری لەسەر دراوە وەک کتێبێکی سەرچاوە بۆ قوتابخانە کوردییەکان. ئەم کتێبە بەم ناوەوە بڵاوکراوەتەوە «زمانێ کورمانجی – زماننامە، ڕاستنڤیسار، ئاخافتنا خەبەردانێ. ژ ئالییێ مینیستیریا ڕۆنایێ ئەرمەنستانێ هاتیە قەبوول کرنێ» لە یەریڤان لە ساڵی ١٩٤٧ لە چاپ دراوە.

وەزیر یادی پیرۆز و پڕ لە سۆزی لە ناو دڵ و دەروونی نەوەندی ڕۆشنبیری کوردی قەفقاسی ڕووسیا لە شاعیر و نووسەر و خوێندەواران بەجێ هێشتووە، بەداخەوە بیری دەکەنەوە و نەفرەت لەو پیاوکوژانە دەکەن کە بوونە نەمانی فرزەندێک کورد هێشتا پێویستی پێی هەبوو.

## وەزیری نووسەر و شاعیر

وەزیر ئەگەر خوێندەوار نەبوایە دیسانەوە دەبوو بەشاعیرێکی میللی نەخوێندەوار، بەڵام کە بوو بەخوێندەوار شیعری میللیی سەرزاری وەرگێڕایە سەر ئەو جۆرە شیعرەی لە دواییدا شیعری کلاسیکی پێ دەڵێن.

لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیستەم وەزیر دوو بەرهەمی ئەدەبی داهێنراوی گرنگی بڵاو کردەوە:

١- کۆمەڵە شیعرێک بەناوی «نووبار»ەوە، ئەم بەرهەمە تاقیکردنەوەیێکی بەکەڵک بوو بۆ دروستبوونی ئەدەبێکی نووسراوی بەرز لە ناو کوردی ئەو وڵاتە کە لەمەوپێش ئەدەبی نووسراویان نەبوو، بەڵکو خاوەن ئەدەبێکی میللیی سەرزاری جوان بوون.

٢- بەرهەمێکی دیکەی گرنگی وەزیر لە ساڵی ١٩٣٥ بەم ناوونیشانە بڵاوکراوەتەوە «ڕەڤا ژنێ، پیەسە بۆنا تاترۆنێ کورمانجا ژ چار پەردە». ئەم بەرهەمە درامایێکی شانۆگەرییە بەناوی ڕەدووکەوتن یا بەدووکەوتنی ژن لە چوار پەردە پێکهاتووە. شاعیر هەوڵ دەدا ناشیرینی و ناهەمواری ئەم ڕەوشتە خێڵەکی و دواکەوتووە لە بەرچاوی خەڵکی کورد ڕەش بکا. ئەوی ڕاستی بێ کوردی ئەو وڵاتە لەو ڕۆژگارەی ژیانی تازەیان دەست پێ کردبوو گەورەترین ناگزوورییان نەخوێندەواری و بەدووکەوتنی ژن بوو، ئیتر نەک تەنیا وەزیر بەڵکو بەگشتی بزووتنەوە ئەدەبییە تازەکەیان بایەخی زۆری بەم دوو جۆرە گیروگرفتە دەدا و ڕەنگیان لە ئەدەبی کوردی و شانۆ دابووەوە بە شیعر و پەخشانەوە.

چالاکی ئەدەبی وەزیر لە جەنگی دووەمی گێتیی سەدەی بیستەم لە لووتکەدا بوو، شیعری زۆری دژی بیری نازیزم و فاشیزمی هەڵگیرسێنەرانی جەنگ نووسیوە، ستایشی بەرەی سوێندخۆرانی کردووە بەتایبەتی دەسەڵات و سوپای سۆڤیەتی ئەو سەردەمە. نموونەی ئەم ئەدەبە بەرزەی چیرۆکی شیعری «وەتەن و هزکرن» (نیشتمان و دڵداری) یا «نادۆ و گولیزەر»ە. چیرۆکێکی شیعری درێژە، خۆیان «پۆیێم»ی پێ دەڵێن، لە دە بەش



پێکهاتووە. بەرهەمێکە گەلێ هەڵوێستی ناسک لە ژیانی تاکی ناو کۆمەڵ و مرۆڤایەتی دەووروووژێنێ.

وەکو لە ناوی بەرهەمەکە دەردەکەوێ قارەمانی سەرەکی چیرۆکەکە دوو کەسی کورد نادۆ و گولیزەرن. ئیتر شاعیر ڕێگە بەخەیاڵی شیعری خۆی دەدا بەئازادی لە گێتیی داهێنانی ئەدەبی بسووڕێتەوە. دیارە پێش هەموو شتێک نادۆ و گولیزەر دڵدار و دلبەرن، ئینجا دەبن بەرەمزی نیشتمانپەروەری و جەنگاوەری، مێژوو شانازییانە، ئاشتی و دیموکراتی نیازیانە، لە سایەی کۆمەڵی یەکسانیدا دەتوانن دەست لە ملی یەکتری بکەن و بەئازادی بژین.

وەزیر لەم کارە ئەدەبییەیدا بایەخی زۆری بەو ڕووداوانە داوە کە لە مێژووی کوردا بوون بەرەمزی شانازی. شەرەف خانی بدلیسی و ئەحمەدی خانی و خانی لەبزێرین و مەلای جزیری یاد دەکاتەوە. بەلای ئەوەوە کورد تەنیا دێرینەکە نییە. ڕۆژی ئەمڕۆ کوردی هەموو کوردستانەکان لە تورکیا و ئێران و عیراق و سووریا وڵاتەکەی خۆیان، هەموویان هەڵساونەتە سەرپێ، لەگەڵ بەرەی دیموکراتی و لە دژی جەنگخوازە فاشستەکان.

شاعیر گێڕانەوەی ڕووداوەکانی بەقسەی نەستەق و پەندی پێشینان و بیروڕای داناییانە ڕازاندۆتەوە. ڕەچاوی ئەوەی کردووە زۆرترین خەڵکی کوردزمان لە خوێندەوار و نەخوێندەوار لە قسەکانی بگەن و مێشک و خەیاڵیان بجووڵێنێ.

وەزیر پێشەکی چیرۆکەکەی بەم دێڕە شیعرانە دەست پێ دەکا:

خولی دێیە بۆنا هەر بەنی ئینسان
هەر تشت ژێیە ئو مرن هەر زەمان
وەلات باڤە نە تەنێ فرۆتن نە کرین
ئازایی ناڤە کولتوور بۆی تاریقا مێزین
دەرب یا دایانە هوون بکن باوەڕی
ناڤ بۆی گشکانە خۆف کو نەکە سەرکاری
ئەو شێرێ شێر مێرخاسێ پر ناڤدار
تاریقێدا حوبرا زێڕین تێ نڤیسار
عەسمان ژ وێ دا نزلە بۆی سەیرانگێ
ب خوونێ خەملاندییە جیێ جەنگێ

بنێڕە ستوخار ل عەگیتێ منی ب عەمەل
نادۆیێ کوباری بێ خۆفی بێ عەجەل

***

با دەعوەتە هێسرێ عەورا ژی باران
هەر شایێ شینەک هەیە هەر ئوسان
تم پێشێ ئینسانە حوب و حەز کرن
شین و شایی ژ هەڤ نایێن کرن

بەم وێنە شیعرییە جوان و پڕ مانایانە شاعیر ڕێگە خۆش دەکا بۆ باسکردن لە سۆزی دڵداری لای ئەو کوڕ و کیژە کوردەی ناویان نادۆ و گولیزەرە و بوون بەرەمزی دڵداری و نیشتمان.

***

وەزیری نادری یەکێک بوو لە ڕۆشنبیرە بەرچاوەکانی کوردی وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا. ئاسۆی بیری فراوان بوو، توانای داهێنانی بەهێز بوو، سەری لە سیاسەت و جموجۆڵی نیشتمانپەروەری دەردەچوو. ژیانی کورت بوو بەڵام تاقیکردنەوەی زۆر بوو، دایک و باوکی تا پاش لە دایکبوونی ئەویش گوزەرانیان باش بوو، لە دواییدا کەوتنە بەرەی هەژارانەوە. شوێنەواری ژیانی دواکەوتوویی دەسەڵاتی تورکی عوسمانی لە مێشکیدا ماوە. زوڵم و زۆری پیاوکوژە تورکە کەمالییەکانی لە بیر نەچووە، دڵسۆزی ئەو دەسەڵاتەی قەفقاسی ڕووسیا کە لە تیرۆری تورک کەسوکاری ڕزگار کردن لە پێش چاوە. ئەم هەموو هۆیانە قوتابخانەی بنچینەیی وەزیری نادری بوو. تاقیکردنەوەی ئەم ژیانە تاڵ و تفتە، لەگەڵ خوێندنی بەردەوام و زانینی کۆمەڵێک زمانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی مامۆستا و نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیرێکی کوردی بەدیمەنی لە وەزیری نادری دروست کرد.

# بەشی پازدەم

## قەدری جان

**١٩١١ – ١٩٧٢**

### ژیانی

عەبدولقادر کوڕی محەممەد عەزیز جان لە شارۆچکەی دیرک لە نزیک ماردین لە ساڵی ١٩١١ لە دایک بووە. لە دواییدا لە نێوەندی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و ناو خەڵکیدا بە قەدری جان ناسراوە. سەرەتای خوێندنی لە وڵاتی خۆی بووە، ئینجا ڕووی کردۆتە شاری قۆنیە لەگەڵ ڕەشیدی کورد لەوێ لە خانەی مامۆستایان لە ساڵی ١٩٢٨ – ١٩٣١ خوێندوویانە. بەهۆی جموجۆڵی سیاسییانەوە لە دەست تەنگەتاوی دەسەڵاتی شۆڤێنی تورک ئەوێیان بەجێ هێشتووە و ڕوویان کردۆتە ناوچە کوردییەکانی سووریا.

لەو کاتەدا کە قەدری جان هاتۆتە سووریا (١٩٢٨) لە تەمەنی حەڤدە ساڵی بووە لە قۆنیە خوێندنی تەواو نەکردبوو، لە شاری سەلەمییە خوێندنی لە خانەی کشتوکاڵی مامۆستایان گەیاندۆتە ئەنجام، ئینجا بەمامۆستای قوتابخانە لە ئەنتاکیا دامەزراوە، لە پاشانا لە قوتابخانەکانی قامیشلی و عاموودە مامۆستا بووە ئەوجا ماڵی گواستۆتەوە دیمەشق و بەمامۆستا لە قوتابخانەییێکی گەڕەکی کوردان دامەزراوە. لە ساڵی ١٩٣٤ لە پاش فێربوونی زمانی عەرەبی بووە بەمامۆستا لە شاری ئەسکەندەروونە، لە دوای ئەوە لە هەندێ لە قوتابخانە جیاوازەکانی شارانی سووریە بووە بەمامۆستا و لە هەندێکیاندا بەکارگێڕی قوتابخانە.

لە ساڵی ١٩٤٤ گۆڕانی بیری لە مێشکیدا سەری هەڵداوە و باوەڕی وا بووە فیکری سۆسیالیزمی زانستی میللەتەکەی لە مەینەتی ژێردەستی و دیلیەتی و دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی ڕزگار دەکا. ئەمە تووشی سەرئێشەی کردووە. لە تەمووزی ١٩٥٧ لەگەڵ نێرراوی لاوانی کورد بەشداری لە میهرەجانی شەشەمی لاوانی گێتیی کردووە لە مۆسکۆ. لەو کاتەدا مەلا مستەفا بارزانی زۆر نەبوو بۆ یەکەم جار لە تاشقەندەوە جێگەی زیندەگانی گواسترابووەوە مۆسکۆ. لەو گەشتەیدا چاوی بەبارزانی کەوت، بۆ یەکەمین جاریش ئاشنایەتی لەگەڵ قەناتی کوردۆ پەیدا کرد. ئەو سێ کوردە گەلێ بیرەوەرییان



لەگەڵ یەکتریدا هەیە. لە دوای ساڵێک پاش گەڕانەوەی بارزانی بۆ نیشتمان قەدری جان ڕوو دەکاتە بەغدا بۆ پێشکێش کردنی پیرۆزبایی بەهۆی گەڕانەوەی بارزانیان بۆ وڵات و دەبێتە میوانی مەلا مستەفا.

لەمە بەدواوە ژیانی قەدری جان دەکەوێتە ناخۆشییەوە. چوار جار گیراوە، درێژترینیان لە ماوەی ١٩٥٩ تا ١٩٦١ بووە، لە بەندیخانە بەناوبانگ و ترسێنەرەکەی سووریا «مەززە» کاتی بردۆتە سەر. لە پاشانا گەڕاوەتەوە قوتابخانە، لە ساڵی ١٩٦٩ لە پیشەی مامۆستایی دوورخراوەتەوە و کراوە بەمووچەخۆری میری. دوا ساڵانی ژیانی لە دیمەشق بردۆتە سەر. لە ساڵی ١٩٣٩ ژنی هێناوە کچەکە بەنەژاد تورک بووە، باوکی لایەنگری دەسەڵاتی عوسمانی و لە دژی کەمالییەکان بووە. لە ڕۆژی ٩ی ئاغستۆسی ١٩٧٢ بەنەخۆشی هەژانی مێشک کۆچی دوایی کردووە و لە دیمەشق نێژراوە.

### شیعری

قەدری جان یەکێکە لە شاعیرانی کوردستانی باکوور لە ساڵی ١٩٣٦ شیعرێکی داناوە دەچێتە ناو بزووتنەوەی «شیعری نوێ» لە ناوچەی سلێمانی لە کوردستانی باشوور، هەرچەندە شاعیر ئاگاداری بزووتنەوەکەی سلێمانی نەبووە، هەروەها زوو بەزووش ئەم داهێنانەی شاعیر نەبووە نەریت و شاعیرانی ئەوێ پێڕەوییان نەکرد، تەنیا خۆی لە دوای ئەم شیعرە بەرهەمی هەیە دەچێتە ناو ئەم شیعرە نوێیەوە. بەڵام بەشدارییێکی گرنگ بوو لە چەسپاندنی ئەو قوتابخانە تازەیە لە ئەدەبی کوردیدا بەگشتی، هەروەها زیرەکی و هوشیاری قەدری جان دەخاتە ڕوو لە ژێر کاریگەری ئەدەبی ڕۆمانتیکی ئەوروپا و ئەدەبی نوێی تورکی ئەم ئینقیلابە مەزنە لە ئەدەبی کوردیدا بەرپا بکا.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

قەدری جان ئاگاداری شیعری کلاسیکی کوردی بوو، چێژی لێ وەردەگرت و ئەگەر ئارەزووی بکردایە دەیتوانی بەڕوخسار شیعری کلاسیکی ئامێز دابنێ. کەچی ئەو لەگەڵ نوێگەریدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا شوێنەواری کلاسیکی لە شیعریدا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەوە هەیە وەکو خۆی وەری نەگرتووە و دەسکاری تێدا کردووە بەمە بووە بەوێنەییێکی تازەگەری. بۆ بەڵگە هەولێ داوە شیعر بهۆنێتەوە لەسەر بنج و بناوانی بەندی چوارین لەسەر قافیەی (ا ا ب ا) و (ا ا ا ب).

شیعری بەگشتی دەچێتە ناو قوتابخانەی «شیعری نوێ»ی کوردییەوە. کێشە خۆماڵییەکانی سیلابی بەکار دێنێ، لەوانە بەزۆری حەوت بڕگەیی و هەشت بڕگەیی. لە شیعرێکدا ئەم کێشانەش کەرت دەکا، تەنیا بەوە ناوەستێ دێڕە شیعری دوو بڕگەییش بەکار دێنێ. شیعری لە ڕووی مۆسیقییەوە ڕەوانە، وشەی فەرهەنگی شیعری ئاسانە، زمانی کوردی پەتییە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مانای داخراوی هەیە، ئەمە زیاتر لەوەوە هاتووە لەو کاتەی پەنا دەباتە بەر شێوازی سیمبۆلی، ئەمە لە لیریکی هونەری سەردەم نزیکی دەکاتەوە و لە ئەدەبی میللیی سەرزار دووری دەخاتەوە.

### شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

قەدری جان لە منداڵییەوە هەستی بەوە کردووە لەبەرئەوەی کوردە بەچاوێکی نزم تەماشا کراوە، هەر لەو کاتەوە دوژمنی خۆی ناسیوە، بۆیە مەسەلەی نیشتمانی گەلەکەی خۆی بەمەسەلەی نیشتمانی هەموو میللەتە زوڵم لێکراوەکان بەستۆتەوە، ئەمە نوێشکی ناوەڕۆکی شیعریەتی. لەو کاتەی هەوڵی داوە شیعری ببێتە وێنەی ڕاستەقینەی هەستی ناوەوەی هەموو چەوساوەیێک ئاگاداری لایەنە هونەرییەکانی شیعر بووە، ئەمەی نەکردووە بەقوربانی بیروباوەڕی سیاسی بۆ ئەوەی زۆرترین خەڵک تێی بگەن، بەڵکو وەستایانە توانیویەتی لایەنی جوانکاری بپارێزێ و خەڵکیش لە شیعری بگەن. خۆ ئەگەر شیعری وای هەبێ تەمومژی سیمبۆلیزم و ڕۆمانتیزم هەندێ لێڵی بخەنە سەر وێنە و ماناکانی ئەمەیان کارێکی ئاساییە بەپێی ئەو تیۆرییەی دەڵێ پێویستە بۆ فراوانترین توێژەکانی کۆمەڵ بنووسرێ، ئەدی فەیلەسوف و دانا و ڕۆشنبیرە گەورەکانیش پێویستییان بەداهێنانێک نییە چێژیان بجووڵێنێ و خەیاڵیان بەدەنگ بێنێ!

داهێنان لە شیعری سیاسیدا شاعیرێکی وەستای گەرەکە، چونکە کە ئیلهام لە دیاردەیێک یا ڕووداوێک وەردەگرێ و پارچە شیعرێکی بۆ دادەنێ لەوانەیە ئەم دیاردە و ڕووداوە درەنگ یا زوو بەخراپە بگەڕێتەوە، ئەو کاتە دەبێتە دروشمێکی سیاسی ڕۆژانەی بێ تام، بەڵام قەدری جان لەو شاعیرانەیە بەرهەمی ئەدەبی لە سەرچاوەکەی جیا دەکاتەوە و دەبێ بەموتڵەق و بەهیچ جۆرێ بۆنی سەرچاوە بنچینەییەکەی لێ نایە. لەبەرئەوەیە حسێب لەگەڵ بەرهەمی ئەدەبی دەکرێ لە ڕووی هونەرییەوە و هیچ پێوەندییێکی بەئیدیۆلۆجییەتی نووسەرەکەوە نییە.



### پەخشانی

قەدری جان لە سەرەتای ژیانی ئەدەبییەوە لە هونەرەکانی پەخشان سەرکەوتوو بووە. بەهۆی ئەوەی لە نزیکەوە پێوەندی بەرۆژنامەگەری کوردییەوە هەبوو لە سووریا مەشقی نووسینی وتاری ئەدەبی و کۆمەلایەتی بووە، لەوەوە هەوڵی داوە چیرۆکیش بنووسێ. بەزۆری سنووری لە نێوان چیرۆک و وتار دانەناوە. دیارە ئەمە سیفەتێک نەبووە تەنیا لای ئەو بووبێ، هەموو ئەو شاعیرانەی لەو سەردەمەدا مەشقی نووسینی وتار و چیرۆکیان کردووە، هەندێ جار ئەم دوو هونەرەیان تێکەڵ بەیەکتری کردووە بەبێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن. ئەم دیاردەیە لە ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی گێتیدا هەیە.

نووسینە پەخشانییەکانی قەدری جان پێوەندییان بەئەدەب و ژیانی کۆمەلایەتی کورد و ناساندنی هەندێ گەورەپیاوانی کورد و سروشتی کوردستان و بیروباوەڕی دیمۆکراتییەوە هەیە. کارێکی چاکی کردووە کە بایەخی بەئەدەبی میللی سەرزار (فۆلکلۆر) داوە و چەند حیکایەتێکی میللیی ئەفسانەیی بەرگوێی ئاگردانی دووبارە بەزمانێکی ئەدەبی ڕۆشنبیرانە داڕشتۆتەوە.

### نموونەی شیعری

١

قەدری جان بەم جۆرە موناجات لەگەڵ خۆشەویستدا دەکا لە شیعرێکیدا بەناوی "دادێ":

بەهارە ژییانا من بێ تە پایزە دادێ
بۆ من دیارێ جەننەت بێ تە فاییزە دادێ
چێل کەوا لنگ شکەستی ل پێ هەڤالێن خوە ما
چێلکە و ئەز بم و نەگریم ما قەی جاییزە دادێ

***

دادی پر کوور مەنالە تە جەگەر ل من نەهشت
دەوسا کۆن و لۆرنی ئاه و زارینا خوە هشت
گرین ترسێ ددە من خراپ دکە سنگ و پشت
ییدن خوین کێمێ دزێن کانی و کارێزێ دادێ

***

هەرچەند پۆل و پەتالێن ژ بەر خانومانان مان
گەلەک قەنج گریَ بدە ل برینێن خوە ئەمان
بژشکێن مە چێدکن ژ بۆ دەردێ تە دەرمان
هنەک ژوان سەکبانێن هن ژ نافزە دادێ

***

داو نە ما مە ماچ کر پاقژ نە پاقژ بێ دەست
هەر کێ ئەڤ حالێ مە دیت گۆتنا پارسەکییە گەست
دە وەر ژ بەرڤی دەردێ مەبە پەریشان و مەست
نە ئەقل ما نە نەشی وور نە ژی حافزە دادێ

***

خوەرن ڤەخوەرن تونە هەبە ژی من سوند خواری
پاری یەک ب هێسانی د قرکا مە ناری
دیتنا تە میەسەر مەکە خودایێ باری
گاڤ و دەمێن مە هەمی روژی پەهریزە دادێ

***

ژ بەر کێمانی یێن خوە ل جەم تە شەرمەسارن
تەنێ تو کوور مەناله ئەم ژ تە هێڤیدارن
ژ چاڤێن مەیێن مەلوول هێسترێن خوین دبارن
ژانا زراڤ تۆڤ مەکە ئەمان پاکیزە دادێ

ئەم شیعرە موناجاتێکی بەرزە قەدری جان لەگەڵ خۆشەویستدا دەیکا. ئەو خۆشەویستە تەنیا دلبەر نییە، دایک و خوشک و کچن. بۆی هەیە وەکو داهێنانێکی شیعری بەرەی پیاوانیش بگرێتەوە. لە سۆزێکی بەکوڵی ڕاستییەوە هەڵقوڵاوە. شاعیر ڕوو لەو خۆشەویستە نزیکانە دەکا ئەوانەی لەوە دڵنیایە ئەوەی دەیڵێ تێی دەگەن، چونکە ئەو کارەساتانەی بەسەر ئەو هاتووە ئەوانیشی گرتۆتەوە.



## ٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «بەگێ ئاخرزەمان» قەدری جان بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

دۆستێ من
دژمنێ پۆستێ من
بەگێ ئاخرزەمان
ئەڤ زەمبیلا تو پێ هاتی
نەما داتێ ژ ئەزمان
بەنێ وێ رزی یا
ل ناڤا رێ قەتییە
ئو کەت
کەت ناڤا دەریا سۆر
دەریا سۆر ژێرا بوو گۆر
دەریا سۆر
ژ تێر خاوەن و چەند خودایێ بچووک را
بوو کەفەن
مووسا و مریدێن هەمی
بێ پر و بێ گەمی
ژ وی دەریایێ دەرباز بوون
ژ جەور و جەفایێ
ل ور خەلاس بوون
نەمرוودێ بچووک
مە ب ئاگر دترسینە
پف مەشکا ڤالا
ئەی کەڤنارەیێ سالا
باوەری یا دلێ من
تا قەتا ملێ من

ژ ئیمانا ئیبراهیم بێترە

نە کێمترە

ڤێیا بزان

ئەی پێغەمبەرێ دزان

ئەم پارچەیە بەشێک بوو لە پۆیێمێکی بەرز و ڕەنگین بەشێوازێکی ڕۆمانتیکی و سیمبۆلییانە قەدری جان باس لە ژیانی دەستبەسەری و نالەباری نەتەوەکەی خۆی دەکا لە سووریا. لە دوای جەنگی دووەمی گێتی و بەسەرچوونی دەسەڵاتی ئەمپریالیستی فرەنسی لە سووریا و لبنان، حوکوومەتە یەک لە دوای یەکەکانی سووریا سیاسەتی بەعەرەب کردنی هەموو هاووڵاتییە ناعەرەبەکانیان بەکار دەهێنا، بەتایبەتی لەگەڵ کورد زۆر تیژ بوون. ئەم شیعرە لەو سەردەمەدا نووسراوەتەوە کە یەکێتی لە نێوان میسر و سووریا و یەمەن جێبەجێ کرا و بوون بەیەک دەوڵەتی یەکگرتووی عەرەب.

لەم شیعرەدا قەدری جان لەگەڵ جەمال عەبدولناسری شۆڤێنیی عەرەب قسە دەکا، پێی دەڵێ بەقسە دۆستی منی، چونکە من هاووڵاتی تۆم لە سووریا، بەڵام بەڕاستی تۆ دوژمنی، من لەناو دەبەی، بەڵام ئەی بەگی ئاخر زەمان، واتە گەورەی ئاخر زەمان ئەو زەمبیلەی تۆی هێناوەتە خوارەوە پەتی ڕزیبە و زوو دەپسێ و دەکەوییە ناو زەریای سوور و دەخنکێی. ئەو زەریایە بووە بەگۆڕستان بۆ گەلێ لە دەسەڵات بەدەستانی سەر بەتۆ. لە پاشانا زیرەکانە بەسەرهاتی مووسا پێغەمبەر دەگێڕێتەوە دارە قولەکەی پێ بوو بەبێ پرد و بێ بەلەم لەو زەریایە پەڕیبەوە. لەولاشەوە ناوی نەمروودی بچووک دەبا مەبەسی کاربەدەستانی پیاوی عەبدولناسرە کە کورد لە سووریا دەچەوسێننەوە. ئینجا پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری دزان ئەوە بزانە باوەڕی من بەرامبەر بەکورد لە باوەڕی ئیبراهیم پێغەمبەر بەهێزترە بەرامبەر بەخوا. شاعیر ناوی ئیبراهیم پێغەمبەری لەبەرئەوە هێناوە چونکە عەرەبە شۆڤێنییەکان کردوویانە بەڕەمزی نەتەوایەتییان.

ئینجا لەسەر پۆیێمەکەی دەڕوا و دیسانەوە پێنج دێڕە پێشەکییەکەی دووبارە دەکاتەوە و دەڵێ:

دۆستێ من

دژمنێ پۆستێ من

بەگێ ئاخر زەمان

ئەڤ زەمبیلا تو پێ هاتی



نەما داتێ ژ ئەزمان

مەزناتی

نە ب پارە و مالە

نە ژ ب گەرما کالە

مەزناتی

ب جەوهەرێ ئینسانە

ب عیلم و ب عیرفانە

بەلێ، ئەم خزانێ مالن

لێ زەنگینێ کەمالن

زەنگینێ ئیدیالن

کۆشکا تە ئاهم ڤالا

یا ب نەینۆکێ پالا

یێن ب خاین

یێن ب برین

تە ئاڤاکر و د بندا ڕوونشت

ئو گەلەک ڕەبەن ژ برچینا کوشت

ئەوێ ل سەر سەرێ تە هلوەشە

گەر چ دلێ مە ب تە نایێشە

لێ ئەم دەخوەزن

ب دل د بەزن

زارۆیێن تەیێن ب گونەه

کو ب هەژمار هەنە نەه دەه

ژ وێ تالۆکی خەلاس بکن

دریا راسترا دەرباز بکن

ڕێیا راست ریبیامە

ئەوە پێغەمبەری یامە

زنجیر شکاندن

ئارمانج گهاندن
بابیلووسکان بستان
دیرۆکا راستان دبێژە:
گوهـ مەدە ئەفسانەیێ دێوان
ب شووندا نەمینە کارڤان
کارڤانی مەدەنییەت
گورووهێ بەشەرییەت
خولاسە
پێشی و پاشی یا فیلۆسۆفە
فیلۆسۆفا مە
ئەڤە
دین، مەزهەب، ئیمان
ببە ئینسان ببە ئینسان
دۆستێ من
دژمنێ پۆستێ من
بەگێ ئاخر زەمان
ئەڤ زەمبیلا تو پێ هاتی
نەما دا تێ ژ ئەزمان

قەدری جان لە قسەکانی بۆ دیکتاتۆر بەردەوامە، پێی دەڵێ گەورەیی بەپارە و ماڵ نییە، بەڕەوشت و زانینە. ئەوە باش بزانە ئێمە خاوەن ماڵێن، لە ڕەوشت و بیروباوەڕ دەوڵەمەندین. ئەو کۆشک و سەرایەی تۆ لێی دانیشتووی بەفێڵ و خوێن دروستت کردووە هەموو هەڵدەوەشێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هیوامان وایە خەڵکی نزیک تۆی بێ گوناهـ، لەم بیروباوەڕە لابدەن، خۆیان ڕزگار بکەن و بێنە سەر ڕێی ڕاست. ڕێی ڕاست ڕێی ئێمەیە، لەو ڕێیەدا زنجیر دەشکێنین و دەگەینە ئامانج، هەموو شتێک بۆ بەختیاری ئادەمزاد دەبێ.



## ٣

لە لیریکی «ڕێیا تەزە» قەدری جان دەڵێ:

ئەڤ پەردەیا رەش و تاری
کو ژ شەڤێن رەش دیاری
من ژ روویێ خوە کشاند
ل بەرچاڤێن خوە چراند
ئو ئاڤێت
ئاڤێت پاش سەد چیایێ
ناڤا هەزار دەرگایێ
من گەمارا گوهێ خوە
ب زمزمەکە نوهـ شوشت
ئو مەقرۆبێن جانی خوە
ب دەرمانەکی نوهـ کوشت
ئەو کو فیکا توفەیلی
کو د دلدا دچەری
من ژ کۆکێدا راکر
هێلیناوی خەراب کر
ئو بلاڤ کر
ل ڕۆژێن دەرباز بوویە
ل راستی یێن کەڤنارە
ل هەڤالێن نە هەڤال
جارا پێشن سلاڤ کر
ئەو زنگۆرا د مژی
من ب کێرێ خەرتاند
ئو ب ئاگر شەوتاند
ئو پاقژ کر

پاقژ کر ژ سەرێ خوە
من ئاڤێت ژ دەرێ خوە
ب چاڤەکی بێ پەردە
ب گوهەکی بێ گەمار
دبن سەر رێگە تەزە
ب مەژیکی بێ زەنگار
ئەدی ب دیتنا خوە
ب بهیستینا خوە
ب ڤینا خوە ئو مەژی
ب رێڤە چوونا خوە ژی
ئەز بووم ئینسانەکی نوو
پەرەستەشێ ئۆلەکە نوو
ئو د باژارێ دلدا
من ئاڤاکر هۆلەک نوو

ئەم شیعرەی قەدری جان بە یەکەمین شیعری ڕێبازی نوێ یا قوتابخانەی نوێ دانراوە لە باکووری کوردستان. بەڕاستی لەم دەورووبەرەدا بوو، یاخود ڕاستتر لە نێوان هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەم ئەم بزووتنەوە ئەدەبییە تازەیە لە کوردستانی باشوور پەیدا بوو. لەم شیعرەدا شاعیر یەکێتییێکی تازەگەری لەم ڕێبازەدا داهێناوە، بەوەی تازەیی لە ڕوخسار و ناوەڕۆک دروست کردووە، شکاندنی کێش و قافیەی کلاسیکی، گەڕانەوە بۆ کێشی سیلابی خۆماڵی، هەڵبژاردنی کێشە عەرووزییە سووکەکان ئەگەر ڕەخنەگر بیەوێ هەندێ لە دێڕە شیعرەکانی بە بەحری عەرووزی بکێشێ. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شاعیر لە گواستنەوە یا گۆڕانی فیکر و ئیدیۆلۆجییەت دەدوێ، ئەمە دیاردەیێکە تایبەتییە بەخۆی، چونکە ئەگەر «وەستاو = ثابت» نەجووڵێنرێ پێشکەوتن نابێ. ئەمە سەرچاوەیێکە بۆ تیۆریی فەلسەفی، بەڵام وەستایەتی قەدری جان توانیویەتی لە سەرچاوەیێکی دوور لە جوانکاری وێنەی هونەراوی داهێنراو دروست بکا بەهۆی شێوازی سیمبۆلیزم و ڕۆمانتیزم. وەکو خۆی دەڵێ بوو بەمرۆڤێکی نوێ و لە نیشتمانێکی نوێدا دەژی، لە ناو شاری دلیشدا نوێخوازی دروست دەکا، ئەمەیان ئاوڕدانەوەیێکی سۆفیزمیانەیە.



## ٤

لە شیعرێکیدا بەناوی «شێرێ وەلات بارزانی هات» دەڵێ:

ل عیراقێ کورد و عەرەب
ئازاد بوونە ژ نیرێ غەرب
ل سەر یەک رێ ل سەر یەک دەرب
رۆژا کوردستانێ هلات
شێر هات وەلات، شێر هات وەلات
مزگین ل وە بارزانی هات

***

ئازاد بوویە سلێمانی
سبا دۆرا مووش و وانی
مەهاباد و سنە و بانی
رۆژا کوردستانێ هلات
شێر هات وەلات، شێر هات وەلات
مزگین ل وە بارزانی هات
بژی ئازادی ئو کوردستان
بژی ئاسایش ل جیهان
بژی ئینسان برای ئینسان
رۆژا کوردستانێ هلات

قەدری جان لە پێشانا پیرۆزبایی لە خەڵکی هەموو عیراق دەکا بەهۆی ئەوەی ڕزگارییان لە ئەمپریالیستی ئەورووپا بووە. کورد لەمەدا قازانجی کردووە، هەندێ لە مافی سروشتی خۆی دەستی کەوتووە، بەڵام گرنگتر بەلای شاعیرەوە ئەوەیە بەهۆی ڕووداوەکانی ١٤ی تەمووزی **١٩٥٨**ی بەغدا مستەفا بارزانی و هەواڵەکانی لە وڵاتی ئاوارەیی گەڕانەوە نیشتمان. ئەو قسە گەرمانەی شاعیر بۆ بارزانی تەنیا لەوەوە نەهاتووە وەک کەسایەتییێکی نیشتمانپەروەر و سەرکردایەتی شۆڕش لە پێناوی مافی کورد بەڵکو پێوەندییێکی گیانی لەگەڵ هەبوو لە پاش ئەوەی لە هاوینی **١٩٥٧** لە مۆسکۆ ناسیاوی

لەگـەڵدا پەیدا کـرد و لە دوای سـاڵێک بارزانی گـەڕایەوە نیـشـتـمـان و قـەدری جـان بۆ پیرۆزبایی لە دیمەشقەوە هاتە بەغدا و ئەم شیعرەی بەدیاری پێشکێش کرد.

***

قـەدری جان شـاعـیـر و نووسـەر، نیـشـتـمـانپـەروەر و سیاسی، لە تەمـەنی منداڵییـەوە تا کـۆتـایی ژیانی بەربەرەکـانی کـراوە لە لایەن دەسـەڵاتدارانی تورکـیـا و سـووریا، ئەوانەی خـاکی کـوردیان کـەرت کردووە و هێڵی سنووریان کـێـشاوە. قـەدری جـانیـان ئازار داوە، خـسـتـوویانەتە بەندیخـانە و دەربەدەریان کـردووە، بەڵام ئەو کـۆڵی نەداوە. خـزمـەتی لە قوتابخانە و پێگەیاندنی منداڵان لە کارە ئەدەبییەکانی کەمتر نەبووە.

قـەدری جان شـاعـیـرێکی خـۆڕسک بوو، لە مـانای شـیـعـر گـەیشت بوو، دەیتـوانی ببی بەشاعیرێکی کلاسیکی، کەچی بوو بەیەکێک لە شاعیرانی قوتابخانەی «شیعری نوێ»ی کـوردی. قـاڵبی تازەی هێنـایە ناو شـیـعـری کـوردییـەوە، ناوەرۆکی گـۆڕی لـەگـەڵ هیـوا و ئامانجی نەتەوەکەی خۆی گونجاند. لە خۆشویستنی گەلەکەیەوە گیرۆدەی تەنگوچەڵەمەی مـرۆڤـایەتی بـوو. بیـری لە بێنـەوایان دەکـردەوە، غـەمی هەژارانی دەخـوارد، بەربـەرەکـانێی خوای جەنگی دەکرد. سـامـانێکی بەکـەڵکی لە شـیـعـر و پەخشـان بۆ نەتەوەی خۆی بەجێ هێشت و نامەخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند کرد.

## بەشی شازدەم

## ئەخۆڵ

**١٩١١ – ١٩٨٨**

### ژیانی

ئەحمەد کوڕی دەروێش کوڕی عەبدوڵڵا لە ساڵی ١٩١١ لە سلێمانی لە دایک بووە. هێشتا زۆر منداڵ بووە دایک و باوک و ئەندامانی خێزانیان بۆ خۆشەویستی بە«ئەحۆڵ» بانگیان کردووە. ئامۆزاییێکی بووە فسەزمان بووە (زمانی گیراوە)، لەباتی «ئەحۆڵ» بە«ئەخۆڵ» ناوی بردووە. لەمەوە هەموو لاییێک لاسایی ئەویان کردۆتەوە و بەئەخۆڵ بانگیان کردووە، لە ناو خەڵکیش هەر بەم ناوەوە ناسراوە. ئەخۆڵ ناوی ڕاستەقینەی خۆی «ئەحمەد»ی کردووە بەنازناو و لە تۆماری شیعریدا بەکاری هێناوە.

سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت بووە. کە ئینگلیز لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی سلێمانی داگیر کردووە، قوتابخانەییێک بەناوی «نموونەی سەعادەت» لە سلێمانی کراوەتەوە، ئەخۆڵ ساڵێک لەو قوتابخانەیە خوێندوویەتی. لە هەڵسانی شێخ مەحموود و بۆمبابارانی سلێمانی قوتابخانەکان داخران، کە حوکمدارییەتی شێخ مەحموود جارێ درا دوو قوتابخانەی تازە بەناوی «مەحموودییە» و «قادرییە» کرانەوە. قادرییە بەناوی شێخ قادری برای شێخ مەحموودەوە بوو. ئەخۆڵ تا پۆلی سێیەم لە قوتابخانەی قادرییە خوێندوویەتی. لەو سەردەمەدا سلێمانی جارێکی دیکە کەوتەوە ژێر کارەساتی بۆمباباران، لەو کاتەدا ئەخۆڵ ڕووی کردە بەغدا، ماوەییێک لەوێ مایەوە، کە گەڕایەوە سلێمانی لە پۆلی سێیەم دەستی کردەوە بەخوێندن تا پۆلی پێنجەم ئەوجا بەیەکجاری وازی لە خوێندن هێنا.

ئەخۆڵ لە منداڵییەوە ئیشی کردووە و خۆی بەڕێوە بردووە. لە ساڵی ١٩٢٩ لە چاپخانەی شارەوانی سلێمانی دامەزراوە، لەو سەردەمەی ڕۆژنامەی «ژیان» (١٩٢٦ – ١٩٣٨) لە سلێمانی بڵاوکراوەتەوە ئەو کاری تێدا کردووە تا ساڵی ١٩٣٤. لە دوای ئەمە بەمووچەخۆر لە دادگا دامەزراوە تا ساڵی ١٩٧٠ خۆی خانەنشین کردووە.



بەلای ئەخۆڵەوە ئەو ماوەیەی لە چاپخانە لەگەڵ پیرەمێرد کاری کردووە خۆشترین ڕۆژگاری ژیانی بووە. پێوەندی دۆستایەتی لەگەڵ شاعیر و ڕۆشنبیرانی ئەو کاتە بەهێز بووە، لەوانە محەمەد عەلی مەدهۆش و نووری شێخ ساڵح و فایەق بێکەس و شێخ سەلام و عەبدوڵڵا گۆران و ئیبراهیم ئەحمەد و ڕەمزی قەزاز و هی دیکە. لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی ژیان و ژین و گەلاوێژ و ڕۆژی نوێ شیعری بڵاوکردۆتەوە. لە ساڵی ١٩٧٠ یەکەم دیوانی شیعری بەناوی «پەیمان و شیوەن» بڵاوکردۆتەوە. لە پاشانا لە ساڵی ١٩٨٤ شیعری بەناوی «دیوانی ئەخۆڵ» لە بەغدا بڵاوکراوەتەوە. دوای خانەنشینی لە جموجۆڵی ئەدەبی نەکەوتووە تا ڕۆژی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٨٨ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

### شیعری

یەکەمین شیعری ئەخۆڵ بەناوی «سکاڵا لەگەڵ بلبل دا بەدڵێکی پڕ لە سەوداوە» لە مارتی ١٩٣٣ بڵاوکراوەتەوە. لەو کاتەوە بەرهەمی شیعری جوانی ڕەنگدانەوەی شیعری میللی ئەدەبی کوردییە. سەرکەوتووانە توانیویەتی لەم بابەتە شیعرە ئاسانەدا کێشی بەحری عەرووزی و یەکێتیی قافیە بەکار بێنێ. شیعرە عەرووزییەکانی لەسەر بەحری هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و ڕەجەز هۆنیوەتەوە. قافیەی ڕەنگاوڕەنگە، لە شیعری کێشە میللییە خۆماڵییەکانیدا جووت قافیە (مەسنەوی) بەکارهێناوە. لە هەندێ شیعری دیکەیدا ئەوانەی لەسەر بنچینەی بەند دانراون هەر بەندی قافیەی تایبەتیی خۆی هەیە.

لە دیوانیدا غەزەل و قەسیدە و پارچە شیعری میللی و پێنجین و چوارین و تاک بەرچاو دەکەون. ئەخۆڵ شیعری مستەفا بەگی کوردی و مەحوی و زێوەری کردووە بەپێنج خشتەکی. شاعیرانی دیکەش شیعری ئەویان کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە: ن. ئاری، ڕازی (سابیر سەعید)، محەمەد عەزیز مەلا ڕەحیم، أ. ب. هەوری.

زمانی شاعیر ئاسانە، وشەی بێگانە لە شیعریدا کەمە، کاریگەری ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی لە بەرهەمیدا بەهێز نییە، شەقڵی سیمبۆلیزم و ڕۆمانتیزمی ئەدەبی میللی زیاتر بەسەر شیعریەوە دیارە. هەروەها زۆربەی وێنە و نموونەی ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی عەرووزی و خۆماڵی لە داهێنانی خۆیەتی.

ئەخۆڵ شاعیرێکی خۆڕسک بوو، خوێندنێکی ڕێکوپێکی قوتابخانەیی نەبوو، سەلیقەی

شیعری لە بەهرەی خۆیەوە هەڵقوڵا بوو. گوێی مۆسیقی سەرچاوەی یەکەمی شیعری بوو، نەک خوێندنەوەی شیعری بێگانە. ئەو گوێی مۆسیقییە لە ئەنجامی موتالاکردن و وردکردنەوەی شیعری کۆن و نوێی کوردی بوو.

ناوەڕۆکی شیعری ئەخۆڵ هەمەڕەنگە. لە ڕووی بابەتەکانی شیعرەوە دڵداری بەسەر هەموو بەشەکانی دیکەدا زاڵە. جگە لەوە بایەخێکی کەمی بەمەبەسەکانی دیکەی وەکو شیوەن و ماتەمنامە و ستایش و کوردایەتی و سیاسەت داوە. هەرچۆنێ بێ ئەخۆڵ یەکێکە لەو شاعیرانەی شیعری بۆ ویژدانی خۆی وتووە، کەس نەیتوانیوە شیعر لای ئەو بەڕادان بدا، لەبەرئەوە وەک شیعرێکی جوان و ناسک و ئاسان دەکەوێتە بەرگوێ. ئەخۆڵ ماتەمنامەی بۆ پیرەمێرد و بێکەس و بێخود و چوار ئەفسەرە شەهیدەکەی کورد هەیە: عیزەت و خۆشناو و خەیروڵڵا و قودسی.

## نموونەی شیعری

### دڵداری و وەسف

١

لە شیعرێکیدا ئەخۆڵ بەناوی «دەردی عەشق»ەوە دەڵێ:

خوایە کەس تووشی نەبێتە دەردی بێ دەرمانی عەشق
کەس نەبێ دووچاری تیر و خەنجەر و زیندانی عەشق
هەرکەسێ زۆر زۆر بەجەرگە و پاڵەوانە و قارەمان
با بتوانێ بەرگە بگرێ گەر بووە میوانی عەشق
عەشقە پەروانە دەکاتە زەڕڕەیێک خاکی سیاه
ناوی مەشهوورە کە مەجنوون بۆتە سەرگەردانی عەشق
زاڵمێکی وایە عەشق فەرهادی کردە کۆهکەن
حوکمی دا بۆ قەتلی مەنسووری حاکم و سوڵتانی عەشق
شەمسی تەبریزی کە سووتا کردییە کۆهی زوخاڵ
پلپلەی خوێن کەوتە جەرگی بولبولی خۆشخوانی عەشق
چەن جوانی جوانەمەرگ کرد چەن هەزار شاه و گەدا
دەردی بێ دەرمان و دائی بێ سەروسامانی عەشق



عالەمی خستۆتە هۆهۆی کوڕی زیکری خۆیەوە
شێخەکەی بەرماڵ بەشان قوتبەکەی ڕەببانی عەشق
نەک هەمووی عەشقی خودا بێ ئەغڵەبی عەشقی ترە
بولبول و گوڵ لەیل و مەجنوون غەوسەکەی گەیلانی عەشق
وا ئەزانم جەمعی عاشق گشتی هەر مەقلووب ئەکا
لەشکری شمشێر بەدەست و خاوەنی قەڵغانی عەشق
(ئەحمەد)یش پرشنگی بەرکەوت بوو بەعەبدو چاکری
نەونەمامی تازە خەڵفە تا ئەبێ قوربانی عەشق

لەم شیعرەدا ئەخۆڵ بەزمانێکی ئاسان و ساکار داستانی دڵداری دەگێڕێتەوە. وشەی «عەشق»ی کردووە بەپاش قافیە، باس لەو کەسانە دەکا گیرۆدەی عەشق بوون وەکو فەرهاد و مەجنوون و مەنسووری هەلاج و شەمسی تەبریزی. ئەخۆڵ لە شیعرێکی پڕ لە ئاواز و تەنتەنە بەسەرهاتی هەندێ لە عاشقان لە مێژووی سۆفیزمدا دەگێڕێتەوە. زانیارییەکانی پێوەندییان بەسۆفیزمی ئیسلامییەوە هەیە. ئەم شیعرەش وەکو گەلێ شیعری دیکەی کوردی دەچێتە ناو وەسفی سۆفیزم، نەک داهێنانی سیمبۆلییانە و ڕۆمانتیکییانەی سۆفیزمی کۆزمۆسی.

٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «وڕێنە»وە ئەخۆڵ دەڵێ:

دڵم هەر ئەو دڵەی جارانە ئێستاکەش ئەناڵێنێ
هەناسەی ساردی ناکامی لە سینەمدا ئەتاسێنێ
ئەگەر جوانیت سەرنجم ڕابکێشی مەگرە لێم چونکە
جەمالت پەیکەری ڤینۆسی خوای جوانیش ئەجووڵێنێ
پەچەت لادە ببینم ڕووت ئەمن خۆ سەیری تۆ ناکەم
لە ڕووی تۆ تێ دەگەم یەزدان چلۆن نەخشی ئەنەخشێنێ
کە تیشکی ڕۆژ ئەدا زاخاوی پرچی زەردی زێڕینت
لە لام قەوس و قەزەح هیچ ڕەونەق و شەوقێکی نامێنێ
بەوەش دڵشاد و خۆش حاڵم کە یادی نائومێدی خۆم
بەخوڕ ئەشکی لە چاوانا قەتیس ماوم ئەبزووێنێ

تەمەن ڕوو بۆ خەزان ئەڕوا کەچی گەردوون ئەوا تازە
لە وێرانەی دڵا تۆوی گوڵی دڵداری ئەڕوێنێ
بەچەشنێ خۆشەویستی تۆ لە سینە و کەللەما چەسپە
مەگەر جامی ئەجەل ئەو تین و تاوەی لێ هەڵێنجێنێ

ئەخۆل ناوی «وڕێنە»ی بۆ ئەم لیریکە هەڵبژاردووە، ڕەنگە مەبەسی ئەوە بێ بەگشتی شیعر سنووری بۆ نییە، لە نەبوو شت دەخولقێنێ، بۆیە داهێنانی پێ دەوترێ، ئەگەر نا ئەم شیعرە یەکێکە لە شیعرە جوانەکان، تەعبیر لە هەستی ناوەوەی شاعیر دەکا بەرامبەر هەندێ شتی سەرنج ڕاکێشەر لە سروشت و لە ناو کۆمەڵدا. جوانی دلبەر ڕەنگدانەوەی ڤینۆسی خوای جوانی گریک و ڕۆمانەکانە. شاعیر داوا لە دلبەر دەکا پەچە لەسەر ڕووی لابەرێ بۆ ئەوەی چاوی بەکردەوەی یەزدان بکەوێ چۆن ئەو پەیکەرە قەشەنگەی لە قوڕ دروست کردووە. ئیتر دەکەوێتە وەسفی ئەندامەکانی دیکەی دلبەر و لەگەڵ دیمەنی سروشت بەراوردیان دەکا. لە دواییدا دەڵێ دڵداری ئەو پەیکەرەیە بەجۆرێک لە ناخی دڵدا چەسپیوە مەگەر جامی ئەجەل دەرەقەتی بێ.

## ٣

لە شیعرێکیدا ئەخۆل بەناوی «پەیمان و شیوەن»ەوە دەڵێ:

شەرتە تا ڕۆژی حەشر خولیایی من بێ چاوی یار
وێڵی سەحرا بم هەمیشە تەرک ئەکەم خوێش و دیار
شەرتە خوێنم یا بەگریان ئەڕێژمە سەفحەی عەدەم
یا بەشمشێری ڕەقیبانا ئەبێ بتکێتە خوار
شەرتە وەک مەجنوونی بێکەس دەشت و کێو بێ مەسکەنم
تا بەداخی لەیلەوە دەمنێنە قەبری تەنگ و تار
شەرتە وەک فەرهاد قوڵنگی یادی شیرین هەڵگرم
تا لە پای کێوی فیراقا جێ دەهێڵم یادگار

***

شەرتە وەک یەعقووب لە دووری یووسفی گوم گەشتەکەم
سینە پڕ غەم، دیدە پڕ نەم تا ئەبەد نەگرم قەرار



شەرتە وەک ئازیزمەردە سەر لە ئەژنۆ بەرنەدەم
بۆ دڵەی وێڵ و غەریبم دائیما بگریم بەزار
شەرتە وەک بولبول بەشیوەن قەت لق و چڵ بەرنەدەم
تا دەمی غونچەی ئەمەل نەکرێتەوە سوبحی بەهار
شەرتە وەک دێوانە کەشکۆڵ و عەسایێک هەڵگرم
بێخەمە لاوە بەجارێ عیززەتی نەفس و ویقار

***

شەرتە بمبێ تاجی خوسرەو گەنجی قارِوون تەختی کەی
هەر لە دەرگای ئەوا بمرم کەساس و خاکسار
شەرتە ڕەنگین کەم لە داخی تۆ بەئەشکی دیدەکەم
عەرد و بەرد و شاخ و داخ لالەزار و جۆیبار
شەرتە یا حەسرەت لەگەڵ خۆما ئەنێمە قەبرەوە
یا ئەبێ بمژم لە غونچەی نەو شکۆفەی لێوی یار

ئەخۆل لەم لیریکە ئاساییەدا سەرەتای هەموو دێڕێک واتە نیوە دێڕی یەکەم بەوشەی «شەرتە» دەست پێ دەکا. پەیمان و بەڵێن دەدا لە پێناوی چاوی جوانی دلبەر وێڵی بیابان بێ وەکو مەجنوون، قوڵنگ بەشان و زەحمەتکێش بێ وەکو فەرهاد، چاو بەگریان بێ وەکو یەعقووب، کەشکۆڵ بەدەست بێ وەکو دێوانە. بەلای شاعیرەوە ئەمە ژیانی خۆشی و جاویدانییە، گەورەیی لەوەدایە لە دەرگای دلبەر بەکەساسی بمرێ نەک تاجی خوسرەو و گەنجی قارِوون و تەختی کەیقوبادی هەبێ. شاعیر ڕاست دەکا ئەگەر دڵداری بەڕاست بێ لە هەموو شتێک بەهێزترە.

## ٤

لە شیعرێکیدا ئەخۆل بەشێوازێکی میللییانە و کێشێکی سووک و ڕیتمێکی پڕ لە ئاواز گفتوگۆ لەگەڵ دلبەر دەکا و پێی دەڵێ تۆ هەموو شتێکی بۆ من:

ئای چەن گرفتاری تۆم
جگەر بریناری تۆم
دڵ بەستەی زناری تۆم
شۆخی و جوانی و لاوی تۆ

بۆ ژیانم بوو بەهۆ
دنیا تۆی تیا ئەبینم
نابم دەربەستی ژینم

***

لە ناو باغ و گولّزارا
لە مێرگ و مێرغوزارا
لە هاوین و بەهارا
گەڕام ڕوانیم خوار و ژوور
لە نزیکی چ لە دوور
نەمدی وەک تۆ بالاّ بەرز
وەک تۆ شووش و عەرعەر تەرز

***

قاسپەی کەوانی سەر کەل
ئاوازی قومریی و مەل
لەسەر ئەم چڵ و ئەو چڵ
ئەبیێم ئەم هەموو دەنگە
هەرچی یەک نای و چەنگە
لە لای منی ڕەنجەڕۆ
ناگاتە ئا یەکی تۆ

***

گولاّلەی سوور و شەوبۆ
وەنەوشەی سەر لە ئەژنۆ
سفیدەی دەمی ئاسۆ
دیم و نەمدی لەمانە
وەک تۆ ڕازاوە گیانە
شین و مۆر و زەرد و ئاڵ
چاو و گەردن کولّم و خاڵ

***



جوانیم کردە چەپکێ گوڵ
گوڵی ڕازاوە بەدڵ
لێم بژارد دڕک و چقڵ
خۆشم بوومە یەک بولبول
پێما ڕوانی گولاّ و گوڵ
کەچی لەو چەپکە جوانە
تاسەی تۆم نەشکا گیانە

***

ژیانی کامەرانی
ئەم دنیایە و سامانی
هەرزەکارییە و جوانی
توخوا وەرە تا جوانین
ئەرکی پیری نازانین
با بیچێژین بێ زاری
تامی عەشق و دڵداری

هەموو شتێکی شاعیر تەنیا ئەو خۆشەویستەیە. هەموو جێیێک گەڕاوە، لە هەموو کاتێکدا جوانی وەک ئەوی نەدیوە. ئاوازی خۆشی مەل و باڵندان ناگاتە وشەی «ئا»یێک کە لە دەمی دێتە دەرەوە. گولاّلەسوورە و شەوبۆ و وەنەوشە و سپێدەی بەیان ناتوانن بەڕەنگی شین و مۆر و زەرد و سوور خۆیان لە قەرەی چاو و گەردن و کولّم و خەت و خاڵ بدەن. بەڕەوانبێژی میللییانە ئەخۆل دیمەنی داهێنراوی هونەری دروست کردووە. جوانی دلبەر دەکا بەچەپکە گوڵ، خۆی بە بلبل. بەگەشبینییەوە بەدلبەر دەڵێ تا گەنجین با خۆشی لە ژیاندا ببینین و بیر لە پیری نەکەینەوە.

**٥**

لە لیریکێکیدا ئەخۆل بەناوی «هەجوو»وە باس لە فێڵبازی و عەیاری یاری دەکا:

ئەگەرچی شۆخ و شەنگێکە ئەگەرچی نەرم و نۆڵێکە
بەلاّم عەییارە زۆرزانە حەرام زادە چی زۆڵێکە

چ زۆرزانە چ شەیتانە وەکو دیزە بەکوڵێکە
سەعاتی دەست و ئەحبابی یەکێکە و دەس بەقوڵێکە
نییە مانەند و ئەمسالی لە هیچ ئەنحائو چۆلێکا

***

هەزارم دیوە نەمدیوە وەکو تۆ هێندە زۆرزانی
لە کەرکووک و لە بەغداد و چ لە شاری سولەیمانی
هەموو موویێکی ئەگریجەی دەسی سەد گەنجی پیا هانی
کە دەرکەوت ڕافرێنراوە وەکو ماڵێکی تالانی
مەعازەڵلا کەچی لای خۆی ئەمە سڕێکە پەنهانی

لێرەدا نازانرێ ئەمە دلبەری شاعیر خۆیەتی یا نازەنین و شۆخ و شەنگێکە شاعیرێکی هەستیار خۆی پێ ناگیرێ و گەشکەی جوانی دەبێ کە چاوی پێی دەکەوێ. ئەو سیفەتانەی شاعیر بۆ ئەو جوانەی دەژمێرێ کە بەڕووکەش سیفەتی باش نین لە نرخی جوانی کەم ناکەنەوە. سیفەتەکانی عەیار و زۆرزان و زۆڵ و شەیتان کە بۆ ئەو نیگارەی بەکارهێناوە لەم شیعرەدا بەداشۆرین ناچن، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبن بەپێداهەڵدان و ستایش. ئەو جوانە ئەوەندە شارەزای مەکری ژنانە هەر موویێکی ئەگریجەی سەد لاوی هەڵخەڵەتاندووە. شاعیر لە کەرکووک و بەغدا و سلێمانی گەڕاوە یەکێکی وەکو ئەوی نەدیوە. لەبەر جوانییەکەی ڕفێنراوە و تالان کراوە، ئەمەیان هەر خۆی دەیزانێ چۆن ڕووی داوە. لێرەدا ئاماژەیێک هەیە بۆ ئەوەی ئەم جوانە هەڵخەڵەتێنراوە لە دواییدا تووشی داوێن پیسی بووە.

### گردی سەیوان

لە شیعرێکیدا ئەخۆڵ بەناوی «سکاڵا لەگەڵ سەیوان و تکا لە گەردوون» موناجات لەگەڵ گردی سەیوان دەکا:

ئەی گردی سەیوان سەیوانی سێوان
ئەی کەنزی گەوهەر سەر تا بەلێوان
هەر خوا ئەزانێت چی لە دڵتایە
چەن گوڵی وەریو لە ژێر چڵتایە



تۆ گوڵزارێکی خارە سەمەرت
ووشکە شۆڕەبی نار و عەرعەرت
هەر گەلایێکی کە لێت ئەوەرێ
پارچە دڵێکە و گۆشەی جگەرێ
هەر پەڕێ گوڵی ئەرخەوانەکەت
هەر دەنکێ گڵی بیابانەکەت
لە خوێنی گەشی چەن جوان و پیرە
لە ئێسکی سەری چەند گەدا و میرە
سەوزە ووردە گیات بەلام ئەبوایە
بەپێچەوانە ڕەنگی سوور بوایە
چون لەسەر لاشە و دڵان ڕواوە
بەخوێناوی گەش ئاویان دراوە
بەلام تا دوێنێ بەڕاست گوڵشەن بووی
مێرگ و مێرغوزار باغ و چەمەن بووی
لەسەر چلانت بولبول و قومری
دڵشاد ئەیانخوێند ئێستاکە ئەگری
چەن جووتەی دڵخواز بێ جەور و مەینەت
لەسەر سینەی تۆ ئەیان کرد عوشرەت
ئێستاش ئەوانەن کەوتوونە بەر پێ
ئێسقانیان بۆتە خاکی سەرەڕێ
ئەی گەردوون کە تۆ ئەمە بێ وەفات
بۆچی بمێنم بکێشم جەفات!
قەسەمت ئەدەم بەحەققی یەزدان
وەر تا زووە بمنێرە سەیوان
وەک لە دنیادا کەوتوومە بەر پێ
با لەوێ ببمە خاکی سەرەڕێ

ئەگەر گردی سەیوان گۆڕستانیش بووبێ پێش بناغە لێدانی شاری سلێمانی لە دوای دروستبوونی پایتەختی میرنشینی بابان گردەکە بوو بەگۆڕستانی ڕەمزی یادگاری هەموو مردووییێکی ئەو شارە. شاعیر قسەی لەگەڵ دەکا، بەسەرهاتی دەگێڕێتەوە. لە پێشانا گوڵستان و دەوەنستانێک بووە، ئەرخەوانەکانی نەخشی سروشت بوون لەسەر قەدپاڵی ئەو گردە. شاعیر باس لە خەڵکی ناو گردەکە دەکا. لاو و پیر، هەژار و میر، شەهیدی نیشتمان. ئەو دڵدار و دلبەرانەی لە کاتی خۆیدا لە بەهاری گردی سەیوان دەست لە ملانێ بوون، ئێستا لە ناو هەناوی گردەکە نێژراون و کەوتوونەتە بەرپێیان.

شاعیر بەوێنەی جوانی داهێنراوی شیعری کۆتایی بەلیریکەکەی دێنێ بەوەی زوو ئەو شانازییەی بەرکەوێ و لە سەیوان بنێژرێ. دیارە هیچ زیانێکیشی لێ ناکەوێ ئەگەر لەوێ ببێتە خاکی سەرەڕێ، چونکە لە دنیاشدا خۆشی نەدیوە و هەر لە ژێر پێیاندا بوو.

## ئەیلوولی خوێناوی

بۆ هەڵسانی خەڵکی سلێمانی لە ڕووی زۆرداریییەوە لە ٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ ئەخۆڵ دەڵێ:

بەجارێ ماڵی وێرانم سلێمانی خرۆشاوە
بەسەر هیچ کەس نەیەت خوایە ئەوەی لەو شارە قەوماوە
بەیانی بوو شەشی ئەیلوول لەناکاو گوللەی وەک باران
ئەباری بۆ قڕی میللەت ئەوی پیرە و ئەوی لاوە
بەدەم شەستیرەوە لاشە وەکو زۆربەی گەڵاڕێزان
لە ڕێدا عەینی ئەتووت بەردەبازی جۆگەلەی ئاوە
لە بەردەرکی سەرا دیارە لە هەر لایێک تەماشاکەی
سەراسەر پڕ لە لاشەی مردووە شێلراوە کوژراوە
لە هەر کووچە و پەنایێکدا تەڕی و سووریت ببینیایە
ئەوە خوێن و سریشکی دایک و جوانان بوو کە ڕێژراوە
لە کام ماڵ گوێت ئەگرت هەر باوکەڕۆ بوو ڕۆڵە ڕۆ و کاکە
لە کوێ سەیرت دەکرد هەر لاشەیە تێکەڵ بەخوێناوە
ئەوی دوێنێ جگەرگۆشە و عەزیزی باب و دایک بوو
ئەوا ئەمڕۆ لە ژێر خاکا شەهیدە و چاوی لێک ناوە



دەمەو ئێوارە نەتنواڕی بەوێنەی ڕێچکە مێروولە
بەڕێز تابووتی کوژراوان بەرەو سەیوان ملی ناوە
چ قینێکە چ زوڵمێکە چ کوشتار و برینێکە
ئەبێ قەت بیر نەچێ هەرگیز هەتا کورد زیندووە و ماوە

ئەم شیوەنەی ئەخۆڵ یەکێکە لە ماتەمنامە جوانەکانی کە کۆمەڵێک شاعیر بۆ ئەو ڕووداوە گرنگەی شاری سلێمانی هۆنیویانەتەوە. شاعیر سۆزێکی بەکوڵی هێناوەتە ناو مانا و وێنە شیعرییەکانی ئەم لیریکە. لە لایێکی دیکەوە ئەگەر بەچاوی ڕاستی مێژوو تەماشای ئەم شیعرە بکرێ زیادەڕۆیی تێدا دەبینرێ، کەچی ئەمە بەسەرکەوتوویی بۆ شیعرەکە گەڕاوەتەوە. شاعیر ئیلهامی لە ڕووداوەکە وەرگرتووە، ئەو کاتە تەمەنی هەژدە نۆزدە ساڵان بووە. بەچاوی شاعیر تەماشای مەسەلەکەی کردووە نەک بەچاوی مێژوونووس، لەبەرئەوە لەم شیعرە پڕ لە سۆزەیدا سەرکەوتووە، وەک بەرهەمێکی نایاب چۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

## شیوەنی سەرداری نەمر

بۆ کۆچی دوایی شێخ مەحموود ئەخۆڵ دەڵێ:

ئەی دڵ ئەی دەروون وەختی گریانە
ئەی چاو جا نۆرەی ئەشک بارانە
ئەی کوردی کڵۆڵ گەلی چارەڕەش
ئێستاکە دەمی سیا پۆشانە

***

بۆ شۆڕەسواری کورد و کوردستان
بۆ قارەمانی بەردە قارەمان
لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دیارە
هەڵمەت و تاوی وەک نەڕەشێران

***

ئای چۆن کوردستان بەکۆچت سەردار
بێکەس مایەوە لە دەس ڕۆژگار

ئالای پێچراوەی گەلی بێچارەت
نەک لە نیوەی دار کەوتۆتە بن دار

***

لە ناو چیاکان لە چۆڵ و لە دەر
لە خوار و لە ژوور لەمسەر و لەوسەر
ئەزرنگێتەوە هەتا هەتایە
دەنگی نەعرەتەی ئەڵڵاهو ئەکبەر

***

خۆت و لاوانی نەترس لە مردن
ئەو هێرشانەی بردتە سەر دوژمن
هەر هەڵمەت دان و هەر کۆڵ نەدان بوو
تا ڕەگ و ڕیشەی دەرهێنرا لە بن

***

ئەی نەوەی پاکی ئەحمەدی کاکی
ئەی پاڵەوانی چوست و چالاکی
کردەوەی بەرز و جەنگاوەری تۆ
بوو بەمەشخەڵێک بۆ ڕێی ڕووناکی

ئەخۆڵ یەکێکە لەو شاعیرانەی لە نزیکەوە دۆستی بنەماڵەی شێخ مەحموود بوون. ئەگەر دەروێشی ڕێکخراوی تەریقەتی قادریش نەبووبن لە ناو خەڵکی سەر بەو تەریقەتە حسێب کراون. لە لایێکی دیکەوە شاعیرێکی وەکو ئەخۆڵ شێخ مەحموودی وەکو برادەرێکی گیانی بەگیانی ناسیوە، ڕەنگە ئەگەر نەبوایە بەمەلیکی حوکوومەتی کوردستانی باشووریش شاعیر ئەو سۆزە بەکوڵەی لەگەڵ شێخدا بوایە. لە ڕووی هونەرییەوە ئەخۆڵ ئەم شیعرەی لەسەر بنچینەی بەندی چوارین هۆنیوەتەوە بەقافیەی (اا ب ا).

**بۆ ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨**

لە ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە بەغدا کوودیتاییێکی سوپایی ڕووی دا، ڕژێمی مەلیکی عیراقی سەراوژێر کرد و جاڕی کۆماری لە عیراق دا، بەم هۆیەوە ئەخۆڵ ئەم شیعرەی داناوە:



مناڵ بووم بیرمە مێژووی کوردستان
وەک سەرگوزەشتە وەکو داستان
لە بیرمە چلۆن بوو بەوێرانە
بەگوللە و تۆپ و بۆمبای بێگانە
لە بیرمە چەن لاو چەن قارەمانان
کران بەدارا و خرانە زیندان
بەچەند هەزاران کۆرپەی نازداران
لە ژن و لە پیاو لە پیر و لە جوان
ئەمانە هەمووی زۆرتر تێکڕا
بوونە خۆراکی برسێتی و بۆمبا
بەهۆی جەنگەوە و کردەی زەمانە
کەوتە ژێر دەستی پیسی بێگانە

***

ئەمڕۆ پاش دەنگی ئەڵڵاهو ئەکبەر
گوێم لە دەنگێ بوو وەکو شێری نەڕ
ئەینەڕان پڕ دەم پڕ دەشت و چیا
پڕ بەئاسمان و پڕ هەموو دنیا
دەنگێک پڕ نەعرە و بانگی ئازادی
ئەزرنگایەوە وادی بەوادی
ئەیووت ئەی گەدا دیل و سەرگەردان
ڕاپەڕن لە خەو خەوی چەن ساڵان
وەرنە ژێر سایەی داری ئازادی
پاش ساڵەهای ژین بەنامرادی

ئەخۆڵ ئەم لیریکەی کردووە بەدوو بەند، لە بەندی یەکەمدا باس لە نالەباری کوردستان و چەوساندنەوەی کورد دەکا لە عیراق لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیکی. لە بەندی دووەما لەو ئازادییە دەدوێ کە کوودیتا سوپاییەکە لە ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە بەغدا لەگەڵ خۆی هێنا. ئەو بەیانییە ڕادیۆی بەغدا بەسروودی عەرەبی «ئەڵڵاهو ئەکبەر»

هەواڵی کوودیتاکەی بەخەڵکی گەیاند. شاعیر لە ڕووی سۆزی کوردایەتییەوە پشتگیری ئەو گۆڕانە گرنگەی کردووە لە دەسەڵاتی عیراقدا. ڕاستی مەسەلەکە ئەوە بوو ئەم ئازادییە درێژخایەن نەبوو، بێ بەر بوو و زوو خۆی خواردەوە. لە دوای سێ ساڵ میللەتی کورد ناچار بوو چەک هەڵبگرێ و لە ئەیلوولی ١٩٦١ دەست بەشۆڕش بکا چونکە هەڵوێستی دەسەڵاتی بەغدای کۆماری بۆ سەر کورد دژوارتر بوو لە دەسەڵاتی سەردەمی مەلیکی.

**چوارین**

١

ئەخۆل بۆ بەرژەوەندی کەسێتی خۆی لە هیچ ناکەسێک ناپاڕێتەوە، لە چوارینێکیدا دەڵێ:

لە خوێن و خۆڵا گەر بتلێمەوە
ناگریم ناناڵم ناکڕووزێمەوە
چاوم تاریک بێ گەر لە برسانا
لە هیچ نامەردێ ناپاڕێمەوە

ئەوەی بەخۆڕایی و بەبێ بنچینە بووە بەخاوەن دەسەڵات شایانی ئەوە نییە، بۆیە نابێ بەگەورە بناسرێ.

٢

لە چوارینێکیدا ئەخۆل لە نایەکسانی دەدوێ لە ژیانی ئادەمزاددا:

دیم پاچ لێ ئەدا کابرای کرێکار
لە جێیێک دایک و سێ کۆرپەی نازدار
لە برسا مردوو خۆم دیم کە نێژران
ئێستاش بۆ پایەی هەیوان و تەلار

پاڵەیێک شەو و ڕۆژ پاچ لێ دەدا و عەرەق دەڕێژێ، کەچی لە برسانا دەمرێ، بەرەنجی ئەو دەوڵەمەند دەبێ کۆشک و باڵەخانە دروست دەکا.

٣

لە چوارینێکیدا ئەخۆل لەسەر ئەو باوەڕەیە دڵداری ڕاستەقینە بەتراجیدیا کۆتایی پێ دێ:



کە دوێنێ شەمعی مەجلیس بوو چریسکەی ڕوومەتی ئاڵی
ئەوا ئەمڕۆ ئەڵێی داغە لە جەرگا فیرقەتی خاڵی
بەڵێ عاشق ئەگەر سەد بار بنۆشێ بادەیی عوشرەت
ئەبێ هەر ئاخری بخوا بەسەر شیرینی یا تاڵی

بەرەوانبێژییێکی داهێنراو شاعیر بەراورد لە نێوان تریسکەی مۆم و بریقەی ڕوومەتی ئاڵ دەکا. ئەمە بەداغ دەچوێنێ. ئیتر زوو ڕادەکا بۆ لای دڵداری. بەلایەوە هەرچەندە خۆشی تێدا بێ دەبێ بەکارەسات کۆتایی پێ بێ، چونکە هەموو دڵدارییەکانی گێتی هەر وا بووە.

٤

ئەخۆل لە مەیگێڕ دەپاڕێتەوە ئەوەندەی بۆ تێکا تا بەتەواوی سەرخۆش دەبێ:

ساقی بەدەوری سەرتا خولەم بێت
هێندەم بۆ تێکە بکەومە بەر پێت
تۆ لە ئالامی دنیام بەدەر کە
با هەر بڵێن پێم (ئەخۆل) شێتە شێت

دەردی ژیانی سەر ڕووی زەمینی شاعیر ئەوەندە پڕ ئێش و ئازار و دژوارە بەسەرخۆشییێک نەبێ تا پلەی شێتی سەر ناگرێ و چارەسەر ناکرێ.

**تاک**

ئەخۆل لە تاکەکانیدا سەرکەوتووە، ئەو جۆرە شیعرانەی وەکو پەندێک یا قسەی نەستەقێک و بیرێکی دانایانە دەچنە ناو ئەو ئەدەبەوە وەک داهێنانێکی سیمبۆلی و ڕۆمانتیکییانە خۆیان دەنوێنن.

١

لە تاکێکیدا ئەخۆل دەڵێ:

ئەگەر چاوم لە تۆ جوانتر کەسێکی دی هەتا ماوم
ئەڵێم خوایە لەو دنیاش بەساغی هەڵنەیێ چاوم

لەو شیعرەدا چاوی شاعیر تەنیا بۆ بینینی دلبەر دانراوە، واتە بۆ بینینی دەرەوەی ئەو

کوێرە، شاعیر داوای ئەوە دەکا لە دنیای دیکەش هەر کوێر بێ بۆ ئەوەی تەنیا بۆ بینینی دلبەر ساغ بێ.

**٢**

لە بەراوردێکیدا شاعیر دەڵێ:

یەکێ نەمـــام ئەڕوێنێ و یەکێ نەمـــام ئەنێـــژێ
ئەمیـان چاوەڕێی گوڵە و ئەویان فرمێسک ئەڕێژێ

ژیان بریتییە لە بزە و فرمێسک، یەکێ شەتڵی گوڵ دەڕوێنێ، یەکێکی دیکە جوانێک دەنێژێ، یەکەمیان بەپێکەنینەوە چاوەڕێی گوڵە، ئەوی دیکەیان فرمێسک بۆ جوانەمەرگ دەڕێژێ.

**٣**

لە بابەت دڵداریی بەهێز و گەرمی خۆیەوە دەڵێ:

دڵێکم ئەوێ دڵداریم فـێـر کـا
چاوی چنۆکی پڕ عـەشقم تێر کا

لەبەرئەوەی شاعیر لە دڵداریدا زۆر چاوچنۆکە دڵێکی دەوێ فێری دڵدارییێکی قووڵی وای بکا لە چاوچنۆکییەکەی تێر بێ. وەک ئاشکرایە چاوچنۆکی ڕەوشتێکی ناشیرینە، بەڵام شاعیر ئەو ناشیرینەی جوان کردووە.

***

ئەحمەد کوڕی دەروێش کوڕی عەبدوڵڵا ناسراو بە ئەخۆل یەکێکە لەو شاعیرانەی بەهرەی هونەری و گوێی مۆسیقی کردوویەتی بەشاعیر پێش ئەوەی زانیاری گشتی فریای بکەوێ. زۆری نەخوێندووە، بەڵام زۆری خوێندۆتەوە. عەودالّی شیعر بووە، شیعری خەڵکی بووە بەپشتیوانی شیعری خۆی و بەهێزی کردووە.

ئەخۆل ڕاستگۆ بووە لە شیعریدا، بۆ خۆی نووسیوە، لەبەرئەوە زۆرتر خەریکی دڵداری بووە، لەو جۆرە شیعرەدا سەرکەوتوو بووە. شیعری دەرەوەی دڵداری کەمە، لەوانەشدا داهێنانی هەیە ئەگەرچی لە پلەی دڵدارییەکانی نین. هەموو بابەتەکانی کێش و قافیەی شیعری کوردی لە بەرهەمیدا بەکاری هێناون. لە هەمووی گرنگتر ڕەوانی شیعریەتی لە ئەنجامی بەکارهێنانی وشە و تەعبیری ئاسان و مۆسیقای سازگارەوەیە.

# بەشی حەڤدەم

## هەوری

### ١٩١٢ - ١٩٧٩

### ژیانی

ئەبووبەکر کوڕی شێخ جەلال کوڕی شێخ تەها لە ساڵی ١٩١٢ لە گوندی چنارەی نزیک دەربەندیخان لە دایک بووە. سەرەتای فێربوونی نووسینی لە لای باوکی بووە. لە ساڵی ١٩٢٥ماڵیان گواستۆتەوە سلێمانی. لە ساڵی ١٩٢٦ لە قوتابخانەی زانستیی شەوان خوێندوویەتی، لە پاشانا چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی ئینجا قوتابخانەی ناوەندی سلێمانی تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٣٥ بووە بەقوتابی خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە بەغدا. لە ساڵی ١٩٣٨ خوێندنی ئەوێی تەواو کردووە بووە بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی هەڵەبجە. ئینجا لە ساڵی ١٩٣٩ گوێزراوەتەوە قوتابخانەی ئەیووبییە و لە پاشانا فەیسەڵییەی سلێمانی. لە دوای ئەوە کراوە بەبەڕێوەبەری قوتابخانەی سووورداش. لە ساڵی ١٩٤٥ گوێزراوەتەوە سلێمانی و لە چەند قوتابخانەیێک مامۆستا بووە، تا لە ساڵی ١٩٤٩ بووە بەبەڕێوەبەری قوتابخانەی کانی ئاسکانی شاری سلێمانی، ماوەیێکی زۆر لەم کارەیدا ماوەتەوە تا ساڵی ١٩٦٩ خانەنشین کراوە.

ماوەی دوای خانەنشینی بەخوێندن و نووسین بردۆتە سەر، کەسێکی مرۆڤ حەز بووە، پێوەندی لەگەڵ شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیران بەهێز بووە، نیشتمانپەروەر بووە، کوردایەتی کردووە، زیاتر بایەخی بەدڵداری و ژیانی کۆمەڵایەتی داوە، لە پراکتیک کردنی سیاسەتی ڕۆژانە هەندێ بەدوور بووە، لەبەرئەوە تووشی سەرێشەی ئازاردان و گرتن نەبووە.

لەو کاتەی دەستی بەنووسین کردووە و هەوڵی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی داوە نازناوی «هەوری» بۆ خۆی هەڵبژاردووە بەناوی «أ. ب. هەوری»یەوە بڵاوی کردۆتەوە. لە ماوەی خانەنشینیدا هەوڵی داوە ژیانی بەهێمنی بباتە سەر و لە ماندووبوونی ڕۆژانی ڕابردوو هەندێ بحەسێتەوە، بۆ ئەم مەبەسە گەشتی لەندەن و مۆسکۆی بووە. تا لە ساڵی ١٩٧٩ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.



### بەرهەمی

هەوری یەکێکە لەو ڕۆشنبیرە کوردانەی بایەخیان بەشیعر و پەخشان داوە. لەو کاتەی سنووری بۆ هەردووکیان داناوە، هەر لەو کاتەدا تێکەڵی کردوون و ئەم بابەتەی لە ئەدەبی کوردیدا دەوڵەمەند کردووە. لە ژیانی نووسەردا بەشێکی زۆر لە بەرهەمی بڵاوکراوەتەوە، لە دوای مردنی فازل نیزامەدین بایەخی بەسەرجەمی بەرهەمی هەوری داوە و بەتایبەتی هەندێکی بڵاونەکراوەی زیندوو کردۆتەوە و لە نەمان ڕزگاری کردووە (٢٠٠٢).

### شیعر

شیعری هەوری دەچێتەوە سەر شیعری سیلابی خۆماڵی لەسەر کێشی دە بڕگەیی دامەزراوە، قافیەی بەگشتی مەسنەوییە، لە شیعری ئەم جۆرە کێشەیدا بەندی چوارینی هەیە (اا ب ا)، هەروەها بەندی پێنجینی هەیە لەسەر یەک قافیە (ااااا ب ب ب ب...). جگە لەمە، لە شیعری دە بڕگەییدا یەکێتیی قافیەی بەکارهێناوە. لە کێشەکانی دیکەی خۆماڵیدا چەند شیعرێکی هەیە لەسەر کێشی حەوت بڕگەیی دامەزراون، هەندێ دێڕی ئەم بابەتە شیعرە دەبن بەهەشت بڕگە. زۆربەی ئەم شیعرانەی وەک گۆرانی بەمۆسیقاوە یا سروود بۆ قوتابیانی قوتابخانەکان هۆنراونەتەوە.

شیعری بەحری عەرووزی لە بەرهەمی هەوریدا زۆر کەمە. لەوانەیە مەیلی بۆ پێنج خشتەکی هانی ئەوەی دابێ ئەم جۆرە شیعرە بڵێ، چونکە پێنج خشتەکییێکی هەیە لەسەر شیعرێکی ئەخۆل. هەوری بایەخی بەچوارین داوە، هەست بەهەناسەی خەیام دەکرێ لە چوارینەکانیدا.

زۆرینەی شیعری هەوری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دەچنە ناو سنووری شیعری دڵداری و وەسف و کۆمەڵایەتی و کوردایەتی، ئۆپەرێتی چوار وەرزی ساڵی هەیە، بەشیعر جووتیار و ڕەنجبەر و ئاودێر و سەپان و وەرزێر گفتوگۆ دەکەن. شیعری زۆری بۆ نەورۆز وتووە. شیوەنی بۆ شێخ سەلام و ڕەفیق حیلمی کردووە، پێشوازی کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدای کردووە چونکە کە هاتووە لە سەرەتادا خۆر وەپایەوە بووە.

## پەخشان

بەشێکی زۆر لە بەرهەمی ئەدەبی هەوری بە پەخشان کەوتۆتە ناوەوە، کارە گرنگەکانی لەم بەرهەمانەدا دەکەونە بەرچاو:

١- دڵداری و پەیمانپەروەری: شانۆگەرییێکی حەوت پەردەییە. لە دڵداریی ڕاست دەدوێ لە پێناوی پێکەوەنانی خێزانێکی بەختیار.

٢- بووکی ژێر دەواری ڕەش: چیرۆکێکی دڵداری دراماتیکییە هەوری بەم قسانە بەخوێنەری دەناسێنێ «ئەو کچەی لێوی بەخوێنی دەسگیرانەکەی ئاڵ کرد، خەنەی شاییەکەی خوێنی لاوان و تارای بووکێنی دەواری ڕەش بوو».

٣- زینەت خان: شانۆگەرییێکی دوو پەردەییە، ناوەڕۆکی دڵداری دراماتیکییە.

٤- ڕۆژانی دێرین ١٩٢٥ – ١٩٥٨: بەشێکە لە یادداشتەکانی هەوری جگە لە نرخی جوانکاری وەک پەخشانێکی هونەری داهێنراو نرخێکی مێژوویی خۆی هەیە، هەندێ لایەنی ژیانی تایبەتیی خۆی و ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە ڕوون دەکاتەوە.

## نموونەی شیعری

١

لە ساڵی **١٩٣٩** هەوری لە لیریکێکیدا دەڵێ:

ئەی وەتەن تۆ وا مەزانە شادمانم ئارەزووی سەیران ئەکەم
حەز بەلەنجەولار و شێوەی دیدە مەخمووران ئەکەم
سەد هەزار چاوی خوماری عیشوەداری کەچ کولاە
بۆ سەعاتێک شادمانی خاکەکەت قوربان ئەکەم
نامەوێ بۆ چیمە بەزم و دەبدەبەی جانانی شەو
من تەمەننای بەزمی وەسڵی خاکەکەی کوردان ئەکەم
شەو لە داخی ڕۆژی تۆیە ڕۆژ بەیادی شەوتەوە
مەیلی دەشتی چۆڵی پەستی گەرمی گوێی سیروان ئەکەم
شەرتە ئێسکم تا نەبێتە خاک لە بۆ کۆشکی وڵات
من لە قەبرا بۆ کەساسیت شیوەن و گریان ئەکەم



ئەی وەتەن با جارێ وا بێ تا هەلێکت دێتە پێش
تێدەگەی ئەوسا شێرانە ئارەزووی مەیدان ئەکەم
ئەی وەتەن من خام و خامەش دەردی تۆی گرتۆتە بەر
ئەم قسانەش ئاگرە و (هەوری) پێ بەرپا ئەکەم

هەوری لە سەردەمێکدا ژیاوە نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لە ناو خوێندەواراندا باو بووە. نرخی هەر شاعیر و نووسەرێک بەپێی هەوڵ و کۆششی لە پێناوی ڕزگاری نەتەوە دیاری کراوە، لەبەرئەوە لە قاڵبی شیعری کلاسیکی شاعیر ئەم هەستەی دەربڕیوە.

٢

لە ساڵی **١٩٣٥** هەوری ڕوو دەکاتە دیجلە و دەڵێ:

دیجلە تۆ هەروا بۆچی سەرەوخوار!
پێچ ئەدەی ئەڕۆی ڕۆژ و شەو بێدار
گوڕەت نەماوە دیدەت لێڵاوە
زولفت وەک حەبەش گرژ و شێواوە
کز کز بۆی ئەڕۆیت کەنارە و کەنار
فرمێسک ئەڕێژیت وەک هەوری بەهار
بۆ ڕوو لە دەشت و پشت لە کێو ئەکەیت
شەو سپی پۆشیت هەر لە خێو ئەکەیت
وەک من دڵ پڕ داخ بەخۆزگە و ئاوات
بەزوڵلەی زەمان چۆڵمان کرد وڵات
ئینجا کە وا بوو هەردوو وەک بولبول
بەجووت بخوێنین لەسەر چرۆی چڵ
بڵێین هەر بژی خاکی کوردستان
خۆی و زانستی و کۆمەڵی لاوان

لە ساڵی **١٩٣٥** کە هەوری بۆ خوێندن لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی چووە بۆ بەغدا بۆ یەکەمین جار چاوی بەڕووباری دیجلە کەوتووە. ئەوەی زانیوە لە ناوجەرگەی خاکی کوردەوارییەوە هەڵدەقوڵێ بەرەو بیابان و سارا. شاعیر ئاماژەی هەیە بۆ زوڵف

وەک حەبەش، ئەم لێکچوواندنە لە ئەدەبی کلاسیکیدا باوە، زوڵفی ڕەش وەک ڕەنگی حەبەشییان وایە، بەڵام شاعیر لێرەدا مەبەسی ئاڵۆزی و شێواوییە نەوەکو ڕەنگ، بەتایبەتی لەو ساڵانەدا وڵاتی حەبەشە (ئەیتووپیا) لە ژێر باری ئەمپریالیستی ئیتاڵیا شێوا بوو. هەروەها ئاماژەی هەیە بۆ زانستی و کۆمەڵی لاوان، مەبەسی قوتابخانەی زانستیی شەوانەی سلێمانییە لەو سەردەمەدا، کۆمەڵی لاوان مەبەس ئەوانەن لەو قوتابخانەیەدا بەشەو بەبێ پارە وانەیان دەوتەوە.

### ٣

لە بابەت «گوڵ»ەوە هەوری دەڵێ:

ئەی گوڵ تۆ قیبلەی هەرزەکارانی
تۆ دەوای دەردی دەردەدارانی
بەقول پڕ مەشتی شوان و پیری
تۆ غەمڕەوێنی جوان و میری
بەزەردەخەنەت بۆ باکەی سەحەر
تارای زەرد و سوور دەشت ئەکاتە بەر
تۆ ئاگاداری ڕازی دڵداریت
تۆ ڕەونەق بەخشی وەرزی بەهاریت
بۆ تۆیە بولبول بێدار و بێ خەو
وەنەوزێک نادات بەدرێژایی شەو
بۆ تۆیە وەرزێر بەهەوڵ و تەکان
زەوی لەت دەکات بەبێڵ و بەشان
ئیلهام ئەبەخشی بەشاعیری زار
ئایەتی بوون و بەرزی کردگار
بۆن و بەرامەت عیللەت پەرێنە
دیمەنی بەژنت ئەو دڵڕفێنە
ناسک ئەندامی کیژی شۆخ و شەنگ
بەئاوێنەی ڕووی تۆ دەکرێن بەسەنگ



ئەی گوڵ من بۆیە تۆم زۆر خۆش ئەوێ
کاتێک ئەپشکویت کە خۆر دەرکەوێ

شاعیر لە ساڵی ١٩٥٦ ئەم لیریکەی هۆنیوەتەوە بەمەبەسی ئەوەی وەک سروودێک بەئاوازەوە ببێ بەگۆرانی. شیعرەکە وەک دیاردەیێکی سروشت دەکەوێتە ڕوو، خۆشیی گیانی دەگەیەنێتە هەموو ئادەمزادێک. شاعیر نموونەی ئەو ئادەمزادانە لە ناو کۆمەڵدا دیاری دەکا، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە بەلای شاعیرەوە سەرچاوەی گرنگی گێتیی دڵدارییە، گوڵ و کچ جوانییان لە یەکتری وەردەگرن.

### ٤

لە شیعرێکیدا بەناوی «بووکی درەخت» هەوری لە ساڵی ١٩٥٨ هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

تازە نۆ بووکی بەهاری دەم کەل
دەنگی پێ خەسو وەک جریوەی مەل
لەگەڵ چریکەی بەحەیوانەوە
بەسیاچەمانەی ناو شاخانەوە
ئەدەن بەگوێمدا نەورۆز و بەهار
پێشوازی ئەون جەژنی درەخت و دار

لە پێش ساڵی ١٩٥٨ دەسەڵاتی عیراق بەربەرەکانی جەژنی نەورۆزی دەکرد، لەباتی ئەو جەژنێکی بەناوی (دار و درەخت)ەوە دانا بوو، لە شاعیرانی کورد ئەگەر هەندێ بەو ناوەشەوە شیعریان دانا بێ، بێ گومان هەر مەبەسیان نەورۆز بووە، هەوری ئەم شیعرەی بۆ نەورۆزی ١٩٥٨ داناوە کە هێشتا ڕووداوەکانی ١٤ی تەمووزی ئەو ساڵە هەڵنەگیرسا بوون، هەرچەندە شیعرەکە بەناوی درەختەوەیە، بەڵام شاعیر یادی نەورۆزی کردۆتەوە و هەر بەناوی ئەو جەژنەوە پیرۆزی کردووە.

لە شیعرەکەدا ناوی پێ خەسوو هاتووە، ئەمە ناوی یەکێک لە گۆرانییە میللییەکانی کۆمەڵی کوردەوارییە وەکو سیاچەمانە و لاوک و حەیران و هی دیکە.

### ٥

لە شیعرێکیدا بەناوی «تاوانی ئەتۆم» لە ساڵی ١٩٤٥ هەوری بۆ کارەساتەکەی هیرۆشیما و ناگازاکی هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

لەسەر ئەم زەوییەی تەوەرە کۆماو
ڕاستی نابینیت تۆ هەرگیز بەچاو
بۆ بەرەی بێ دەست نییە تروسکە
گەر باوەڕ ناکەیت لە ژاپۆن پرس کە
لە هیرۆشیما بەڵگەی نام و نەنگ
بۆچ مافی ژیان وا کرا بەپەنگ
بۆ ئەوەی زۆردار زیاد بێت بەدەستدار
ئەبێت بێ دەستان بمرن بەهەزار
هەر بەیەک بۆمبای ئەتۆمی بەدناو
دووسەد هەزار کەس بوو بەهەڵمی ئاو
بۆمبا هاوێژیش بەهیچ تەر نەبوو
بێدەنگ بێ سزا بەگورجی دەرچوو

تاوانی بۆمبابارانی وڵاتی یابان بەبۆمبای ئەتۆم لە لایەن دەسەڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەسەرۆکایەتی هاری ترومان هەموو مرۆڤایەتی هەژاند، بەتایبەتی کە لە دواییدا زانرا تاقیکردنەوەکە بۆ ئەوە بوو بزانن لە دروستکردنی ئەم بۆمبایە لە ڕووی پیشەسازییەوە سەرکەوتوون یا نا!

شاعیر و نووسەرانی کورد لەگەڵ هەموو ڕۆشنبیرانی گێتی بێزاری خۆیان دەربڕی بەرامبەر ئەم کارە دڕندەییەوە بە بەرهەمی ئەدەبی داهێنراو.

***

أ. ب. هەوری شاعیر و نووسەرێکی ناوچەی سلێمانی جێ پەنجەی دیارە لە ئەدەبی کوردیدا. مەشقی زۆری هەبوو، لە شیعردا پێڕەوی شیعری میللی خۆماڵی کردووە، بەزۆری کێشی سیلابی خۆماڵی و قافیەی مەسنەوی بەکارهێناوە. تازەگەری لە قافیەدا هەیە. شیعری عەرووزی کەمە، لەمەدا کێشە سووکەکانی بەکارهێناوە. شیعری لە بابەتی لیریکییە، ناوەڕۆکی شیعری دڵداری و کۆمەڵایەتی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتییە.

لایەنی گرنگ لە بەرهەمی هەوری ئەوانەن بەپەخشان دایناون. بایەخی زۆری بەچیرۆکی شانۆگەری داوە، لە وتاری هونەریدا سەرکەوتووە، یەکێ لە ئەدگارە داهێنراوەکانی ئەو وتارانەن بەشیعر موتروبەی کردوون. بەرهەمی بەگشتی دەچێتە ناو چاک کردنی باری ژیانی کۆمەڵ و دوارۆژی کورد (تەنویر).

## بەشی هەژدەم

## قاچاغی مراد

**١٩١٤ – ١٩٩٢**

### ژیانی

قاچاغ کوڕی مراد کوڕی شەباب لە ساڵی ١٩١٤ لە شاری قارس لە کوردستانی عوسمانی لە دایک بووە. تەمەنی چوار ساڵان بووە کە سوپای عوسمانی بەزبوی جەنگی یەکەمی گیتی لە ساڵی ١٩١٨ هێرشە دڕندانەکەی بردە سەر کوردی ناوچەی قارس. ماڵی باوکی روویان کردە ئەرمەنستان و لە ناوچەی ئەلەگەز جێگیر بوون. قاچاغی منداڵ بەختی یار بوو، لەو ناوچەیە زۆر نەمانەوە و باریان کرد بۆ شاری تفلیس پایتەختی گورجستان. دە ساڵ خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە قوتابخانەی ڕووسی ژمارە (٤٧) لە تفلیس تەواو کرد. ئینجا بۆ ئەوەی قۆناغەکانی زانستگایی تەواو بکا ڕووی کردە یەریڤان. لە پێشانا سێ ساڵ بوو بەقوتابی لە ئامۆژگای زمان و ئەدەبی ڕووسی لە یەریڤان، ئەوجا ئامۆژگای ئامادەکردنی مامۆستایانی زمانی کوردی لەو شارەدا گەیاندە ئەنجام. لە دوای ئەمە دوو ساڵ مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بووە لە شاری لینینەکان لە ئەرمەنستان.

لە ساڵی ١٩٣٩ قاچاغ لە ڕێکخراوی لاوانی لینینی بوو. لەو ساڵەدا بوو بەپارتیزان و دەستی کرد بەمەشقی جەنگی پارتیزانی. لە ساڵی ١٩٤١ کە ئەڵمانیا هێرشی بردە سەر ڕووسیا لە توانایدا بوو لە هێڵەکانی ئەو جەنگەدا دەوری باڵای ببێ. لە بەشێکی زۆری خاکی چیکۆسلۆڤاکیا لە ڕیزی سوپادا بوو، لە داگیرکردنی شاری بەرلین یەکێک بوو لەو سەربازانەی بەیداغی سڤاستیکای ئەڵمانیای نازییان سەرشۆڕ کرد. لە دوای جەنگ قاچاغ تا ساڵی ١٩٥٨ لە سوپای سووری ڕووسیا مایەوە. لەو ساڵەدا بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک لە بەشی کوردی ڕادیۆی یەریڤان کاری کرد. لە ساڵی ١٩٥٩ گوێزرایەوە بۆ ڕۆژنامەی «ریاتازە» و بوو بەئەندامی دەستەی نووسەران. ناوە ناوە دەبوو بەسەرنووسەر، چونکە ئەندامانی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە یەک لە دوای یەک هەریەکەیان بۆ ماوەیێک دەبوون بەسەرنووسەر بەم جۆرە قاچاغ لەو ڕۆژنامەیەدا کاری کرد تا سەردەمی خانەنشینی و کۆتایی ژیانی.



قاچاغ لە جەنگدا دووجار بریندار بووە، شەش میدالیای وەرگرتووە بەرزترینیان میدالیای «ئەستێرەی سوور»ە. بەهۆی ئەوەوە زۆرترین ماوەی ژیانی خەریکی کاروباری ڕۆژنامەگەری بووە، پێوەندی بەچاپ و چاپەمەنی بەهێز بووە. لە ئامادەکردنی کتێبی هاوڕێیانی بۆ چاپ یارمەتیی زۆری داون بەپێشەکی نووسین و پێداچوونەوە و بژارکردن. کۆششی قاچاغ لە هەندێ نووسینی سەمەندی سیابەندۆڤ و میکایلی ڕەشید و حاجیی جندی و کارلینی چەچانی و هی دیکە دیارە. زانینی کوردی و ڕووسی و ئەرمەنی و گورجی و ئازەری بەخوێندن و نووسین یارمەتی داوە لە هەموو کاروبارێکی خوێندەواری سەرکەوتوو بێ.

لە دوای ژیانێکی پڕ لە خزمەتی ڕۆشنبیری و داهێنانی ئەدەبی قاچاغ سامانێکی ڕەنگین و بەکەڵکی بۆ نەتەوەی بەجێ هێشت کە لە ساڵی ١٩٩٢ لە شاری یەریڤان کۆچی دوایی کرد.

### شیعری

قاچاغ لە منداڵییەوە هۆگری ئەدەبی میللیی سەرزاری دەوڵەمەندی کوردی بووە. خوێندەواری تازە و بینینی شاری گەورە و زانینی زمانی زۆر زەمینەی بۆ خۆش کردووە دەوری گرنگی ببێ لە پێشخستنی ئەدەبی کوردی تازە لە دایکبووی وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا. شیعری هەمووی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی کێشە درێژەکانە، کێشە بڕگە زۆرەکان کەرت دەکا. لە قافیەدا شارەزایە. بەگشتی شیعری لە ڕووی قافیەوە لەسەر دەستووری «شیعری نوێ» دەڕوا، واتە قافیەی زۆری ڕەنگاوڕەنگ. قاچاغ هەوڵی داوە بۆ ڕەوانی ڕیتم و ئاهەنگ شیعری لەسەر بنجی یەکێتی قافیە داناوە. ئەمە لە لای ئەو لە بێگانە وەرنەگیراوە، بەڵکو داهێنانی خۆیەتی.

یەکێ لە ئەدگارە گرنگەکانی شیعری قاچاغ ئەوەیە هەوڵی داوە زمانی شیعر دەوڵەمەند بکا بەوەی گەلێ وشەی فەرهەنگی و زاراوەی پێوەندی بەکۆمەڵی پیشەسازییەوە هەیە هێناویەتییە ناو شیعرییەوە. بەمە هەندێ لەو شیعرە نووسراوە مومتازەی لە شیعری میللیی سەرزار دوور خستۆتەوە و ئەم جۆرە شیعرەی بۆنی مەدەنییەتی لێ دێ. ئەمەو جگە لەوەی زاراوەیێکی تازەی زۆری بەکارهێناوە کە پێوەندییان بەژیانی سۆسیالیزمی ئەو سەردەمە بووە کە کوردی قەفقاس تێیدا دەژیا.

شیعری قاچاغ بەگشتی لە بابەتی لیریک و پۆیێمە. لیریکەکانی لە ڕووی ژمارەی

دێرەوە کورت و درێژیان تێدایە. هەرچی پۆیێمەکانیشن درێژن. بەناوەڕۆک هەندێکیان لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەرگیراون، بەڵام شاعیر هونەری نواندووە و بەرهەمێکی تازەی دروست کردووە. بەشێکی دیکەی ئەو پۆیێمانە لە داهێنانی شاعیر خۆیەتی و بەزۆری لە ژیانی کوردەواری وەرگیراون. لە پۆیێمە جوان و ڕەنگینەکانی ناوی ئەمانە دەکەونە بەرچاو: چیرۆکەکانی میرزا مەحموود (١٩٣٦)؛ لەیلێ (١٩٤٨)؛ قادرێ نێچیرڤان (١٩٦٠)؛ کلاما ئیگریداغێ (ئاگری داغ) (١٩٦٢)؛ گەلیی عەلی بەگێ (١٩٦٥).

لە بارەی ئەو چیرۆکە شیعرییەی بەناوی «گەلی عەلیی بەگ»ەوەیە قاچاغ دەیووت: لە ساڵی ١٩٦١ەوە کە شۆڕشی ئەیلوولی کوردستانی عیراق دەستی پێ کرد لە پێشانا وەکو کوردێک، ئینجا وەکو ڕۆژنامەنووسێک ڕۆژانە عەوداڵی ئەوە بووم هەواڵ و ئاگا و ڕووداوی شۆڕشەکە ببیستم، لە دواییدا ئەو هەواڵانە بوون بەئیلهام و ئەم شیعرە لە دایک بوو.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شیعری قاچاغ هەموو لایەنێکی ژیانی کوردی ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە. بەگشتی هەمووی لە هەناسەیێکی گەشبینییەوە هەڵقوڵاوە و لە ڕەشبینییەوە دوورە. پارێزگاری نەریت و خوو و ڕەوشتی کوردەواری کردووە، گیرۆدەی جوانی کچی کوردە. سۆزی بەرامبەر بەئیدیۆلۆجییەتی سۆسیالیزم قووڵە، ڕزگاری کوردی لەو بینیوە. قاچاغ یەکێک بوو لە خوێندەوارە دیارەکانی کورد بەمانا ئینتیلیجێنتە ئەورووپاییەکەی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کوردەوارییەکەی ون نەکردبوو.

## نموونەی شیعری

١

لە لیریکێکیدا قاچاغ دەڵێ:

وەختا ئەز تە دکم گازی
هەزار دەنگی ئو ئاڤازی
ئەز سۆتم ئاڤرێ نازی
نزانم دها چ دەخوەزی؟
***
وەختا ئەز بووم تەیرێ بازی
تو کە ڤۆتکا گەردەن گازی



پەی تە فریم ب پەروازی
بێ فایدەیە چ دەخوەزی
***
سەر تەدا تێم ب دلسازی
لێ تو منرا نابی رازی
ئەڤ بوو نۆلانی جانبازی
نزام دها چ دەخوەزی

شاعیر بەم وشە ساکار و پڕ سۆزانە لە دلبەری دەپاڕێتەوە، سەرسام ماوە نازانێ ئەو نازەنینە چی لێی دەوێ، بەهەموو جۆرێ دەیەوێ ڕازی بکا، دەیەوێ بزانێ بەچی ڕازی دەبێ. ئەمەیان نهێنییە، هەر ئەو نهێنییەش بووە بەمایەی جوانی شیعرەکە. جگە لەوەی یەکێتی قافیە جۆرە جوانییێکی داوەتە لیریکەکە لە ڕووی ڕەوانبێژی ڕیتم و مۆسیقاوە.

٢

لەسەر ئەو دەستوورەی پێشوو لیریکێکی بۆ گوڵ و مرۆڤ هۆنیوەتەوە:

توومێ گولێ تەڤ سترینە
لێ گولێرا دبێژن گول
گول کو تەزە پشکڤینە
هە من وانرا دبێژن گول
هن ئەو سۆرن، هن سپینە
دیسا وانرا دبێژن گول
بینا خوەش مەرڤ هلتینە
هەما ژ بینێ دبێژن گول
وەختا بەلگ لێ خەیرینە
ژێرا دیسا دبێژن گول
چمکی شوورەت لێ گولینە
لە ما ژێرا دبێژن گول
لێ تو مەرڤ بدوومینە
کو تەرا ژی بێژن مەرڤ

حورمەت، سیانەتێ دەست بینە
کو تەرا تم بێژن مەرڤ
شوورە تا خوە نەیێخینە
کو تەرا تم بێژن مەرڤ
عەمر بۆی وەتەن نەهێڤشینە
کو هەر دەرا بێژن مەرڤ
مەرڤی، مەرڤ بمینە
کو ب کو بار بێژن مەرڤ

شاعیر خەریکی بەراوردە، لە ڕووی دووبارەکردنەوەی «گوڵ» و «مرۆڤ» لەم شیعرەدا لە بابەت ئاوازەوە، لەوێ یەکێتیی قافیە بەکار دێنێ. لە مانادا سیفەتە جوانەکانی گوڵ هەڵدەبژێرێ هەر سیفەتێکی بخەیە پاڵ ئەو هەر گوڵە، بۆ ئادەمزادیش تەنیا سیفەتە چاکەکانی هەڵدەبژێرێ، واتە هەر کەسێک ئەو سیفەتە باشانەی هەبێ مرۆڤە، ئەگەر نەیانی بێ مرۆڤ نییە.

٣

لە لیریکێکیدا شاعیر لە شیربایی دەدوێ لە ناو کۆمەڵی کوردەواریدا:

هەی قەلەن، قەلەن ئورت تە بقەلە
چ ملەتێ کورد بوویی تەشقەلە
چ قاس قیزێد جان چ خورتێ تەلی یان
مراز چەڤدا ما تو بایسێ وان
چ قاس دلێ گەش خورت قیزێد نەدەر
هەڤدوو حەباندی ب هەڤ سەوداسەر
ئەڤینتی ل وان نۆلی مەم و زین
تو بەکویێ وان مخەنەتی کین
بەسە، لۆ قەلەن، ئورت تە بقەلە
چ بوویی بەلا، بوویی تەشقەلە

شاعیر لەم لیریکەدا لە دژی شیربایی (قەلەن) وەستاوە، ئەمە یەکێک بوو لە گیروگرفتە



هەرە گرنگەکانی کۆمەڵی کوردەواری ئەو وڵاتە. نووسەر و شاعیران بەشیعر و چیرۆک و ڕۆمان و درامای شانۆ بەربەرەکانی ئەم ڕەوشتە دواکەوتووەی کۆمەڵیان دەکرد. بەگشتی لەبەرئەوەی لایەنی ئابووری تا پلەیێک بووژابووەوە، شیربایی ئەوەندە باوی نەما بوو، بەڵام کەسی وا هەبوو بەڕەوشتێکی چاکیان دەژمارد و وەک نەریتێکی نەتەوەیی تایبەتی بەکورد دەیانخستە ڕوو، لەبەرئەوە بوو خوێندەواران هەوڵیان دەدا خەڵکەکە تێ بگەیەنن کە شیربایی ڕەوشتێکی دواکەوتووە و پێویستە لە ڕیشەدا هەڵبکەندرێ، چونکە کچ ئادەمزادە و ئادەمزادیش نافرۆشرێ.

٤

قاچاغ بۆ کۆچی دوایی نووسەر و شاعیر وەزیری نادری دەڵێ:

بن شووشێدا دانیە شکلێ وی بەر من
خودانەکە سار داکەتیە ل سەر من
ئەو دکەنە ئەز مرووزم سەبا وی
من دپرسە ئەز نادمێ جابا وی
بەرێدا ئەم برا بوون دل حەلال
نۆلی شرکێ ئاڤێ ژ کانیا زەلال
ئەز سوند دخۆم ڤرا ل سەر شکلێ تە
ژ حوری یا چەتر کەنێ هەرو عەکلێ تە
ب ئەڤینتی وەتەن حزکن شڤێتا تە
مبە سەرکن ئەم هەر جارا نێتا تە

کوشتنی شاعیر و نووسەر وەزیری نادری لە ساڵی ١٩٤٦ لە لایەن دوژمنی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکان و نەیارانی کوردەوە ڕووداوێکی گرنگ بوو لە ناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا. کاری گەورەی کردبووە سەر دڵ و دەروونی خەڵکی. قاچاغ هاوڕێی دڵسۆزی وەزیر بوو، لەم لیریکە غەمینەیدا ئەڤینی برایەتی لە ناخی دەروونیەوە هەڵدەقوڵێ و بۆ وەزیری دەگێڕێتەوە، خۆی لە ژێر گلدایە، ناچار بووە لەگەڵ وێنەی گفتوگۆ بکا و بۆی بلاوێنێتەوە.

## ٥

له شیعرێکیدا بەناوی «کلاما ئیگریداغێ» قاچاغ دەڵێ:

دەلۆ، لۆ، لۆ، لۆ، لۆ وایێ، ل من وایێ
ئیسال هەڤت سالێ تەشکیلەتا کوردانە
ل بەرەکا ئیگریداغێ نە تێ کوشتن، نە تێ رایێ
دنێ، مێر دزانن ناڤ، دەنگێ براهیمی چێ
فەرزەندە حەسەن نووری – شێخ زاهر
بەلا بوویە دۆزدە قرالێ ئەجنەبی ل دنیایێ

***

گەلۆ مە نزا نبوو شەرت – شوورەتێ
دەوڵەتا ڕۆمێ وێ ل مە ها بە
ئەمێ جابەکێ بدەنێ، بلا ئێلا کوردا
ل ئەنادۆلی یێ رابە
حەیفا من تێ بەرەکا ئیگریداغێ
ل تەشکیلەتا کوردا، ئالی یێد عەشیرا
ناوەڵڵا دیسا باڤێ عەدو، کەکێ مەمێ
نە ل ناڤە

***

دلێ من تو دلی نەحەبینە
دۆرا کۆچکا کەکی عەدۆ گولێ بینە
حەیفا من تێ بەرەکا ئیگریداغێ
ل تەشکیلەتا کوردا، ل ئالی یێد عەشیرا
نا وەڵڵا دیسا کەکێ عەدۆ
ئەڤ تو نینە

«کلاما ئیگریداغێ» پۆیێمێکە لە زیاتر لە دووسەد دێڕە شیعر پێکهاتووە. قاچاغ لە شوباتی ساڵی ١٩٦٢ لە یەریڤان هۆنیویەتییەوە. چیرۆکە شیعرییەکە باس لە شۆڕشی کورد دەکا لە ساڵی ١٩٣٠ لە ژێر فەرماندەی ئیحسان نووری پاشا. وا بوو تورکە



کەمالییەکان بەئاگر و ئاسن گەلێ کەسیان کوشت و زیاتریان ئاوارە بوون و سەرۆکی شۆڕشەکەش پەنای بردە بەر ئێران و لەوێ بوو بە پەنابەری سیاسی.

ئەم پارچە شیعرە پێشەکیی پۆیێمەکەیە. داهێنانی شیعری قاچاغ لەوەدایە ئەم پێشەکییەی لەسەر دەستووری «لاوک»ی باکووری کوردستان و «حەیران»ی باشووری کوردستان داناوە. لە خوێندنەوەدا بەئاشکرا دیارە وەکو بڵێی گۆیندەیێکی میللیی نەخوێندەوار ئەم لاوکەی هۆنیوەتەوە، بەڵام لە ناوەڕۆکیدا ئەوە دەردەکەوێ خاوەنەکەی ڕۆشنبیرێکی زانا و هەڵکەوتووە. دیارە بەشەکەی دیکەی پۆیێمەکە شیعرێکی ئاساییە.

ئەوەی پێویستە لە پارچە شیعرەکەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە، «ئاگری داغ» بە«ئیگریداغ» دەردەبڕن. مەبەسی شاعیر لە «حەسەن نووری» «ئیحسان نووری پاشا»یە. ئیبراهیم و شێخ زاهیر دەبێ یاوەری ئیحسان نووری یا جەنگاوەری شۆڕشەکە بن. هەروەها ناوی «عەدۆ» و «مەمۆ» هاتووە، ئەمانە بێ گومان جەنگاوەری شۆڕشەکەن. «ئەنەدۆڵ»یش ناوی جوگرافی بەشی ئاسیای تورکیایە، کوردستانی تورکیا هەمووی لەو بەشە دایە.

***

قاچاغی مراد شاعیرێکی ڕەند و ڕۆشنبیرێکی بەرچاو و ڕۆژنامەنووسێکی بەکار بوو. ماوەیێکی زۆری ژیانی خوێندەواری لە ڕۆژنامەی «ریاتازە» بردۆتە سەر. لە شیعردا یەکێکە لەو شاعیرانەی بەشداری کردووە لە دروستکردنی شیعر لە ناو کۆمەڵی کوردەواری قەفقاسی ڕووسیا. لە پێشانا مەشقی شیعری میللی هەبوو، شیعری لە فۆلکلۆر جیا نەدەکرایەوە. بەڵام لە دواییدا شیعری کوردی گەیاندە ئەو پلەیەی لە دواڕۆژدا دەبن بەکلاسیکی، بەمانای شیعری بەرزی چینی خوێندەوار. قاچاغ لە شیعریدا هەموو کێشە خۆماڵییەکانی بەکارهێناوە، لە قافیە دەوڵەمەندە، لە ڕەوانبێژیدا شێوازی تایبەتی خۆی هەیە. سوودی لە شیعری بەرزی هەموو ئەو نەتەوانەی زمانیان دەزانی وەرگرتووە.

## بەشی نۆزدەم

## حەسەن قزڵجی

**١٩١٤ - ١٩٨٤**

### ژیانی

حەسەن کوڕی مەلا عەلی ناسراو بەحەسەن قزڵجی لە ساڵی ١٩١٤ لە بۆکان لە دایک بووە. سەرەتا لە لای باوکی دەستی بەخوێندن کردووە. لە دواییدا هەندێ لە بەرنامەکانی دیکەی خوێندنی مەلایی لە سابلاغ (مەهاباد) تەواو کردووە. ماوەیێک دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە و لە پاشانا جارێکی دیکە گەڕاوەتەوە سەری. خوێندنی پچڕ پچڕ بووە، لەگەڵ ئەوە بەزیرەکی خۆی هوشیارانە سوودی وەرگرتووە و زۆر شت فێر بووە. لە ساڵی ١٩٣٨ بووە بەمووچەخۆر لە کارگێڕی فەرماندەیی مەهاباد. لەو سەردەمەدا پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵەی ژ. ک. پەیدا کردووە و لە گۆوارەکانی «کوردستان» و «ئاوات» و «گەلاڵە» کارمەند بووە و شارەزایی لە ڕۆژنامەگەریدا پەیدا کردووە.

لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد ساڵی ١٩٤٨ ماڵبەندی ژیانی بەجێ هێشتووە و ڕووی کردۆتە کوردستانی عیراق و ماوەیێک شێخ لەتیفی شێخ مەحمود لە گوندی سیتەک لە سلێمانی میوانداری کردووە و پاراستوویەتی. لە پاشانا بەینێکیش لە سلێمانی ماوەتەوە ئینجا ڕووی کردۆتە بەغدا. بۆ دابینکردنی پارووی نانی کرێکاری و شەربەتفرۆشی و وێنەگری کردووە. تەنانەت لە ڕیستۆرانی عەبدوڵلا شەریفی بەناوبانگی بەغدا کاری کردووە. چاوی جاسووسی دەسەڵاتی عیراق بەدوایەوە بووە چونکە بەقاچاغی لە کوردستانی ئەودیوەوە هاتووە بۆ کوردستانی ئەم دیو. لەسەر ئەمە گیراوە، لە ساڵانی ١٩٥٥ - ١٩٥٨ لەگەڵ عەبدولڕەحمان زەبیحی لە بەندیخانە بووە. لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا ئازاد بووە. دەستی کردۆتەوە بەکاسبی، دوکانی بووە و لە ستۆدیۆی وێنەگری کاری کردووە.

لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەم بەهۆی تێکچوونی باری سیاسی کوردستانی عیراق و بەربەرەکانی کردنی کورد لە لایەن عەبدولکەریم قاسمەوە قزڵجی ناچار بووە بەغدا بەجێ بێڵێ و ڕوو بکاتە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی (کۆماری ئەڵمانیای دیمۆکراتی) ئەو



کاتە. لە پاشانا چووە بۆ بولگاریا و لە سۆفیا نیشتۆتەوە. ماوەیێک لە ئێستگەی ڕادیۆی «پەیکی ئێران» بەشی کوردییەکەی بەڕێوە بردووە. ساڵانێکی زۆر لە ئەورووپا ماوەتەوە، لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەم سەری لە بەغدا داوەتەوە، بەڵام چاوی جاسووسەکانی عیراق هەر بەدوایەوە بووە. لە پاش کوودیتا ئیسلامییەکەی خومەینی قزڵجی گەڕایەوە ئێران و بەکوڵ کەوتەوە کاری سیاسی لەتەک پارتی توودەی ئێران تا گەیشتە پلەی ئەندامیەتی مەکتەبی سیاسی، هەروەها بوو بەبەڕێوەبەری بەشی کوردی لە ڕۆژنامەی «مَرْدُم = مەردوم»ی ئۆرگانی پارتی توودە. ڕژێمی ئیسلامی تازە ماوەی بەتوودە نەدا، زوو هەناسەبڕی کرد. لە ساڵی ١٩٨٣ گەلێک لەم توودەییانە گیران، حەسەن قزڵجییان لەگەڵ بوو. لە پاش ساڵ و نیوێک لە پاییزی ١٩٨٤ لە ژێر زەبر و زەنگ و ئازار و ئەشکەنجەی زەبانییەکانی بەندیخانە قزڵجی دوا هەناسەی هەڵکێشا و هەواڵی مردنیان بەکەسوکاری گەیاند.

### قزڵجیی نووسەر

دە دوازدە کورتە چیرۆکی هونەری وەکو بەرهەمێکی داهێنراو حەسەن قزڵجی دەکەن بەنووسەر و ناوی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا تۆمار دەکەن. کارەکانی دیکەی دەبن بەمایەی ئەوەی وەک ڕۆشنبیرێک تەماشا بکرێ و نایکەن بەنووسەر. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کارانەی لە گێتیی داهێنان دەچنە دەرەوە و لە خانەی ڕەخنە و لێکۆڵینەوەدا خۆیان دەبینن بەشێکی گرنگن لە کەسێتی ڕۆشنبیری قزڵجی.

ئەگەر بەپێی ڕێبازە ڕیالیستییەکانی چیرۆکی کوردی تەماشای چیرۆکەکانی قزڵجی بکرێ بێ گومان وەک نموونەیێکی بابەتی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی خۆیان دەنوێنن. لە بنجدا بەگشتی چیرۆکی کوردی بەم ڕێبازە لە دایک بووە و پێ گەیشتووە تا ئێستا. لە گێتیی ئەم ڕێبازە یەکجار فراوانەدا نووسەر چۆتە ناو گۆشەیێکی بچووک و تەسک، بەڵام زۆر گرنگ لە واقیعی ژیانی چەوساوەکان دەدوێ کە لە ئەنجامی دەست ڕۆیشتوویی چینەکانی سەرەوە پەیدا بووە. بەم پێیە قارەمانی بنچینەیی لای قزڵجی نوێنەری چینەکانی خوارەوە و سەرەوەن لە ڕەنجبەری گوند و پاڵە و بۆرجوازی بچووکی شار و دەرەبەگ و شێخ، دوو چینی دژ بەیەک. نووسەر توانیویەتی وێنەی هەستی دەروونی ناوەوەی نوێنەرانی هەردوو چین بەشێوەیێکی داهێنانی ئەدەبی بکێشێ. بۆ ئەم مەبەستە شێوازی کۆمیدی (گاڵتەجاڕی) وەک بەشێکی دراما بۆ کێشەیێکی جیددی یا تراجیدی بەکارهێناوە.

نووسەر ژنی نەکردووە بەقارەمانی ناوەڕۆکی دڵداری، لای ئەو دلبەرە شۆخ و شەنگەکەی بووکی شیعر نییە، هەروەها قارەمانی میللیی خەباتچیش نییە بۆ بیری کوردایەتی، بەڵکو کەسێکی چەوساوەیە، ئایینیش غەدری لێ کردووە و هەوێی بۆ دروست کردووە. بەم جۆرە ژنیش دەچێتە ناو چینی خوارەوە بەپێی دابەشکردنی خەڵکی ناو کۆمەڵ بەسەر چینەکانی کە فەلسەفەی مارکسی هێڵی بۆ کێشاون.

شارەزایی قزڵجی لە تەکنیکی نووسینەوەی چیرۆک و قووڵبوونەوەی لە ناخی ژیانی کۆمەڵایەتی دانیشتوانی گوند و شار لەگەڵ زانین و شارەزایی لە زمانی کوردی بوونەتە هۆی ئەوەی ئەم برە چیرۆکەی ببێتە نموونەی داهێنانی هونەری لە ئەدەبی کوردیدا.

## قزڵجیی ڕۆشنبیر

نووسەر باوەڕی بە هێزی بە فەلسەفەی مارکسیزم بووە و هەندێکی لێ زانیوە، لە پراکتیکدا پێڕەوی مەشقی کۆمۆنیستە بۆلشەڤیکەکانی ڕووسی کردووە (١٩١٧ - ١٩٩١)، ئەوانیش وەکو ئاشکرایە تاقیکردنەوەکەیان سەری نەگرت و ڕووخا. ئەمە هیچ پێوەندییێکی بەزانینی فەلسەفەی مارکسەوە نییە وەک تیۆری. قزڵجی و گەلێ کەسی سەر ئەم ڕووی زەوییە کەڵکیان لێ وەرگرتووە.

قزڵجی بەهۆی چیرۆکەکانیەوە بووە بە نووسەر. لە کاتی خۆیدا تاکە شیعرێکی بۆ سەرکەوتنی عەبدولکەریم قاسم (١٩٥٨) و ژێرکەوتنی ئەمپریالیستی گێتی بەسەرۆکایەتی بەریتانیا و ئەمەریکا وتووە، بەڵام ئەو شیعرە نەیکردووە بەشاعیر و ڕووی بڵاوکردنەوەی نەبووە هەرچەندە بڵاویش کراوەتەوە.

کارەکانی دیکەی لە وتار و لێکۆڵینەوەی زانستی دەکرێن بەدوو بەشەوە:

١- لە هەندێ وتاریدا لە شاعیرانی کورد دەدوێ، زانیاری بەکەڵک دەدا بەدەستەوە، ئاگا و هەواڵی تازە دەردەبڕێ لە بابەت ئەدەبی کوردییەوە.

٢- لەو وتارانەی بەناوی ڕەخنەوە بڵاوی کردوونەتەوە ئەگەر تا پلەیێک سەرکەوتوو نەبێ لەبەرئەوەیە درەنگ و لە تەمەنێکی بەساڵاچوو شارەزایی لە ئەدەب و ڕەخنەی نەتەوەکانی ئەورووپا پەیدا کردووە، لەبەرئەوەی لە هەموو لایێکی نەگەیشتووە، ئیتر ئەمەی تێکەڵ بەئەوەی ڕۆژهەڵاتی لای خۆمانی کردووە بۆیە مەبەسە زانستییە ڕاستەقینەکەی نەپێکاوە.



قزڵجی لە زمانەوانی کوردیدا دەستی باڵای بووە، لایەنە پراکتیکییەکەی پێشکەوتووە، چونکە شارەزای کون و کەلەبەر و نهێنییەکانی زمانی کوردی بووە، لایەنە تیۆرییەکەی کز بووە چونکە مەشق و کۆششی لەم لایەنەوە زۆر نەبووە.

لە وەرگێڕاندا نووسەر دەوری باڵای بووە، بەزمانە جوانەکەی لێکسیکۆنی زمانی کوردی جوانتر کردووە بەوەی هەندێ بەرهەمی گرنگی نووسەرانی گێتی لە زمانانی بێگانەوە وەریگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی، لەمانە هەندێ لە بەرهەمەکانی مەکسیم گۆرکی، ڤیکتۆرهیگۆ، ئێلین پێلین، ئەنتۆن چیخۆڤ، عەزیز نەسین و هی دیکە.

## نموونەی چیرۆکی

نووسەر لە ساڵی **١٩٧٧** لە چیرۆکێکی بەناوی «وەڵامێکی زیرەکانە» دەڵێ:

«شەوی مابوو، مستەفای نانەوا لەگەڵ شاگردەکانی خەریکی تەندوور داخستن و هەویر شێلان بوو، لە بەرەبەیانەوە دوانیان گونتکی دەگرت، یەکێکیان دەیکردەوە، مستەفاش بەو چلەی هاوینە لەبەر تەندوورەکە وێستا بوو، نانی پێوە دەدا، یەکێ لە شاگردەکانیشی لەسەر پێش خوانەکە دانا بوو نانەکان بفرۆشێ. بەیانی زوو لە پێش هەموو کەسدا کارگەرەکان دەهاتن، هەریەکەی چەند نانی دەکڕی و بەپەلە دەڕۆیشت تا خێرا بگاتە سەر کارەکەی، نەوەکو ئەو ڕۆژە کاری دەست نەکەوێ یا هەقدەستی کەمتری بدەنێ. تاوبان گەرم بووبوو، هورووژمی نانکەر نەختێ هێدی بووبووەوە، مستەفا بە یەکێ لە شاگردەکانی گوت: ڕۆڵە چایەکە لێنێ و بچۆ هێندێ پەنیر بکڕە با لە دەرەفەتدا نانەکەمان بخۆین.

لەو وەختەدا حاجی ڕەحیم وەکو مانگا و گوێرەکە نۆکەرەکەی وەدوای خۆی دابوو پێنج شەش نانی پێ هەڵگرت بوو، پەیدا بوو. هێشتا بەتەواوی نەگەیشتبووە بەر دوکانەکەی نەڕاندی: ئەوە کوا مچەی نانەوا؟. مستەفا گوێی لە دەنگی حاجی بوو، هات بەقۆڵی کراسەکەی ئارەقی تەوێڵی سڕی و گوتی: حاجی ئاغا فەرموو!

- چی فەرمووم، ئەوە نانە بۆ منت ناردووە؟ نابێ خەڵک بناسن و قەدری خەڵک بزانن!

مستەفا زۆر بەمەندی و لەسەرخۆ گوتی:

- حاجی ئاغا ببوورە، ئێمە نانی ڕاسپاردەمان نییە، نان دەکەین و دایدەنێین، هەرکەسێ دێ بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ و دەبیا و دەڕوا.

- نابێ ئاگات لە دەمی خۆت بێ، ئەوە وەڵامە بەمنی دەدەیەوە؟

– بەڵێ وەڵامـە و ڕاسـتـیـیـەکـەشی هەر ئەوەیە، من تووڕە نابم و هیـچی خـراپـیـشم نەگوتووە، لە خۆڕایی تووڕە دەبی، نانەکان خراپییان چییە؟

– چۆن خراپییان چییە، ئەوەتا هەر هەویرن ناخورێن.

– حـاجی ئاغـا بڕوانە نانەکـانی سـەر پێش خـوانەکـە، برژاویان تـێـدایە، کـەم برژاویان تێدایە، هەرکەسە حەز لە جۆرێک دەکا، کڕیار خۆی دەبێ هەڵبژێرێ، پێم گوتی ئێمە نانی تایبەتی بۆ کەس ناکەین.

– چۆن ئاوا لەگەڵ من دەدوێی، تۆ من ناناسی، نازانی من کێم؟

– بۆچی ناتناسم (جەنابت!) حاجی قۆیتاسی.

ئەم کابرایە لە پێشدا پێیان دەگوت قۆیتاس سووتخۆر، پاشان کە دەوڵەمەند بوو، چووە حەج و ناوی خۆی نا حاجی ڕەحیم.

– ئەی خـوا مـوبارەکی نەکـا، وامـان لێ هات؟ من سـەدی وەک تۆ کـرێ نشـینم هەیە، نەختێ بفامە و بزانە چۆن لەگەڵ خەڵک دەدوێی!

– زۆر باش دەفـامم و دەزانم چۆن لەگـەڵ خەڵـک بـدوێم، منیش سـەدەها کـەسی وەک تۆ نانخۆرم هەیە و لایێکی ئەم شارە نانی من دەخوا».

***

حەسـەن قـزڵجی نووسـەر و ڕۆشنبیـرێکە دەوری دیاری بووە لە پێشـخـستنی پەخـشـانی کـوردیدا. لە هونەری چیـرۆکـدا کۆششی بەرچاوە. لە نیـوەی دووەمـی سەدەی بیـسـتـەمـدا لەگەڵ ئەوەی دەبوو شیـعری کوردی لە ناوەوە بێ چونکە ژیانی ئادەمزاد بەبێ شیـعر نابێ بەڵام پێشکەوتنی پەخشـان بۆ ئەدەبی کوردی گـەلێک گرنگ بـوو، چونکە لە قـۆناغـێکی خـەباتی نەتەوەیی تایبـەتیـدا بوو، پێـویسـتی بە وتـار و چیـرۆک و ڕۆمـان و بابەتـەکـانی دیکەی پەخشان بوو. قزڵجی یەکێک بوو لەو نووسەرانەی فریای ئەوە کەوتن لەم ڕووەوە ئەدەبی کوردی دەوڵەمەند بکەن.

نموونەی چیـرۆکی ڕیالیستی کۆمەڵایەتی لە لای قـزڵجی ئەگەرچی بەژمـارە و قەوارە کـەم بوو، بەنـاوەڕۆک و بابەت فـراوان نەبوو، بەڵام بوو بەو گەوهەرەی گـێـتـیی ئەدەبی کـوردی ڕووناک کردەوە.

# بەشی بیستەم

## شاکر فەتاح

**١٩١٤ – ١٩٨٨**

### ژیانی

شاکر فەتاح یەکێکە لە نووسەرە بەراییەکان کە پەخشانی بۆ نووسینی کوردی هەڵبژاردووە، بەمە بووە بەیەکێک لە دامەزرێنەرانی چیرۆک لە ئەدەبی کوردیدا. نووسەرێکی دیار و کەسێکی بەدیمەنی کۆمەڵی کوردەوارییە. شاکر فەتاح لە ساڵی ١٩١٤ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە. سەردەمی منداڵی لە گوندەکانی شارباژێڕ و شاری سلێمانی بەسەربردووە و خوێندنی سەرەتایی لەوێ تەواو کردووە. قوتابخانەی ئامادەیی لە بەغدا بەئەنجام گەیاندووە. لە پاش ئەمە ماوەییێک لە لبنان و فەلەستین ماوەتەوە، ئینجا گەڕاوەتەوە بەغدا و لەوێ کۆلێجی ماف (حوقووق)ی تەواو کردووە. لە دوای سێ مانگ بووە بەمووچەخۆری میری و لە گەلێ لە ناوچەکانی کوردستانی عیراق خزمەتی کردووە، تا گەیشتۆتە پلەی سەرۆکی شارەوانی و قایمەقامیەتی. لە ژیانی وەزیفەیدا ڕەوشت ڕاست و دروست بووە، بەشدارییێکی زۆری لە کاروباری کۆمەڵایەتی و بڵاوکردنەوەی خوێندەواریدا کردووە.

لەو شارۆچکانەی شاکر فەتاح کاری بەڕێوەبردنی کردووە لەگەڵ ئیش و کاری ڕەسمی بەتەقەلای ئەو گەلێ قوتابخانەی شەو و ڕۆژ و بنکە و یانەی ڕۆشنبیری دامەزراوە. هەندێ قوتابخانەی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری کردبووەوە. خۆی سەرپەرشتی دەکردن و گەلێ جار خۆشی وانەی لەو قوتابخانانەدا دەووتەوە. لە قوتابخانە و یانەکاندا ڕۆژنامەی دیواری بە مامۆستا و قوتابی و مووچەخۆری دیکە دەنووسییەوە، ئەمە هەمووی لەو سەردەمانەی کە لە قەزا و ناحیەکاندا قایمقام و مودیر بووە.

نووسەر زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی عیراق گەڕاوە، لە ناوەڕاستی سییەکانەوە، لە هەندێ شارۆچکەکاندا کاروباری بەڕێوەبردنی بەرزی بووە. لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا (١٩٧٥) کە ئاواتەکانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ بەدی نەهاتن، دەسەڵاتی بەغدا یەک لایی ئیدارەی ئەڤتۆنۆمی کوردستانی عیراقی دامەزراند و هەولێر کرا بەنێوەندی



بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی کوردستانی عیراق. شاکر فەتاح لەم دامودەسگایەدا بەشداری کرد. دوا کاری لێرەدا جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی یاسا دانان بوو. لە ڕۆژانی ١٢ و ١٣ی ئاداری ١٩٨٨ لە هەولێر سیمینارێک بەناوی «سیمینارێکی زانستی لە بابەت کوردەوە لە بیری سەرکردە سەدام حوسێن»دا ساز کرا. کۆمەڵێک شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیری کورد ئامادە بوون. شاکر فەتاح بەشداری لەم سیمینارەدا کرد. دیار بوو بڕیاری ئەوەی دابوو لەگەڵ دەسەڵاتی بەغدا ڕووبەڕوو ببێتەوە. لەو ماوەیەدا دەسەڵاتی پارتی بەعس بەتوندوتیژی هەڵوێستی بەرامبەر بەهەموو کەسێک دەنواند ئەگەر بیزانیایە هێندەی تۆزقاڵێک پێوەندی بیری هەیە بەبزووتنەوەی نیشتمانی چەکداری کوردەوە کە لە ناو شاخەکانی کوردستاندا خەباتی چەکداری دەکرد. لەو وەزعەدا شاکر فەتاح نەیتوانی لەوە زیاتر خۆی بخەڵەتێنێ و دەروون و مێشکی کردەوە و بەئاشکرا وتی: باشترین چارەسەر بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی کورد ئەوەیە دەسەڵاتی دەوڵەت لەگەڵ تێکۆشەرانی بزووتنەوەی ڕزگاری کورد لە عیراق ڕووبەڕوو دابنیشێ و بکەوێتە وتوویژەوە، بەم ڕێگەیە نەبێ، چەک و سیلاح مەسەلەکە ناگەیێنێتە ئەنجام، ئیتر لە پاش دوایی هاتنی سیمینارەکە شاکر فەتاح گیرا. پاش ماوەییێک لاشەکەیان بەمردوویی دایەوە دەست خێزانی. بەم جۆرە کۆتایی بەژیانێکی پڕ لە ڕەوشتی چاک و بەرهەمی ئەدەبی بەپێز هات و ڕووزەردی و سەرشۆڕیش بۆ ئەو ڕۆشنبیرانە مایەوە کە لە سیمینارەکە بوون و بەرگرییان لە شاکر فەتاح نەکرد.

### ڕۆشنبیر و نووسەر

شاکر فەتاح کەسێکی دیاری ناو کۆمەڵ و ڕۆشنبیرێکی هێمن و لەسەرخۆی دوور لە هەڵەپاچی و بزێوی بوو. پێوەندی لەگەڵ هاوچەرخەکانی خۆیدا بەهێز بوو. زۆربەی شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە پێوەندییان لەگەڵ شاکر فەتاحدا هەبوو، هی وەکو شاعیرانی ناودار زێوەر و بێکەس، مێژوونووسانی سەردەم ئەمین زەکی و تۆفیق وەهبی و حوسێن حوزنیی موکریانی، نووسەرانی ناودار مەحموود جەوەدت و ڕەفیق حیلمی و شێخ محەمەدی خاڵ، کەسی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری دیار ئیسماعیل شاوەیس و ئەمین ڕواندزی، خۆی بەقەرزاری ئەمانە دەزانی چونکە زۆر شتیان لێوە فێر بوو.

لە سەرەتای ژیانی ڕۆشنبیریدا وتاری لە ڕۆژنامەکانی «هاوار» (١٩٣٢ – ١٩٤٣) و «ڕووناکی» (١٩٣٥ – ١٩٣٦) و «ژین» (١٩٣٩ – ١٩٦٣) و «یادگاری لاوان»

(١٩٣٣) و «دیاریی لاوان» (١٩٣٤) بڵاوکردۆتەوە.

نووسینەکانی بەگشتی هەموو لایەنێکی ژیانی خوێندەواری کورد دەگرێتەوە، لە قاڵبی وتاری ئەدەبی و چیرۆک و پەخشانە شیعردا دەست بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی منداڵان و ئەدەبی میللی و مێژوو و ئایینی ئێزیدی و ژیانی رۆشنبیری و گەورەپیاوان و رۆژنامەنووسی و شتی دیکەش درێژ دەکا.

کەسایەتی ئەدەبی شاکر فەتاح لە سەرەتای سییەکانەوە دەست پێ دەکا. یەکەمین کتێبی نووسەر بابەتێکی عەرەبی بووە، وەریگێڕابووە سەر زمانی کوردی. ئەمە کۆمەڵێک کورتە چیرۆکی عەرەبی بوو، بەشێوەییێکی هونەری سەرکەوتوو لە بابەت ژیانی منداڵ و سایکۆلۆجییان دەدوێ. وەکو دەردەکەوێ شاکر فەتاح لە سەرەتای ژیانی ئەدەبییدا بایەخێکی تەواوی بەئەدەبی منداڵان داوە، تەنیا بەوەرگێڕان نەوەستاوە بەڵکو لە دواییدا چیرۆک و ئەدەبیاتی بۆ بچووکان نووسیوە، بەمەبەسی پەروەردەکردنی منداڵ و مێردمنداڵان. بەم جۆرە بەرهەمی ئەم لایەنەی لە دوو کاردا خۆی دەنوێنێ. یەکەمیان «چیرۆک بۆ منداڵان» (بەغدا ١٩٣٥) و دووەمیان «هاوڕێی مناڵ» (بەغدا ١٩٤٨). ئەمانە بریتین لە کۆمەڵە چیرۆکێکی کورت بەمەبەسی ئاراستەکردنی منداڵی کورد بۆ رەوشتی چاک و گونجان لەگەڵ کۆمەڵی تازەدا.

## پەخشانە شیعر و چیرۆک

ماوەی پاش جەنگی دووەمی گێتی، بەتایبەتی ساڵی ١٩٤٧ سەردەمی بڵاوکردنەوەی دوو بەرهەمی گەورە و پڕ بایەخی شاکر فەتاح بوو. یەکەمیان بەناوی «پرشنگ» و دووەمیان بەناوی «شەبەنگەبەڕۆژ»ەوە. «پرشنگ» کۆمەڵە وتارێکی هونەرییە، هەندێ جار دەبێ بەشیعر، کەرەتی دیکە شیعر تێکەڵ بەپەخشان دەبێ، هەندێ بەشی پیەسە، هی دیکەی دیالۆجە لە نێوان ئادەمزاد و سروشتدا. هەرچۆنێ بێ داهێنانێکی بەرزە لە پەخشانی کوردیدا. باس لە هەژاری و نەخوێندەواری و زۆرداری و نالەباری دەکا. گەشبینی لە بیر نەچووە یادی زۆری دڵداری دەکاتەوە. لاوی کورد ئاراستەی زانست و ئەدەب و هونەر و ژیانی بەختیاری دەکا. ئەم کۆمەڵە داهێنانە بەرزە کارێکی گەورەی کردە سەر لاو و پێگەیشتوانی ئەو سەردەمە و دەورێکی باڵای هەبوو لە پەروەردەکردنی نەوەی ئەو رۆژگارە بەشێوەییێک چێژ لە جوانی ژیان و سروشت وەربگرن.

«شەبەنگەبەڕۆژ» کۆمەڵە چیرۆکێکە شاکر فەتاح هونەروەرییانە و ئازایانە پەردە لەسەر



دواکەوتوویی ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەواری هەڵدەماڵێ. بەهەموو هێزییەوە دژی وەستان لە جێی خۆ و کۆنسێرڤاتیزم دەوەستی لە پێوەندیی بنەماڵەییدا بەتایبەتی لە دژی ژن هێنان بەزۆر، وەزعی دیلایەتی ژن لە ناو خێزاندا، بەکارهێنانی ئایین بۆ کاری خراپە، دژی بیرۆکراتیزمی دامودەسگای دەوڵەت. بەم جۆرە چیرۆکەکانی «شەبەنگەبەڕۆژ» لە لووتکەی بەرهەمی شاکر فەتاح دەوەستن. یەکێ لە چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵە چیرۆکە «چۆن گرامافۆنەکەم کڕی» وەرگێڕاوەتە سەر زمانی رووسی.

لە وتاری هونەری و چیرۆکی کوردی شاکر فەتاح بابەتێکی ئەدەبی دیکەی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، بەهیوای ئەوەی خوێندەواری و رۆشنبیری لە کۆمەڵی کورداندا بڵاوببێتەوە. بۆ ئەم ئامانجە کتێبی «گەورەپیاوان» (بەغدا ١٩٣٨)ی بڵاوکردۆتەوە. ئەمە بریتییە لە زنجیرەییێک وتاری هونەری لە بارەی کەسایەتییە بەدیمەنەکانی گێتی لە زانستی و هونەر و سیاسەت و شتی دیکەدا. وتارەکان ژیانی کەسی وایان گرتۆتە خۆ وەکو: گوتنبیرگ، کریستۆڤەر کۆلۆمب، مارکۆنی، گاندی و هی دیکە. نووسەر خۆی لە بابەت کتێبەکەیەوە دەڵێ: سەرگروشتەی چەند گەورەپیاوێکە، ئامانجی پێگەیاندنی گەورە و پێکهێنانی گیانی گەورەیی و پێشکەوتنە لە کوردەواریدا». هەرچەندە بابەت و ناوەرۆکی نووسینەکانی شاکر فەتاح کۆمەڵایەتییە بەڵام بەهەناسە و هەوایێکی رۆمانتیکی و هونەرییانە قاڵبیان دەدا. هەموو مەرجێکی داهێنانیان تێدایە و ئیستێتیک دەبێ بەماکی دروستبوونی بەرهەمەکانی. بۆیە دەبینین لە دوا ساڵی پەنجاکاندا دوو بەرهەمی تازە بڵاو دەکاتەوە، یەکەمیان بەناوی «ئافرەتی کورد» (بەغدا ١٩٥٨)، دووەمیان بەناوی «ژینی نوێ» (بەغدا ١٩٥٩). ئەم دوو بەرهەمە لەگەڵ ئەوەی بەناو و ناوەڕۆک خەریکی ژیانی کۆمەڵایەتین، بەڵام بریتین لە وتاری رۆمانتیکی شیعرئامێز. لە یەکەمیاندا نووسەر تێدەکۆشێ بۆ پێشکەوتنی ژنی کورد، بۆ رزگارکردنیان لە کۆت و پێوەندی رەوشت و خووی رزیوی کۆمەڵایەتی، بۆ گێڕانەوەی مافی داگیرکراویان، چونکە مایەی ژیانی ئادەمزادن.

شاکر فەتاح لە «ژینی نوێ»دا جێگە و رووداو و قارەمان لە کۆمەڵی خۆیدا پیشان دەدا، لە ژیانی میللیی نەتەوەوە وەردەگرێ و دەیخاتە قاڵبێکی هونەرییەوە. هەوڵ دەدا و تێدەکۆشێ بۆ ژینێکی نوێ، دوور بێ لە ئازار و هاوار، پڕ بێ لە ئازادی و کامەرانی، لەسەر بنچینەی زانست و هونەر و دادپەروەری دامەزرا بێ.

## بەسەرهات و گەشت و یادداشت

لە پاش ڕووداوەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا بەرهەمی شاکر فەتاح هەندێ کەم بووەوە. لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا بەگشتی خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردی لە کوردستانی عیراقدا لە لێژیدا بوو. لە دوا ساڵانی شەستەکاندا شاکر فەتاح دەستی کردەوە بەجموجۆڵی ئەدەبی و خوێندەواری، بۆ ئەم مەبەسە سێ پرۆژەی بڵاوکردنەوەی دامەزراند. کۆمەڵێک نامیلکە و سیپارەی نووسییەوە لە زنجیرەی یەکەمدا لە بابەت ژیانی بەشێک لە گەورەپیاوانی گێتی وەکو گاریبالدی، مادام کۆری، سوکرات، ئەفلاتوون، عومەر خەیام زانیاریی گشتی خستۆتە ڕوو. زنجیرەییێکی دیکەی بڵاوکردەوە بەناوی گەشتنامە لە ئاوەدانییە جیاوازەکانی ناوچەی سلێمانی، لەمانە «گەشتی شاربازێڕ» و «گەشتی سرۆچک» و «گەشتی پێنجوین» و «گەشتێ بۆ هەڵەبجە و هەورامان». لە زنجیرەی دواییدا کۆمەڵێک کتێبی دیکەی بڵاوکردەوە لە بابەت ئایینی ئێزیدی و ژیانی کۆمەڵایەتی کورد و بەسەرهاتی هەندێ لە شاعیرانی کوردی وەکو حاجی قادر و زێوەر و بێکەس.

شاکر فەتاح تا ڕۆژی مردنی قەڵەمی لە کار نەکەوت، سامانێکی ڕۆشنبیری بەنرخی بۆ نەتەوەکەی خۆی بەجێ هێشت. لە بەرهەمە ئەدەبی و کۆمەڵایەتییەکانی نووسەردا گەلێ تەنگوچەڵەمە و ناگزووری و ناکۆکی ناوەوەی خەڵکی کورد ئاشکرا دەبێ. شاکر فەتاح بانگی خەڵکی ناکا ڕاپەرن لە دژی زوڵم و زۆرداری، بەڕێگەی خوێن ڕشتن نایەوێ باری ژیان سووک بکا، لەبەرئەوەیە بەرهەمەکانی دەورێکی باڵایان هەبوو لەوەی کە خەڵکی بیر لە هەژاری و دواکەوتوویی خۆی بکاتەوە. لاوان بیر لە دوارۆژی نیشتمان بکەنەوە. هەوڵ بدەن بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێکی سەربەست و بەختیار. ئەوەی سەیر بێ ئەوەیە شاکر فەتاح زۆر دوور بوو لە زەبر و زەنگ و تیرۆر، کەچی ژیانی خۆی بەتیرۆر و تراجیدییانە کۆتایی هات.

زمانی نووسینی شاکر فەتاح ئاسان و ڕەوان و بێ گرێیە، ئاراستەی زۆربەی خوێنەر و خوێندەوارانی کۆمەڵی کورد دەکرێ. تازە بابەتە و دوورە لە شێوازی ڕەوانبێژیی نووسینی کلاسکیی کۆن.

# بەشی بیست و یەکەم

## عەونی

**١٩١٤ - ١٩٩٢**

### ژیانی

عوسمان کوڕی حەبیب کوڕی عەبدوڵڵا لە ساڵی ١٩١٤ لە شاری کۆیە لە دایک بووە. لە تەمەنی مێردمنداڵی بووە لە ساڵی ١٩٢٧ لە قوتابخانەی سەرەتایی تا پۆلی پێنجەمی خوێندووە. لەو کاتەدا باوکی کۆچی دوایی کردووە ناچار بووە قوتابخانە بەجێ بێڵێ و خەریکی بەڕێوەبردنی دوکانی باوکی و خێزانەکەی بێ. ئەمە بەهیچ جۆرێ ڕێگەی لێ نەگرتووە هاتوچۆی حوجرەی خوێندنی فەقێیان لە مزگەوت بکا. لە مزگەوتی حەتک لە کۆیە لای مەلا محەمەدی مەلا برایمی عەودالآنی هەندێ وانەی ئایینی ئیسلامی وەرگرتووە. عەودالآنی شاعیر بووە، بە نازناوی شیعری «دلاوەر» ناسراوە. جگە لەمە لە دەرەوەی قوتابخانە کتێبەکانی پرۆگرامی پۆلی شەشەمی سەرەتایی خوێندووە. لە سەردەمی لاویەتیدا ناوی «عەونی» وەک نازناو هەڵبژاردووە و لە شیعریدا بەکاری هێناوە. هەر لەو ڕۆژگارەدا گیانی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لە دڵ و مێشکیدا ڕسکاوە، وەک هەندێ لە لاوانی ئەودەمە لە پارتی هیوا نزیک بووە. بەم ڕەنگە کەوتۆتە ناو بزووتنەوەی نەتەوەیی لە کوردستانی عیراقدا. بەم هۆیەوە چەند جارێک زیندانی کراوە و خۆی لە گرتووخانە و بەندیخانەکانی کۆیە و هەولێر و کەرکووک و بەغدا و کووت و نوگرەت سەلمانی باشووری عیراق دیوە. لە شوباتی ١٩٦٣ عەونی وەکو زۆربەی خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد تووشی بەندیخانە بوو، هەروەها لە ساڵی ١٩٦٥ ماوەی حەوت مانگ لە گرتووخانەی هەولێر دەستبەسەر بوو.

عەونی بەدرێژایی ژیانی مووچەخۆری میری نەکردووە، لەسەر ڕەنج و کۆششی خۆی ژیاوە، دوکانی هەبووە و ئاڵوێری کردووە. دوا ساڵانی ژیانی بەنەخۆشی بردۆتە سەر و تا لە ڕۆژی ٢٠ی تەمووزی ١٩٩٢ لە کۆیە کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی باسکی عارەبیان بەخاک سپێرراوە.



### شیعری

عەونی لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیستەم دەستی کردووە بەشیعر وتن، لە ژیانیدا پێوەندی بەشاعیرانی کوردەوە بووە بەتایبەتی ئەوانەی لە کۆیە زیندەگانیان کردووە، هەروەها لە ڕۆژنامەگەری کوردییەوە نزیک بووە وەک ڕۆژنامە و کۆوارەکانی گەلاوێژ و بەیان و هەولێر و کاروان و هاوکاری و برایەتی.

شاعیرییەتی عەونی خۆڕسک بووە، بەگشتی مەسەلە لای ئەو بیر نەبووە بەڵکو جوانکاری بووە، خەیاڵی ئامادە بووە ئیلهام لە هەموو جۆرە بزووتنەوەیێک وەربگرێ و بەرهەمێکی داهێنراوی ئیستێتیکی دروست بکا.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

عەونی بەسەلیقە لە هەردوو جۆرە شیعری کوردی عەرووزی و سیلابی میللی خۆماڵی وتووە.

١- لە شیعری عەرووزیدا بەزۆری بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەلی بەکارهێناوە، کەچی لە موزاریعدا سێ چوار شیعر و لە بەسیتدا تاقە شیعرێکی هەیە. لە یەکێتی قافیە ئەم دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە: ا ت ج د ر ش غ ق ک م ن (ە - ـە) و وو ۆ ی ێ. لە پاش قافیە ئەم وشانەی بەکارهێناوە: چبکا، دەکا، گرت، نەگرت، کرد، تر (دیکە)، عەشق، بم (ببم)، دەبزانم، چین، من، بوو (هەموو)، گەرەکە، لە کێیە، چی، دەوێ، دەکەم، کەم (بکەم)، ناکەم، کردم، بوو، نییە، بێ (ببێ)، دەوێ، نەبێ، نەدا، تۆ، ئیمڕۆ.

٢- لە شیعری کێشی خۆماڵی بەرهەمی زۆرە، هەموو کێشەکانی بەکارهێناوە. لە دە بڕگەیی و حەوت بڕگەیی شیعری فرە زۆرە. قافیەی مەسنەوی لەم جۆرە شیعرەدا بەکارهێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا قافیەی ڕەنگاوڕەنگیش لە شیعریدا بەرچاو دەکەوێ، لە پارچە شیعرێکدا قافیەی وەکو (ا ب ا ب جـ د جـ د) و هی دیکە دەبینرێ.

لە بنجدا شیعرە عەرووزییەکانی لە بابەتی لیریکن، ژمارەی دێڕیان کەمە، لەسەر بنچینەی یەکێتی قافیە دامەزراون، کەچی چیرۆکە شیعرییەکانی بەزۆری درێژن، ئەمانە دەکرێ قەسیدە یا پۆیێمیان پێ بووترێ. کۆمەڵێک بەرهەمی لەم بابەتەی هەیە، ناوەڕۆکیان لە ئەدەبی میللی سەرزار (فۆلکلۆر) و حیکایەتی بەرگوێی ئاگردان

وەرگیراون. لەم لایەنەوە جێی خۆیەتی هەندێکیان دەستنیشان بکرێن: سەرگوزەشتەی مام ڕێوی و وورچ، ڕێوی و دەهۆڵ، سەرگوزەشتەی وورچ و مەیموون، پیرێک، مامەی لادێ، مار و باغەوان، گوڵ و بلبل، بازرگان و تووتی.

لە پێنجیندا عەونی چەند پارچە شیعرێکی بەندی پێنجینی هەیە (ا ا ا ا ب) هەریەکەی لە حەوت بەند پێکهاتووە. جگە لەمانە کۆمەڵێک تاک و چوارین و هەڵهێن (مەتەڵ)ی هەیە. هەروەها بەشێک لە چوارینی خەیامی کردووە بەکوردی.

عەونی شیعری چەند شاعیرێکی کردووە بەپێنج خشتەکی، وەکو نالی، وەفایی، مەیلی (نازناوی شیعری مەلا سابیری مەلا حەبیبە لە ساڵی ١٩١٤ لە شاری کۆیە لە دایک بووە) ، لە شیعری هێمن حەوت غەزەلی کردووە بەپێنج خشتەکی.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

عەونی لە نێوەندێکی ئەدەبیدا ژیاوە، لە شاعیر و نووسەرانەوە نزیک بووە. کەسێکی خودا پێداو بووە کە زوو ئاشنایەتی لەگەڵ دیوانی نالیدا پەیدا کردووە. نالی خۆشویستووە ئەوەندە شیعری ئەوی خوێندۆتەوە بووە بەیەکێ لە قوتابییە زیرەکەکانی قوتابخانەی شیعری کوردستانی باشوور. جگە لە نالی لە کۆنەکان کاریگەری مەحوی و وەفایی بەسەریەوە هەیە. لە تازەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم شیعری ئەحمەد موختار و هێمن ئاسۆی خەیاڵیان فراوان کردووە. ئەمانە هەموویان بوون بەسەرچاوە بۆ شیعری عەونی. هەندێ جار لێیان وەردەگرێ بەدەسکارییەوە، هەندێ جاری دیکە ئیلهامی دەدەنێ بۆ وتنی شیعرێک دەبێتە زادەی خەیاڵی شیعری هەردوو لایان.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە عەونی وەستای غەزەلی کلاسیکیی ئاساییە لە وەسف و دڵداریدا، لە کوردایەتی دەستێکی درێژی هەیە. ناوەڕۆکی نیشتمانپەروەری تێکەڵ بەدانایی و دڵداری کردووە، دەکرێ «غەزەلی نیشتمانی» پێ بووترێ. لە ناوەڕۆکی شیعرە نیشتمانییەکانیدا بەئاشکرا دیارە بیر بەسەر خەیاڵدا زاڵە، لەبەرئەوە لە ڕووی جوانکارییەوە ئەم شیعرانە ناگەنە پلەی شیعرە دڵدارییەکانی، بەڵام ئەگەر لە ژێر ڕۆشنایی شیعری پەروەردە (دیداکتیکی)یەوە تەماشا بکرێ ئەم شیعرە نیشتمانییانەش وەک بەرهەمێکی هونەری داهێنراو خۆیان دەنوێنن.

عەونی لە ناسیۆنالیزمی کوردی (کوردایەتییەوە) دەرباز بووە بۆ ئەنتەرناسیۆنالیزم. پشتی ڤێتنامی باکووری گرتووە و دژی دەستدرێژی ئەمەریکا وەستاوە، هەروەها لەسەر مافی فەلەستینییانی کردۆتەوە.



## نموونەی شیعری

### دڵداری و وەسف

١

لە شیعرێکیدا عەونی دەڵێ:

گەلاوێژ کاتێ هەڵهات نیوەشەو بوو
کە چاوی مەستی ئەو شۆخە لە خەو بوو
بەیان بوو غونچە پشکووت و هەزاریش
خەواڵوو کفت و کۆی بێداری شەو بوو
هەناسەم زولفەکەی لادا لەسەر ڕوو
کە مانگ ئاوا بوو ئەمجا مانگەشەو بوو
گوتم بەختی خەواڵوو زووکە زووکە
دەهەستە هاتنی ڕۆژت بەشەو بوو
مەگەر وا تاریک و ڕوونی بەیانە
کە ڕۆژ هەڵهات بەبۆنەی کۆچی شەو بوو
کە ئەو ڕۆیی بزانن من نەماوم
کە بوونی من لە سایەی مانی ئەو بوو
لە ڕێی هاتا نەهات ئەمجارە (عەونی)
لە مەیدانی گرەو ئەسپی جدەو بوو

لەم شیعرەدا عەونی ئیلهامی لە نالی وەرگرتووە، هەندێ وێنەی داهێنراوی وێنەکانی نالی دێننەوە یادی خوێنەر، بەڵام وەستایی تێدا نواندووە. بەڵگەکانی بریتییە لە چەند ئەندامێکی وردی دلبەر لەگەڵ هەندێ لە دیاردەکانی سروشت بەراووردیانی کردووە.

٢

لەسەر بەرنامەی شیعری پێشوو لە لیریکێکیدا دەڵێ:

دوێنێ کە بە تەنیا بە چەمەن دا گوزەرم کرد
سەیری گوڵ و ڕەیحان و گوڵی نیلۆفەرم کرد

گولّ ویستی به ناز وێنەیی ڕووی تۆ بنوێنێ
ئیمڕۆکه بەیانی بەسەرت لێره دەرم کرد
ڕەیحانه به هیوا بوو وەکو پەرچەمی تۆ بێ
نەم هێشت بدوێ گرتم و بەندی کەمەرم کرد
لافی قەدی تۆی کەوته سەری سەرو و سنەوبەر
ڕاستی لەمەدا سەرزەنشی نەی شەکەرم کرد
شەرحێکی موتەووەل بوو بەیانی سەری زولفت
ئیمشەو به چرای کولّمتەوه موختەسەرم کرد
من ئەودەمه زانیم چییه ئازاری جودایی
ئەو ڕۆژه که نەمزانی بەبێ تۆ سەفەرم کرد
لەم مەجلیسه مەستانه لەبەر دیدەیی مەستت
من بۆ مەزه هێنام و کەبابی جگەرم کرد
موژگان و برۆت تیروکەوانن له کەمینن
لەم دیمەنه سامناکه بەڕاستی حەزەرم کرد
لەو ساوه دلّم داوه به تۆ هەروەکو (عەونی)
لێی بێ خەبەرم تەسلیمی دەستی قەدەرم کرد

شاعیر گەشتی چەمەن و گولّزار و دارستان دەکا، کۆمەلّێ گولّ و دار و درەخت و دەوەن سەرنجی ڕادەکێشن و یادی ئەندامه جوانەکانی دلبەری دەکاتەوه، بۆی دەردەکەوێ ئەوانەی دلبەر لەوانەی سروشت جوانترن. عەونیش وەکو مەستانی غەزەلی کلاسیکی که لەگەلّ دلبەر کۆ دەبێتەوه بەزمی ڕەندان و مەی و مەیخانه دەست پێ دەکا. جگەری شاعیر دەبێ بەمەززه بۆ ئەو بەیەکتری گەیشتنه جاویدانییه.

٣

شاعیر هێلانه لەسەر کولّمی دلبەر دروست دەکا:

دلّ له من تۆراوه دیسان هەمدەمی یاری دەوێ
ئارەزووی گەشت و گوزاره باغ و گولّزاری دەوێ
بولبول ئاسا وا خەریکی ئاشیان هەلّبەستنه
غونچەییێکی ناسکی وێنەی دەمی یاری دەوێ



پەرچەمی چین چین بەڕێز هێنایه دەوری ڕوومەتی
گەنجی ڕوخساری هەمیشه جووتێ پاسداری دەوێ

شاعیر ئارەزووی ئەوه دەکا لەسەر کولّمی دلبەر وەکو بلبل هێلانەیێک دروست بکا. کەرەستەی ئەو هێلانەیه پەرچەمی دلبەره له دەوری ڕوومەتی ئالّاوه. دەمی دلبەر غونچەییێکه لەوانەی بلبل گرفتاری بووه، دوو کەزییەکانیشی پاسەوانی هێلانەکەن. ئەمه وێنەییێکی هونەری داهێنراوی شاعیرانەیه.

٤

له شیعرێکیدا عەونی ملوانکه له شیعر دروست دەکا:

ملوانکەییێکی له هەلّبەستی جوان
بۆی دەهۆنمەوه وێنەی مرواری
بەکێشان سووک بێ بەنرخ گران
پێشکێشی دەکەم بەناوی دیاری
که کردیه ملی گەردانەی هونەر
وەک لەعلی سووره شین وەک پیرۆزه
زۆر بەنرختر له دانەی گەوهەر
ئەوه جەژنانەی جەژنی نەورۆزه

نەورۆز له لای شاعیر ئەوەنده پیرۆزه، دلبەر ئەوەنده خۆشەویسته، دەبێ چی شایانی دیاری بێ بۆ ئەو خۆشەویسته بەهۆی ئەو جەژنه پیرۆزەوه! هەموو گەنجینەی سەر ڕووی زەوی کەمه، ئەو کیژه شایانی دیارییێکه وێنەی نەبێ، ئەو دیارییه ئەم شیعره جوانەیه که شاعیر دایهێناوه.

## نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

له لیریکێکیدا عەونی بەناوی «بەرەو هەواری سەرکەوتن» دەلّێ:

کۆچبار کۆچی کرد بەرەو کۆساران
بنەوبارگەیان خست له نزاران

بەرەو هەورازی سەرکەوتن دەڕۆن
مژدەی سەربەستی دەدەن بە یاران
دوا حەشارگەم بێ لانەی خوێناویم
دەگەڕێمەوە لای گیان سپاران
بە خوێنی سووری زامی ناسۆرم
دەبێ ڕەنگین بێ مەکۆگای جاران

کاروانی خەباتی میللەتی کورد کەوتۆتە ڕێ بەرەو ژوور، بەرەو لووتکە. لەوێ کاروان دەگاتە ئەنجام. ئەم کۆششە بۆ گەیشتن بەهیوا بەبێ خوێن ڕشتن و شۆڕش سەرناگرێ. ئەمە تیۆریی ڕۆشنبیری کورد بوو لەو سەردەمەدا. ئەو کاتە ڕاست بوو، لەبەرئەوە ئەو شیعرە بەهۆی هەوێنی جوانکارییەوە بۆ هەموو کاتێک دەست دەدا و کۆن نابێ. کاروانی خەباتی کورد ئەگەرچی تا ئێستاش نەگەیشتۆتە ئەنجام، بەڵام خوێن ڕشتن باوی نەماوە. ئەگەر شاعیرێک یا ڕۆشنبیرێک هەرچەندە ڕۆمانتیکیش بێ لە سەدەی بیست و یەکەمدا خوێن ڕشتن ناکاتە مەرج بۆ گەیشتن بەئامانج.

٢

عەونی گفتوگۆی لەگەڵ کچێکی کوردا هەیە، ئەو کچە ڕەمزی کچی دایکی نیشتمانە، بەم دێڕانە پرسیاری لێ دەکا:

گوتم ئەی کچ لە گەشتی
شارستانی یا دەشتی
وا جوان و پاک ڕەوشتی
مەسیحی یا زەردەشتی!

***

ئەو کچە کوردە نازدارە
ڕەنگ زەرد و لێو بەبارە
بەرگی ڕەشی پۆشیوە
وا مەلوول و غەمبارە

***



ئەو کچە کوردەی وا نازدار
کە من لێم دەکرد پرسیار
دەستی کرد بە گرینێ
فرمێسکی دەهاتنە خوار

***

گوتم ئەی کچ تۆ و یەزدان
بۆ دەستت کرد بە گریان
کە من وا تۆ دەبینم
جەرگم دەبێتە بریان

عەونی کچێکی جوان و نازداری کردووە بەڕەمزی کچی دایکی نیشتمان، جلی ڕەشی پۆشیوە و لێو بەبارە، لێی دەپرسێ بۆ وا پەشووکاوە! فرمێسکی کچ دێتە خوارێ، هەنسکە هەنسکییەتی، شاعیر لێی دەپاڕێتەوە، سوێندی دەدا باس لە کارەساتی خۆی بکا، کچی دایکی نیشتمان دێتە وەرام و دەڵێ:

گوتی ئەی برای کوردی من
گەر بزانی دەردی من
هیچ جاری تر ناپرسی
مەلوولی و ڕەنگ زەردی من

***

کیژێکم لێم قەوماوە
خزم و برام کوژراوە
هانام هێناوتە بەرتان
نازانم کێتان پیاوە!

***

ئەو گەورانەی ناسراون
دەڵێن کورد زۆر پیاون
هەموو میللەت فرۆشن
جاهیل و ناتەواون

***

پەنام بردە بەر گشتیان
لە ووردیان تا درشتیان
هەموو لێم ڕوو گرژ بوون
تفوو لە چارەی ڕەشیان

***

تفوو لە چارەیان بێ
لە موڵک و پارەیان بێ
ئەو ڕۆژە شەرمەزار بن
ڕۆژی ژمارەیان بێ

***

حەیفم لە کوردەواری
بۆ لاوانی هوشیاری
خۆڕایی ڕەنجەڕۆ بن
زۆرن تێکدەری کاری

شاعیر دواکەوتن و بەجێمانی خەڵکی کورد لە کاروانی میللەتان و ئەو کارەساتانەی بەسەریان هاتووە دەگەڕێنێتەوە بۆ کردەوەی خۆپەرستی و چاوچنۆکی ناو میللەتی خۆی. خیانەتی میللەت فرۆشان و زەبروزەنگی سەرداران هێندەی سیاسەتی ناهەمواری هاوسێیانی کورد و بەرژەوەندی ئەمپریالیستەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا بەڵکو زیاتریش بۆتە هۆی هەموو ئەو گیروگرفتانەی کورد تیایاندا دەژی. شاعیر ناهەقی نییە بەزمانی ئەو کچەوە جنێو بەو سەرۆکانە دەدا.

## ٣

عەونی لە شیعرێکیدا باس لە کاوەی ئاسنگەری مێژووی دێرینی ڕۆژگارانی ئەرکیۆلۆجی ئەفسانەیی دەکا. ئەوجا کاوەییێکی دیکە دەدۆزێتەوە لە سەدەی بیستەمدا لە مستەفا بارزانی بەرجەستەی دەکا:

دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر
هەستا کاوەی ئاسنگەر
بوو بەپێشڕەو و ڕابەر
دەستی کرد بەشۆڕوشەڕ



بەهێزی بازوو و مەچەک
نایە سەرشانی کوتەک
دژی زۆردار ڕاوەستا
سوێندی خوارد بە ئاڤێستا

شاعیر دەڵێ لە مێژووی دێرینی کورد لە ناو هۆزەکانی باپیرانی کوردی ئێستا کە یەکێکیان مادەکان بوون قارەمانێکیان لێ هەڵکەوت، ناوی کاوەی ئاسنگەر بوو، شۆڕشی هەڵگیرساند و میللەتی خۆی لە زۆرداری ئەژدەهاک (زەحاک) ڕزگار کرد. لە نەوەی کاوە و میدیاییەکانی کۆن لە سەدەی بیستەمدا مستەفا بارزانی پەیدا بوو:

لەوسا ئاگر یەکجاری
دروشمە بۆ ڕزگاری
پشت بەپشت هەر مایەوە
بەهیچ هێز نەکوژایەوە
تاکو سەدەی بیستەم هات
پاش هەزاران کارەسات
لە کوردستانی بەرین
کاوەی سەدەی بیستەمین
کاوەی نەمر بارزانی
ئالای خستە سەرشانی
شۆڕشێکی بەرپا کرد
مافی کوردی داوا کرد

لە ڕۆژگارانی مێژووی ئەفسانەیی کۆنەوە ئەو ئالایەی کاوە هەڵی کردبوو هەر دەشەکێتەوە و پشتاوپشت قارەمانانی مێژوو لە یەکتریان وەرگرتووە، تا گەیشتە سەدەی بیستەم و کەوتە دەست مستەفا بارزانی. مەبەسی شاعیر هەڵگیرسانی ڕاپەڕینی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ە لە کوردستانی عیراقدا.

## دانایی و مێژوو

١

بەلای شاعیرەوە گەورەیی ئەنجامی ئازایی و ژیرییە:

بەختیاری دوو جیهان تەنیا بەکۆشش کردنە
هەر کەسێکی کۆڵنەدەر بێ ڕووی بەرەو سەرکەوتنە
حەز دەکەی گەر بەرگی ئازاد بپۆشێ وەک کەوا
نرخی سەربەرزی لە ڕێگای سەرلەژێری کەوتنە
لافی سەرداری لە ژێر دارا دەبێ ترست نەبێ
دەست هەموو کەس ناکەوێ ڕێگا بەهیوا بردنە
چوونە کۆی لەیلا هەموودەم ڕێگەییێکە ترسناک
چاکترین کارێک لە بۆ ئەم ڕێگە خۆ شێت کردنە
چوونە مەیدانی خەبات بۆ بەختیاری قەومەکەت
دوودڵی پێناوی (عەونی) پشت بەیەزدان بەستنە

لەم شیعرە جوان و پڕ مانایەدا عەونی لەسەر ئەو باوەڕەیە گەورە ئەو کەسەیە لەسەر هەق لە سێدارە نەترسێ، ئازایی مەنسووری هەلاجی هەبێ، بیروباوەڕی سۆفیزمی مەجنوونی هەبێ، هیچ هێزێک لە گەردووندا نەبێ ڕێی لێ بگرێ و نەهێڵێ بەرەو مەڵبەندی لەیلا مل بنێتە ڕێ. لەیلای کورد بەدرێژایی مێژوو «ئازادی» بووە.

٢

عەونی لە ڕاستی دوور نەکەوتۆتەوە کە دەڵێ مێژوو درۆیە:

ئەگەر ڕاستت دەوێ مێژوو درۆیە
هەموو ڕووداو و ڕابردوو درۆیە
بەچاوی خۆت دەبینی کارەساتێک
دەگۆڕێ پێچەوانەی هەر لە کاتێک
ئەوەی مێژوو دەنووسێ وەک بەڕۆژە
گوڵێکە تابیعی سووڕانی ڕۆژە



لەم دێڕانەدا شاعیر کە هێرش دەباتە سەر زانستی مێژوو ناهەقی نییە، چونکە بەسەرهاتی ڕووداوێک وەکو بووە نانووسرێتەوە بەڵکو وەکو ئەوەی مێژوونووس یا دەسەڵات بەدەست دەیەوێ دەنووسرێتەوە. لەبەرئەوە بۆ دوارۆژ وەکو سامانێکی ڕۆشنبیری بەرهەمی ئەدەبی و هونەری داهێنراو (شیعر و پەخشان) سوودی بۆ کۆمەڵی مرۆڤایەتی هەمیشەییە، بەڵام زۆربەی مێژووە کە لە کەڵک دەکەوێ و کەمی دەبێتە سەرچاوەی ڕاستەقینە. بەتایبەتی مێژووی سیاسی کوردی سەردەم.

***

عوسمان عەونی شاعیرێکی ڕەسەنی گێتیی کوردەوارییە. لە شیعری دڵداری و کەسێتیی قانگدراو بەتارمایی ڕۆمانتیکی باڵادەستە. لە ڕووی کێش و قافیە و ڕیتم بێ کەم و کووڕییە، زمانی ئاسانە. لە ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی کۆن و شیعری میللیی سیلابی خۆماڵی دەوڵەمەندە. لە شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتیدا سەرکەوتووە. لە ڕووی هونەری شیعری و جوانکارییەوە بێ گومان ناگاتە شیعرە دڵدارییەکانی. ئەمە دیاردەییێکە لە لای زۆربەی شاعیرانی کورد بەم جۆرە دەکەوێتەوە. لە پاشانا عەونی بەدوو قۆناغی یەک لە دوای یەک تێنەپەڕیوە، لە پێشانا خەریکی دڵداری بووبێ و لە پاشانا بۆ نیشتمانپەروەری چووبێ. ئەو هەردووکیانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە و بەڕاستی بووە بەشاعیری «دڵداری و کوردایەتی».

## بەشی بیست و دووەم

## ئیبراهیم ئەحمەد

**١٩١٤ – ٢٠٠٠**

### ژیانی

ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد کوڕی فەتاح لە بەهاری ساڵی ١٩١٤ لە سلێمانی لە دایک بووە. سەرەتا لە ساڵی ١٩٢٢ لە قوتابخانەی نمونەی سەعادەت لە سلێمانی دەستی بەخوێندن کردووە. لە ساڵی ١٩٢٣ گواستوویەتییەوە قوتابخانەی لەتیفیە ئینجا چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی یەکەم. لە پاشانا لە ساڵی ١٩٣٢ لە قوتابخانەی ناوەندی سلێمانی بووە بەقوتابی. بەهۆی دەست کورتی ماڵی باوکییەوە مامی گرتوویەتییە خۆی بردوویەتییە بەغدا. لەوێ قوتابخانەی ناوەندی تەواو دەکا ئینجا پۆلی چوارەم و پێنجەمی ئامادەیی لە قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەیی لە بەغدا دەگەیەنێتە ئەنجام.

لە ساڵانی ١٩٣٤ – ١٩٣٧ کۆلێجی ماف (حوقووق) لە بەغدا تەواو دەکا و دەبێ بەئەوقات (محامی). ماوەیێک خەریکی کاری پارێزەری دەبێ تا لە ساڵی ١٩٤٢ کاری دادوەری (قازی) پێ دەسپێرێ کارەکەی لە هەولێر و هەڵەبجە بەمووچەخۆری دەباتە سەر. لە سەردەمی جەنگی دووەمی گێتی (١٩٤٤) ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ چەند رۆشنبیرێکی کورد لقی «کۆمەڵەی ژ. ک.»یان لە سلێمانی کردەوە. لە ساڵی ١٩٤٩ گیراوە و فەرمانی ساڵ و نیوێک بەندی بۆ دەرچووە، ئەو ماوەیەی لە بەندیخانەی ناوەندی بەغدا بردۆتە سەر. لە دوای ئازادبوونی (١٩٥١) خەریکی کاری ئەوقاتی بووە، هەر لەو ساڵەدا لە کۆنفرانسی پارتی دیموکراتی کوردی (لە دواییدا کوردستان) لە بەغدا بەسکرتێر هەڵبژێرراوە. ئیبراهیم ئەحمەد رۆشنبیرێک بوو لەسەر هەژارانی دەکردەوە، لە دژی کردەوەی دەرەبەگان بوو. رق و کینی ئەمانە گەیشتبووە پلەیێک هەوڵی کوشتنیان دەدا، لە ساڵی ١٩٥٤ تەقەیان لێ کرد و لە ئەنجامدا بریندار بوو.

لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی بیستەم ماڵی ئیبراهیم ئەحمەد لە کەرکووک بوو. بەئاشکرا ئەوقات بوو، بەنهێنی خەباتی سیاسی دەکرد. لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا ماڵی لە کەرکووکەوە گواستەوە بەغدا و خەریکی



سیاسەت بوو وەک کادیرێکی پارتی دیموکراتی کوردستان.

لە دووبەرەکییەکەی ساڵی ١٩٦٤ لە ناو رێزی ئەو پارتییەدا ئیبراهیم ئەحمەد لایێک بوو. لە پاشانا چەندوچوون لە ناو هەردوو بەرەدا تەشەنەی کرد تا گەیشتە ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٦ شەڕی ناوەخۆ دەست پێ بکا. لەو ماوەیەدا ئیبراهیم ئەحمەد لە بەغدا بوو تا ساڵی ١٩٧٠ و دەرچوونی بەیانی ١١ی مارت. لەو ماوەیەدا هەردوو بەرەکەی پارتی لە یەکتری نزیک بوونەوە تا ساڵی ١٩٧٥ و کارەساتی کۆتایی هاتن بەشۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کوردستانی عیراق. لە دوای ئەمە ئیبراهیم ئەحمەد وازی لە کاری پارتییایەتی هێنا و نیشتمانی بەجێ هێشت لە پێشانا بۆ ئێران و لەوێوە بۆ لەندەن و بوو بەپەنابەری سیاسی. هەڵسوکەوتی لە ژیانی لەندەنیدا رۆشنبیرانە بوو، وەک کەسێکی بێ لایەن خۆی دەخستە روو، دۆستی پارتی کرێکارانی کوردستان (pkkی کوردستانی تورکیا) بوو، خۆی لێیان نزیک کردبووەوە و بەئەندامی پەرلەمانی خۆیانیان هەڵبژاردبوو لە دەرەوەی نیشتمان. رۆژانە ئیبراهیم ئەحمەد کاتی بەخوێندن و نووسین و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی بیروباوەڕی سیاسییەوە دەبردە سەر. تا لە رۆژی ٨ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٠ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد. لە ٢٠ی نیسانی ئەو ساڵە تەرمی گەیشتەوە سلێمانی و لە گۆڕستانی گردی سەلیم بەگ بەخاک سپێررا.

### رۆشنبیر و سیاسی

ئیبراهیم ئەحمەد خۆی دەڵێ راپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی لە ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ رووداوێکی گرنگ بووە بۆ بەهێزکردنی گیانی کوردایەتی لە دڵ و دەروونیدا. هەر لەو کاتەوە بیری لە چارەنووسی میللەتی خۆی کردۆتەوە، کێشەی نەتەوەیی کوردی بەمەسەلەی هەژاری کوردەوە گرێداوە، بۆ ئەم ئامانجە چۆتە ناو خەباتی سیاسییەوە. لە پێشانا لە کۆمەڵەی ژ. ک. و لە پاشانا لە پارتی دیموکراتی کوردستان بەنهێنی و بەئاشکرا خەباتی کردووە. کارەکەی دوو لایەنی بووە تیۆری و پراکتیکی، لە فێرکردنی خۆی دەوری گرنگی بووە، پیشەی ئەوقاتی رێی بۆ خۆش کردووە ئاسۆی بیری فراوان بێ لە زانیاری گشتیدا. ئاگاداری زانیاری بەگشتی و کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤایەتی بوو، بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بەکوردەوە هەبوو. لە سیاسەتیشدا نیوەی زیاتری ژیانی لەو مەیدانەدا بردۆتە سەر وەک پراکتیک، واتە لە ساڵی ١٩٧٥ کە لە ژیانی پارتییایەتی دوور کەوتەوە، وازی لە ژیانی سیاسی نەهێناوە وەک بێ لایەنێک تا دوا هەناسەی کوردایەتی کردووە.

## ڕۆژنامەنووس

لەو سەردەمەی ئیبراهیم ئەحمەد هێشتا قوتابی بووە لە بەغدا لەگەڵ کۆمەڵێک لاوی کورد دوو بڵاوکراوەیان چاپ کردووە، یەکێکیان بەناوی «یادگاری لاوان» (١٩٣٣)؛ دووەمیان بەناوی «دیاریی لاوان» (١٩٣٤). ئەم دوو بڵاوکراوەیە وەکو کۆوار کۆمەڵێک وتار و شیعریان بەزمانی کوردی گرتۆتە خۆ. جگە لەمە ئیبراهیم ئەحمەد لەم کۆوار و ڕۆژنامانەدا دەوری بووە:

١- گەلاوێژ: لە ساڵی ١٩٣٩ ئیبراهیم ئەحمەد پرۆژەی دەرکردنی کۆواری «گەلاوێژ»ی دانا. لەبەر جموجۆڵی سیاسی خۆی و نەپەرژانی بۆ سەرپەرشتی کردنی کۆوارەکە بەتەواوی، بەڕێوەبردنی بەعەلائەدین سەجادی سپارد. خوێندەوار و ڕۆشنبیری کوردی بەغدا و هەموو کوردستانی عیراق لە دەوری کۆبوونەوە. تا پلەیێکیش کوردانی ئێران و سووریا پێوەندییان بەکۆوارەکەوە هەبوو. بەڕاستی گەلاوێژ یەکێکە لە چاپەمەنییە گرنگەکانی ڕۆژنامەگەری کوردی. ئیبراهیم ئەحمەد و سەجادی دەوری دیاریان هەبوو لە دەوڵەمەندکردنی ناوەڕۆکی کۆوارەکە. ئەم بڵاوکراوەیە تا ساڵی ١٩٤٩ مایەوە، ئیتر لە دەرچوون وەستا.

٢- شەفەق: لە پاییزی ساڵی ١٩٥٧ ئیبراهیم ئەحمەد لە کەرکووک بوو، لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ەوە تا تەمووزی ئەو ساڵە دەوری دیاری هەبوو لە دەرکردنی ئەو کۆوارە. یەکێک بوو لە دەستەی نووسەرانی، سەرکەوتنی کۆوارەکە دەگەڕێتەوە بۆ کۆششی هەموو ئەندامانی دەستەی نووسەران کە ئیبراهیم ئەحمەد یەکێک بوو لەوان.

٣- خەبات = النضال: لە ٤ی نیسانی ١٩٥٩ دەرکردنی ڕۆژنامەی «خەبات = النضال» بەکوردی و عەرەبی بەناوی ئیبراهیم ئەحمەدەوە بوو. ئەم ڕۆژنامەیە زۆری نەخایاند، لە پێش شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ بەماوەیێک لە ٢٨ی مارتی ١٩٦١ داخرا. ڕۆژنامەکە تەنیا سیاسی نەبوو، گشتی بوو، بۆ ڕۆژگاری خۆی سوودی سیاسی و خوێندەواری زۆر بوو، لە پاشانا بوو بەسەرچاوەیێک بۆ مێژووی ڕۆشنبیری کوردی.

٤- کوردستان: لە بەهاری ساڵی ١٩٦١ لە بەغدا لە لایەن ئیبراهیم ئەحمەدەوە پێنج ژمارە لە کۆواری «کوردستان» بڵاوکرایەوە. ژمارە یەکەمی لە ٤ی مارتی ١٩٦١؛ ژمارەی پێنجەم لە ١ی نیسانی ١٩٦١. لە دوای ئەمە کۆوارەکە لە لایەن عەبدولکەریم قاسمەوە داخرا. کۆوارەکە سیاسی و خوێندەواری گشتی بوو، لە



کاتێکدا بڵاو دەکرایەوە گوریسکێشانیی نێوان بزووتنەوەی کورد و دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم گەیشتبووە لووتکە.

٥- چریکەی کوردستان: لە دوای کارەساتی کۆتایی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ لە بەهاری ١٩٧٥ کە ئیبراهیم ئەحمەد بەماڵ و منداڵەوە وەک پەنابەری سیاسی لە لەندەن نیشتەجێ بوو یەکەم ژمارەی کۆواری «چریکەی کوردستان = صرخة کردستان»ی بڵاوکردەوە (تەمووز و ئاغستۆسی ١٩٧٩). نۆ ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە، هەندێکیان بەزمانی عەرەبی بوون، ئەم کۆوارە تا ساڵی ١٩٨٥ بەردەوام بوو، لە ئەیلوولی ئەو ساڵەدا ژمارە (٨ – ٩)ی بڵاوکرایەوە. کۆمەڵێک کوردی دانیشتوانی لەندەن و وڵاتەکانی دیکەی ئەورووپا لە دەوری کۆوارەکە کۆ بووبوونەوە و بەنووسین یارمەتییان دەدا. لە ناویاندا تۆفیق وەهبی و محەمەد ڕەسووڵ هاوار یاریدەدەری بەکار بوون.

## نووسەر

سلێمانی وەکو نێوەندێکی ڕۆشنبیری گرنگ لە کوردستانی عیراقدا دەوری دیاری بووە لە پەروەردەکردن و خەملاندنی گیانی هونەری بۆ نووسینی پەخشان و شیعر لە مێشک و خەیاڵ و دەروونی ئیبراهیم ئەحمەد و هەموو ئەوانەی لەوێ لە دایک بوون. ئەم نووسەرە زوو بەهرەی نووسینی تەقیوەتەوە، لە حوزەیرانی ١٩٣٢ لە ڕۆژنامەی «ژیان»دا وتاری بڵاوکراوەتەوە. لە سەرەتاوە هەوڵی داوە نووسینی بەناوی نهێنی بڵاو بکاتەوە، لە پێناوی ئەوەی خۆی لە چاوی سیخوڕانی دەسەڵاتی میری بشارێتەوە. بەدرێژایی تەمەنی ئەم ناوە نهێنییانەی لە بەشێ لە نووسینەکانیدا بەکارهێناوە: سیاپۆش، بلە، ب. هـ. ل.، ن. أ.، ا. ب. ج.، إ. أ.

بەرهەمی پەخشانی هونەری ئیبراهیم ئەحمەد لە دوو بابەتی سەرەکی دەکەوێتە بەرچاو:

١- چیرۆک: نووسەر ڕۆڵێکی دیاری بووە لە پەیدابوون و پەرەسەندنی چیرۆکی هونەری کوردی لە لایەن نەوەی یەکەمی ئەم بابەتە لە ئەدەبی کوردیدا. لە ساڵانی ١٩٤٢ – ١٩٤٥دا چەند چیرۆکێکی نووسیوەتەوە. خاسیەتی تایبەتی خۆیانیان هەیە، لە ناوەکانیانەوە هەست بەو سیمایە دەکرێ کە لە چیرۆکی دیکە جیا دەکرێنەوە. هەندێ لەو چیرۆکانە ئەمانەن: لە وڵاتی قارەمانانا (١٩٤٢)؛ خازێ (١٩٤٣)؛ کوێرەوەری (١٩٤٤)؛ کەرلۆتی مەنووچەر (١٩٤٥)؛ تۆڵە سەندن (١٩٤٥). ئەم چیرۆکانە وەکو زۆربەی چیرۆکی کوردی ئەو سەردەمە دەچنە ناو شێوازی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتییەوە.

ئەو کۆمەڵایەتییەی پێوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەسیستێمی بەناو دیموکراتی و بەناوەڕۆک فەرمانڕەوایی دەرەبەگی ناوەوەی کۆمەڵ کە هێزی ئەمپریالیستی دەرەوە بەرێوەی دەبا بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی هەردوو لایان. چیرۆکەکانی ئیبراهیم ئەحمەد ڕەنگدانەوەی ئەم جۆرە کۆمەڵەن، بۆیە قارەمانەکانی لە لاییێک ڕەنجبەر و جووتیار و چەوساوە و هەژارانی ناو کۆمەڵن، لە لاییێکی دیکەوە مووچەخۆری گەورە و دەرەبەگ و دەوڵەمەند و دەست و پێوەندەکانیانن.

پۆلیس و هەندێ مووچەخۆر تاقمی یەکەم دەڕووتێننەوە بۆ چاکەی تاقمی دووەم. هەندێ لەم چیرۆکانەی ئیبراهیم ئەحمەد وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی و ڕووسی و هی دیکە. وەرگێڕانی ڕووسی چیرۆکی «خازێ» و «کوێرەوەری» لە لایەن خوێنەری ڕووسەوە پێشوازی چاکی لێ کراوە.

٢- ڕۆمان: ئیبراهیم ئەحمەد دوو ڕۆمانی نووسیوەتەوە، یەکەمیان بەناوی «ژانی گەل» و دووەمیان بەناوی «دڕک و گوڵ»ەوەیە.

ڕۆمانی ژانی گەل لە ساڵی ١٩٥٦ نووسراوەتەوە، بەڵام بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٧٣ بڵاوکراوەتەوە. بەرنامەی ئەم ڕۆمانە بەگشتی هەر ئەوەیە ئیبراهیم ئەحمەد بۆ چیرۆکەکانی داناوە. جێگە کۆمەڵی کوردەوارییە، کات قۆناغی دوای جەنگی دووەمی گێتییە، قارەمانی ڕۆمانەکە شۆڕشگێڕی کوردە بەرهەڵستی زۆرداری دەسەڵات دەکا لە پێناوی مافی نەتەوەیی کورد و مافی سروشتی خەڵک لە یەکسانی و سەربەستی و ئازادی.

ڕۆمانی دڕک و گوڵ لە ماوەی ژیانی بەریتانیای ئیبراهیم ئەحمەد نووسراوەتەوە. بیری بنچینەیی ئەم ڕۆمانە لە هوشیاری ڕۆشنبیرییەوە هەڵقوڵاوە لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا کە زەمینە خۆش دەبێ بەهۆی دەوڵەمەندییەوە منداڵیان ببن بەڕۆشنبیر. هەندێ لەم ڕۆشنبیرانە دەبن بەهەڵگری بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازی لە دژی کۆمەڵی دواکەوتووی دەرەبەگی و فەرمانڕەوایی ئەمپریالیستی ئەورووپا. ئیبراهیم ئەحمەد قارەمانێکی وای دروست کردووە کوڕی دەوڵەمەندێکی کوردە. لە پێناوی بیروباوەڕی تووشی دەردی سەری دەبێ. بەزۆری لە ئەدەبی ڕووسیدا چیرۆک و ڕۆمانی لەم چەشنە دەکەونە بەرچاو.



## وەرگێڕان

ئیبراهیم ئەحمەد دەستێکی درێژی هەبوو لە وەرگێڕان لە زمانانی عەرەبی و ئینگلیزییەوە بۆ زمانی کوردی. زوو دەرکی بەوە کردبوو بەبێ وەرگێڕان خوێندەواری لە ناو کۆمەڵی کوردەواریدا بەتەواوی سەرناگرێ. ئەم بیرەی ئیبراهیم ئەحمەد لە کۆواری گەلاوێژدا ڕەنگی دابووەوە، لەبەر هەندێ ئەو کۆوارە بایەخی بەوەرگێڕان دەدا.

لە کۆششی نووسەردا وەرگێڕان جێی تایبەتی هەیە. بایەخی بە وتاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەدەبی و مێژووی ژیان دەدا. کردەوەی لە هەندێ لەم کارانەدا بەرچاو دەکەون:

١- کۆمەڵێک چیرۆکی نووسەرانی گەورەی گێتی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، کاریگەری ئەمانە بۆ سەر مشتوماڵ کردن و دەوڵەمەندکردنی دەستووری چیرۆکنووسی بەسەر چیرۆکنووسانی کورد بەهێز بوو. سەرەڕای ئەمە بەشێ لەو چیرۆکانە ڕەنگیان لە چیرۆکی کوردی داوەتەوە. هەندێ لەو شاعیر و نووسەرانەی ئیبراهیم ئەحمەد چیرۆکیانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ئەمانەن: تۆماس ئالان، ولیەم شکسپیر، مەکسیم گۆرکی، هانس ئاندرسن، موپاسان، چێخۆڤ، لێڤ تۆڵستۆی، ئەلفۆنس دۆدێ، رەئیف خووری، ئەناتۆل فرانس، جۆرج لینۆر، ئەنۆرێ دی بەلزاک، سیمیۆنۆڤ، ی. ل. بیرتس (چیرۆکنووسی زمانی عیبری).

٢- ئیبراهیم ئەحمەد بایەخی بەشیعری بێگانە داوە، کۆمەڵێک لە جوانترین شیعری نەتەوەکانی گێتی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. لە ناو ئەم جۆرە کارە ئەدەبییانەدا نموونەی بەرهەمی شاعیری ئەم میللەتانە دەبینرێ: ئینگلیز، ئەمەریکی، ئیتاڵی، چینی، عەرەبی، هیندی، هەنگاری، یابانی، یۆنانی، ئەرمەنی.

٣- هەندێ وتاری لە بابەت مێژووی ژیان و بەسەرهاتی کۆمەڵێک کەسانی بەناوبانگ لە زمانانی بێگانەوە گۆڕیویەتییە سەر زمانی کوردی، لەوانە: ماتاهاری (ژنە جاسووسی ناودار لە جەنگی یەکەمی گێتی)، چێرچل، هیتلەر، ستالین، مۆسۆلینی، گالیلۆ، لووتەر، ڕۆسۆ، داروین، مارکس، فرۆید، ئەنشتاین، جەواهیر لال نەهرۆ، تاگوور، فۆرۆشیلۆڤ، ناپولیۆن، ماری کووری، گاندی، جەنگیز خان، مارشاڵ، نای (قوماندانی ناپولیۆن)، سیمۆن بۆلیڤار (قارەمانی ئەمەریکی)، فرانکلین ڕۆزفیلت، وۆرد ویلسن (٢٨ەمین سەرۆکی ئەمەریکا)، چیان کای چیک.

## شیعر

پلەی هەڵچوونی شاعیرییەتی ئیبراهیم ئەحمەد گەیشتۆتە ڕادەیێک کەفوکوڵی پەخشانیشی داگیر کردووە، بەم ڕەنگە پەخشانی بووە بەشیعرئامێز، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ شیعریدا زیاتر لەگەڵ مێشک قسە دەکا و ئەوەندە لە تەلی سۆز و چێژی ئادەمزاد نادا. شیعری کەمە، لە دەوری بابەتێک دەسووڕێتەوە، ڕەنگدانەوەی بیری کوردایەتی و ئەنتەرناسیۆنالیزمی و ئیدیۆلۆجییەتی سۆسیالیستی کۆمەڵایەتییە. ئەگەر دڵداری لە پەیکەری کچێکی جوان بدۆزێتەوە، ئەو دلبەرەش دەبێتە چەوسێنراوی دەرەبەگی زۆردار و دەوڵەمەند و مووچەخۆری چاوچنۆکی میری.

### یادگار و هیوا

ئیبراهیم ئەحمەد ئەم قەسیدەیەی لەسەر **٢٦** بەندی چوارین لە ساڵی **١٩٣٣** هۆنیوەتەوە، لە هەندێ لە بەندەکانیدا دەڵێ:

لەبەر چاوی بەد لە ترسی بەدکار
دڵ خۆم ئەکەمە گۆڕی یادگار
بەگریانی ووشک بەناڵەی بێدەنگ
دێنمە لەرزین تەختی کردگار

***

شیرین! بەهارە بەهاری شادان
بێ بەهرەن لە ژین گەلی نامرادان
جەژن و بەهار و سەیران و خۆشی
گشتی پیرۆزی گەردن ئازادان

***

مەژی بۆ مردن بمرە بۆ ژیان
چۆن قازانج ئەکەی تا نەکەی زیان
لە زرەی زنجیر دڵت نەلەرزی
پێوەند بۆ لەشە نەوەک بۆ گیان

***



بێ دابنیشین جە بن چناران
لە چاوی مەستی دیدە خوماران
بەری بەیان و سەر لە ئێواران
بادە بنۆشین بەیادی جاران

***

بەهار هاتەوە وەسیرانەوە
وە لێ لێ و لۆ لۆ وەحەیرانەوە
وە لەنجەولاری نیگارانەوە
وە دەنگی خۆشی هەزارانەوە

***

شیرین! هەتاکەی دووری بچێژم
فرمێسکی خوێنین تاکەی بڕێژم
تاکەی لە گۆشەی دڵی زارم دا
غونچەی جوانی و گەنجی بنێژم

***

ئەوا تۆ ئەڕۆی بەخوام سپاردی
پێم نەکرا خۆم بێم دڵم بۆ ناردی
ڕێی ژیان سەختە پڕ ترس و لەرزە
نابێ بترسی لە گەرمی و ساردی

***

چاوە وەک لێزمەی بارانی بەهار
فرمێسکی خوێنت بۆ پیا دێتە خوار
گریان کردەوەی بێ دەسەڵاتە
بێ دەسەڵاتان ئەڕزێن لە ژێر بار

شاعیر لەگەڵ شیرین دەدوێ. شیرین لە لایێک دلبەری شاعیرە، لە لایێکی دیکە ڕەمزی سەربەستی و ئازادییە. بەلای شاعیرەوە سەیران و بەهار بۆ کەسانی ئازادە نەک دیلی ناو زیندان. بەشێوازێکی سۆفیزمیانە ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئاه و ناڵەی بێ

دەسەڵاتان ئەوەندە کاریگەرە تەختی کردگار دەهەژێنێ، لە دواییدا لە خەباتی ئاشتییانە لادەدا و دەست بەهێرش بردن و شۆڕش دەکا و دەڵێ گریان کردەوەی بێ دەسەڵاتانە، ماف بەهێز نەبێ وەرناگیرێ.

**یادی پێشەوا**

لە ساڵی ١٩٤٧ لە دوای لە سێدارەدانی قازی محەمەد و هاوڕێکانی ئیبراهیم ئەحمەد بەم پێشەکییە ماتەمنامەی بۆ نووسیوە:

یاران با بادەی پڕ مەی بڕێژین
با کۆڕپەی خۆشی و شادی بنێژین
با بە ئاخ بە ئۆف بە حەسرەت بە داغ
تەماوی بکەین ئاوێنەی دەماغ

بەهەناسەیێکی ڕۆمانتیکییانە غەم و پەژارە و شێوانی ناو دڵ و دەروونی هەڵدەڕێژێ بۆ مردنی ئەو پیاوە بەکارەی لە دەست چوو و ڕووخانی ئەو کۆرپە نازدارەی کۆماری کوردستان کە جارێکی دیکەش هەرەسی بە دەسکەوتی هیوای نەتەوەیی هێنا.

**ڕووبەڕووی مردن**

لە ساڵی ١٩٥٩ پیلان بۆ کوشتنی عەبدولکەریم قاسم دانرا بوو، لەسەر شەقامی ڕەشیدی بەغدا تەقەی لێ کرا و بریندار بوو. بەم هۆیەوە ئیبراهیم ئەحمەد قەسیدەیێکی درێژی دەوروبەری هەشتا دێڕی هۆنییەوە، لە هەندێ لە دێڕەکانیدا دەڵێ:

کەریم لای گەڵ ئازادییە
ئاشتی ئاسایش شادییە
مانای سەربەرزی ژیانە
بۆ گەل و بۆ ئەم نیشتمانە
بۆیە هەرچی کە هەمانە
گەر ماڵ و حاڵ و گەر گیانە
ئەیکەینە قوربانی کەریم

ئەو کاتەی هەوڵی کوشتنی عەبدولکەریم قاسم درا هێشتا خۆشەویست بوو لای خەڵکی عیراق. ئەم شیعرەی شاعیر لە ڕووی هونەرییەوە شیعرێکی ڕەوانە، لە هەموو لایەنێکی



هونەرییەوە لە ئەدەبی میللیی سەرزارەوە نزیکە، بەڵام شاعیر هەندێ زیادەڕۆیی هەیە. سۆزی هەڵچووی ناو دەروونی دەگاتە پلەی «پەرستنی ئادەمزاد» لەو کاتەی ماڵ و حاڵ و گیان و ئەوەی هەیە دەیکا بەقوربانی کەریم. تاک پەرستن دەگاتە پلەیێک لە جێی دیکەی قەسیدەکە کەریم لە گۆشت و ئێسقان دەردێنێ و دەیکا بەگیان و بیروباوەڕ، وەکو ئەو کەسانەی لە سەردەمی ئێستادا تاکە کەس دەگەیەننە پلەی پێغەمبەری و هەندێ جاریش دەبێ بەکردگار. ئەو بیروباوەڕە لە فیکری سیاسی لە هەموو گێتیدا مابوو تا دوا ساڵانی سەدەی بیستەم، بەڵام لە پاش ڕووخانی دەسەڵاتی سۆڤیەت (١٩٩١) زۆر کز بووە.

**بۆ سەدام حوسێن**

ئیبراهیم ئەحمەد لە ساڵی ١٩٨١ لە لەندەن شیعرێکی بۆ سەدام حوسێن وتووە:

سەدام! کوردستان موڵکی تۆ نییە
نە هی ئەتاتورک نە خومەینییە
مەلای لابەلا کوردی خستە داو
ئینگلیزیش ئێوەی لێ کردین بەپیاو
تاقە بستێکی ئەم کوردستانە
داگیر نەکراوە بەجەنگی مەیدان
هەمووی بەپاکی و دڵ سافی خۆمان
بە فرت و فێڵی زۆڵە موسوڵمان
کورد بێبەش کرا لە ماف و لە نان
لە ماڵی خۆیا بوو بەبێگانە
کوردی خاوەنی ئەم نیشتمانە
پڕ خێر و بێر و پڕ نەوت و کانە
خاوەنی مێژوو هی ئەم زەمانە
بەرگری هەموو گورزی زەمانە
بەگۆڕ سپێری سەد هاری وەک تۆ
بۆ نەگرێتە دەس چارەنووسی خۆ
بۆ هەقی نەبێ ئەویش وەک ئێوە
ئاڵای خۆی هەڵکا لەم کەژ و کێوە

ئەم شیعرەش لە ڕووی هونەرییەوە وەکو شیعرەکەی پێشووە، شاعیر هەندێ زانیاریی مێژوویی خستۆتە قاڵبی کێش و قافیەی شیعرییەوە و بەرەو ڕووی سەدام حوسێنیان دەکاتەوە. داواکانی شاعیر ئەوەیە مافی کورد پێویستە وەکو مافی عەرەب بێ لە نیشتمانی عیراقدا. هەروەها لە تورکیا و ئێرانیش. ئەو هەڵسوکەوتەی کوردی تێکەوت لە کوردستانی عیراقدا لە ئەنجامی سیاسەتی چەوتی چاوچنۆکانەی ئەمپریالیستی ئینگلیزییەوە بوو.

## ئەی مانگ

بەهۆی چوونە ناو مانگی هاووڵاتی ئەمەریکی ئارمسترۆنگ لە ڕۆژی ٢٩ی تەمووزی ١٩٦٩ ئیبراهیم ئەحمەد لە بەغدا بووە، قەسیدەییێکی درێژی هۆنیوەتەوە، لە هەندێ لە دێڕەکانیدا دەڵێ:

ئەی مانگ کە لە لا دۆستی دێرینم
ڕۆشن کەرەوەی شەوگاری ژینم
هاوڕێ و هاودەمی دەستەی یارانی
خوێنمژی گەورەی سەرمایەداری
جارانی دنیا وەک ماستی مەییو
جارانی گەلان کاڵ و نەگەییو
ئەوسایەی زەمین موڵکی زۆردار بوو
دنیا بەهەشتی سەرمایەدار بوو
ئارمسترۆنگ و ئەلاینی هاوڕێ
سێ پەیکی ئاشتین ئازاریان نەدەی
ئازان چالاکن بەسەزمانن
لە فاک و فیکی نیکسۆن نازانن
بەدڵی خۆش و پڕ لە هیواوە
نامەی دایکیان بۆ کوڕ هێناوە
ئەوساکە مانگ و زۆر ئەستێرە جوان
ئەکرێنە مۆڵگە و هەوارگەی ئینسان
ئەڕازێنەوە بەدەستی زانین
بەڕاستی ئەبنە بەهەشتی بەرین



لەم شیعرەدا ئیبراهیم ئەحمەد هەوڵی داوە میللەتی ئەمەریکا لە کاربەدەستانی جیا بکاتەوە. ئەو خراپەیەی بەناوی ئەمپریالیزم و کۆڵۆنیالیزمەوە لە میللەتان دەکرێ دەسەڵات بەدەستان تاوانبار دەکا. لەبەرئەوەیە ئافەرینی ئارمسترۆنگ دەکا لەو گەشتەی کە کەشتییە ئاسمانییەکەی لە ناو مانگ دابەزاند و لە پاشانا گەڕایەوە سەر ڕووی زەوی. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەو زانستی و تەکنیکەی ئەو ئامێرەی دروست کردووە پێویستە بۆ چاکەی هەموو مرۆڤایەتی بەکار بهێنرێ بۆ ئەوەی زەوی ببێ بەبەهەشتی بەرین.

## بەرەو ڕووناکی

بەرەو ڕووناکی بەرهەمێکی ئەدەبی داهێنراوی ئیبراهیم ئەحمەدە، لە زیاتر لە سی دێڕ پێکهاتووە. لە هەندێکیدا شاعیر دەڵێ:

لە ناو جەرگی تاریکییەوە
دەست بەکەلەپچە و تەوق لە مل و زنجیر لە پێ
لە کانگای نەزانی و هەژاری و دیلییەوە
کەوتوومە ڕێ هاتووم ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی

***

پشتم داڕزاوی جەزرەبەی قامچییە
ناوچەوانم تفی پیا دێتە خوارەوە
پێم شەلی دارکارییە
فرمێسک لە چاوما قەتیس ماوە
پێستم بەسەر ئێسکمدا ووشک بۆتەوە
بەڵام بەدڵێکی وەک پۆڵاوە ڕێم گرتۆتە بەر
ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی...

ئەم کارەی شاعیر لە نێوەندی ئەدەبیدا زۆر بەناوبانگە، لە کاتی خۆیدا کە بڵاوکرایەوە، ڕووی ڕەخنەی لێ کرایەوە. هەندێ کەس بەپەخشانیان دادەنا، هی دیکە پەخشانەشیعریان پێ دەوت (یا شیعری پەخشانی) سێیەمیان بەشیعری نوێی تەواویان دەژمارد. هەروەها کە بڵاوکرایەوە خاوەنی بەو ناوە بڵاوی کردەوە گۆیا لە زمانی بێگانەوە وەرگێڕدراوە. ئەوی ڕاستی بێ ئەم بەرهەمە لە دانانی ئیبراهیم ئەحمەد خۆی بوو، بەئانقەست نووسیبووی

وەرگیراوە بۆ ئەوەی سانسۆری میری بەچاوێکی دیکە تەماشای بکا، چونکە نووسینێک لە لایەن دەسەڵاتەوە پەسەند نەکرابایە و لە زمانێکی بێگانەوە بکرایە بەکوردی یا عەرەبی تاوانی خاوەنەکەی سووکتر دەبوو لەوەی ڕەسەن بێ و خاوەنەکەی خۆی دانەری بێ.

ئەم بەرهەمەی ئیبراهیم ئەحمەد نموونەییێکی بەرزی ئەدەبی کوردییە، دەچێتە ناو ئەدەبی بەرگرییەوە، لە پێناوی مافی ئادەمزاد، مافی چارەنووسی هەموو نەتەوەییێک بۆ دروستکردنی کۆمەڵێک هەموو کەس وەک یەک تیایدا بژین.

***

ئیبراهیم ئەحمەد جێگەی تایبەتی هەیە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووس و سیاسییێکی بەدیمەن بوو. بەرهەمی لە شیعر و پەخشاندا بەرزە، شیعری لیریکی هۆنیوەتەوە، وتار و چیرۆک و ڕۆمانی نووسیوە، لە وەرگێڕاندا دەوری گرنگی هەیە. شێوازی تایبەتی خۆی هەیە لە نووسیندا، قەڵەمی بڕشت بووە لە بەپەتی کردنی زمانی کوردی لە نووسیندا، شارەزای زمانی میللیی کۆمەڵی گوندایەتی کشتوکاڵ و زمانی ناو بازاڕی شار بووە. لەبەرئەوە فەرهەنگی نووسینی دەوڵەمەند بووە و ڕستەی سفت و ڕەوان بووە.

ئیبراهیم ئەحمەد لە سیاسەت بەدوور نەبوو، ڕاستییەکەی ئەوەیە لە دوو دەرگای گەورەوە چووە ناو باڵەخانەی سیاسەت و ئەدەبەوە، بەڵام لە دوو دەرگای بچووکتر لێیان هاتە دەرەوە. لە سیاسەت وازی لە حیزبایەتی هێنا، ئەو قازانجەی پێویست بوو لێی نەکرد. لەم هەڵوێستەدا ئەدەب زیانی لێ کەوت چونکە ئیبراهیم ئەحمەد بۆ ئەدەب خوڵقا بوو، ئەگەر هەموو کاتی بۆ ئەمە تەرخان بکردایە مەسەلەکە بەجۆرێکی دیکە دەکەوتەوە. لەگەڵ ئەم هەموو بۆچوون و بیروباوەڕانە ئەو بەرهەمەی ئیبراهیم ئەحمەد بەجێی هێشتووە بەرز و باڵا و لووتکەی داهێنانە، ئەدەبی کوردی دەوڵەمەند کردووە.

# بەشی بیست و سێیەم

# کاردۆخی

## ١٩١٦ - ١٩٨٢

### ژیانی

محەمەد ئەمین کوڕی کاکەشێخ کوڕی شێخ محەمەد (بەهائەدین) کوڕی شێخ عوسمانی تەوێڵەیە. لە ڕۆژی ٢٥ی مارتی ساڵی ١٩١٦ لە گوندی تەوێڵەی هەورامان لە دایک بووە. لە سەردەمی لاویەتیدا وشەی «کاردۆخی» وەک نازناوێکی شیعری و ناوێکی هونەری هەڵبژاردووە و هەموو نووسینێکی بەم ناوە بڵاوکردۆتەوە و لە ناو خەڵکیدا بەوەوە ناسراوە. وەکو خۆی دەیووت لەبەر خۆشەویستی کورد و کوردستان ئەم ناوە دێرینە ئەرکیۆلۆجییەی مێژووی کوردی لە خۆی ناوە و هیچ ناوێکی دیکەی گەرەک نەبووە.

سەرەتا لای باوکی و خاڵوانی هەندێ لە پرۆگرامەکانی حوجرەی مزگەوتی خوێندووە. لە ساڵی ١٩٢٩ چۆتە قوتابخانە و خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە. لە پاییزی ساڵی ١٩٣٥ ڕووی کردۆتە بەغدا و خانەی مامۆستایانی گوندایەتی بەئەنجام گەیاندووە و لە هاوینی ساڵی ١٩٣٩ بووە بەمامۆستای قوتابخانەی تەوێڵە و دوای ساڵێک گوێزراوەتەوە بیارە و چوار ساڵی لێ بووە، ئینجا بۆ گوندی عەبابەیلێ. لە دوای ئەمە بۆ ماوەی شەش ساڵ لە چەند ئاواییەکی ناوچەی سلێمانی مامۆستای قوتابخانە بووە، لە پاشانا لە هەڵەبجە بووە، ئینجا جارێکی دیکە گەڕاوەتەوە سلێمانی، دوو ساڵ مامۆستای قوتابخانە بووە. لەسەر داوای خۆی گوێزراوەتەوە بۆ بەغدا، شەش ساڵ لەوێ مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بووە. لەو ماوەیەدا خەریکی هۆنینەوەی شیعر و نووسینی وتاری ئەدەبی بووە و لە ڕۆژنامە و گۆوارە کوردییەکاندا بڵاوی کردۆتەوە. لە ساڵی ١٩٧٠ لە بەغدا خانەنشین کراوە، بەیەکجاری ماڵی گواستۆتەوە سلێمانی و لەوێ نیشتەجێ بووە. قۆناغی حەفتاکانی سەدەی بیستەمی بەنووسینی شیعر و پەخشان و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بردۆتە سەر. لە ڕۆژی ٤ی ئاغستۆسی ١٩٨٢ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.



### شیعری

کاردۆخی لە بنەماڵەیێکی ئەدەب دۆست بووە و لە نێوەندێکی کۆمەڵایەتی و سۆفیزمی نزیک لە ئەدەب و خوێندەواری ژیاوە. لە تەمەنی هەرەتی لاویەتی لە ساڵی ١٩٣٥ هەوڵی داوە شیعر دابنێ. لە ساڵی ١٩٤١ تووشی دڵداریی کچێکی خزمی خۆی بووە. بۆ بەدبەختی شاعیر کچەکە زوو جوانەمەرگ بووە و شاعیر پێی شاد نەبووە، بەڵام یادی ئەو دڵدارییە بووە بەهەوێن و سەرچاوەی ئیلهامی و شیعری بەسۆزی بۆ هۆنیوەتەوە. جوانیی کوردستان هۆیێکی گرنگتر بووە و خەیاڵی ناسکی بزواندووە و هەندێ پارچە شیعری جوانی هێناوەتە بەرهەم. لە ساڵی ١٩٦٠ بەملاوە کەسێتی شیعری کاردۆخی دیار دەکەوێ و دەست دەکا بەبڵاوکردنەوەی شیعر و وتاری ئەدەبی، جگە لە بەرهەمی داهێنانی خۆی هەندێ وردە چیرۆکی میللی پەخشانی خۆماڵی بە شیعر وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی بۆ منداڵ و قوتابیان وەک شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) چوونەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. خۆشەویستی پڕ لە سۆزی بەرامبەر بە ئەدەبی کوردی پاڵی پێوە ناوە دیوانی شاعیری ڕەند شاهۆ ئامادە بکا بۆ چاپ و بڵاوی بکاتەوە.

شیعری کاردۆخی لە ڕووی ڕوخسارەوە بەم تێبینییانەی لای خوارەوە هەندێ ڕوون دەبێتەوە:

١- لە شیعرە عەروزییەکانیدا ئەم بەحرانەی بەکارهێناوە: هەزەج، ڕەمەل، خەفیف. لە ڕووی قافیەوە دیاردەیێکی تازە لەم جۆرە شیعرەیدا دەکەوێتە بەرچاو. ئەویش ئەوەیە یەکێتیی قافیەی تێدا نییە، لەو کاتەی پێویستە ئەم جۆرە قافیەیەی هەبێ، کەچی شیعری ئەم بابەتەی هەموو جووت قافیەیە (مەسنەوی).

٢- لە شیعرە خۆماڵییەکانیدا کێشی سیلابی بەزۆری دە برگەیی بەکارهێناوە لەوانەی وەستان لە ناوەڕاستیاندا هەیە (٥ + ٥)، لە ڕووی قافیەشەوە هەمووی جووت قافیەیە (مەسنەوی).

٣- زمانی قسەکردنی ماڵەوەی کاردۆخی بەدیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی بووە، وەکو هەموو کەسانی وەک ئەو دیالێکتی کرمانجیی باشووریش لەتەک ئەو بووە، ئیتر لەو کاتەی شیعر وتن بەکرمانجی خواروو باو بووە شاعیرانی ئەم دیالێکتە بۆ یادگار یا بۆ نوقڵانەش بووبێ بەدیالێکتی گۆرانیش شیعریان وتووە، کاردۆخیش یەکێک بووە لەمانە. هەروەها هەندێ دەستووری شیعری ئەم دیالێکتەی هێناوەتە ناو شیعری

دیالێکتی کرمانجیی باشوور وەکو ئەوەی قافیەی شیعرە عەرووزییەکانی لەسەر سیستێمی جووت قافیە دامەزراندووە لە کاتێکدا دەبوو لەسەر بنچینەی یەکێتیی قافیەدا بن.

٤- زمانی شیعری ئاسانە، لە ئەدەبی میللییەوە نزیکە. ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی تێدا نابینرێ. هەروەها شوێنەواری ڕەوانبێژی شیعری نوێش کەم بەرچاو دەکەوێ.

شیعری کاردۆخی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بەزۆری دەشکێتەوە سەر بابەتەکانی لەو سەردەمەی ژیانیدا لە ناوەوە بوون، بەتایبەتی شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و کۆمەڵایەتی. لەگەڵ ئەوەشدا وەسف و دڵداری و دانایی جێگەی دیاریان هەبوو لە بەرهەمی شیعریدا.

## نموونەی شیعری

### دڵداری

لە شیعرێکیدا بەناوی «هیوا و ئاوات» لە ساڵی **١٩٦٢** لە هەڵەبجە هۆنیویەتییەوە کاردۆخی دەڵێ:

شیرین خۆشەویست گیان و حەیاتم!
ئەزانی چییە هیوا و ئاواتم
وەرە لای منی شێتی نیشتمان
عاشقی شاخ و دەشتی کوردستان
دەست کەمە ملت و تێر بکەم ئۆخەی
بگرم پەرچەم و زولف و لیمۆ و بەی
مۆژدەی ڕزگاری و ژینی سەربەستی
باری غەم لابات نەمێنێ پەستی
چەند ڕۆژ پێکەوە بەخۆشی بژین
هەوای بێگەردی سەر شاخ هەڵمژین
بەمەمک زولف دەستگیراو بەسراو
دەستم هەردووکی بەند بێ و گیرکراو
تۆی پەی پەی بادە بکەیتە دەمم
بە بەستەی کوردی لابەری غەمم



لەباتی مەزەش دوو لێوی شیرین
بخەیتە دەمم سارێژ کەی برین
بەبۆنی چنوور سوورە هەڵاڵە
شەوبۆ بەرزەلنگ گوڵ و گوڵاڵە
بێهۆش بکەوین لە شاخی ڕەنگین
لە دڵمان دەرکەین ژەهری تاڵی ژین
هەر ڕۆژ لە شاخێ هەر شەو لە شوێنێ
بگەڕێین بنووین تا گیان ئەمێنێ
من بەسەرین کەم بازووی نەرم و شل
لەسەر سەوزەگیا لەگەڵ تۆی وەک گوڵ
ڕابوێرم بۆ خۆم بەبێ دەردی سەر
سێ مانگەی هاوین تەواو سەرانسەر
ئاگام لە دونیا و درۆ و ڕاست نەبێ
لە ووتی ووتی و دەنگ و باس نەبێ

ئەمە لیریکێکی پڕ لە سۆزی دڵداریی هەرزەییە، بێ فەرۆفێڵ دڵدارییێکی ڕۆمانتیکییانەی ڕۆژهەڵاتییانەیە، ڕەنگدانەوەی ناو دڵ و دەروونی هەموو لاوێکە. ڕاستە هەندێ دەڵێن «دڵداری بەهێزترە» و هەندێکی دیکە دەڵێن «برسیەتی بەهێزترە»، بەڵام کاردۆخی دەیەوێ بڵێ «کوردایەتی بەهێزترە» لەبەرئەوە گەلێ شاعیری ئەو سەردەمە پێیان شەرم بووە لە شیعردا تەنیا دڵداری بکەن، بۆیە دڵداری و کوردایەتییان تێکەڵ بەیەکتری کردووە.

### کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا کاردۆخی بەزمانی پیرێکی کوردەوە بۆ شپرزەیی میللەت دەلاوێنێتەوە:

پیرێک ڕیش سپی پڕ فام و دڵپاک
هێمن و زانا تەواو پیاو چاک
هات و دی بەچاو بن بەرد و داران
گۆڕی شەهیدان لە لادێ و شاران

لەسەر مەزاری گردی شەهیدان
ئەگریا بەکوڵ ئەیووت ئەی یەزدان
بەکام نەگەییو لە کوردستانا
خوایە چەند زۆرن لە گۆڕستانا
دیم خۆی لە قوڕ نا بەگریە و زاری
پیری ڕیش سپی بەبێ قەراری
وەک کۆرپە کوژراو بەسۆز ئەگریا
خۆی لە قوڕ ئەنا و ئەیدا بەسەریا
ئەیووت با بەس بێ چەرخی ستەمکار
بەسە خوێنڕێژی و کۆیلەیی و ئازار
کورد بێ گوناهە بێکەسە زەبوون
ئاوا بەناحەق بۆچی تیا چوون
دیم پیرە ئەوەند شین و زاری کرد
لە پەلوپۆ کەوت لەو شوێنەدا مرد

شاعیر پیرەمێردێکی هەڵبژاردووە و کردوویەتی بەقارەمانی شیعرەکەی بۆ ئەوەی وا پیشان بدا کارەساتی کورد گەیشتۆتە پلەیێک لە وزەی کەسدا نییە بتوانێ بیچێژێ، ئیتر ئەو پیرە بۆ خۆی لە خەفەتانا دەمرێ.

٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «ڕقمە لە لار و خوار» لە ساڵی **١٩٤٢** لە بیارە هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

بەناو شێخم کەچی ڕقمە لە شێخی لاری کەج ڕەفتار
بەخوێن کوردم کەچی دوژمن بەکوردی زاڵمی زۆردار
سەرم رووت کرد لە داخی مێزەر و چەتفەی نەسیمانە
ئەوانەی ڕۆژ لە مزگەوتان شەویش مەیخانە جێیانە
بە ووردی کاتێ سەیری کردەوەی ئینسانی لارم کرد
بەدڵ پەست بووم و زوو هەستام لە لایان کۆچ و بارم کرد



زمان و کردەوەی ئینسان ئەبێ دوور بێ هەتا مردن
لە ناپاکی و درۆ و دەعیە ڕیایی و فیتنەیی کردن
لە ڕێی ڕاست هەر کەسێ لادا خراپە لارە بێ بارە
مەراق و دەردی من زۆری لە دەس لار و بەد ئەتوارە
ئەوەی ڕاستە لە لام چاکە ئەگەر بۆرە وەگەر خزمە
پیاوی لار و ناڕاستیش لە لای من تا بلێی نزمە
هەرچی خوارە لەسەر ئەرزا بەدڵ ڕقمە لە ڕەفتاری
هەتا مردن ئەکەم نەفرین لە گوفتاری لە کرداری
حەقیقەت ڕوون ئەکەم بۆ گەل بەبێ ترسی و بەبێ پەروا
هەمیشە ناحەزی لازم هەتا خوێنم لە لەش ئەڕوا

لەم شیعرەدا کاردۆخی هێرش دەباتە سەر هەندێ شێخ و مەلا بەناوی تەریقەت و شەریعەتەوە خراپە دەکەن. ئینجا دەکەوێتە ئامۆژگاری و داوا لە هەموو کەسێک دەکا پیاوی چاک بێ، لە بابەت کەسی خراپەوە بەلای ئەوەوە پێویستە ڕێزی لێ نەگیرێ، ئەو کەسە خزم بێ یا دۆست، چونکە مافی خەڵکی و چارەنووسی میللەتی خۆی لە سەرووی هەموو شتێکی دیکەوەیەوە.

## کۆمەڵایەتی

لە شیعرێکیدا بەناوی «خۆ سووتاندنی کچ»ەوە لە ساڵی **١٩٧٢** لە سلێمانی هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

کچ بە نەبەدڵ گەر درا بەشوو
لە دڵیا هیوای خۆشی لە دەست چوو
خۆی بەفرۆشراو کەساس ئەبینێ
ڕۆژ بەڕۆژ غەمی پەرە ئەسێنێ
ئەگری و ئەناڵێ لە نیوەشەوا
بەچاک ئەزانێت کاری ناڕەوا
زۆر دڵ تەنگت کرد خۆی ئەسووتێنێ
چون مردن لە ژین خۆشتر ئەبینێ

نەفرۆشرایە کچ ئەگەر بەپارە
بۆچ خۆی ئەسووتان جوانی بێچارە
کچ ژینی خۆش بێ خۆی ناسووتێنێ
گولّی عومری خۆی هەلّناوەرێنێ

ئەم شیعرەی کاردۆخی زادەی ڕووداوێکە لەو سەردەمەدا شاری سلێمانی شلّەژاندبوو، بەوەی کچێک بەنابەدلّی و بەزۆری بەمێرد درا بوو. لە داخانا خۆی سووتاندبوو. بەڕاستی ئەم جۆرە ڕووداوانە لە کۆمەلّانی باوکسالاری و دواکەوتوودا پێوەندی ئادەمزاد بەیەکترییەوە دەشێوێنن. ئێستا ئەمە بووە بەکێشەییێکی زۆر گرنگ لە مافی ژناندا.

**شیعر**

شاعیر لیریکێکی بەناوی «شیعر و میعر» لە سالّی ١٩٤٤ لە عەبابەیلێ نووسیوەتەوە:

شیعریش ئەبێ ئاودێری گولّی ژین و ژیان بێ
مۆسیقەیی پڕ سۆزی سوپای زیندە دلّان بێ
مانگێکی چواردە شەوی تاریکە شەوان بێ
بووکێکی بەپەرداخ و تەواو ڕێک و جوان بێ
ئاوێنە نوێنەر بێ لە بۆ قەومی هەژاری
حالّی وەتەن و خۆشیی و ناخۆشیی و باری
شاعیر ئەبێ غەمخواری گەل و خاکی وەتەن بێ
ئاگای لە دلّی دوژمن و ناپاکی وەتەن بێ
پەردەی دلّی زوو بێتە لەرین بەهۆنراوە دەری خا
حالّی گەل و داماوییەکەی چۆنە سەری خا
شیعرێک نەدڕێ پەردەیی جەهل و خەو و سستی
شیعرێک نەبڕێ داوی ئەسیری غەم و پەستی
شیعرێک کە نەفەوتێنێ ووتەی پووچ و خەرافات
شیعرێک کە نەسووتێنێ بینا و کۆشکی فەسادات
شیعرێک کە نەڕووخێنێ بناغەی ستەم و زۆر
ڕووناکی نەکات جاددەیی ئازادی وەکو خۆر



شیعرێک کە نەجوولّێنێ دەمار و ڕەگی فیرەت
بێداری نەکات هۆش و حەواسی دلّی تیرەت
شیعرێک کە نەبێتە سەبەبی خوێندن و هەلّسان
یەک بیری نەکات کۆمەلّ و خەلّقانی پەرێشان
شیعرێک کە نەکا باسی خراپەی کەسی زۆردار
شیعرێک کە نەکا چینی هەژاران هەموو بێدار
کەی شیعرە برا میعرە بەکێشان و بەپێوان
کەی شیعرە ئەوە هیچە بەئایین و بەویجدان
شیعرێک کە هەمووی باسی دەم و چاوی جوان بێ
یا باسی خەت و خالّی کچی شۆخ و کوڕان بێ
یا زەممی برای قوڕ بەسەری کوردی هەژار بێ
یا مەدحی بەگ و ئاغە وو ئەشخاسی کیبار بێ
یا شیعری خراپە و بەدیی و فیسق و فوجوور بێ
یا شیعری ڕیاکاری لەبەر قەسر و قسوور بێ
یا شیعری دیعایەی گەلی خوێنخواری بەلّا بێ
یا شیعری لەبەر خاتری دینار و تەلّا بێ
کەی شیعرە لە لای زیرەک و زانا وو ئەدیبان
کەی نافیعی دەردە بەقسەی ژیر و تەبیبان
ڕاستی ئەوە میعرە لە هەر شوێن و لە هەر کات
بێ قیمەتە ئەو میعرە حەیای شیعر ئەو ئەبیات
(کاردۆخی) ئەگەر ناقیسە ئەشعار و ووتارت
تۆیش کوردی پەرێشانی وەکو قەومی هەژارت

کاردۆخی لەم لیریکەدا دەمی بۆ مەسەلەیێکی ناسک بردووە، ویستوویەتی شیعر بەخەلّکی بناسێنێ، ئەوەی لەم شیعرەدا دەری بڕیوە نابن بەتەعریف بۆ شیعر، چونکە شیعر بەرهەمێکە تەعریف ناکرێ. ئەو قسانەی کاردۆخی لە بابەت شیعرەوە کردوویەتی هەولّێکی دیکەن دەخرێتە سەر ئەو تەعریفە زۆرانەی پێش ئەو لەم بابەتەوە کراون. ئەوە هەیە شاعیر وەسفەکانی جوان هێناوەتەوە و تیایاندا سەرکەوتووە.

## شیعری دیالێکتی گۆرانی

له شیعرێکیدا بەدیالێکتی گۆرانی (هەورامانی) دەڵێ:

بولبول تۆ هێشتا ئومێدت مەندەن
بەڵام من دانو دڵ وەشـیم کـەندەن
تا ئا دەقیـقـه گـیـانم مـسـپـاروو
دمـاو ئاو لێم وەشی مـەو یاروو
خەفەت و مەینەت ئێنده جەم بیەن
هۆشم نەمـەندەن فـامم بەرشـیـەن
دڵ به کـوڵ مـاچۆ دەس دنیـای بازە
تۆیش پەی لاو ئادێ ئاوات بوازە

لەم شیـعـرەیدا کـاردۆخی ڕاز و نیـازی بۆ بلبل دەردەبڕێ، پێی دەڵێ ئەگـەر تۆ هێشـتـا ئومـێدت مابێ بەگـوڵ شاد بی؛ من نا، تا ئێـسـتـا بێ ئۆقـره و بێ یار و هاودەم. غـەم و مـەینەت و پەژاره مـیـوانی منن؛ هۆش و فـامم پەرێشـان و بڵاوه، دڵ له ئاسـمـانی ناهەمواریدا پەرواز دەکا، تۆش له ئاواتی خۆت دەگەڕێی.

ئەم شیعرەی بەزمانێکی تێکەڵاو وتووه له دیالێکتەکانی گۆرانی و کرمانجیی باشووری ناوچەی سلێمانی.

***

مـحـەمـەدئەمین کـاردۆخی خـوێندەوارێکی کـورد بـوو و کـوردایەتی کـردووه پێش ئەوەی شێخـێکی تەریقەتی نەقـشـبەندی بێ. هەر لەبەرئەوەیە نازناوی شیـعـری و لەقـەبی خۆی کردووه بە«کاردۆخی» . ئەمە ناوی هۆزێکه له باپیره گەورەکانی کوردی ئێسـتا وڵاتیـان له جێی هەرێمی بۆتـان و شـاری جزیرەی ئێـسـتـا بووه. مـینۆرسکی بەلانکی مـیللەتی کوردی دادەنێ، واته لەو هەرێمەدا له دایک بووه و لەوێوه بڵاوبۆتەوه.

کـاردۆخی نیـشـتـمـانپـەروەرێکی ڕاست و کـوردێکی بێگەرد بوو. توانای بیـری و شـاعـیـرییەتی بۆ چاکەی نەتەوەی خۆی تەرخـان کـردبوو. شیـعـری بۆ زۆرترین خـەڵکانی کۆمەڵ نووسیوەتەوه. له ڕووی ڕوخسـار و ناوەڕۆکەوه شیعری ڕەنگدانەوەی ئەدەبی کوردی سەردەمی ژیانی خۆیەتی. له کێشی شیعریدا بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی بەکـارهێناوه. قـافـیـەی مـەسنەوییـه (اا ب ب جـ جـ...) ، له یەکـێـتـیی قـافـیـه لای داوه.



بابەتـەکـانی دڵداری و وەسف و نیـشـتـمـانپـەروەری و کـوردایەتـی و کـۆمـەڵایەتی تێکەڵ بەیەکـتـری کـردووه. شـیـعـری له هەر بـابەتێک نـووسی بێ کـوردایەتی تێـدا کـردووه. له زۆربەی شیعردا بۆ هەر مەبەسێک وترا بێ ناوی کورد یا کوردستانی تێدا هێناوه.

# بەشی بیست و چوارەم

## شێخ لەتیف

**۱۹۱۷ - ۱۹۷۲**

### ژیانی

لەتیف کوڕی شێخ مەحموود کوڕی شێخ سەعید لە ساڵی ۱۹۱۷ لە سلێمانی لە دایک بووە. لە بنەماڵەی شێخانی بەرزنجی و نەوەی شێخ مارفی نۆدێیە. لە دواییدا بەشێخ لەتیفی حەفید و شێخ لەتیفی بەرزنجی ناسراوە. لە تەمەنی دوو ساڵیدا لە دوای بەدیل گیرانی شێخ مەحموودی باوکی لە ساڵی ۱۹۱۹ لە لایەن ئینگلیزی داگیرکەرەوە بەماڵەوە پەنایان بۆ ئیسماعیل ئاغای شکاک (سمکۆ) لە کوردستانی ئێران بردبوو. بەمنداڵی لەگەڵ باوکی بووە لە شەڕی ئاوباریکدا. لەبەر بێ ئۆقرەیی ماڵی باوکی خوێندنی ڕێکوپێک نەبووە. هەندێ جار لە حوجرەی مزگەوت خوێندوویەتی، جاری وا بووە مامۆستا و میرزای تایبەتی فێری خوێندن و نووسینی کردووە.

لە تەمەنی لاویدا لەگەڵ چەند برادەرێکی هەوڵی داوە ڕێکخراوێکی سیاسی بەناوی «کۆمەڵی برایەتی»یەوە لە دژی ئینگلیز دامەزرێنێ، بەڵام لەم کارەیدا سەرنەکەوتووە. لە ڕۆژگارانی جەنگی دووەمی گیتی دەسەڵاتی بەغدای عیراق پیلانی دادەنا بۆ گرتنی، ئازایانە توانی خۆی بەدەستەوە نەدا و ڕووی کردە ناوچەکانی کوردستانی ئێران. لە دوای ساڵێک (١٩٤٣) گەڕایەوە سلێمانی. بەکۆتایی جەنگی دووەم و دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٦ شێخ لەتیف لە بنەماڵەی قازی محەممەدەوە نزیک بوو، بەهەموو شێوەیێک یارمەتی دەدان. لە ساڵی ١٩٥٦ لەو کاتەی نووری سەعید سەرۆک وەزیرانی عیراق بوو شێخ لەتیف گیرا و لە پێشانا لە گرتووخانەی سلێمانی و لە پاشانا لە بەندیخانەی بەسرە زیندانی بوو تا کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی بەغدا. لەو دوو سێ ساڵەی پاش کوودیتاکە شێخ لەتیف جموجۆڵی سیاسی هەبوو، لە خزمەتی کاروباری کۆمەڵایەتی دوور نەبوو. لە کاتێکدا گۆڕانەکەی ١٤ی تەمووز لە پێشکەوتنخوازییەوە وەرگەڕایە سەر کۆنەپەرستی، لە ساڵی ۱۹٦۱ لە دژی دەسەڵاتی عیراق بوو لە گوندی سیتەک نیشتەجێ بوو تا ڕۆژی ١٢ی مایسی ۱۹۷۲ لە



نەخۆشخانەی ڕەبەنان (ڕاهیبات) لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی هێنرایەوە سلێمانی و لە مزگەوتی گەورە لەتەک شێخ مەحموودی باوکی و کاک ئەحمەدی باپیرە گەورەی نێژرا.

### شیعری

شێخ لەتیف لە ماڵێکی گەورە پەروەردە بووە، تەریقەتی دەروێشی و ڕەوشتی ئایینی و جموجۆڵی سیاسی سیفەتی دیاری ئەو خێزانە بووە. هەروەها شیعر و سەربردەی ئەدەب دیاردەیێکی گرنگ بووە لەو ماڵەدا. لە منداڵییەوە گوێی گۆش بووە بەشیعری کوردی، ئەو شیعرە خۆشەویست بووە لە لای. سەرەڕای ئەم هەموو سیفەتانە. شێخ لەتیف کەسێکی قسە خۆش و نوکتەچی بوو، زۆرزان و هەڵسوکەوتی دیمۆکراتیانە بوو. هاوڕێ و برادەری زۆر بوون، لە شاعیر و ڕۆشنبیر و خەڵکی ساکاری چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵەوە نزیک بوو.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شێخ لەتیف هەردوو کێشی عەرووزی و خۆماڵی لە شیعریدا بەکارهێناوە. لە هەموو جۆرە قافیەکانی هەیە، یەکێتیی قافیە، جووت قافیە (مەسنەوی)، قافیەی ڕەنگاوڕەنگ. لە بابەت قەوارەی شیعرەوە بەزۆری بەرهەمی بریتییە لە پارچە شیعری کورت، لە بابەتی لیریک (غەزەل)، شیعری درێژ یا قەسیدە لە بەرهەمیدا بەدەگمەن بەرچاو دەکەوێ. شیعری کورتی پێنجین و شەشینی بەحری عەرووزی هەیە، جگە لەوە لە هونەری چوارین و تاک هەندێ نموونەی هەیە لە ناو کۆمەڵە شیعریدا بەرچاو دەکەوێ. سەرەڕای ئەمانە شیعری بەدیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردیش هەیە.

#### شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شێخ لەتیف شیعری کەمە، بەڵام ئاسۆی ناوەڕۆک و بابەتی فراوانە. لە وەسف و دڵداری و کۆمەڵایەتی و سیاسەت و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی دەستێکی درێژی بووە. داهێنانی بەرچاوی هەیە لە شیعری گاڵتەوگەپ (کۆمیدی) و شیعری کراوە (ئیرۆتیک). هەندێ جار شێخ ڕەزایانە گاڵتەوگەپ و سێکسی مێبازی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. شێخ ڕەزا یەکێک بووە لە شاعیرە خۆشەویستەکانی کورد لای شێخ لەتیف، هەمیشە ستایشی کردووە و بەشاعیری گەورە ناوی بردووە.

## نموونەی شیعری شێخ لەتیف

### وەسف و دڵداری

١

له پارچه شیعرێکیدا شاعیر دەڵێ:

شۆخەکەم! نازدارەکەم! نەونەمام روومەت بلوور
تاقە پۆڕی مل بەخاڵی دەشتی جوانی شارەزوور
لێو بەچەشنی دەنکە شاتووی کاتی ناکام ئاڵ و سوور
دەنکە یاقووتی سەری کوڵمت بەشوعلەی پڕ لە نوور
وا دڵی پیری موغانی خستە ئاشووب و خەیاڵ
داخەکەم تازە مەحاڵە هەر خەیاڵە دوور بەدوور

شێخ لەتیف لادێییانە ڕوو دەکاتە کیژۆڵەیێکی جوانی دەشتی شارەزوور بە خەیاڵی خەڵکی ساکاری ناو عەشایەر لێوی بەدەنکە شاتووی سوور و کوڵمی بەیاقووت دەچوێنێ. ئەو کچەی پیری موغان بشێوێنێ چۆن لە شاعیر نزیک دەکەوێتەوە.

٢

له وەسفی خۆشەویستە جوانەکەیدا دەڵێ:

خرپنە ئەی کۆترە شینە ماسیە پانکەی ساف و لووس
زۆر گەڕاوم چین و ماچین ئەوروپا تا خەڵکی رووس
چاوی وا گەش زولفی وا ڕەش کوڵمی چەشنی پرتەقاڵ
لایێ سێوە لایێ لیمۆ جوانە نەخشی وردە خاڵ
جوانی وەک تۆم هیچ نەدیوە دەستە گوڵ سەر گۆنە ئاڵ
بێ درۆ دڵ ڕاچەنی چەشنی دڵێکی نۆزدە ساڵ
پان و پۆڕی نەختێ تۆڕی ئاسکی سمکۆڵ ئەکەی
داخەکەم پیری میوانە هیچ نەماوە هێزی باڵ

شاعیر لە چێژە میللییە کوردییە ڕۆژهەڵاتییەکەی نایەتە خوارەوە. سوورە لەسەر ئەوەی ئەندامە وردە جوانەکانی دلبەر لەگەڵ هەندێ میوەی جوان و بەتام و بۆن خۆش بەراوورد



بکا. وەکو شاعیرانی دیکە زۆر جێ گەڕاوە چین و ماچینی دیرین، ئەوروپا و ڕووسیای ئێستا، جوانی وەک ئەوی نەدیوە. ئەمە خەیاڵی لاوێکی تەمەن نۆزدە ساڵییە، کەچی شاعیر بەرەو پیری دەڕوا، دەبێ ئەم هەموو جوانییە تامی چی بێ بۆ ئەو!.

٣

لە زنجیرە شیعرێکی بابەتی چوارین و تاک شاعیر بەم جۆرە دەچێتە ناو گێتیی دڵدارییەوە:

ئەو گڕوگاڵەی کە ئێستە دڵ خەریکە فێر ئەبێ
وابزانم لێوی تۆ بمژێ تەواوی تێر ئەبێ
هەر بەساوایی بەسێوی ئاڵەوە فێرە دەمی
بۆیە هەرکەس حەز بەڕەنگی ئاڵە ئاخر خێر ئەبێ

شاعیر گفتوگۆ لەگەڵ دلبەردا دەکا و پێی دەڵێ ئەو مەشقەی دڵ خەریکە لە گێتیی دڵداریدا دەیکا ئەگەر لێوی تۆ بمژێ تێر دەبێ. زۆر جوان کۆتایی بەچوارینەکە دێنێ بەوەی ئەو کەسە بەختیارە کە لە سەرەتاوە فێری ڕاموسانی سێوی ئاڵ واتە ڕوومەتی سوور بێ.

لە چوارینێکی دیکەیدا لە ساڵی ١٩٦٩ هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

چ شیرینە کاتێ ئارەق و پەرچەم لەسەر ڕووتە
بەچەشنی سێوی ڕووتە ئاڵ و سوورە عەینی یاقووتە
لە کاتێ شەمع ئەسووتێ باڵی پەروانە شکا تیا چوو
ئەگەرچی مردن و قەبرە گوڵ و پەروانە تیا چوونە

شاعیر ئاشقی میوەی کوردستانە، سێوی لاسوور ڕەونەقی لە کوڵمی دلبەر وەرگرتووە. کە مۆم دەسووتێ پەپوولە دەمرێنێ، ئەو مردنە چەندە خۆشە کە پەروانە و ڕووناکی مۆم بەیەکتری شاد دەبن.

لە تاکێکیدا دەڵێ:

گەردنت مەرمەڕ وەکو کێلێک بشێ بۆ گۆڕەکەم
جەننەتی چی! وا ئەزانم مەیلی حووری هەر نەکەم

ئەگەر ئەو گەردنە مەرمەڕییەی نازدار ببێ بەکێلی گۆڕی شاعیر، چی باکی بە بەهەشت دەبێ و پەرییەکانی بۆ چییە!.

له تاکێکی دیکەیدا له ساڵی ۱۹۳۷ هۆنراوەتەوە دەڵێ:

وەکو پەروانەکەی شەیدا کە سووتاوم بەڕووی لالا
چ خۆشە ئەو شەوی وەسڵە کە لالا پێم ئەڵێ لالا

دیارە شێخ لەتیف واز لە پەروانە ناهێنێ، کارێکی بەجێیە لە خەیاڵیدا بێ ئەگەر ئیلهامی لێ وەربگرێ بۆ هۆنینەوەی شیعری نوێ. شاعیر پەپوولەیە و دەیەوێ بسووتێ چونکە بەو سووتانەی دەگاتە دلبەر کە ئاگرە و لە ناویدا دەتوێتەوە.

### بەسەرهاتی شاعیر

له شیعرێکیدا بەناوی «تەمەنی ژین» شاعیر ڕووداوی ئێستگە نالەبار و پڕ لە ئازارەکانی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە. شیعرەکە له ساڵی ۱۹۷۰ هۆنراوەتەوە، بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

سەد و چوار جەژنە تەمەنی ژینم
جەژنێکم نەدی خۆشی ببینم
یان لە غەریبی یا بەندیخانە
یان دەربەدەر بووم لەم وڵاتانە
ئێران و عێراق هەتا باش قەڵا
وەک خێڵی قەرەج گەڕۆک تەوەڵلا
یان باوک ئەسیر یان خۆم فیرار بووم
بەدەست بەسەری خاوەن ئازار بووم
بەسزای دوژمن بێ وەفایی دۆست
ڕیشەی گەنجێتیم دەرهێنرا لە پۆست
جەژنێکم نەدی بەدرێژی ساڵ
لای باوک و دایک و ناو عەشرەت و ماڵ
هەر ڕۆژ لە شاخێ هەر ڕۆژ لە دێیێ
هەر ڕۆژ وڵاتێ ساتێ لە جێیێ
وەکو قژقڕە سەد لەهجە فێر بووم
هێندە گەڕاوم لە گەڕان تێر بووم



ئەم بەسەرهاتە حیکایەتی ژیانی نالەباری زۆربەی خەڵکی کوردە. شێخ لەتیف وەکو کوڕی شێخ مەحموود گەلێ لەو ئازارانەی چەشتووە کە تووشی باوکی بوون.

لە پاشانا شاعیر دەکەوێتە وەسفی ژیانی ئاوارەیی لە جێیێک بۆ جێیێکی دیکە:

چەند سەگی دێهات بەمن وەڕیوە
چەند سەرما و گەرما نەخۆشیم دیوە
ئەم دێ بۆ ئەو دێ لەم شاخ بۆ ئەو شاخ
کۆچا و کۆچ ئەڕۆم بەکەر و وڵاخ
پەنجا ساڵ تەمەن وا بەسەر بەری
گەڕۆک و خوێڕی وەکو سەرسەری
ئەم شاخ بۆ ئەو شاخ ئەم دێ بۆ ئەو دێ
لە گشت جێگایێک بێ لانە و بێ جێ
ئەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ بەدرێژی ساڵ
تەیم کرد ژینی عومری ترش و تاڵ
ئەم ژوور بۆ ئەو ژوور سەرخان و ژێرخان
لەسەر بەرەی شڕ یان گوێی ئاگردان
شاخی هەورامان هەتا گەلاڵە
دێهاتی پەڕپووت لەو چەم و یاڵە
وەڵڵانە و وێڵە تا بناویلە
لەگەڵ ئەسپێ دا ئەکەم تەهلیلە

لەم دێڕانەدا باس لەو ئاواییانە دەکا کە تیایاندا ئاوارە بووە، ناوی هەندێ لەو شوێنانە دەهێنێ وەکو ناوچەکانی نێوان شاخی هەورامان و گەلاڵە و ئاواییەکانی وەڵڵانە وێڵە و بناویلە. ئینجا بەم دێڕانە دوایی بەشیعرەکەی دێنێ:

ژێرخانی پڕ کێچ هاڵاوی شیاکە
خۆ ڕشک و ئەسپێ ئەوە قەی ناکا
ئاوازی دەنگ خۆش زەڕەی نێرەکەر
قسە و باسی خۆش باسی دزی و شەڕ

ديـداری خـــــــزم و ئـەولاد و منـدالّ
بووەتە خـەیالات شـتـێکی مـەحـالّ

شاعیـر لەم دێڕانەدا وێنەی دواکەوتوویی چینی هەژاران دەخاتە ڕوو، هەژاری دەبێتە هۆی پیس و پۆخڵی و پەیدابوونی کێچ و ڕشک و ئەسپێ. مرۆڤ لەگەڵ ماڵات لە ناو چوار دیواری تەویلە ئاسایی پێکەوە دەژین. بەشی زۆری ژیانی ئاوارەیی شاعیر بەم جۆرە بووە، جگە لەوەی لە ماڵ و منداڵیشی دوور بووە.

## شاری نەجەف لە بیری شاعیردا

شێخ لەتیف لە ساڵی ١٩٥٢ لە شاری حیللە زیندانی بووە ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە:

لای دەسی ڕاستم حوسێنە و ڕووبەڕووی چاوم عەلی
سەر خەریکی خۆ بڕینە تا فیدای بێ ناوەکەم
موددەتێکە من خەریکم بچمە زیارەت بۆ نەجەف
مەنعی دیدارم ئەکەن پۆلیس لە ماڵی باوەکەم

شاعیر لە شاری حیللە دەستبەسەر بووە، نەیتوانیوە لە شار بچێتە دەرەوە. لەو کاتەی لای دەستی ڕاستی شاری کەربەلایە و حوسێنی لێ نێژراوە، بەرامبەر شاری نەجەفە تەرمی عەلی گرتۆتە خۆی، هەردووکیشیان لە شاری حیللەوە نزیکن، بەڵام پۆلیس ڕێگەی نادا زیارەتی ئارامگای ئەو دوو کەسە بکا.

## ماتەمنامە بۆ کۆچی دوایی بێخود

لە پارچە شیعرێکیدا شێخ لەتیف شیوەن بۆ بێخود دەکا:

وا لەسەر چاوەی دوو چاوەی چەشمەگاهی چاوەکەم
هێرشی لافاوی حەسرەت تەم ئەخاتە چاوەکەم
چەم بە ئەسرین چەم بەلێلاو تاڤگەی ڕووی کردە ڕوو
هەوری ڕەش تانەی لە نێو خستە گلێنەی چاوەکەم
لازمە ساڵێ خەزانێ بۆ قڕانی شاعیران
تا بە جارێک بێتە سوێ دیسان دڵە ئێشاوەکەم
داخی بێکەس ئێشی زێوەر نوکتەکانی پیرەمێرد
کۆچی بێخود داغی نایە جەرگە هەڵقرچاوەکەم



لەم شیعرە جوان و پڕ لە سۆزەدا شاعیر فرمێسک تەنیا بۆ بێخود نارێژێ، لەو سەردەمەدا چەند شاعیرێکی دیکەی وەکو بێکەس و زێوەر و پیرەمێرد ماڵئاواییان کردبوو. بەم پێیە شیعرەکە بووە بەماتەمنامە بۆ هەموویان.

## پەرێشانی شاعیر و دواکەوتوویی کۆمەڵ

لە شیعرێکیدا شاعیر دەڵێ:

دۆستەکەی ئەهلی وەفا ئەی دەردەداری دەردەکەم
ڕووحەکەم ئەی نووری چاوم ڕۆشنی دوو دیدەکەم
گەر ئەپرسی تۆش لە ئازاری دڵم وا مردنم
زۆر نزیکە پاییزی عومر و خەزانی ژینەکەم
هەرچەندە خۆ ئەمری خوایە لام خەڵاتە ئەی ڕەفیق
داخی نا وەختی ئەلەرزێ جەستەیی بێ تینەکەم
زۆر ئەسەف وا ئەشکی حەسرەت چاوەکانی گرتووە
دەنگی ئایوو ئۆبی دڵمە سازی دەروونی سینەکەم
پێم ئەڵێت گەر دەستی ڕەحمەت بۆتە شیفایی بەزوو
تۆبە لەو کارەت بکەیت عەیبی نەزانان پینەکەم
گورگ و مەڕ مەعلووم نییە ئەمڕۆ لە دنیادا عەزیز
خزمەتی سەگ باشترە نەک خزمەتی ئەو چینەکەم

شێخ لەتیف ئەم شیعرەی بەناوی «بۆ دۆستێک» داناوە، ئەوە دەردەبڕی کە ستایشی دۆستێکی خۆی دەکا، بەڵام پەژمردەیی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، لە کەموکووڕی ژیانی کۆمەڵایەتی دەدوێ، شیرازەی کۆمەڵ تێکچووە، کەس نازانی گورگ و مەڕ کامەیان دۆستە و کامەیان دوژمنە. شاعیر لەسەر ئەو ڕایەیە خزمەتکردنی سەگ باشترە لە خزمەتکردنی ئەو چینە زۆردارەی فەرمانڕەوایی دەکا.

## نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «سروودی ئەی کوردی فەقیر» شاعیر دەڵێ:

ئەی کوردی فەقیر بۆچی ئەسیری
بۆچی گیرۆدەی بەندی زنجیری
براگەل بێنەوە بەیەکجار
بشکێنن تەوقی غەددار
کوردە وەرە بڕوانە
خاکمان وێرانە

***

تاکەی دوودڵی! دڵ پیس لەگەڵ یەک
زڕەی فنجانی مەشرووبات بەپێک
دەست بەنە دەست یەک! ئێوە و خوداتان
بۆ پێشکەوتنی خاکی نیشتمان
کوردە بڕوانە
خاکمان وێرانە

***

ئەرخەوانەکەی گردەکەی سەیوان
ڕەنگ کرا بەخوێن گەشی شەهیدان
بچۆرە خزمەت حوزووری باری
بەشین و ڕۆ ڕۆ بەگریە و زاری
بڵێ خوداکەی خاوەن دوو جیهان
بە چ ئایەتێک کورد نەیبێ ژیان
کوردە بڕوانە
خاکمان وێرانە
براگەل بێنەوە بەیەکجار
بشکێنن تەوقی غەددار

شاعیر ئەم لیریکەی لە ساڵی **١٩٣٧** هۆنیوەتەوە. لەم کارەیدا بەشداری لە بزووتنەوەی «شیعری نوێ»ی کوردی کردووە لە نێوان هەردوو جەنگی سەدەی بیستەمدا. لە شیعرەکەدا زیاتر لە کێشێکی سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە، هەرچەندە سروودی



نیشتمانی کێش و قافیەی ڕەنگاوڕەنگ دەخوازێ بەڵام شێخ لەتیف لە شیعری میللیی سەرزار و بزووتنەوە شیعرییە نوێکە دوور نەبووە. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە خوێنەر هان دەدا بۆ ڕاپەڕین لە دژی دواکەوتوویی، وێرانی خاک، هەروەها شکاندنی کۆت و پێوەند و هەڵمەت بردن لە دژی داگیرکەر.

## ٢

لە ساڵی **١٩٣٤** شێخ لەتیف پارچە شیعرێکی پێشکێش بە«شەهیدانی دەرسیم» کردووە:

نامەوێ ژینێ بەم نەوعە تاڵ بێ
دوژمن لە خاکما بەم جۆرە زاڵ بێ
تف لەو برنجە با نانی کاڵ بێ
دۆشەک و یاتاغ هەردە و سەریاڵ بێ

***

نامەوێ ژینێ نەزانم من چیم
کەڵکی چی ئەگرم یا بۆچی ئەژیم
لاشەی سەردار و لاوانی گەلم
کەوا نەمردم بەچاوی خۆم دیم

لاواندنەوەییێکە شاعیر بۆ شەهیدانی ڕاپەڕینی شۆڕشی کوردی دەرسیم لە کوردستانی باکوور دەکا. بەڕاستی ئەم شیعرە نموونەییێکە هەموو شەهیدانی ڕێگەی کوردایەتی دێنێتەوە یاد.

## ٣

لە چوارینێکیدا شاعیر لە بەسرە لە ساڵی **١٩٥٧** هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

ڕۆژ لەبەر فرمێسکی چاو و شەو لەبەر ناڵانی دڵ
ئێشی چەند زۆرە برین و داغی غەمخۆرانی دڵ
وا پڵووسکی بەستووە فرمێسک خوێناوی جگەر
سەیرە ئارایش ئەکەن بەو خوێنە خوێنخۆرانی دڵ

شاعیر ئەم چوارینەی لە بەندیخانەی بەسرە وتووە. لەو ئاوارەیییەدا بەڕۆژ فرمێسک و

بەشەو پیشەی نالّین بووە. جوانە کە دەڵێ دوژمنان خۆیان ئارایش دەکەن بەو فرمێسکە گەرمە و خوێناوی جگەرە.

لە تاکێکی دیکەیدا لە ساڵی ١٩٥١ لە بەندیخانەی ناسریە هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

وەتەن ڕووح و سەروماڵم لە ڕێتا قۆچی قوربانە
بەیادی ڕۆژی ڕووناکیت لە تاریکی سزاخانە

سۆزی قووڵی بێ پایانی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی شێخ لەتیف لەم شیعرەدا دەردەکەوێ، موناجاتێکە لەگەڵ خاکی کوردستانی دەکا.

**شیعر بەهەوای دیالێکتی گۆرانی**

شێخ لەتیف پارچە شیعرێکی لەم بابەتەی هەیە:

سیا شەوەزەنگ زولفی ماری ڕەش
جیلوەی نەما بوو دوو ئەستێرەی گەش
هەوارگە خاڵی جێ سەیران چۆڵەن
هەناسەی دەروون ساچون سەهۆڵەن
بارەگای چیمەن خەزان کردە بێ
لەیلام سەفەری تەشریف بردە بێ
چون مانگ لە ئاسۆ وە دەم بانی کەل
مەیلی ئاوایی کردن جووتەی مەل
نە ئەستێرەی شەو ئەدرەوشا جە ڕوو
نە ماه و سەما ئۆقرەش کردە بوو
نە گۆشەی ئەبرۆ پرچی سیاتار
لەسەر سەفحەی ڕوو پەی مابوون قەرار

شاعیر ئەم لیریکەی بەزمانێکی تێکەڵاوی دیالێکتە بچووکەکانی کوردی سلێمانی و هەورامی وتووە. وەک گۆرانییێکی وەسفی دلّداری ناوچەی شارەزوور و هەورامان دەکەوێتە بەرچاو.

***

شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحموودە، شێخ مەحموود کەسێکە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەگەڵ شێخ



سەعیدی باوکی میوانی سوڵتانی عوسمانی بووە. شێخ مەحموود ئەو کاتە منداڵ بوو لەگەڵ باوکی چاوی بەکۆشک و سەرا و شانشینی دەوڵەتی عوسمانی کەوت، لە دوای ئەوە خۆشی گەیشتە پایەیێکی بڵند لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی دەوڵەت، بوو بەمەلیکی کورد. لەو کاتەی خوێنەر شیعری شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود دەخوێنێتەوە سەری سوڕ دەمێنێ. زۆری ئەو ژیانە ئاوارەیی و ئازار و بەندیخانە و سەرما و گەرما بووە. هەندێ جار ڕشک و ئەسپێ لە سەر و لەشی مۆڵیان بەستووە. هەلی بۆ هەڵنەکەوتووە خوێندنی بەرێکوپێکی تەواو بکا، بەڵام خەیاڵێکی فراوان و چێژێکی باڵا و بینینێکی قووڵ ئیلهامیان بۆ ڕەخساندووە شیعر بڵێ. لە شیعری وەسف و دلّداریدا سەرکەوتووە، بەشدار بووە لە هێنانی شیعری کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و کۆمەڵایەتی بۆ ناو ئەدەبی کوردی. ئەگەر شێخ لەتیف ژیانی بەخەباتی باوکیەوە نەبەستایە ڕۆشنبیرێکی گەورەی لێ دەکەوتەوە. وەک شاعیرێکیش سەرکەوتووە چونکە بەهرەی هونەری و خەیاڵی شیعری پێوەندییێکی ئەوتۆیان بەخوێندەواریی بەرزەوە نییە.

# بەشی بیست و پێنجەم

## جاهید

**١٩١٨ – ١٩٩١**

### ژیانی

بورهان کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولڕەحمان دۆغرەمەچییە. لە ساڵی ١٩١٨ لە هەولێر لە دایک بووە. وشەی «جاهید»ی هەڵبژاردووە وەک نازناوی شیعر. قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئوولای (یەکەمی) هەولێر تەواو کردووە. لە تەمەنی منداڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە. دایکی شووی بەشوبرای خۆی کردۆتەوە کە جەبار ئاغای کانی شاعیرە، واتە مامی جاهید، لەبەرئەوە لە ماڵی مامی گەورە بووە. لە دوای خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ناوەندی هەولێر خوێندوویەتی. لە پۆلی دووەم لە ساڵی ١٩٣٤ لە قوتابخانە دوور کەوتۆتەوە، لەو سەردەمەدا دایکی کۆچی دوایی کردووە، بێ داڵدە ماوەتەوە، تووشی دەست کورتی و ئاوارەیی بووە. کە ناوی بۆ خزمەتی سوپا هاتووە خۆی نەدزیوەتەوە، لە ساڵی ١٩٣٧ تا ١٩٤٠ سەرباز بووە لە ئۆردووگاکانی کەرکووک و سلێمانی و کۆیە و ڕواندز. هەر لەو کاتەی لە عەسکەری ڕزگاری بووە خووی داوەتە سەرخۆشی و ژیانێکی بێ سەروبەری بردۆتە سەر. وەکو خۆی دەیگێڕێتەوە بێ جێگە و ڕێگە بووە. بەئاوارەیی هەر شەوێ لە جێیێک نوستووە و شەوانی بێگاری لە خان و مزگەوت و ماڵی برادەران بردۆتە سەر. زۆربەی ژیانی ڕۆژانەی بەسەرخۆشی بەئەنجام گەیاندووە، بەڵام مەستێکی بێ وەی بووە و زیانی بۆ خۆی نەبێ بۆ کەسی دیکە نەبووە.

لە ساڵی ١٩٤٥ جاهید یەکێک بوو لەوانەی بەر لێشاوی هێرشی حوکوومەتی کۆنەپەرستی عیراق کەوتن بەهۆی بزووتنەوەی ئەو سەردەمەی بارزانییان و ماوەیێک لە گرتووخانە مایەوە. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم ژنی هێنا، ماوەی سەرخۆشی و ئاوارەیی لە ژیانیدا تا پلەیێک بەسەرچوو و هەندێ ئۆقرەی گرت. لەو کاتەدا بوو بەمووچەخۆر لە بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ڕێگەوبان و هاتوچۆ لە هەولێر. لە پاشانا کارگێڕی نامەخانەی ناوچەیی عەنکاوەی پێ سپێررا لە هەولێر. لە دوای ماوەیێک خانەنشین کرا. ئەم مرۆڤە



بەدبەختەی خێر نەدیوە لە ژیان لە ڕۆژی ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٩١ لە هەولێر کۆچی دوایی کرد و هەندێ شیعری جوان و بەپێزی لە دوای خۆی بۆ نەتەوەی بەجێ هێشت.

### شیعری جاهید

ژیانی جاهید لە ماڵی جەبار ئاغای کانی مامی بەمنداڵی چێژی شیعری لە لای دروست کردووە، لە تەمەنی پازدە ساڵیدا هەوڵی داوە شیعر دابنێ. کە مامی مووچەخۆر بووە لە ڕواندز و بێخود گەشتی ئەو ناوەی بووە لە ماڵی مامی ئەو شاعیرەی ناسیوە و شیعری بۆ خوێندۆتەوە. سافیی هیرانی دیوە، لە ڕانیە دڵداری ناسیوە و بووە بەهاوڕێ لەگەڵی. لەو سەردەمەدا سەعدی مەلا ڕەئووفی برا گەورەی دڵدار مووچەخۆر بووە لە ڕانیە. لە پاشانا لە ساڵی ١٩٤٠ شیعرێکی داشۆرین ئامێزی سووکی داناوە لەگەڵ دڵدار شەڕ بەکانی شاعیر دەفرۆشن. لە شاعیرە لاوەکانی سەردەمی ژیانی خۆی ناسیاوی لەگەڵ ئەحمەد دڵزار و مەسعوود بێبەش و مەدحەت بێخەو و جەلال مەدحەت و پیرباڵ مەحموود هەبووە.

ئەم نێوەندە شیعرییە دەورێکی گرنگی بووە لە مشتوماڵ کردنی هەستی شیعری لای جاهید. شیعرێکی زۆری کلاسیکی و نوێی لەبەر بووە، کۆمەڵێک وێنەی داهێنانی شیعری لە خەیاڵیدا دروست بووە. گوێی مۆسیقی دووبارە وێنەکانی داڕشتۆتەوە بەزمانێک هەندێ جیا لەو شیعرانەی لەبەری بووە. مەبەس لەو زمانە شێوە زارەکەی هەولێر یا سۆرانییە لە دیالێکتی کرمانجیی باشوور، لە هەندێ لە تەعبیرەکانیدا ئەدگاری ئەم شێوازە بەرچاو دەکەون.

شیعری جاهید لە ڕووی ڕوخسارەوە، بەتایبەتی لە کێش و قافیەدا، هەردوو کێشی بەحری عەرووزی و خۆماڵی بەکارهێناوە. هەروەها لە قافیەدا یەکێتیی قافیەی عەرووزی و جووت قافیەی خۆماڵی (مەسنەوی) بەکارهێناوە. زمانی شیعری ئاسانە، مانا لە ڕووە، لە شیعری میللیی سەرزارەوە (فۆلکلۆرەوە) نزیکە. بەگشتی هەمووو شیعری جاهید دەچێتە ناو بابەتی لیریکەوە. شیعری بەقەوارە کورتە، چەند پارچەیێکی درێژی هەیە دەتوانرێ بەقەسیدە بژمێررێن. جگە لەوە شاعیر بایەخێکی زۆری بەچوارین داوە. زیاتر لە ١٦٠ چوارین لە دیوانیدا بەرچاو دەکەون. زۆربەیان لە زادەی بیر و خەیاڵی خۆی دەژمێررێن. لە هەندێکیاندا هەست بەتارمایی شێوازی عومەر خەیام دەکرێ.

شیعری جاهید لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بەشێک لە مەبەسەکانی شیعری کوردی گرتۆتە

خۆی، لەوانە وەسف و دڵداری و ستایش و کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و داشۆرین و کۆمەڵایەتی و هی دیکە. بەشی زۆری شیعری دەچێتە خانەی ئامۆژگاری سەروسەربردەی کۆنینە و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و بیری فەلسەفی بەتایبەتی لە چوارینەکانیدا.

## نموونەی شیعری جاهید

### یەکەم شیعری جاهید

لەو شیعرەدا دەڵێ:

لە بۆ دەفعی غەمی دنیا
لە دەستم بادە بوو پەیدا
عەقڵ فەوتا جیگەر سووتا
بەجارێ کەوتمە سەحرا
غەمم یەک بوو هەزاری کرد
دەخیلی گوڵعوزاری کرد
خەریکی ئاه و زاری کرد
بەشەو تا ڕۆژ ئەبێ بیللا
نەما چارم کە بیمارم
بەدڵ لەم گیانە بێزارم
لە هیجرانا چ بێچارم
بەتیرێ بمکوژێ لەیلا
فەلەک سووتا لە ئاهی من
مەلەک گریا لە ڕاهی من
عەجەب بەختی سیاهی من
نەبوو جارێ لە خەو ئاگا
بەحاڵی (جاهید)ی مەعسووم
ئەگەر ڕەحمێ نەکەن مەعلووم
حیسابی من چ بێ مەفهووم
ئەپرسن لێم لە مەحشەردا



ئەم لیریکە جوانەی جاهید تیۆریی هەندێ لە ڕەخنەگرانی ئەدەبی گێتی ڕەت دەکاتەوە، ئەوانەی لەسەر ئەو باوەڕەن بەرهەمی شاعیر لە ڕووی جوانکارییەوە لە گۆڕان و پەرەسەندندا دەبێ بەپێی گۆڕانی فیکری و وەرگرتنی زانیاریی تازە بەدرێژایی ژیانی. ئەم بەرهەمە یەکەمین شیعری جاهیدە کەچی بەکامڵی لە دایک بووە، ئەمە سیفەتی هەمیشەیی داهێنانی ئەدەبی و هونەرییە.

### وەسف و دڵداری

١

لە لیریکێکیدا جاهید دەڵێ:

گوڵی باغی بەهەشتی سەرزەمین
ئەسەف بۆ من غەم و ئەزیەت ئەچینی
چناری سەرچناری سەر وڵاتی
بەژن بەرزی نەزانی نازەنینی
قەسەم بەڕوومەتی ئاڵت کە ئاڵە
شیفا بەخش و تەبیبی گشت برینی
تەبیعەت هەر وەکو منداڵی ساوا
خەریکە تێک بدات تەرتیبی ژینی
ئەگەر شەقڵاوە مێرگ و مێرغوزارە
ئەتۆش شاخێکی سەر لەوحەی سەفینی
لە دەرسی مەکتەبی عەشق و تەبیعەت
شەهادەت من ئەدەم تۆ یەکەمینی
نەبوو جارێ بپرسی حاڵی (جاهید)
لەبەر چی وا کز و مات و حەزینی

لەم شیعرەدا جاهید ڕووی کردۆتە دلبەر و بەسەر جوانیدا هەڵدەڵێ. ڕەوانبێژی شیعرەکە هەر لەو وێنانەدا خۆی دەنوێنێ کە شاعیرانی کلاسیک دۆزیویانەتەوە یا دایانهێناوە. ڕەوانی شیعرەکە و ناوهێنانی هەندێ جێگەی خاکی نیشتمان جوانییێکی دیکەی داوەتە

شیعرەکە وەکو ئەو وێنەیەی شاعیر کێشاویەتی و شەقلاوەی کردووە بەمێرگ و مێرغوزار و دلبەریش بووە بەشاخی سەفین و مایەی جوانی مێرغوزارەکە، چونکە قەدپاڵ و دەشتەکەش دەپارێزێ.

**٢**

لە شیعرێکیدا جاهید بەناوی «یادی ڕۆژانی ڕابردوو» لە ساڵی **١٩٣٣** هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

ڕۆژێ ئەچوومە ماڵەوە
بەس خۆم و تەنیا حاڵەوە
بێ ئەزیەت و مەلاڵەوە
بێ مەقسەد و خەیاڵەوە
دیتم لەسەر کۆشک و سەرا
مەحبووبێ عەینی شەوچرا
تاقەت و سەبرم لێ بڕا
ئیشارەی کرد لە پاڵەوە
لای برد و چارۆکەی سەری
دەرچوو قەمەر بۆ مشتەری
نووسرا لە بۆم ئاخر شەری
خستمیە عەیشی تاڵەوە
غەمزە هوجوومی کردە دڵ
نەمزانی حیلەبازە گوڵ
زنجیرەی شێتم خستە مل
بەئۆف و ناڵە ناڵەوە
چاوی سوپەهسالاری ئەو
حەرامی کرد لە چاوم خەو
خوێندم وەکو کەو ڕۆژ و شەو
بەحوکمی خەت و خاڵەوە



ساعید و شان و دەست و کەف
سینەیی سافی وەک سەدەف
دوو غونچە گوڵ لە دوو تەرەف
لە ژێر کراسی ئاڵەوە
فەرمووی بڕۆ تۆ ئەو دەمە
ئەمما وەرە ڕۆژی شەممە
نەختێ ئەکەین کەون و گەمە
بەیادی وەزعی حاڵەوە
چارەم نەما غەیر سوکووت
خزیم و هەروەک عەنکەبووت
ڕۆژم حیساب کرد تاک و جووت
بۆ وەعدەیی ویساڵەوە
چوومە دەرگەی حەسارەکەی
وەختێ ویساڵە تایەکەی
هاتوومە دەگرم لێوەکەی
بەجەرگی وەک زوخاڵەوە
وەختێ کە دەرگەی کردەوە
منی لە بۆ خۆی بردەوە
بە گوفتێ نەرم و وردەوە
بەفەرموودەی عەسالەوە
وتی ڕۆژت هەڵات (جاهید)
تۆم خۆش ئەوێ خودا شاهید
با بتەقێ ورگی حاسید
بمرێ بە قیل و قاڵەوە
وتم ئەی ڕووحی ڕەوانم
ئەمناسی کە من بورهانم
بولبولی باغی دڵانم
بێ پەڕ و پووچ و باڵەوە

لەم لیریکەدا جاهید بەسەرهاتی دروست کردووە پێوەندی بەکاتەوە هەیە، لەوەوە دەست پێ دەکا ڕۆژێکیان بەرەو ماڵ دەبێتەوە، لەسەر تەلاری کۆشکێکدا جوانێک دەبینێ. دڵی دەسمێ و گرفتاری دەبێ. ئیتر دەکەوێتە وەسفی ئەندامە بێ وێنەکانی لە جوانیدا. لێی نزیک دەبێتەوە و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکا و بەڵێنی پێ دەدا ڕۆژی شەموو بەیەکتری شاد ببنەوە. لە کاتی دیاریکراودا جاهید دەچێتە بەردەرگای و دەست لە ملی یەکتری دەکەن شەو خەریکی دەسبازی و ماچ و مووچ دەبن تا بەیانی.

لێرەدا شاعیر بەپێچەوانەی شیعری کلاسیکی ئەم بەسەرهاتە کۆمیدیییانە دوایی پێ دێ، بەو مانا کلاسیکییەی کە هەموو ڕووداوێک ئەگەر بەخۆشی و هەلهەلە کۆتایی پێ بێ کۆمیدیای پێ دەڵێن بەپێچەوانەی تراجیدیا.

٣

لە چوارینێکیدا جاهید دەڵێ:

بڵێن بەو یارە شیرینەم لەسەر ڕوو پەردە با لادا
ئەوی هەمبوو لە دنیادا بە بەحری حوسنی ویم دادا
فیغانی گوڵ لە بۆ بولبول لە پاش مردن دەوا نادا
ئەگەر هەیبوو چ ئیحسانێ بداتن پێم لە دنیادا

جاهید دەیەوێ ئەوە لە دلبەر بگەیەنی ئەوەی لە گێتیدا هەیەتی ئەو دڵدارییەیە کە دڵی بەدڵی دلبەر گرێ داوە، لەبەرئەوەیە پێش مردن دەبێ پێی شاد بێ چونکە شینی گوڵ بۆ بلبل لە دوای مردن کەڵکی نییە.

**وەسف و ستایشی خۆی**

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «من چیم!»دا دەڵێ:

لە شەڕ دوور و لە غەم دوورم لە ناو دڵ ساف و خالیمە
لەبەر ئەم حالەتەم دائیم لە ئەم ئەفلاکە حالیمە
ئەگەر سەد ساڵە عومرم بێ ئەسەف نابەم بەژینی خۆم
بەیەک ساڵە ئەزانم خۆم لە دەورێکی منالیمە



بەزاهیر گەرچی ئینسانم لە باتین خۆم ئەزانم چیم
بەرەڵڵای دەشت و سەحرا نیم مەلێکی جوان و ماڵیمە
لە ڕەوزەی زاتەکی عالی ئەخوازم بینی ئومێدم
ئەگەرچی دوورە ئەڕواحم دەخیلی بابی عالیمە
نەجاتم هەر بووە بیللا لە وەحشەت یا لە ناو وەحشەت
شوعووری پاکی ئەفکارم لە پەردەی پڕ خەیالیمە
دڵم مەفتوونی زاتێکە موحەممەد ناوی نووسراوە
لە مەیدانی عەشقبازی کەمالیمە جەمالیمە
منم (بورهان)ی ئەم دەهرە بەشوهرەت پێم دەڵێن (جاهید)
نە فیردەوسی و نە مەولانام نە کانیمە و نە نالیمە

لەم شیعرەدا هەرچی خوو و ڕەوشتی باشە جاهید بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ و ستایشی خۆی دەکا، باوەڕی بەئایینی ئیسلام هەیە، بەهەوایێکی سۆفیزمییانە تەماشای شەریعەتی ئیسلام دەکا. وەکو هەندێ لە شاعیرانی کلاسیکی خۆی بەشاعیری گەورە لە قەڵەم دەدا، خۆی بەفیردەوسی و جەلالەدینی ڕۆمی و کانیی مامی و نالیی گەورەی شاعیرانی کورد نادا.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «دڵ دانەوە» دیسانەوە لە ستایشی خۆیدا دەڵێ:

وەها باشە گوڵی چاوم
ڕەحم کەی چونکە بورهانم
ڕەشیدی بەزمی ڕەندانم
نەدیمی جەوری دەورانم
نەگۆڕاووم هەتا ماوم
هەتا ماوم لە مەیدانم
نە لەم دوو ڕۆژە بێهۆشم
بەڕووزەردی عەباپۆشم
لە بۆ ئەم ژینە داماوم
هەددەر بڕوا دڵ و گیانم

چواندم ڕۆژی خۆشی دڵ
لەگەڵ گوڵ یا لەگەڵ بولبول
ئەمێستاش خۆ فەوتاوم
گوڵی حەلقەی موریدانم
دەمێ شادم دەمێ خورپەم
لەگەڵ زولف و لەگەڵ پەرچەم
لەگەڵ شۆخێکی ئالاوەم
ئەزانم وەک شەهیدانم
بەبێ مەی مەست و بەربادم
شوکور فەوتاوە گشت یادم
لە دەست غونچەی نەپشکاوم
مەگەر بەم حاڵە سوڵتانم
نەجەم مابوو حوکمڕانی
نەما ئەم حاڵەتی زانی
دڵەی پەست و نەشێواوم
ئەڵێت خۆم یاری جارانم
لە سۆفی حەی حەیی و ئەڵڵاھ
تەواوی ناکرێ ئیکراھ
منیش لەم داوە وەک داوم
لەگەڵ دەرزی لە دوورمانم
ئەدوورم بەرگی ئازادی
لە بۆ عالەم بەدڵشادی
مەزانن من گەلێ خاوم
نەخێر رووحێکی کوردانم
توخوا کەی یاری خۆش دلبەر
مەدە لەم سینەیە نشتەر
وەها باشە گوڵی چاوم
ڕەحم کەی چونکە بورهانم



ئەم شیعرە لەسەر دەستووری بەندی چوارین دامەزراوە. بە کێشێکی ڕەوانی هەشت بڕگەیی باس لە هەست و نەستی ناوەوەی خۆی دەکا، ئەو سیفەتانە بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ کە لە ناو کۆمەڵدا پەسەند کراون. لەگەڵ ئەوەی هەندێ جاریش پێچەوانەی یەکترین بەڵام پایەی هەڵگریان لە ناو کۆمەڵدا بڵندتر دەکەن.

## پشیلەی ناو گرتووخانە

لە سەردەمی ڕاپەڕینەکەی بارزانییان لە ساڵی ١٩٤٥ جاهید لە لایەن دەسەڵاتەوە دەگیرێ. لە ناو گرتووخانەدا ئاشنایەتی لەگەڵ وەهاب ئاغای جندیان و حەمەد ئاغای مێرگەسۆر و برایم ئاغای کاولۆکان پەیدا دەکا. دیارە ئەوانیش بەناوی جموجۆڵی کوردایەتی گیرابوون. لە نیوەشەوێکدا پشیلەییێکی برسی لە گیراوەکان نزیک دەبێتەوە.
ئەم دیمەنە دەبێتە سەرچاوەی ئیلهام بۆ جاهید و ئەم شیعرە دادەنێ:

پشیلەییێکی وەک بەشەر خولقاو
لێمان هاتە ژوور بە میاو میاو
تەسلیم کرا دامنا لە ڕۆخم
ئەبێ بۆ ئەمە نەختێ بکۆخم
لە دەموچاوی گەلێ تێفکریم
ئەو هەڵبەستەیەم من لەوی کریم
پاشی مەرحەبا نانم دەرخوارد دا
زانیم برسییە بەحەقی خودا
گەلێ مەغدوورە گەلێ برسییە
شەریفی ئاشچی لێی نەپرسییە
وتم هەی فەقیر هەی بەستەزمان
میوانی ئەتۆ لای کاکە بورهان
من زمانی تۆ لە کوێ پەیاکەم
بەکامە دوکتۆر دەردت دەواکەم
بۆ کامە حاکم دەردی تۆ بەرم
کێ بێ بخوێنێ قسە و دەفتەرم

هەزار محامی هەزار فەیلەسووف
لە تەشی ئەدرێ ئیمڕۆ وەکو سووف
هەزار مەلا وو هەزار خوێندەوار
فلسەکی ناکا ئیمڕۆ لە بازاڕ
هەزار خەریجی سانەوی و عالی
لە کون و قوژبن بۆ خۆی دەناڵی
هەزار کاتبی خۆش خەت و ئینشا
بوویتە غولامی چەلەبی و پاشا
ئیمڕۆ بێ پارەی هەتیوی بێ باب
لەشی ڕزیوە لە دەرد و عەزاب
حەپسخانەیە جێگە و مەسکەنی
لەسەر ئەو حاڵەش هەر پێئەکەنی
ئەگەر جارێکی ڕووی خۆی ترش کا
دەڵێن کفری کرد لە قاپی خودا
جا ئەی پشیلەی بێ چارە و زەلیل
کە تۆ وا هاتی بۆ لای من دەخیل
ئەتۆ بۆ زگت وا پەرێشانی
ئیمشەو میوانی برات بورهانی
شەرت بێ تێرت کەم برسیت نەهێڵم
وەها مەزانە لە تۆ بەفێڵم

جاهید لەم شیعرەدا لە ناگزووری کۆمەڵایەتی و دواکەوتوویی خەڵکی دەدوێ. دەسەڵات بەدەست کەسانێکەوەیە لە بەرژەوەندی خۆیان بەولاوە هیچی دیکە نابینن، فەیلەسووف و خوێندەوار نرخیان نییە. زانست و ئەدەب و هونەر بەهیچ ناچن. پارە و ناوی بێ ناوک مەبەسە، ڕۆشنبیر هەموویان لە خزمەت پاشا و چەلەبی و دەوڵەمەندی نەخوێندەواری دواکەوتوون. جاهید لەگەڵ پشیلە قسە دەکا، خۆی لەو کەسە بێهۆش و زۆردارانە جیا دەکاتەوە، بەپشیلە دەڵێ خۆشی دەوێ، ئەو شەوە میوانی ئەوە، زگی تێر دەکا، بەدڵسۆزییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکا، ئەمەی بەڕاستییە و فێڵ و فەنەری تێدا نییە.



**کوردایەتی**

لە شیعرێکیدا جاهید دەڵێ:

هەتاکەی ئاو و خاکی تۆ نەسیبی خوێن مژی خۆت بێ
هەتاکەی دوو یاری ئەغیار لەگەڵتا هەم دەم و جۆت بێ
هەتاکەی بەم خەیالاتە شەو و ڕۆژ ئاه و ڕۆ ڕۆت بێ
هەتاکەی دەست و پا وو گەردەنت بەسراوەیی کۆت بێ
هەتاکەی نایەڵی ئەم جەننەتە بێ ئاگر و سۆت بێ
هەتاکەی چاوی غەیرە هەر لە نان و لەززەتی دۆت بێ
بەخێری ئێوە غەیرە بوو بەخاوەن تۆپ و تەییارە
هەتیو و بێوەژنتان بۆ سواڵ لەم شار و ئەو شارە
فیکر کەن بێکەسینە بەس نەبێ ئەم کار و ئینکارە
بەسەرتان وەرگەڕێ یاخوا بەسە ئەم بەیع و بازاڕە
......
بەچاو ساغ و بەسەر ساغ و بەدەس ساغ و بەپێ ساغی
لە ناو ئەم نیشتمانەی خۆت لە ناو گوڵزار و ناو باغی
لە بۆ قرتاندنی گوڵ پێم بڵێ بۆ قەید و یاساغی
دز و جەردە ئەحەویێنن لە بۆی باڵێن و یاتاغی
......
وەتەن مەعنای بزانی بێ وەتەن نابی لە ژینی خۆت
بەیەک دوو مەرحەبای گەورە تەرک ناکەی سەرینی خۆت
هەوەس ناتباتە بەزمی ئەو بەجێ نایێلێ شینی خۆت
بەسە تیماری بێگانە تیمارکە تۆ برینی خۆت
......
لە کام بێگانە سەندت تۆ ئەدەب غەیری قسە و پارە
لە کامە ئەجنەبی سەندت لە بۆ دەردت دەوا و چارە
هەتا ئیمڕۆ بزانە چیت بەسەرهات چیت دی لەم کارە
وەرە ڕێگای سەلامەت بەسیەتی ئەم شەرم ئەم عارە
......

گوڵی خۆت لێ نەکا باییێکی تر خۆت بۆنیکە چاکە
هەتاکەی غەیرە غەسبی کات لە دەستت عەردی وا پاکە
بەسە غەیرە بکێڵێت و بچینی ئەم زەوی و خاکە
ئەسەف ئەم کوردە هەردەم وا غورووڕ و مەست و بێ باکە
......
برایێکین برایینە هەموو یەک دین و ئایینین
ئەگەر یەکتر بحوبێنین لە پێش چاو خۆش و شیرینین
بەسە ئەم هەندە موحتاجی خەراباتی ڕق و کینین
هەموومان چاوەنۆڕی ڕۆژەکێن ناوی بەجێ بێڵین
هەتاکەی نایەڵی ئەم جەننەتە بێ ئاگر و سۆت بێ
هەتاکەی چاوی غەیرە هەر لە نان و لەززەتی دۆت بێ

ئەم شیعرە لەسەر بنچینەی بەندی شەشین (شەش نیوە دێڕ شیعر) دامەزراوە، دوو نیوە دێڕ شیعری دوایی لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەبنەوە (ا ا ا ا م م، ب ب ب ب م م، جـ جـ جـ جـ م م...). لەم شیعرەدا جاهید ڕووی قسەی کردۆتە میللەتی کورد، لە لاییێک سەرزەنشتی دەکا و لە لاییێکی دیکەوە ئامۆژگاری دەکا. لایەنە ڕەشبینییەکانی ژیانی کوردەواری بۆ دەگێڕێتەوە، باس لە دواکەوتووییان دەکا، بەشان و باهووی سروشتی کوردستان هەڵدەڵێ. ئەو خاکە ڕەنگینەی شایانی ئەوە نییە وا بەدواکەوتوویی بمێنێتەوە، ڕۆڵەکانی لە خەودا بن، خەڵکی دیکەش هوشیارانە مەدەنییەت بۆ خۆیان دروست بکەن. بەلای شاعیرەوە کورد نووستووە و هەوڵ دەدا لە خەو هەڵیسێنێ.

## مەی و مەیخانەی جاهید

لە شیعرێکیدا جاهید دەڵێ:

تێکە لە بۆ من کەم کەمە شەراب
دڵم حازرە بۆ مەزە و کەباب
مەڵێن بۆ ڕەنگی بادە سوور ئەکا
گەلێ شەرمنە لێم ئەکا حیجاب
من بەیەک دوو قوم تێناگەم لە مەی
بەیەک دوو پێکان تێر نابم جەناب



مەی من دایم لە مەی خواردنە
تاکو ڕەحەت بم لە دەرد و عەزاب
دڵی شێواوم ڕۆژێ سەد کەڕەت
ئەچێتە بەحری غەم و ئیزتیراب
لۆمەمان دەکا عالەمی بێهۆش
ئاگای لە چییە لێ دەدا ڕەباب
لە ڕۆژی مەحشەر زۆر چاک دەبینین
کامەمان دەچین بۆ تەحتەلسەراب
گەر مەلەک هاتن لێم بکەن سوئال
بەڕاستی و مەستی باش ئەدەم جەواب
کاکە (جاهید)تان زۆر بێ گوناهە
بێ مەی و بادە نابینرێ حساب

جاهید بەشێکی زۆری ژیانی بەمەستی و سەرخۆشی بردۆتە سەر، لەو باوەڕەدا بووە سەرخۆشی هەموو ئێش و ئازار و مەینەتی ژیانی لە بیر دەباتەوە. کاتی ناخۆشی لە ژیانیدا زۆر بووە، سەردەمی خۆشی کەم بووە. لەبەرئەوە ماوەییێکی زۆر لە ژیانیدا هاوڕێ و هاودەمی مەی و مەیخانە بووە. شاعیر ئەوەندە هۆگری سەرخۆشییە ئامادەیە دڵی خۆی بکا بەکەبابی مەزە، هەروەها ڕەنگی مەی سوورە چونکە شەرم لە شاعیر دەکا. بەجامێک و دوو جام تێر نابێ، چونکە دەردی زۆرە و برینی پڕ لە ئێش و ئازارە.

## هەولێر

جاهید قەسیدەییێکی درێژی هەیە بەناوی «هەولێر»ەوە، بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

قەڵەم بنووسە باسێکی هەولێر
تا لە دەس منی ئەی کاکی دلێر
ئەم شارە شاری شاه و سوڵتان بوو
ژیا لە ناوی بەهەزاران نێر
ئەم شارە شاری بت و سەنەم بوو
دەورەی درا بوو بەپڵنگ و شێر

ئەم شارە شاری سەخا و کەرەم بوو
شارێکی دڵ گیر و پڕ لە زیو و زێڕ
سوڵتان موزەفەر لەم شارەدا بوو
کە سوڵتانێک بوو بێ نەفس و چاوتێر
پێغەمبەر لە ناو گشت ئەم عالەمە
تەشریفی هاتە خەونی کردی فێر
کە ڕزگاری کات لە دەس کافران
گوێ بگرە شیعرم هەولێر! دێڕ بەدێڕ

لەم بڕە شیعرەدا وەسفی هەندێ ڕووداوی مێژوویی شاری هەولێر دەکا. شاری سوڵتان موزەفەرەدینی گۆگبەری بووە، لە پێش ئیسلام بت و سەنەمی لێ پەرستراوە. شاعیر هەوڵی داوە ناوەرۆکی ئەو خەونە بگێڕێتەوە کە سوڵتان موزەفەر دیویەتی. پێغەمبەر هاتۆتە خەونی و پێی وتووە چەند کافرێک ژێر زەویان کۆڵیوە و دەیانەوێ لەشی پێغەمبەر لە ناو گۆڕدا لە شاری مەدینە بدزن. جاهید لە شیعرەکەدا بەردەوامە و دەڵێ:

گەورە خەریکی پوول و ئانەیە
مل ئەستوور ئەکا زەنگینەکانمان
نە شێخ نە مەلا هۆشی لە خۆیەتی
بەخوا زۆر حەیفە هەولێری گران
هەموو بۆ ڕوتبە و معاش کار ئەکەین
بەپوول و پارە ئەفرۆشین دینمان
ناڵێن با لەسەر ئەم زاتە پاکە
مزگەوتێ بکەین بۆ مێژووی زەمان

لە پاش خەونەکە سوڵتان موزەفەر خۆی و هەندێ لە یاوەرانی ڕوو دەکەنە مەدینە. بۆیان دەردەکەوێ چەند کافرێک لەمێژە ژێر زەوییان کۆڵیوە بۆ دزینی لەشی پێغەمبەر بەڵام هێشتا نەگەیشتبوونە گۆڕەکە. ئەو تاوانبارانە دەگیرێن و لە سێدارە دەدرێن. ئیتر لەو ڕۆژەوە بەهۆی ئەم کارەی سوڵتان موزەفەرەوە هەموو ساڵێک لە ڕۆژی لە دایکبوونی پێغەمبەر ئاهەنگ دەگێڕدرێ بەناوی مەولوودەوە، ئەم نەریتە لە دواییدا لە هەموو وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاوبووەوە.



ئینجا شاعیر گلەیی دەکا، بەلایەوە خەڵکی بەتەنگ شارەکەیانەوە نین و بایەخێکی ئەوتۆیان بەگۆڕی سوڵتان موزەفەر نەداوە. لە گلەییەکانی بەرامبەر بەدواکەوتوویی هەولێر بەردەوامە و لەم لایەنەوە دەڵێ:

لە دەس حاڵەتی هەولێری نازدار
گەلێ غەمگین و زۆر خەفەتبارم
ئەم نیشتمانەی وا کۆن و بەناو
بەنرخ و بەتام خۆش و ئاودارم
تاکەی بێکەسی و بێ سامان بژیت
تاکەی کاول بی ناوچەی بازاڕم
تاکەی منداڵمان بێ عیلم و ئەدەب
بەڕەڵڵا ببی نێتە هاوارم
تاکەی بێ کۆمەڵ بخوێنین ژیان
تاکەی بڕزێتن ئێسک و دەمارم
قەرز و قومار و شەراب بەس نەبی
ئەم تەرزە کارە نابیتە کارم
شاعیر و ئەدیب جگەری سووتا
هەموویان کەوتن لە ژێر دیوارم
حەیفە سەد حەیف بۆ ئەم میللەتە
کە چارەم ناکات زۆر برینداڕم

شاعیر غەمبارە چونکە هەولێر پشتگوێ خراوە، غەمخۆری نییە، کاول بووە، منداڵی لە ئەدەب و زانستی دوورە. ئەوی ڕاستی بێ هەولێر لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە شارە دواکەوتووەکانی کوردستانی عیراق بوو. خەڵکەکەی بەتەنگ پێشکەوتنی شارەکەیان نەبوون. جۆرە نەریتێکی دواکەوتوو لە ناوەوە بوو ڕێگەی لە پێشکەوتن گرتبوو، بەتایبەتی لە بارەی مافی ژنان و خوێندنی قوتابخانە، هێشتا هەندێ نەریتی کۆنی دەرەبەگی دواکەوتوو لە ناوەوە مابوو.

ئینجا شاعیر باس لە کردەوەی ناپەسەندی دەوڵەمەند و کاربەدەستان دەکا:

پاشام خۆت بگرە تا ڕۆڵەكانت
ئەبن بەپیاو لەم چەند ڕۆژانە
ئەوسا ئەو عەردە بفرۆشە بۆ خۆت
پارەی سەرف كە بۆ دیوەخانە
بدە قاورمە و شفتی و شێخ مەحشی
قوزەڵقورتت بی عەینی سندانە
چونكە بەناهەق ئەم عەردە پاكە
كەوتۆتە دەستت بێ پوول و ئانە
ئەخۆی ئەزانی لێ ئەدەی دەعیە
بەڵام تەمەعكار هەر پەشیمانە
لەسەر گۆڕەكەت ڕۆژێک بە ئەشعار
ئەنووسرێتەوە لەعنەت لەمانە

شاعیر ئەوە دەردەبڕێ دەوڵەمەند و كاربەدەستانی شار تەنیا خەریكی خۆیان بوون، لە پێناوی چاكەی خۆیان خەڵكی هەژار و بێ نەوایانیان دەڕووتاندەوە. بەڵام جاهید لەوە دڵنیا بووە ئەم كارە هەتا هەتایە بۆیان ناچێتە سەر، ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕووڕەش دەبن و خۆیان و كردەوەیان دەچنە ناو گۆڕەوە.

جاهید بەم دێڕانە كۆتایی بەشیعرەكەی دێنێ:

قەڵەم بنووسە باسێكی هەولێر
تا لە دەس منی ئەی كاكی دلێر
بنووسە قەڵەم داخی گرانم
بۆ ئەم عالەمە قەزات لە گیانم
نە دوختۆر هۆشی ماوە لە نەخۆش
نە حاكم گوێچكە ئەدا قسانم
نە فەقێ ئاگای لە دەرس و عیلمە
نە مەلا باری سووكە لە شانم
مەلا نووزە نووز ئەكات بۆ زەكات
فەقێش هەر چاوی لە یەک دوو نانم



غەیرە بۆ مانگ و مەریخ ئەڕواتن
منیش پارەیە هەموو ئیمانم
ئێمە بەم حاڵە ناگەینە ئامانج
بورهانی ڕۆژم زۆر چاک ئەزانم
بچووكی هەموو كورد و ئیسلامم
بەشوهرەت (جاهید) بەناو بورهانم

شاعیر باس لە ئاژاوەی ناو كۆمەڵ دەكا، كار لە كار ترازاوە، كەس خەریكی كار و كردەوەی خۆی نییە، پزیشک و دادوەر و فەقێ و مەلا و هەموو خەڵكی كەس بەكەس نییە. لای ئێمە ئاژاوە و وێرانەیە كەچی خەڵكی دیكە وا لە ڕێگەن بەرەو مانگ و مەریخ دەڕۆن. لای ئێمە هەموو شتێک پارەیە، لە دواییدا جاهید خۆی بەبچووكی هەموو كوردێک و ئیسلامێک دەزانێ.

## ڕەخنەی كۆمەڵایەتی و داشۆرین

لە ڕۆژگارێكی فەرمانڕەوایی مەلیكی عیراق نەجمەدین سائیب موتەسەریفی هەولێر بووە. لەو سەردەمەدا شار لە بارودۆخێكی ناخۆش بووە. بەم هۆیەوە جاهید شیعرێک دەهۆنێتەوە و لەسەر كاغەز تۆماری دەكا و لەسەر دیواری سەرای هەولێر هەڵیدەواسێ. بەیانی كاربەدەستان چاویان پێی دەكەوێ جاهید لەسەر ئەو كارە دەگرن و دەیخەنە گرتووخانەوە.

لە شیعرێكیدا جاهید دەڵێ:

بازاڕی فەلەک چەوتە بەفلسێ نییە ئەشعار
مەیدانی عەقڵ بۆتە تەویلەی كەر و كەردار
زیندانە مەقامی عوقەلا ژێر دەستی غەددار
ئیتر بە چ نەوعێ بكەن ئەم عالەمە هاوار!
قەسسابی سەری میللەتە حوككامی زەمانە
جەللادی كەسی بێكەسە پۆلیس و شەبانە
لێمان ئەستێنن بەهەوەس باج و سەرانە
ئیتر بە چ نەوعێ بكەن ئەم عالەمە هاوار!

قانوونی عوقووباتە مەگەر ئالەتی ئەزیەت
دانراوە لە بۆ مەنفەعەتی مامە حوکوومەت
شێواوە لە دەس زوڵمی هەموو میللەت
ئیتر بە چ نەوعێ بکەن ئەم عالەمە هاوار!

عالەم لە هەموو لاوە بریندارى جەفایە
مەعلوومە کە ئەم چەرخە چ بێ ڕەحم و وەفایە
ئەم کارە چ کارە چ عەزابە چ بەڵایە
ئیتر بە چ نەوعێ بکەن ئەم عالەمە هاوار!

(جاهید) لە دەر و دەشت و بیابانە هەموودەم
شیعر و غەزەلی زینەتی ئینسانە هەموودەم
بوێژێکی وەتەنپەروەری کوردانە هەموودەم
ئیتر بە چ نەوعێ بکەن ئەم عالەمە هاوار!

ئەم شیعرە لەسەر دەستووری بەندی چوارین دانراوە، هەر بەندی لە چوار نیوە دێڕ پێکهاتووە (ا ا ا م، ب ب ب م، جـ جـ جـ م...). ئەو ڕەخنانەی جاهید لە کاربەدەستانی حوکوومەتی عیراقی گرتووە لەو سەردەمەدا کەم کەس ئەو ئازایەتییەی تێدا بووە بوێرێ قسەی وا بکا. جاهید کاربەدەست بەزۆردار و قەساب و ئۆردیان ناودەبا. قانوون بۆ ئازاردانی خەڵکی بێ تاوان و چاکەی دەوڵەمەند و کاربەدەستان دانرا بوو.

### دانایی

لە شیعرێکی دانایی فەلسەفە ئامێزدا بەناوی «غەزەلێکی خەیالی» جاهید دەڵێ:

خەیالاتی دڵی تەنگم لە دونیاما لە یەک پێکە
بفەرما چاوەکەم ساقی هەتا ئەتوانی بۆم تێکە
عەمامە و جوببە پۆشم دی نەیانتوانی بدەن فەتوا
بەڵام مەست و خەراباتی هەموو فەتوایەکەی ڕێکە
لە عیلم و تەجریبەی دونیا شەهادەم سەند بەبێ باکی
قوتابی مەدرەسەی غەم بووم دڵم لەم چەرخە بەینێکە
بەعیلمی نەفس و کەف نادەم عولوومی بادەنۆشی خۆم
هەموو عیلمی بەشەر لای من خولاسەی ئەلف و عەینێکە



شەرارەی ئاتەشی سەودام بگاتە پووشی حوسنی یار
لە سووتانی نەترساوم ئەویش هەر ڕووی موعەللێکە
تەریقەت بێ شەریعەت بێ ئەبەد ناگەیتە ئەنجامی
ئەگەر شێخ و ئەگەر دەروێش لە بۆ خوا عەینی عەبدێکە
لە (جاهید) وەرگرن دەرسی عولوومی دین و دونیاتان
مەڵێن بێ دین و بێ فیکرە کوڵاوی دەرسی عەشقێکە

لەم شیعرەدا جاهید هەندێ زاراوەی فەلسەفە و دانایی و عەشقی حەقیقی و شەرابی کردگاری تێکەڵ بەیەکتری کردووە، حەقیقەت و مەجاز بەچاوێک تەماشا دەکا، ڕیالیزم و میتافیزیک لە تەرازوویێک دەکێشێ، ئەوجا لە دواییدا شەریعەت و تەریقەت لەگەڵ یەکتریدا دەگونجێنێ. کاملی ئادەمزاد لەوەدا دەبینێ لە هەردووکیان بێ، هەرچۆنێ بێ شاعیر توانیویەتی ئەم هەموو تەنگوچەڵەمە و پرسانەی دژ بەیەکترین بیانخاتە چوارچێوەی لیریکێکی جوانەوە.

### چوارین

لە دیوانی جاهیددا هونەری چوارین جێگەیێکی تایبەتی هەیە، تەنیا بایەخی بەم جۆرە شیعرە نەداوە، بەڵکو کۆمەڵێک لە شیعری دیکەی لەسەر دەستووری بەندی چوارین داناوە. لەبەرئەوە جاهید لە ئەدەبی کوردیدا وەک پسپۆڕێکی هونەری چوارین دەکەوێتە بەرچاو.

١

لە چوارینێکیدا بۆ ئەو کەسەی تەنیا بیر لە خۆی دەکاتەوە دەڵێ:

حاڵی نەخۆشێک ناپرسێ جارێک
بۆ ڕووت و هەژار هەڵناگرێ بارێک
مەجلیس و بەزمی لەگەڵ پارەیە
نایێتە یادی سوحبەتی یارێک

٢

بێزاری جاهید گەیشتۆتە پلەیێک ئاواتەخوازە هەموو شتێک بوایە، تەنیا ئادەمزاد نەبوایە:

بریا وەک جاران هەر بێ خەبەر بام
مەڕ بام مالآت بام لە ناو لەوەڕ بام
دێو بام دەعبا بام نەوەک بەشەر بام
بێ ماڵ و حاڵ بام هەر دەربەدەر بام

٣

شاعیر وا هەست دەکا لە ژیانی ئادەمزاد پچڕاوە، هاودەمی تەنیا غەم بووە و هاوڕێی ڕاستەقینەیەتی:

چەند ساڵان گەڕام سووک و ڕیسوایی
بێ یار و هاودەم تاک و تەنیایی
تەنیا هەر غەم بوو یار و ئەنیسم
هۆگرم بووبوو زۆر بەسانایی

٤

بەلای شاعیرەوە پیاو پێش هەموو شتێک پێویستە نیشتمانپەروەر بێ، ئینجا ئاگاداری پەروەردەکردن و پێگەیاندنی ماڵ و منداڵی بێ:

سینەت هەدەفی تیری قەدەر کە
بۆ نیشتمانت خوێنت هەدەر کە
ڕۆژت مەچوێنە بەخەیاڵی خاو
منداڵی ساوات بەس دەربەدەر کە

٥

بەلای شاعیرەوە خۆشی لە ناخۆشییەوەیە، ئەگەر زستان نەبێ بەهاریش نابێ:

سەیری بوهار کە چەند خۆش و جوانە
سەیری زستان کە چەند قورس و گرانە
بێ زستان بوهار گیای سەوز نابێ
ئەمە ئەحکامی دونیا و زەمانە



٦

بەلای شاعیرەوە قسەی بێ مانا نەبێ چاکترە، هەموو کەسێک ئەگەر شوێنی خۆی لە کۆمەڵدا دیاری نەکا، وەکو ئەو کەسەیە دەهری بێ و باوەڕی بەهیچ کردگارێک نەبێ:

قسەی لابەلا کە سوودی نەبێ
وەکو ناوێکە وجوودی نەبێ
ئینسان کە هات و جێی خۆی نەناسی
وەک مەخلووقێکە مەعبوودی نەبێ

٧

شاعیر دەڵێ مەرجی سەرەکی خواناسی ئەوەیە ڕەوشتت پاک بێ و بەڕاستی خوا بناسی:

ئەگەر مەسیحی ئەگەر موسوڵمان
هەموو خوڵقاون هەموو عەبدی خوان
دیانەت یەعنی ڕەوشتت پاک بێ
بەدڵێکی ڕاست بناسی یەزدان

٨

بەلای جاهیدەوە پیاو ئەو پیاوەیە بەگژ زۆرداردا بچێ نەک هەژار بڕووتێنێتەوە:

ئەگەر ئەترسی تۆ لە عەیب و عار
پەلامار مەدە بەڕووت و هەژار
ئەگەر خەریکی غیرەت بنوێنی
پەلامار بدە بەکەسی زۆردار

٩

شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە پیاو دەبێ ڕاست بێ. دەروێشی لەسەر ڕاستی دامەزراوە، پیاو ئەوەیە بەخۆیەوە بنازێ نەک بەباب و باپیرانی.

کەشف و کەرامەت لە ئیحتیرامە
شێخی بێ حورمەت ڕەنجی حەرامە

کــردەوەت باش بێ بەکــەس مــەنازە
تۆ چ دەخلێکت بەخـــاڵ و مـــامـــە

**تاک**

لە دیوانی جاهیددا هەندێ تاک بەرچاو دەکەون.

لە تاکێکیدا دەڵێ:

عاقیبەت ئەرزێ لەشم هەرچەند بەنازی گەورەکەم
خزمەتی زگ چەند بکەم موحتاجی یەک نانم دەکا

مـانـای ئەم تاکـە لە دانایی شـیـعـری کـلاسـیکی نەتەوەکـانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەرگیراوە. لەش هەرچەندە خزمەتی بکەی ئەنجامی لەناوچوونە، زگیش هەرچی بۆ بکەی پڕ نابێ.

***

بورهان محەمەد عەبدولڕەحمانی دۆغرەمەچی لە شیعردا ناسراو بە«جاهید» یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی ناوچەی سۆرانی هەولێر. ژیانێکی سەختی پڕ لە نائومێدی تووشی مەی و مەیخانەی کردووە، لە ژیانیدا بەزۆری سەرخۆشی بەخۆیەوە دیوە، بەڵام ئەوە هەیە زیانی بۆ کەس نەبووە، ئەگەر هەیبووبێ بۆ خۆی بووە.

جاهید ئاگاداری شیعری کلاسیکی کورد بوو، لە ئەنجامی خوێندنەوەی شیعر و لە ژێر کـاریگەری جەبار ئاغـای کـانی مـامی چێـژ و خـەیاڵی ڕۆمـانـتـیکی لە لا دروست بووە. نوێکردنەوەی شیـعری کـوردی لە لای جـاهید لە قـاڵبی شیـعـری کـلاسیکی عـەرووزی و شیعری سیلابی خۆماڵی جووت قافیە (مەسنەوی) بووە. گیروگرفتی ڕۆژانەی سیاسی و کوردایەتی و کۆمەڵایەتی و هەندێ خاسیـەتەکانی کۆمەڵی هەولێر لە شیـعریدا ڕەنگیان داوەتەوە. سەرەڕای ئەمانە جاهید بەشیعری گێتیی مەستی و سەرخۆشی ئەدەبی کوردی دەوڵەمەند کردووە.

## بەشی بیست و شەشەم

## مەدهۆش

**١٩١٩ - ١٩٩٤**

### ژیانی

محەمەد عەلی کوڕی محەمەد ساڵح کوڕی محەمەد قوربانی لە ساڵی **١٩١٩** لە سلێمانی لە دایک بووە. لە زگی دایکی بووە کە باوکی مردووە. دایکی بەخێوی کردووە. لەو کاتەی هەستی بەشاعیرییەتی خۆی کردووە نازناوی «مەدهۆش»ی هەڵبژاردووە. لە ناو خەڵکی بە حەمەعەلی مەدهۆش ناسراوە. ژیان و شیعری لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا خاسیەتی تایبەتیی خۆیانیان هەیە. لە ژیانیدا مووچەخۆری نەکردووە، خاوەنی پیشەی بەرگدروویەتی بووە، لە شیعردا بەرهەمێکی داهێناوە لە ئەدەبی کوردیدا نوێیە.

لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دایکی دایناوەتە بەر خوێندن لە حوجرەی مزگەوت. بەئێواران حەڵوای گەزۆ و کۆلارەی لە کاغەز دروستکراوی دەستی خۆی بەمنداڵانی گەڕەکی فرۆشتووە. لە پاشانا بووە بەشاگرد لە دوکانی حەمەسەعیدی خەیات و فێری پیشەی بەرگدروون بووە. بەمە بەشێ خوێندن و ماوەیێکیش بەشەو لە مزگەوتی شێخ ئەمین لە گەڕەکی دەرگەزێن لای کاکە مەلای پاوەیی لەگەڵ فەقێکانی خوێندوویەتی. هەندێ زانیاری لە بابەت ئەدەبەوە لەو فێر بووە. لە پاشانا لە قوتابخانەی زانستیی شەوان خوێندوویەتی. لە کۆڕی ئەدەبی شەوانی سێشەموان بەشداری لە شیعر خوێندنەوەدا کردووە. بەهەوڵ و کۆششی خۆی لە ڕووی خوێندەوارییەوە پێگەیشتووە ئینجا دوکانی بەرگدروویەتی بۆ خۆی داناوە، قوماشی لە بەغداوە هێناوە، گوزەران و هەڵسوکەوتی دارایی باش بووە. دوکانەکەی بووە بەیانەی شاعیر و ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی سلێمانی، کەسانی وەکو فایەق بێکەس و بەختیار زێوەر و شاعیرانی دیکە هاتوچۆیان دەکرد.

لە ساڵی ١٩٤١ لە ترسی هەراکەی ڕەشید عالی گەیلانی مەدهۆش لەگەڵ دایکی چوونەتە هەڵەبجە، لە پاشانا بەغدا کە هەندێ هێور بۆتەوە گەڕاونەتەوە سلێمانی. لە ساڵی ١٩٤٨ لەسەر بیری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی گیراوە، ماوەیێک لە



بەندیخانەی ناوەندی بەغدا بووە ئینجا لە دوای ئازادبوون گەڕاوەتەوە سلێمانی. دایکی لە دوای ماوەیێکی زۆر بەسەر مردنی باوکی تێپەڕیوە لە ساڵی **١٩٥٩** کۆچی دوایی کردووە. ئەم دایکە دەوری گرنگی بووە لە پێگەیاندنی مەدهۆش، جگە لەوە لە ئەدەبدا گەلێ شتی لێ فێر بووە، چونکە ئەو دایکە لەگەڵ ئەوەی نەخوێندەوار بووە کەچی سەرچاوەی ئەدەبی میللیی سەرزار و قسەی نەستەق و پەندی پێشینان بووە.

لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا مەدهۆش چەند جارێکی دیکەش لەسەر سیاسەت گیراوە. لە دوای کوودیتا فاشستییەکەی ٨ی شوباتی **١٩٦٣**ی بەغدا لە دوکانی بەرگدروویەتی و بازرگانی قوماش زیانی لێ کەوتووە. قەرزێکی زۆر بەسەریدا بووە بەماڵ، ناچار سلێمانی بەجێ هێشتووە و ڕووی کردۆتە بەغدا؛ لەوێ دوکانی بەرگدروویەتی داناوە. ئەمجارەیان بووە بەبەرگدرووی ژنان. قازانجی زۆر بووە و گوزەرانی باش هەڵکەوتووە، بەهۆی خوێندنی منداڵەکانی لە زانستگای بەغدا ناچار بووە جارێ لەوێ بمێنێتەوە، لە پاشانا گەڕاوەتەوە سلێمانی و خانووی کڕیوە و دەستی کردۆتەوە بە بەرگدروویەتی. لە ساڵانی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکان لە سلێمانی لە دوورینی بەرگ نەکەوتووە و زیاتریش خەریکی ئەدەب بووە تا لە ڕۆژی **٢٦**ی شوباتی **١٩٩٤** لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

### شیعری

مەدهۆش خۆی مامۆستای ڕاستەقینەی خۆی بووە و کردوویەتی بەخوێندەوار. دەوروبەر هەلێکی لەباری بۆ ڕەخساندووە. لە پێش هەموویانا دایکی شارەزای ئەدەبی میللیی سەرزاری کوردی بووە. خزم و کەسوکاری دایکی هەندێکیان شاعیر بوون وەک نەجمەدین مەلا، مەلا سەعدی، ئەخۆڵ، کامەران موکری، میرزا غەفوور، مەلاحەسەنی قازی (شاهۆ). هۆگری خوێندنەوەی دیوانە کوردییە چاپکراوەکانی ئەو ڕۆژگارە بووە، بەتایبەتی دیوانەکانی بڵاوەخانەی کوردی - مەریوانی لە چاپیان دابوو. لەگەڵ ڕۆژنامەی «ژین» پێوەندی هەبوو. پیرەمێرد لە ئەدەبدا ڕێبەری بووە و دەستی گرتووە، لە ساڵی ١٩٤٠ بۆ یەکەمین جار لە «ژین» شیعری بۆ بڵاوکردۆتەوە. لە ناو شاعیراندا شیعری پیرەمێرد و کەمالی و گۆرانی بەدڵ بووە.

## شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

مەدهۆش ئەگەر شیعری کێشی میللیی خۆماڵی و شیعری نوێی نەووتایە، لە شیعری عەرووزیدا دەبوو بەتازەکەرەوەی کلاسیک. لەو جۆرە شیعرەدا وەستا بوو، بەحری عەرووزی و یەکێتیی قافیەی بەکارهێناوە بۆ مەبەس و ناوەڕۆکی تازە. ئەم جۆرە شیعرەی زۆر لە بابەتەکانی دیکەی کەمترە. ئەوەی هەیەتی هەمووی دەچێتە ناو لیریکەوە، خۆی لە قەسیدە (شیعری درێژ) لاداوە.

بەشی زۆری شیعری لە بابەتی کێشی سیلابی میللیی خۆماڵییە، لەمەدا زیاتر کێشی دە بڕگەیی بەکارهێناوە، هەشت بڕگەیی هەیە و لەو کەمتر حەوت بڕگەییە. لە شیعری نوێدا چەند لیریکێکی هەیە لە یەک کێش و یەک قافیە زیاتر لە تاکە شیعرێکدا بەکاری هێناوە. هەندێ لە هونەرەکانی شیعری کلاسیکی بەڕوخسار کۆن و بەناوەڕۆک تازە لە شیعریدا دەبینرێ وەکو: قەسیدەی پێنجین بەقافیەکانی (ا ا ا ا ا) و (ا ا ا ا ب)، قەسیدەی شەشین بەقافیەی (ا ا ا ا ب ب). جگە لەمە تەرجیع بەند لە دیوانیدا بەرچاو دەکەوێ: پێنج پارچە غەزەل، هەریەکەی حەوت نیوە دێڕ، نیوە دێڕی دوایی لە هەموویاندا دووبارە دەبێتەوە. لەگەڵ ئەمانەدا مەدهۆش پێنج خشتەکی هەیە لەسەر شیعری ئەدەب (میسباح) و ئەخۆل و کەمالی.

بەشێکی زۆر لە شیعری لە بابەت نەورۆز و سەیران و بەهارەوەیە، ئەمەی بۆ ئەوە بووە کچی جوان بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ببن بەهەوێنی شیعری. بەشێکی زۆر لە شیعری بەم ناوانە بڵاوکراونەتەوە: «نەورۆز»، «نەورۆزنامە»، «بەهار و سەیران»، «گوڵباران»، «هەمیشە بەهار». بەهۆی بەهار و نەورۆزەوە لە سالانی ١٩٤٠، ١٩٤٦، ١٩٥١، ١٩٥٧، ١٩٦٩، ١٩٧٠، ١٩٧٦ شیعری هۆنیوەتەوە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

لەگەڵ ئەوەی بنج و بناوانی شاعیرییەتی مەدهۆش لە بەهرەی سروشتی و زگماکی خۆی هەڵقوڵاوە، دەوروبەر یارمەتییێکی زۆری داوە شاعیرێکی چاکی لێ هەڵبکەوێ. لە شیعرە دڵدارییەکانیدا شاعیر لەگەڵ هەست و نەست و دەروون و خەیاڵی خۆیدا ڕاستگۆ بووە، جوانی پەرستووە، لە پەیکەری ژندا دیویەتی، لە بزووتنەوە و خۆنواندن و ناز و فیزی مێیینەیانەیدا بەدی کردووە، تا گەیشتۆتە ئەوەی لە ژیانی بەغدایدا لە «شەقامی زێ» (شارع النهر)ی بەناوبانگ دوکانی بەرگدروویەتی بکاتەوە، بەڵام بەرگدرووی ژنان.



خودا خۆی دەیزانێ، هەروەها شاعیریش دەڵێ، چی لەو ژنانەی جلی بۆ دووری بوون فێر بووە! وەک لە خۆی بیستراوە بەمنداڵی ئەگەر حەزی کردبێ ببێ بەقوتابی بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا ببێ بەئەفەندی (مووچەخۆر) کەچی بوو بە بەرگدرووی مۆدەی ژنانەی ئافرەتانی سنگ و باڵ ڕووت.

ناوەڕۆکی شیعری مەدهۆش بەگشتی خەریکی دڵدارییە، دەچێتە خانەی ئەو شیعرە دڵدارییەی زەمینی پێ دەووترێ. خۆشەویستییێکە لە نێوان نێر و مێ، بۆنی ماچ و مووچ و دەست لە ملانێ و چوونە ناویەکی دڵدار و دلبەری لێ دێ. ئەم شێوازەی شیعری مەدهۆش لە دوو کۆمەڵە شیعری «دڵی کچان» و «دڵی کوڕان» ڕەنگی داوەتەوە. شاعیر بەتەما بوو لە پاشانا ئەگەر بۆی بگونجێ «دڵی پیران»یش چاپ بکا.

مەدهۆش لە شیعرە دڵدارییەکانیدا خاسیەتێکی هەیە وێنە لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەردەگرێ، بەزمانێکی ئاسان و ساکاری ناو خەڵک بەشێوەییێکی تازە دایدەڕێژێتەوە، خوێنەر دەتوانێ شیعری مەدهۆش بناسێتەوە چونکە شێوازی تایبەتیی خۆی هەیە. شاعیر گرفتاری هەموو ئەندامە وردە جوانەکانی دلبەرە، لە ناو ئەوانەدا لە هەموویان زیاتر لە مەمک و چاو دەدوێ، ئەمانە سەرچاوەی زۆرینەی شیعرەکانین. بەگشتی شاعیرێکی گەشبین بوو، وێنەی جوانی لە مێبازی و مەکری ژناندا هەیە.

پرسیارێکی گرنگ لە بارەی شیعری مەدهۆشەوە لە ناوەوەیە، دڵ و بیر پێوەندییان بەیەکترییەوە چییە و چۆن ڕەنگیان لە شیعری مەدهۆش داوەتەوە؟ دەکرێ بووترێ پێوەندییێکی ئەوتۆ لە نێوان دڵی شاعیر و ئەقڵییەوە لە ناوەوە نییە. مەدهۆش بەفیکر نیشتمانپەروەر و کوردپەروەر بوو، ئەنتەرناسیۆنالیست بوو، لەسەر چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵی دەکردەوە، لە دژی دەرەبەگی ناوەوە و ئەمپریالیستی ئەوروپا و ئەمەریکا بوو، بۆ ئەم ئامانجە بەپراکتیک سیاسەتی کردووە، ئازاری بەندیخانەی چەشتووە، کەچی ئەمە بەشێوەییێکی ڕوون لە بەرهەمیدا ڕەنگی نەداوەتەوە. ئەم دیاردەیە ئەوە دەگەیەنێ شاعیر دڵسۆزی سۆزی خۆی بووە، درۆی لەگەڵ خۆیدا نەکردووە، شاعیرێکی ڕەسەن بووە، وەکو خۆی دەڵێ لە پێشانا شیعری تەنیا بۆ خۆی وتووە، وای زانیوە شاعیر دەبێ شیعر بۆ خۆی و شاعیرانی دیکە بڵێ. بەهۆی دڵسۆزی و ڕاستگۆیی لەگەڵ خۆیدا شیعری بووە بەنموونەی داهێنانێکی ڕەسەن لە ئەدەبی کوردیدا.

لەوە گرنگتر لە مەیدانی دڵداریدا مەدهۆش لە ناو شاعیرانی کوردا سەرپشکە بەوەی

شێوازی دڵداری بەزمانی کچ و ژنەوە بۆ کوڕ و پیاو هێناویەتییە ناو ئەدەبی کوردییەوە. ئەگەر ئاماژەیێکی بچووک لە شیعری کوردیدا لەم لایەنەوە هەبێ، مەدهۆش ئەم لاپەڕەیەی ئەدەبی نەتەوەکانی گێتی کردووە بەقوتابخانە لە ئەدەبی کوردیدا. بەگشتی شیعری کلاسیکی کوردی خۆی خەریک نەکردووە هەست و نەستی کیژ و لاوی هەرزەی تازە نەمام بخاتە قالبی شیعرەوە، بەتایبەتی هەستی کچان و ژنان بەرامبەر بەنێرینە. مەدهۆش هاتووە هونەروەرانە ئەو هەست و نەستەی کیژۆڵە و ژنان بەدزی و نهێنییەوە بۆ یەکتری دەگێڕنەوە لە بابەت دڵدارییەوە خستوویەتییە قالبی شیعرەوە. ئەوی ڕاستی بێ نێرینە دڵداری دەکا، مێیینەش دڵداری دەکا، کەچی هەستی یەکەمیان چۆتە ناو شیعرەوە و سەرانسەری ئەدەبی کوردی داگیر کردووە، بەڵام ئەوەی ژنان، لەبەر هەر هۆیێک بێ نەهاتۆتە دی. مەدهۆش بەم جۆرە شیعرەی ئەدەبی کوردی دەوڵەمەند کردووە.

شاعیر لە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕی سیاسی ڕاست بووە، لە پێناوی ئەوەوە چۆتە بەندیخانە، هەروەها لە دڵداریشدا ڕاست بووە ئەمە لە بەرهەمی شیعریدا دەردەکەوێ، یەکەمیان لە دووەمیاندا ڕەنگی نەداوەتەوە.

شاعیر کە لە ژیاندا بوو هەمیشە شانازی بەو قسەیەوە کردووە نووسەری ئەم کتێبە پێی وتووە «ئەگەر لە نزیکەوە تۆم نەناسیایە هەرگیز باوەڕم نەدەکرد لەسەر سیاسەت گیرا بی». ئەمەی لە یادداشتی تایبەتی خۆی نووسیوەتەوە ڕاستییەکەی ئەمەیە حەقیقەتی مەدهۆش.

## پەخشانی

جگە لە شیعر مەدهۆش کۆمەڵێک چیرۆکی هەیە. چیرۆکەکان لە بنجدا دڵدارین، قارەمانە سەرەکییەکانیان کچن. نووسەر هەوڵی داوە لە دیاردەیێکی کۆمەڵایەتی بدوێ و لەگەڵ ماکی درامی تێکەڵ دەکا، هەندێ جاریش کوردایەتی تێدا دەکا. بڕێک لەو چیرۆکانە بوون بەسەرچاوە بۆ کۆمەڵێک شیعر، بەڵام ئەو چیرۆکانە وەک بەرهەمێکی ئەدەبی نرخی خۆیان ماوە.

زمانی شاعیر ساکارە، وشە و ڕستەی مانا لە ڕووە. زۆری بەسەرهاتەکان وەک خۆیان دەیانگێڕێتەوە. دەسکاری هونەری نووسەر لە پلەیێک دایە بەگشتی چیرۆکەکان لە نێوان چیرۆکی میللی (فۆلکلۆری) و چیرۆکی هونەری دەوەستن. ناوەڕۆکیان لە ڕووداوی ژیانی کوردەواری بەتایبەتی ژیانی شار هەڵقوڵاوە.

نموونەی هەندێ چیرۆکی مەدهۆش لەمانە بەرچاو دەکەون.



١- چیرۆکی سەرگوڵ

هەندێ لە ژیانی تایبەتی مەدهۆش لەم چیرۆکەدا ڕەنگی داوەتەوە. سامان و دلێر دوو هاوڕێ بوون، باوکی دلێر دەوڵەمەند بووە، دلێر بۆ خوێندن چۆتە بەغدا. پێش ئەوە حەزی لە سەرگوڵ کردووە، ئەمەش ئەوی خۆشویستووە. دلێر لە بەغداوە بۆ خوێندن دەچێتە ئەمەریکا، لەوێ جوولیێت دێنێ و دەگەڕێتەوە سلێمانی. ژیانی ئەم شارە بەجوولیێت خۆش نابێ. لە کۆمپانیای نەوتی کەرکووک دادەمەزرێ و ماڵیان دەچێتە ئەوێ. بۆ ئاهەنگی کۆنسێرتێک دلێر و جوولیێت هەردووکیان دەچن بۆ بەغدا، لە ئاهەنگەکە نێوانیان تێک دەچێ، ماڵ جیا دەکەنەوە، دلێر دێتەوە سلێمانی و جوولیێتیش دەگەڕێتەوە ئەمەریکا.

سامان لە کاتی خۆیدا حەزی لە سەرگوڵ کردبوو، بەڵام سەرگوڵ مەیلی بۆی نەبوو. دلێر کە گەڕایەوە سلێمانی سەرگوڵ لە ڕقی پێوەندیی نێوان دلێر و جوولیێت ئەوە دەردەبڕێ کە حەزی لە سامان کردووە. سامان ئەوە دەزانێ سەرگوڵ دڵی بۆی نەچووە، بۆیە ئەوە بۆ دلێر ڕوون دەکاتەوە کە ئەویش وازی لێ هێناوە. بەم جۆرە دلێر بەسەرگوڵ شاد دەبێ.

سامان کەسێک بوو خەریکی سیاسەت بوو، لە ئاهەنگێکدا بەرەی دوو ڕێکخراوی سیاسی دژ بەیەکتری لێ بووە، یەکێک هێرشی بردۆتە سەر سامان، نەسرین ناوێک لەسەری کردۆتەوە، سامان لەگەڵ ئەو نەسرینە حەز لە یەکتری دەکەن. دلێر بۆ ڕابواردنی سەرچنار بانگیان دەکا، بۆ ڕۆژی دوایی سامان لە لایەن پۆلیسەوە دەگیرێ چونکە ڕێکخراوە سیاسییەکەی دیکە ڕاپۆرتی لەسەر نووسی بوو، بەم هۆیەوە دەخرێتە گرتووخانەوە. دلێر بەخۆی و کۆڵێک دیاری و ئەموستیلەی زاوایەتی دەچێ بۆ گرتووخانە و لە پەنجەی سامانی دەکا و پیرۆزبایی لێ دەکا بۆ هاوسەریەتی لەگەڵ نەسرین.

٢- چیرۆکی ئاوات

قوتابییێکی عیراقی بۆ خوێندن دەچێتە تورکیا، لە ناو پاپۆڕی زەریای مەڕمەڕە ناسیاوی لەگەڵ یەڵمازی کچە تورک پەیدا دەکا. کە ئەو کوڕە لە کۆلێجی پزیشکی دەبێ بەقوتابی ڕۆژێکیان چاوی بەو کچە دەکەوێ ئەویش لەوێ قوتابییە. ئارەزوو دەکا خۆی لێ نزیک بکاتەوە، کچەکە خۆی لێ دەدزێتەوە. هەرچۆنێ بێ کچەکە گازینۆیێکی بۆ دەسنیشان دەکا لەوێ چاویان بەیەکتری بکەوێ. لە گازینۆ یەکتری دەبینن، کچەکە ئەوەی تێ دەگەیەنێ لەبەرئەوەی بێگانەیە ناتوانێ لێی نزیک بکەوێتەوە. چەند جارێک لەو گازینۆیە دەگەنە یەکتری. جارێکیان یەڵماز بەتەنیا نایە بۆ گازینۆکە بەڵکو ژنێک و

پیاوێک و دوو منداڵی لەگەڵدا دەبێ، ئەمانە دایک و باوک و خوشک و برای یەڵماز بوون. ئەم بنەماڵەیە کورد دەرچوون، لە بنجدا خەڵکی دیاربەکر بوون، لە ساڵی ١٩٣٨ ئاوارە کراون. ئەو کاتە لە شاری ئەدەنە دەژیان. کوڕە کوردی عیراق و کچە کوردی تورکیا دەبن بەدڵدار و دلبەر. زۆری پێ ناچێ کوڕەکە لە قوتابییەتی دەردەکرێ، بەتاوانی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی کوردایەتی. ناچار بۆ تەواوکردنی خوێندن ڕوو دەکاتە ئەوروپا. لەم ماوەیەدا کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا ڕوو دەدا. ئەمە بۆ کوڕە کوردەکەی ئەوروپا بوو بەدوو خۆشی، یەکەمیان ڕزگاربوونی عیراق لە فەرمانڕەوایی مەلیکی، دووەمیان ڕێی بۆ خۆش بوو دەست لە ملی یەڵماز بکا.

٣- چیرۆکی دڵ و گل

کۆمەڵێک ڕۆشنبیر لە سلێمانی گیرابوون، لە دواییدا ڕەوانەی گرتووخانەکانی هەولێر و مووسڵیان کردبوون. لەپڕ ڕۆژێک یەکێکی پەشۆکاویان فڕێ دایە ناو بەندییەکان. ناوی دارا بوو، بەم جۆرە بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە: دراوسێیان ماڵێکی دەوڵەمەند بوون، کچێکی ناشیرینیان هەبوو، کەچی بەهێی کارەکەریان زۆر جوان بوو. دارا بۆ خوێندن ڕووی کردە بەغدا، لە ماوەی خوێندنیدا ماڵیان گواستبووەوە. کە لە پشووی نیوەی ساڵ گەڕایەوە سلێمانی بەهێ لە ماڵیان بوو. لە ماڵە دەوڵەمەندەکە دەرکرا بوو. دارا دڵی چووبووە بەهێ، پێش ئەوەی بچێ بۆ بەغدا خوشکی خۆی تێگەیاندبوو تامی زاری وەربگرێ بزانێ ئەویش دارای خۆش دەوێ! ئەگەر نا با بەشووی بدەن. ئیتر دەگەڕێتەوە بەغدا. خوشکی نامەی بۆ دەنووسێ و تێی دەگەیەنێ بەهێ لە خۆشیانا دەستی کردووە بەگریان کە زانیویەتی دارا حەزی لێ کردووە. پیاوێکی وەکو دارا بەکارەکەرێک ڕازی بێ.

نزیکی تاقیکردنەوەی سەری ساڵ لە مانگرتنێکی سیاسیدا دارا لە کۆلێج دەرکرا. هەندێ دیاریی بۆ بەهێ و ئەوانی دیکە کڕی و گەڕایەوە سلێمانی. دایکی دارا کە بەم دڵدارییەی زانی تووڕە بوو. هەر ئەو کاتە فەرمانی دەرکرد بەهێ تەنیا ئەو شەوە دەتوانێ لەو ماڵەدا بمێنێ، پێویستە بەیانی بڕوا. ڕۆژی دوایی کە لە خەو هەڵدەستن دەبینن بەهێ خۆی خنکاندووە و بەمردوویەتی لەوێ کەوتووە. کە دارا بەرامبەر ئەم کارەساتە دەوەستێ پۆلیس هێرش دەبەنە سەریان چونکە لە بەغداوە هەواڵ گەیشتووە لە کۆلێجی بەغدا لەسەر سیاسەت دەرکراوە، هەروەها بەهۆی ئەو وێنەیەی دارایان لە گیرفانی بەهێ دۆزیوەتەوە بەکوشتنی ئەویش تاوانباریان کردووە. ئیتر چۆن بەپەشۆکاوی نەکەوێتە بەرچاوی بەندە سیاسییەکانی دیکە!.



٤- چیرۆکی نەریمان چی بەسەرهات

نەریمان لە دەشتەوە دەکەوێتە شار، دەبی بەیەکێ لە منداڵە کۆڵ هەڵگرەکانی ناو بازاڕ. لە پاشانا دەبێ بەکۆڵ هەڵگر و ئیشکەری ماڵە حاجییێکی دەوڵەمەند. حاجی کچێکی جوانی دەبێ بەناوی نازدار. ئەو کچە گوارەییێکی بووە تاکێکی لێ ون دەبێ. حاجیی باوکی بەمە نازانێ. ڕۆژێک نەریمان داوای پارە بەقەرز دەکا لە حاجی و ئەویش نایداتێ. نازدار تاکە گوارەکەی دەداتێ. کە دەیبا بۆ لای زێڕنگر کابرای ڕێزناس گوارەکە دەناسێتەوە. هەواڵ بەحاجی دەگا، نازدار ناوێرێ پێی بڵێ ئەو داویەتییێ. ئیتر نەریمان بەدز تاوانبار دەکرێ و لە ماڵ دوور دەخرێتەوە. بەم جۆرە نەریمان لەسەر دزی دەگیرێ، ئەو کاتە بۆ میری ئاشکرا دەبێ ناوی سەربازی هاتووە. دەکرێ بەسەرباز و دەنێررێ بۆ ڕواندز، لەوێ لە ئەفسەرێک نزیک دەبێتەوە کوڕی حاجییە. لەبەر دەست پاکی دەیکا بەپیاوی خۆی. نازدار دەچێتە ڕواندز بۆ لای برای، لەوێ چاوی بەنەریمان دەکەوێ، ماوەیێک پێکەوە دەبن. کە نازدار دەگەڕێتەوە سلێمانی بەڕێگەی کەرکووک، ئەفسەری برای نەریمانی لەگەڵدا دەنێرێ. حاجی بۆی ئاشکرا دەبێ نەریمان لای کوڕەکەیەتی، نامەی بۆ دەنووسێ باوەڕ بەو کوڕە دزە نەکا، ناچار دەبێ لەسەر ئارەزووی باوکی نەریمان بنێرێتەوە ناو سوپا. لە ساڵی ١٩٤٢ کە سوپای عیراق هێرش دەباتە سەر بارزانییان نەریمان لەو تیپە دەبێ کە شەڕ دەکا. لە شەڕێکدا ئەفسەرەکەی فەرمانی بۆ دەردەکا تەقە بکا، ئەو نایکا. پێی دەڵێ دەتکوژم! نەریمان ناچار دەبێ ئامێرەکەی دەکوژێ. ئیتر ڕادەکاتە ناو جەنگاوەرە بارزانییەکان، لەو کاتەدا فڕۆکە ئەو ناوە بەردوومان دەکا لە ئەنجاما نەریمان بریندار دەبێ و لە پاشانا دەمرێ.

لەو ڕۆژەوە کە لە سلێمانی نازدار و نەریمان لە یەکتری جیابوونەوە نازدار چاوەنۆڕ بوو. خەڵکی پێیان دەووت یەکێکی کوشتووە و چۆتە لای بارزانییان و لەگەڵ ئەواندا ڕووی کردۆتە ڕووسیا. لەم ماوەیەدا خوشکەکانی هەمموویان شوویان کردبوو و تەنیا خۆی و دایکی لە ماڵەوە مابوونەوە. کە بارزانییەکان گەڕانەوە ووڵات، نازدار چووە لایان. لێیانی پرسی، پێیان ووت کەسێکی وا لەگەڵیاندا نەبووە. ئیتر نازداری غەمگین وا مایەوە تا دایکی کۆچی دوایی کرد. ناچار بوو شوو بکا، لە ژیانا شاد نەبوو. زوو بەسەر منداڵەوە ئەویش مرد. پێش مردن وەسیەتی کردبوو ناوی کوڕەکەی بنێن نەریمان، بەڵام بەقسەیان نەکردبوو.

## نموونەی شیعری

### دڵداریی ئاسایی

١

لە لیریکێکیدا لە ساڵی ١٩٤٠ هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

دڵم بۆ خـۆش نەبێ یارم بەرامـبـەر من کـە وەسـتـاوە
لە سـایەی خـواوە هێشـتـا عـەشقی جـارانی لەلا مـاوە
ئەگـەر لوتفی ببێ سـاتێ لە لام دانیـشێ ئەو شـۆخـە
هەتا ئەمـــــرم مـنەتبـــــاری ئەبم دایم لـەمـــــەولاوە
وەرن سـەیری جـوانی و دڵفـرێنی بەژن و باڵای کـەن
بەشەر بەم ڕەنگە هەر نابێ سەرم لەم جوانە سورماوە
ئەگـەر نازیش بکا تـوخـوا دڵی مـەشکێنن ئەی یاران
کـە داوای چی بکا دلبـەر بەسـەر ڕووح و بەسـەر چاوە
نەوەک هەر من بە تەنیـا بێ قـەرار و کـوشتـەیی عەشقم
هەزاران عـاشـقی بێـچـارە هەر بەم ڕەنگە فـەوتاوە
بە لەنجەولار و هات و چۆی جوانی شێت و (مەدهۆش)م
لە سـەرتا پای تەمـاشا کـەن چ خـەوشی تیـا نەبینراوە

لەم شیعرەدا مەدهۆش لە دۆخی هەندێ شاعیرانی کلاسیک چۆتە دەرەوە، ئەوانەی تەنیا دلبەریان بۆ خۆیان ویستووە و ڕەقیبیان ڕیسوا کردووە. دلبەری شاعیر ئەوەندە جوانە هەموو کـەس بووە بۆی بەدێوانە، لەبەرئەوە شانازی بەجوانییەکەوە دەکا بۆیە بەتەنگ ئەوەوە نییە خەڵکی خۆشیان بوێ.

٢

لە شیعرێکیدا مەدهۆش گەردوون لە ناو جوانی دلبەردا دەتوێنێتەوە، ئەو هەموو شتێکە بۆی، لە ساڵی ١٩٤٢ هۆنیویەتییەوە:

قـــوربان وەرە زوو دەسکە ملم مـــاڵ و ســـەرم تۆی
فـــــەوتاوی دەسی تۆم و بەڵێ چارەســــــەرم تۆی
بەینێکە لە ژێر دەستی جەفـا و تەعنەیی عـەشقم
یەک دەفـعـە دڵم بێنەوە جێ خـێـر و شـەڕم تۆی
ڕوو دەرخـــە پەچەت لابەرە لێـــو بێنەرە پێـــشێ
مـــاچێک ئەفـــڕێنم لە دەمت نەشـئـــە دەرم تۆی
من بولبـول و تۆ غـونچـەیێکی سـەرچڵی عـەشـقی
ئێشکچییـە دڵ شـەو کـە ئومـێـدی سـەحەرم تۆی
عـەشـقت کـە هەمـوو ئان و سـەعـاتێک لە دڵم دا
کـــردوویە بەغـــەوغـــایە کـەچی بێـخـەبەرم تۆی
(مـەدهۆش) کە وەکو شایە لە ژێر سێبـەری عـەشقا
غـــەم لەشکر و دڵ دوژمنە مـــایەی زەفـــەرم تۆی

لەم شیعرەدا مەدهۆش لەگەڵ دلبەر دەدوێ. وتەکانی ئاساین، وێنەکانی لە شیعری کلاسیکی وەسف و دڵداری بەرچاو دەکەون، بەڵام ئەوە هەیە شاعیر بەزمانێکی کوردی پەتی دەریان دەبڕێ، وشەی فەرهەنگی و زاراوەی بێگانەی کەمتر بەکارهێناوە.

٣

لە بابەت ڕق هەڵسانی دلبەرەکەیەوە لە ساڵی ١٩٤١ لە پارچە شیعرێکدا بەناوی «تۆ»وە وتوویەتی:

بیـسـتـوومـە کـە یارم ڕقی هەڵساوە لەبەر چی!
تێناگــەم و ســووچم چیـــە تۆراوە لەبەر چی
مـەعلوومـە لە لای من کـە جـوان عـادەتی وایە
ئەم ڕەسمـە لە چەند کـۆنەوە هەر ماوە لەبەر چی
هەر ناوی منی بێکەسی بەدبەخـتـــە لە ناوا
ســەد شـێخ و مـەلا مـێـزەری داناوە لەبەر چی
لەم لەوحی دڵەم نەخـــشـــە دە تێـــفکرە بزانە
ئەم عـەشقە بەڕەنگی چییە نووسراوە لەبەر چی
کـەس حەددی نییـە ناوی بەرێ دلبـەری خۆمـە
(مەدهۆش)ی هەژار خواردنی خوێناوە لەبەر چی!

لێرەدا پیاو نازانێ شاعیر ناز بەسەر دلبەری دەکا یا خۆشەویستی ئەوەندە قووڵە دەربەستی ئەوە نییە ئەگەر ڕقیشی لێ بێتەوە، ئەو هەر خۆشی دەوێ. شاعیر مەبەسی ئەوەیە بڵێ لە دڵداریدا سۆز هەیە، ڕق و کین ئەو سۆزە دەسڕێتەوە، چونکە ئەو لە چاکە بەولاوە شتێکی دیکەی نەبووە بەرامبەر بەدلبەر.

٤

لە پارچە لیریکێکیدا بەناوی «دیاری»یەوە لە ساڵی **١٩٥٩** بۆ دلبەری نووسیوە دەڵێ:

گیانەکەم دیاریت بۆ من ناردبوو
بۆینباغێکت هەڵبژاردبوو
بەیانی جەژن ماچم کرد بەستم
بەڵام بۆینباغ نەبوو مەبەستم
من ویستم دەستی خۆت لە ملما بێ
نەک پارچە پەڕۆ بەپەت چنرا بێ

دلبەر کراڤێتی بۆ مەدهۆش ناردووە وەک دیاری جەژن. شاعیر بەخۆشییەوە لە ملی کردووە. بەدلبەر دەڵێ دەستی خۆت لە ملمدا بوایە، نەک ئەم پارچە پەڕۆیە!.

٥

لە شیعرێکیدا مەدهۆش بەناوی «گوڵبەهار»ەوە لە ساڵی **١٩٧٢** هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

لەسەر گوڵبەهار گەر بمدەن لە دار
بەچەپڵە لێدان دەرم کەن لە شار
هەتا چەند ماچێک نەکەم لە لێوی
دەستێ نەگێڕم لە باغی سێوی
ئەو دەستە نەرمەی نەگرمە ناو دەس
وەها نەگوشم کە خۆی بڵێ بەس
ئەو قژە خاوەی نەئاڵۆزێنم
دەستێ بەشان و ملیا نەهێنم
دەم نەخەمە سەر کوڵمی یاقووتی
نەیگێڕم هەتا سەر سنگی ڕووتی



دەس لە کەمەریا نەکەم بەکەمەند
لێدانی دڵمان نەکەم بەیەک دەنگ
شەرمی نەشکێنم لێم سوور بێتەوە
دوو مستەکۆڵەم پیا کێشێتەوە
پێم نەڵێ هەتیو تۆ زۆر بێ حەیای
بەچاکم زانیت نەمزانی ئاوای
هەرگیز ئەم دڵەم ئاو ناخواتەوە
کەس ئەم ئاواتەم بیر ناباتەوە

گوڵبەهار ناوی خۆشەویستی شاعیرە. وەسفێکی ساکار و ڕووکەشی دەکا. ئەندامە وردە جوانەکانی دەکاتە سەرچاوەی دەسبازی. لێوی گەرمی ماچ دەکا، مەمکی تورتی هەڵدەپشێوی و دەستی نەرمی دەگوشی. دەست دەئاڵێنێتە کەمەری بۆ ئەوەی لێدانی دڵیان ببێ بەیەک دەنگ. کە دلبەر بە ناز و نووزەوە بەشاعیر دەڵێ هەتیو تۆ بێ ئابڕووی، ئەو کاتە شاعیر دەگا بەمرازی.

**مەمک**

١

لە پارچەیێکی بەناوی «مەم»ەوە مەدهۆش لە ساڵی **١٩٦٣** وتوویەتی:

من کە بە مەمک بەخێو کرابم
چۆن هەتا مردن مەم پەرست نابم
ئێستەش بۆ مەمک ئەڵێی منداڵم
هەر بۆ باوەشە خەو و خەیاڵم
هەرچەند ئەم مەمکە لەو مەمکە جیایە
چی بکەم تەمەنم لەگەڵ مەمایە

لەم پارچەیەدا شاعیر باس لە هەردوو دیوی مەمک دەکا. یەکەمیان کانگای ژیانی منداڵانە بەشیرەکەی بەخێو دەکرێن. دووەمیان سەرچاوەی دەسبازی دڵدارییە، ئەگەر کاری یەکەمیان وەختی بێ، کاری دووەمیان هەمیشەیی و نەمرە.

۲

دیسانەوە لە بابەت مەمکەوە لە شیعری «هەر جوانە» لە ساڵی ١٩٦٤ دایناوە دەڵێ:

ئەو مەمکە توندەی لە چنگ ڕائەکا
پیر وەکو منداڵ بۆی سەما ئەکا
لەرزەی لە ترسی دەستی نەزانە
بە شاراوەییش دیمەنی جوانە
مەم هێندە جوانە تا خۆی منداڵە
کەوتە دەم منداڵ سیحری بەتاڵە

لەم پارچەیەدا وەسفی مەمک دەکا. توندە خۆی بەدەستەوەدا نادا، تەنیا بەڕووتی جوان نییە بەشارراوەییش ڕەنگینە. کە لە دەمی منداڵدا دەبێ تەلیسمی دەشکێ، تەنیا لەو کاتەدا جوانە کە مەمک خۆی منداڵە و مایەی دەسبازییە.

## کچ شیعری دڵداری بۆ کوڕ دەڵێ

۱

لە شیعرێکیدا بەناوی «چار چییە؟»ەوە لە ساڵی ١٩٦٦ هۆنیوبەتییەوە دەڵێ:

دایە گیان من سەیری شێوەی خۆم ئەکەم لە جوان ئەچم
تۆش دڵم خۆش کە بەیانی جەژنە بۆ ماڵان ئەچم
خۆ لەگەڵ ئاوێنەکەم دایم بەرەو رووی یەکترین
ئەمگرێتە باوەشی ئەو حەز ئەکا من لا نەچم
هەرچی تووشم دێ لە ڕێگا تێروپڕ سەیرم ئەکا
وەختە هەر قووتم بدەن کاتێ بەرەو روویان ئەچم
لەم هەموو لاوانەدا تەنیا یەکێکم خۆش ئەوێ
بێت و بانگم کا بەلاچاو من بەسەر چاوان ئەچم
داخەکەم هەروەک نەزانێ پێی ئەگەم خۆی گێل ئەکا
چەند بەلایا دێم بە لەنجەولار و خۆ بادان ئەچم
ڕوومەتی بۆ سوور ئەکەم درزی سنگی پیشان ئەدەم
پێکەنینی بۆ ئەکەم دایم بەشێوەی جوان ئەچم



چونکە ناسیاوین بەخێزان هات و چۆی یەکمان هەیە
گەر سەریشی لێ بدەم لای وایە بۆ سەردان ئەچم
خۆ لە ڕووشم نایە باسی خۆشەویستی لا بکەم
ڕەنگە ئەو شەرمن بێ یا لووت بەرزە من هەرزان ئەچم
با ئەویش خۆشی نەوێم من هەر لەسەر ئاوات ئەژیم
نەک دڵی داگیر کرا بێ بۆیە بۆ فەوتان ئەچم
شێوەنێکی مەرگی پێشکەوتووم بکەم بەم جوانییە
تووشی گڵپەی ئاگری دڵ بووم بەرەو سووتان ئەچم

لە ئەدەبی کوردیدا شیعری دڵداری بە زمانی کچەوە بۆ وەسفی کوڕ نەووتراوە. هەرچی شاعیری ژنیشە لە ئەدەبی کوردیدا ترووسکاییێک بەدی دەکرێ ژنی شاعیر غەزەلیان بەپیاو کردبێ (ئامینە و جیهان ئارا، ناویان لەم کتێبەدا هاتووە). بەڵام مەدهۆش وەک پیاو هەست و نەستی دڵداری مێیینە دەخاتە ڕوو بەرامبەر بەنێرینەوە، بەمە بووە بەداهێنەری ئەم جۆرە شیعرە لە ئەدەبدا.

لەم شیعرەدا ئەو کچە بەجوانی خۆی هەڵدەڵێ، لەگەڵ دایکی گفتوگۆ دەکا، هەرچی لە دڵی دایە بۆی هەڵدەڕێژێ و دان بەوە دادەنێ لە ناو ئەو لاوانەی حەزیان لێ کردووە یەکێکیانی خۆش دەوێ. هەرچەند هەوڵ دەدا کوڕەکە تێبگەیەنێ کە گیرۆدەی بووە و خۆشی دەوێ بەڵام کوڕەکە ئەقڵی پێ ناشکێ، لەگەڵ ئەوەشدا کچەکە هەر خۆشی دەوێ تا ئەگەر کوڕەکە مەیلیشی بۆ نەبێ. کچەکە لەوە دەترسێ پەیمانی لەگەڵ یەکێکی دیکە بەست بێ، خوانەخواستە ئەگەر وابێ کچەکە لە ناو بۆتەی دڵداریدا دەتوێتەوە و لە دواییدا لەناودەچێ.

۲

لە بەندی یەکەمی لیریکێکی دیکەیدا بەناوی «بەیانی ئەتبینمەوە» لە ساڵی ١٩٧٧ هۆنیوبەتییەوە دەڵێ:

دەمم بشکێ من ئەو لاوەم بۆچی تۆران
ملم بشکێ ئەو خۆشەویستەم بۆ ڕەنجان
ئەمویست وەکو کچانی تر

فێری ناز و مەکر نەبم
گەر دوانمی
بە ووشەی وورد
ئەگەر داوای ماچێکی کرد
منیش بە نەرمی بیدوێنم
گڕی لێوی دامرکێنم

لەم پارچە شیعرەدا مەدهۆش دیسانەوە هەست و نەستی ناوەوەی کیژ دەردەبڕێ بەرامبەر بەو کوڕەی خۆشی دەوێ. دیارە کوڕەکە داوای ماچی لێ کردووە، ئەویش نەیویستووە بەئاسانی بیداتێ، بەڕەقی وەرامی داوەتەوە، لە پاشانا پەشیمان بۆتەوە. بەلایەوە دەبوو بەنەرمی بیدوێنێ و ماچەکەشی بداتێ، چونکە کیژەکە خۆشی حەزی لێ بووە.

**دڵداریی هەرزان**

١

جوانی ژن بەهۆی ئارایشی دەسکردەوە ئیلهامی داوەتە مەدهۆش و شیعری «ئارایشی تازە»ی لە ساڵی ١٩٥١دا هۆنیوەتەوە:

ئێستاکە سروشت باوی نەماوە
هونەری ڕووکەش وا لە بەرچاوە
باڵای بەرز هەمووی پاژنە عانەیە
پەرچەم ڕازاوەی نەخشە و شانەیە
لێو نە قەیتانە و نە وەک یاقووتە
باشی سەیر بکەی ڕەنگێکی ڕووتە
لێو کە لە خۆیا فێرە درۆیە
بەدەسەڵاتە و هەر بۆیەی بۆیە
پێ و پووز بە بەرگی نایلۆنی ڕەنگ کاڵ
سەرنج ئەکێشن بۆ دەرگای خەیاڵ
چەندم لا جوان بوو ئەو مەمکە قنجە
تومەز ئەو قنجە سوخمەی ئەسفەنجە



ئەو سمتە جوانە کە خرت وەستا بوو
شەرمی بردبووم دەسمی کێشا بوو
نوقورچم لێ گرت هیچ نەئەیەشا
تومەز لاستیک بوو من ڕامئەکێشا
ئەمجا کە ویستم خۆم دامەزرێنم
لەباتی کچێ کۆگایە دێنم

لەم شیعرەدا مەدهۆش بەچاوێکی نزم تەماشای ئەو کچانە دەکا بەسووراو و سپیاوی ماکیاج خۆیان جوان دەکەن. ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە جوانییە سروشتییەکە نرخی خۆی هەیە، بەڵام ڕووکەشەکە هەرچەندە بۆ ماوەیێک نرخی هەبێ وەکو سەراب وایە زوو بەسەردەچێ. شاعیر کۆمیدیانە باس لە هەندێ دیاردەی ئەم جۆرە جوانییە دەکا، وەکو باڵای بەرزە چونکە پێڵاوی پاژنە عانەی بەرزی لە پێیە. مەمکی توندوتۆڵە لە ئەسفەنج دروست کراوە، پەیکەری سمتی خرت و جوان بەلاستیک دروست کراوە. هاوار بەماڵی ئەو کەسەی دەکەوێتە دڵداری جوانی ڕووکەشی بێ ناوەڕۆکی واوە. لە دواییدا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ لەو کچانە لە کۆگاکاندا زۆرن، مەبەسی پەیکەری لە شووشە دروستکراوی ئەو کچانەیە جلی جوانیان لەبەر کردوون بەمەبەسی پروپاگەندە بۆ ئەو کەلوپەلانەی لە کۆگاکاندا دەفرۆشرێن.

٢

لە بابەت کچێکی گومناوی گۆشەی بیرکراو لە شیعرێکیدا بەناوی «بێ پارەیی» لە ساڵی ١٩٥٤ هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

ئەو کچەی ئێستە پێی ئەڵێن جوانە
یەکەم پەسەندی دەستەی لاوانە
لە سووچێکا بوو کەس نەیئەناسی
جار جار دەرئەکەوت زۆر بەکەساسی
خۆی نەیئەزانی کە نرخی چییە
وەیزانی بەشی لە ژینا نییە
دامنا لە دڵما ئەمە یارم بێ
لابەری غەمی ڕۆژگارم بێ

ووتم ئەی پەریە کەس نەناسیوە
زوو ڕاوی ئەکەم تا کەس نەیدیوە
بەڵام بەر لەوەی من بیخەمە داو
کەوتە بەرچاو و ناوی کەوتە ناو
ژمارەی عاشق لە حیساب دەرچوو
دەوری هەژاری وەک من بەسەرچوو
ئێستا ئەو کەسەی دیار نەبێ منم
خۆم خۆ نابینم ئەوەندە وونم
لەشکری پارە دەوری لێداوە
بەدیناری زۆر دەوری گیراوە

مەدهۆش ئەم شیعرەی بۆ کچێک وتووە بەرچاو نەبووە، ئەمەی بەهەل زانیوە بیکا بەیاری خۆی، بەڵام لەو کاتەدا ناوی کەوتە ناوەوە، ژمارەی دڵدارانی ئەوەند زۆر بوون، شاعیر لە ناویاندا وون بوو. بەمەکری خۆیان لای ئەوان شیرین بوو، پارەی دەوڵەمەندان لە شاعیری دوور خستەوە.

## پیری و دڵداری

لە بابەت پیری و دڵدارییەوە مەدهۆش لە شیعری «پیری»دا لە ساڵی ١٩٧٦ هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

هەتاکو گەنج بووم هێزم تیا بوو
خێزانم وەکو ناترم وا بوو
کە سەرمام ئەبوو پشتی ئەشێلام
کە دەرئەکەوتم شەو دائەپۆشرام
ئێستا کە بوومە پەککەوتە و داماو
خراومە لاوە وەک دەوری قوپاو
نەوەکو جاران مشوورم ئەخۆن
نە جلم ئەگۆڕن نە پشتم ئەشۆن
بە لەشی چڵکن دێمەوە ماڵێ
حەمام گەرم ئەکەن کەس بەمن ناڵێ



بەڵام بەرووکەش دۆستی بەڕێزم
کە میوانمان بێ گەورەی سەرمێزم
کچان ئەمدوێنن ئەو پێئەکەنی
وەک جاران دڵی هیچ ڕاناچەنێ
ئاخ پیری توخوا چونکە بێ خێری
بەدۆستی خۆیشت ئەبێ نەوێری

لە دڵداری ڕاستدا پیری ون نابێ، لە دڵداری ڕووکەشدا مۆدەی بەسەر دەچێ. لەم شیعرەدا مەدهۆش کۆمیدییانە و بۆ پێکەنین باس لە پیری و دڵداری دەکا. ئەوەی دەیڵێ بەسەر خۆی نەهاتووە، بەڵام ڕەوشتێکە لە ناو کۆمەڵدا هەیە. دیارە پیاو هەرچەندە بەساڵا بچێ زیاتر ڕێزی دەگیرێ، کەچی لە ڕووی خزمەتکردنەوە ئەوەی پێویستییەتی بۆی ناکرێ، مەبەسی شاعیر ئەوەیە لە پاڵ دڵداری و بەناوی ئەوەوە گەلێ کاری نابەجێ دەکرێ.

***

محەمەد عەلی مەدهۆش لە ناو شاعیرانی کوردا کەسێتی و شێوازی تایبەتی خۆی هەیە. شاعیرێکە لە حوجرەی مزگەوت خوێندوویەتی، لە قوتابخانەی ئێواران فێر بووە. ڕاستییەکەی ئەوەیە خۆی مامۆستای خۆی بووە. جۆرە شیعرێکی ئەڤینی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردی نوێیەوە. بۆ یەکەمین جار بەزمانی کچەوە شیعری دڵداری هۆنیوەتەوە بۆ کوڕ. واتە ئەگەر بووترێ پیاو شیعری مێبازی دەنووسێ بۆ دەبێ کچ شیعری نێربازی بۆ پیاو نەنووسێ، با خۆشی داینەنێ و یەکێکی وەکو مەدهۆش بەناوی ئەوەوە بیڵێ! هەرچۆنێ بێ بایەخی شاعیر بەگشتی بۆ مەبەسی دڵداری زەمینی بووە.

شاعیر لە هەموو بابەتەکانی شیعری کوردی سەدەی بیستەمی نووسیوە لە ڕووی ڕوخسارەوە وەکو شیعری عەرووزی کێشی سیلابی خۆماڵی و شیعری نوێ. زمانی وشە و زاراوەی فەرهەنگی شیعری ئاسان و کوردی پەتییە، لە هەموو ڕوویێکەوە شیعری لە بەرهەمی ئەدەبی میللیی سەرزارەوە نزیکە.

مەدهۆش چیرۆکی پەخشانی هەیە، ناوەڕۆکیان دڵدارییە، تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتییان تێدایە، زۆربەیان دراماتیکین، تارمایی نیشتمانپەروەری و کوردایەتیشیان تێدایە.

# بەشی بیست و حەوتەم

## عەلی عەبدولڕەحمان

**١٩٢٠ – ١٩٩٤**

### ژیانی

عەلی کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی محەممەد لە ساڵی ١٩٢٠ لە هەوارگەی گۆلی چلوور لە قەزای وان لە کوردستانی تورکیا لە دایک بووە. ماڵی باوکی سەر بەلقی برووکی لە عەشرەتی زیللییە. لە دەوروبەری دامرکاندنەوەی هەڵسانی شێخ سەعیدی پیران ماڵی عەلی وەکو هەزارانی دیکەی کورد ئاوارەبوون و لە دواییدا لە نەخچەوان نیشتنەوە. تا سەردەمی تەمەنی مێردمنداڵی بۆ عەلی ڕێک نەکەوت چاوی بەقوتابخانە بکەوێ. لە ساڵی ١٩٣٣ ماڵیان گوزرایەوە ئەرمەنستان لە گوندی حەسەنلوو لە ناوچەی ئێچمیادزین نیشتەجێ بوون. عەلی خوێندنی سەرەتایی لەو گوندە تەواو کرد و یەکسەر بوو بەقوتابی لە ئامۆژگای مامۆستایانی زمانی کوردی، لە ساڵی ١٩٣٧ باوەڕنامەی ئەو دەسگایەی وەرگرت. لەو ساڵەوە تا ١٩٤٠ مامۆستا بووە لە قوتابخانەی مووساکەند و عەمۆ بەهەردوو گوندەوە یەک قوتابخانەیان بووە. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی ڕووسیا و ئەڵمان لە ساڵی ١٩٤١ عەلی بوو بەپارتیزانی تیپێکی سوپای ڕووسیا. خەباتی چەکداری پارتیزانی لە سەنگەرەکانی سوپا قورستر بوو. عەلی لە کۆمارەکانی ئۆکرانیا و بێلۆڕووسیا جەنگاوە، لە ناو شاخ و هەردەکانی ڕۆمانیا و پۆڵۆنیا و چیکۆسلۆڤاکیا و ئەڵمانیا خەباتی کردووە. چوار میدالیای پێ بەخشراوە: نمرە یەکی پارتیزانی، سەرکەوتنی جەنگی نیشتمانی، ڕزگاربوونی قەفقاس و ڕزگاربوونی مۆسکۆ. لە دوای کۆتایی جەنگ لە مایسی ١٩٤٥ گەڕایەوە ئەرمەنستان و خۆی بەکاروباری ئەدەبییەوە خەریک کرد، دیسانەوە هەوەسی خوێندنی هەڵسایەوە و ڕووی کردە ئازربێجان و بوو بەقوتابی لە ئامۆژگای مامۆستایان لە باکۆ و لە ساڵی ١٩٤٩ دیپلۆمی ئەو دەسگایەی وەرگرت. لە دوای ئەمە کرا بەبەڕێوەبەری قوتابخانەی دە ساڵی سەرەتایی و ناوەندی. لەم کارەیدا زۆر نەمایەوە، لە پاشانا بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە و زانستی پێ سپێررا. لە ساڵی ١٩٥٣ کرا بەسکرتێری وەزارەتی زانیاری ئەرمەنستان بۆ کاروباری زمانی کوردی و ئازەری.



ڕۆژنامەی «ریاتازە» مەیدانی مەشق بوو بۆ خەملاندن و فراوانکردنی ئاسۆی بیری عەلی لە ساڵی ١٩٥٥ەوە تا ١٩٦١ نووسینی تێدا بڵاو دەکردەوە. دەستەی نووسەرانی ئەو ڕۆژنامەیە وەک یەکێک لە خۆیان حسێبیان دەکرد. لە ساڵی ١٩٦١ عەلی بوو بەسەرۆکی سۆفخۆزی کالینین، ئەمە یەکێک بوو لە سۆفخۆزە گەورەکانی ئەرمەنستان.

سۆفخۆز دەسگاییێکی ئابووری کشتوکاڵی دەوڵەت بوو لە یەکێتیی سۆڤیەتی کۆندا. عەلی لەم کارەیدا مایەوە تا سەردەمی خانەنشینی و کۆتایی ژیانی. لە دوای ڕووخانی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە قەفقاس (١٩٩١) و لە ئەنجامی شەڕی نەتەوەیی و ئایینی لە نێوان ئەرمەن و ئازەرییان بنەماڵەی عەلی ئاوارە بوون و خۆشی لە ساڵی ١٩٩٤ کۆچی دوایی کرد.

### بەرهەمی ئەدەبی

عەلی کۆمەڵێک زمانی دەزانی و شارەزای ئەدەبیاتیان بوو. جگە لە زمانی کوردی، ڕووسی و ئەرمەنی و تورکی (ئازەری) و قەرەغیزی و ئۆزبەکی و فارسی دەزانی. لە نزیکەوە ئاشنای ئەدەبیان بوو. ئەو زەمینە و سەرچاوانەی ڕێگەیان بۆ عەلی خۆش کردبوو ببێ بەنووسەرێکی بەرچاو دەتوانرێ لەم خاڵانەی لای خوارەوە ببینرێن:

١- عەلی وێنەی ڕاستەقینەی ژیانی نەتەوەی خۆی بوو. لە تەمەنی شەش ساڵییەوە تووشی ئاوارەیی و ئەشکەنجە و دەردی سەری ژیان بووە، لە تافی لاویدا ڕێگەی پارتیزانی هەڵبژاردووە، ئینجا بووە بەمامۆستا، لە پاش ئەمە لە ڕۆژنامەگەریدا کاری کردووە، ئەوجا لە کشتوکاڵ، بەڵام ئەم هەموو کارەی کە بەشێکە لە ژیان بۆ خوێندن و نووسین بووە، چونکە ژیانی ڕاستەقینەیەتی.

٢- وەزیری نادری خزمی عەلی بووە، لە بابەت ئەوەوە دەڵێ: وەزیر مامۆستای یەکەمم بوو، سوودی زۆرم لێ وەرگرتووە و گەلێکیشی لێ فێر بووم.

سەرەتای پشکووتنی بەهرەی ئەدەبی عەلی لە ساڵی ١٩٤٠ دەستی پێ کرد، بەڵام بەهۆی بەشداربوونی لە جەنگی ڕووسیا و ئەڵمانیا (١٩٤١ – ١٩٤٥) مەشقی نووسینی لەم ماوەیەدا نەبوو. لە دوای جەنگ عەلی بەڕاستی وەک نووسەرێک کەوتە سەر پێ و ناوبانگی پەیدا کرد. ئەوەی مایەی وتنە ئەوەیە عەلی وەکو عەرەبی شەمۆ بەرهەمی ئەدەبی لە چوارچێوەی پەخشان نەچووە دەرەوە. ئەو دە دوازدە پارچە شیعرەی ئێستا لە ناوەوەیە بەڵگەی ئەوەن، ئەگەر بابەتی شیعری بۆ بەرهەمی ئەدەبی هەڵبژاردایە شاعیری

باشی لێ دەکەوتەوە. لە نێوەندی ئەدەبی ئەو وڵاتە ئەگەر عەرەب بەنووسەری یەکەم لە قەڵەم درا بێ، ناوی عەلی لە دوای ئەوەوە هاتووە.

عەلی بەرهەمی ئەدەبی خۆی بەگشتی بەرێگەی پەخشان نووسیوەتەوە. چەند پارچە شیعرێکیشی هۆنیوەتەوە. پەخشانەکانی لەو بابەتانەن کە لە ئەدەبی نەتەوەکانی گێتیدا لە ناوەوەن، وەکو وتار و چیرۆکی کورت و چیرۆکی ناوەڕاست (پۆڤیست) و ڕۆمان.

ئەو سەردەمەی لە «ریاتازە» کاری کردووە و نووسینی تێدا بڵاوکردۆتەوە ماوەی مەشق و پێشکەوتنی بووە لە نووسیندا و بەرهەمێکی زۆری هێناوەتە ناوەوە. لە ساڵی **١٩٥٧** لە کتێبی «نڤیسارکارێد کوردایە سۆڤێتیێ یێ» چیرۆکی «مۆرۆف»ی بڵاوکراوەتەوە. ئەم کتێبە بەرهەمی گەورەترین شاعیر و نووسەرانی ئەو سەردەمەی کوردی قەفقاسی ڕووسیای گرتبووە خۆ.

### خاتێ خانم

خاتێ خانم یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی عەلییە لە کتێبێکدا بڵاو کرابێتەوە، لە ساڵی **١٩٥٩** لە یەریڤان دەرچووە. عەلی نۆبەرەی بەرهەمی ئەدەبی بەم جۆرە پێشکێش کردووە «ئەز ڤێ کتێب، خوەیە پێشنە چووک، پێشکێشی نڤیسکارێ کوردایی عەیان دەرسدارێ خوەیی عەزیز ڕەحمەتی وەزیرێ جەبار نادری و برێ خوەیی بێ مراز قولی خان دکم».

خاتێ خانم بریتییە لە چوار چیرۆک «ژنا کورد»، «مۆرۆف»، «بەختێ وی زلامێ»، «بەختەواری یا عەمر». چیرۆکی سەرەکی لەم کۆمەڵەدا «ژنا کورد»ە ناوی خاتێ خانمە لەبەرئەوە چیرۆکەکانی بەو ناوەوە بڵاوکردۆتەوە. دوو چیرۆکی بەرایی لە چیرۆکە درێژەکانن بەقەوارە نزیکەی سەد لاپەڕەن، دووانەکەی دیکە کورتە چیرۆکن.

### دێ (دایک)

لە بەرهەمە گرنگەکانی دیکەی عەلی ئەو کۆمەڵە چیرۆک و شیعرەیە لە ساڵی **١٩٦٥** بەناوی «دێ»وە لە یەریڤان بڵاوی کردۆتەوە، شەش چیرۆکی گرتۆتە خۆ، لەمانە «دێ» و «ڕاست هاتن» و «دوو دلێ حز کری» لە چیرۆکە درێژەکانن. ئەوانی دیکە «بەردێلی» و «دوو ژی یێن» و «سەیران» چیرۆکی کورتن. هەروەها لەو کتێبەدا یازدە پارچە شیعری عەلی بڵاوکراوەتەوە لەگەڵ پێنج پارچە شیعری لە زمانی بێگانەوە کراوە بەکوردی. ئەوەی پێویستە لەم ماوەیەدا بووترێ ئەوەیە پێشەکیی ئەم بڵاوکراوەی عەلی لە لایەن عەرەبی شەمۆوە نووسراوەتەوە.



### هشیاربوون

عەلی عەبدولڕەحمان پێوەندی لەگەڵ نووسەر و ڕۆشنبیرانی کوردی کوردستانی باشوور بووە. لە سەردەمی کۆماری کوردستان لە مەهاباد (١٩٤٦) کۆمەڵێک لاو بۆ خوێندن چووبوونە باکۆ، لە دوای ڕووخانی کۆمار بەپەنابەری سیاسی لەو وڵاتەدا مانەوە. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا ڕەحیمی قازی و عەلی گەلاوێژ کۆمەڵێک شیعر و حیکایەتی ئەدەبی میللیی سەرزاری کوردییان وەرگێڕابووە سەر زمانی ئازەری بەناوی «اویانماق»ەوە (هوشیاربوون یا لە خەو هەڵسان) وا دەردەکەوێ بۆیان نەڕەخسا بوو بڵاوی بکەنەوە، وا دیارە تا ئێستاش بڵاو نەکراوەتەوە. ئیتر عەلی ئەو تێکستە ئازەرییانەی جارێکی دیکە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی (دیالێکتی کرمانجیی باکوور) بەناوی خواستراوی «کوڕی کورد»ەوە لە ساڵی **١٩٥٩** لە یەریڤان بڵاوی کردۆتەوە.

### ناوەڕۆکی بەرهەمی

عەلی لە کوردستان نابێتەوە، وەکو خۆی دەڵێ لە کوردستان نەژیاوە، بەڵام بیرەوەری و یادگاری باوک و دایک و کەسوکاری خۆشەویستی ئەو خاکەیان بەجۆرێک لە ناو ناخی دڵ و دەروونیدا چاندووە هیچ هێزێک ناتوانێ هەڵیبکەنێ. لەبەرئەوە زۆربەی بەرهەمی بۆ مەبەسی مەسەلەی ڕزگاری نەتەوەیی تەرخان کردووە. ئەو کۆمەڵەی تێیدا ژیاوە بەلایەوە خۆشەویست بووە، هیچ ڕق و کینێکی بەرامبەر بەهاوسێیانی کورد نەبووە، دڵسۆزی دەسەڵاتی ڕووس و ئەرمەن بووە ئەوەی لەبەر تیشکی بیروباوەڕی سۆسیالیزم کۆمەڵیان بەڕێوە بردووە. عەلی یەکێک بووە لەوانەی لەو وڵاتەدا بوون مەسەلەی کوردایەتی لە بیروباوەڕیان لە هەموو شتێکی دیکە گرنگتر بووە. چونکە وەنەبێ هەموو ئەو کوردە خوێندەوارانەی ئەوێ لەم بابەتە بووبن.

نووسینی لە دەوروبەری ویست و ئارەزووی کوردی لای خۆیان و هەموو کوردستانە. ئەمەی تێکەڵ کردووە بەهیوا و ئامانجی ئەو میللەتە زۆرانەی هاوسێی کوردن. قارەمانەکانی لە هەموو لایێک هەڵبژاردووە. گەشبینە بەرامبەر بەهەموو کەسێکی خراپەی نەکردووە، دەرگای دۆزەخیش بۆ هەموو کەسێک دەکاتەوە دوژمنی کورد و بیروباوەڕی سۆسیالیزم بێ.

عەلی لەسەر ئەم ڕێبازە ڕۆیشتووە لە سەرەتای ژیانی ئەدەبییەوە. هیچ جۆرە شێوانێکی ئیدیۆلۆجی لە لا دروست نەبووە. لە بارەی ناوەڕۆکی بەرهەمەوە ئۆقرەی بیری لە لای

بەهێز بووە، تووشی هیچ بابەتە شلەقانێک نەبووە. گۆڕانی لە ڕوخساری بەرهەمی ئەدەبیدا بووە. هەرچەندە بەساڵاچووە، زمان و شێوازی بەرەو پێشکەوتن چووە. لە بابەت و قاڵبی نوێ گەڕاوە بۆ تۆماری ناوەڕۆکی بیروباوەڕی، لە پێشانا بایەخی بەوتار و چیرۆکی کورت و درێژ داوە، لە ناوەڕاستی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەم پرۆژەی نووسینەوەی ڕۆمانی بەدەستەوە بوو، لەو ماوەیەدا خەریکی ئامادەکردنی ڕۆمانی «گوندێ مێرخاسا» بوو.

## شیعری عەلی عەبدولڕەحمان

عەلی شیعر وتنی نەکردووە بەپیشە، مەگەر هەندێ جار بەهەوەس بۆی هاتبێ و بێ دڵی خۆی نەکردبێ و ئەو شیعرانەی نووسیبێتەوە.

لە شیعرێکیدا بەناوی «کەچا کوردا» دەڵێ:

قیزا کوردا تو حوسلجەمالی
تو دلێ من دا زەعف دەلالی
بەژنا تە زراڤە چا سپیندار
قالچیچەکا کانیا سەردار
قیزا کوردا قیزا کوردا
تو لەتیفا ئەشقا دلا
ئەز بەنگیمە تو یارا منی
دەڤێ تە چووک دران مرجانی
گولی یی یارێ گاز و نیڤەک
نۆلی کەسکە سۆر، رحان گولەک

***

ل زۆزانێ مە کال و باڤا
شەمال ددی تەر هیڤا شەڤا
ئەز ئاشقم تو قوودوومێ من
قەوەت تو نەبە مەری هێچن

***



تەمام دنێ وێ یەکێ زانە
بەدەوییا کەچا کورد عەیانە
قیزا کوردا هیڤا یەکشەڤە
شەمال گەش چاستیرک دەردکەڤە

***

کەچا کوردا کارا غەزالە
ئەو دلێ من دا زەعف دەلالە
قیزا کوردا بۆی من عەمرە
روحێ من شەڤرۆ وێ دگەرە

***

تو کەچا کوردا ئەز کوڕێ کورد
بەسە ل من خی کولا ئو دەرد
ئەز بۆی تە دنالم - دکالم
گەلۆ خوونا تەدا ناگەرم؟
قیزا کوردا قیزا کوردا
تو لەتیفا ئەشقا دلا

لەم شیعرە جوانەدا عەلی گفتوگۆ لەگەڵ کچی کورد دەکا، بەزمانێکی ڕەوان و ساکار، کوردییێکی پەتی، وەسفی جوانی دەکا، بەبەژن و باڵای هەڵدەڵێ، ئەو نهێنییەی لە ناو دڵیدا هەیە بۆی ئاشکرا دەکا و دەیەوێ تێی بگەیەنی خۆشی دەوێ، کە ئەو خۆشی بوێ پێویستە کچەکەش عەلی خۆش بوێ، بەڵگەی شاعیر ئەوەیە کچەکە کوردە، عەلی پێی دەڵێ کە تۆ کورد بی منیش کوردم بۆیە پێویستە بۆ یەکتری بین.

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «کوردستانا عەزیزرا» دەڵێ:

کوردستانا مە تو چقاسی شرینی
تو بۆ کوردا رۆنایا چەڤانی
ناڤێ تە هەر دلەکیدا گولە
چاواخوون ناڤ دلدا دوخولخولە

***

راسته ئەز چووک بووم لێ کال و باڤ
وور دبێن خوون کشیایە وەکە ئاڤ
لێ کوردا شەرکرییە مێرخاسی
وەتەنێ خوە نەفرۆتییە تو کەسی

***

خوونخۆرا تو برینداردکری
ئو کۆکا ملەتێ مە دبری
مالهەبوونا تە ژی تالان کر
دوور دسەکنی ب تە قەلف کر

***

ئەز لاوەکی کوردایی ناڤسەرە
تاریقا تە دخوونم سەرانسەرە
دل و هناڤێ من دپەرتە
لەما ژی سوژدەدارم ئەز بەر تە

***

ئو من خاندییە فەقی یێ تەیرا
ئەحمەدێ خانی دەلالێ دلا
مەللەیێ جزیری ئو جەگەرخوون
دل – هناڤێ من بوونە کاف و نوون

***

ئەو نالیانە کالیانە ژ دەردا
ریا ئازایێ دا نە پێشیا کوردا
هەر شەرەکەوان بۆ مە ئۆجاخە
تو قەوەت تو نە ژ دلا دەرخە

***

دلێ منی زەلوول هێسا نابە
قەلبێ منی رەشە قەت قەنج نابە



سەبا تە قدوومێ من شکەستنە
ئەز زانم کوردستان جییێ مێرانە

***

کوردستان تو مەسکەنە بۆک – بەرانا
تاریق شەدەیە بۆی وان تالانا
کوشتنا مێرا میرات بوونا مالا
رەشهەشێ ژ نا ئو داغا دلا

***

کوردستانا مە تو چقاسی شرینی
تو بۆ کوردا رۆنایا چەڤانی
ناڤێ تە هەر دلەکیدا گولە
چاوا خوون ناڤ دلدا دوخولە

عەلی ئەم شیعرەی لە ساڵی **١٩٦٢** هۆنیوەتەوە، لەو کاتەی دەسەڵاتە عەسکەریتارییەکەی عەبدولکەریم قاسم لە بەغدا دەستی کرد بەبۆمبابارانی کوردستانی عیراق لە دژی مافە ڕەواکانی کورد و شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی **١٩٦١** دەستی پێ کرد. شاعیر لەم لیریکەیدا لەگەڵ ئێش و ئازاری نەتەوەکەی دەژی. شاعیر ئەگەرچی لە نیشتمان نەژیاوە و زۆر منداڵ بووە کە لەوێ ئاوارە بووە، ئەمە زیاتر خۆشەویستی خاکی لە ناو دڵیدا چەسپاندووە. لەو شیعرەدا عەلی یادی هەندێ لە ڕەمزە ڕۆشنبیرییەکانی دەکاتەوە، بە شانازییەوە ناوی فەقێ تەیران و ئەحمەدی خانی و مەلای جزیری و جیگەرخوێن دەبا.

***

عەلی عەبدولڕەحمان یەکێکە لە ڕۆشنبیر و نووسەرانی کوردی قەفقاسی ڕووسیا. دەوری گرنگی بووە لە پەرەپێدان و پێشخستنی خوێندەواری لە کۆمەڵی کوردی ئەو وڵاتەدا. مامۆستای قوتابخانە بووە، لە ڕۆژنامەگەری کاری کردووە، کێڵگەی کشتوکاڵی بەڕێوە بردووە، جەنگاوەری سەنگەرەکانی جەنگی ڕووسیا و ئەڵمانیا بووە لە ماوەی پێنج ساڵدا بەڵام پیشەی بنچینەیی ئەدەب بووە. بەرهەمە ئەدەبییە داهێنراوەکانی لە وتار و چیرۆک (کورت و درێژ) و ڕۆمان نموونەییێکی بەرزن لە کولتووری نەتەوەیی کورد.

## بەشی بیست و هەشتەم

### هەژار

### ١٩٢٠ - ١٩٩١

### ژیانی

عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی لە گوندی شەرەفکەندی سەر بە شاری مەهابادی ناوچەی موکریان لە ساڵی ١٩٢٠ لە دایک بووە. باوکی مەلا بووە لە گوزەراندا دەستی کورت بووە وەکوو زۆربەی مەلایانی کوردەواری، دیارە هەر لەبەرئەوەش نازناوی «هەژار»ی هەڵبژاردووە، لە مەیدانی شیعر و ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەو ناوە ناسراوە. خوێندنی سەرەتایی هەژار لای باوکی بووە، لە حوجرەی چەند مزگەوتێکی جیاواز خوێندوویەتی، لە منداڵییەوە لەگەڵ فەقێ و شاعیر و خوێندەوارانی ئەو سەردەمە هەڵساوە و دانیشتووە. بەکۆششی خۆی فێری زۆر شت بووە بەتایبەتی لە بابەت ژیانی گوندایەتی و کۆمەڵی کشتوکاڵییەوە. لە دەوروبەری جەنگی دووەمی گێتی و پەیدابوونی ڕێکخراوی سیاسی کوردی وەکو (ژ. ک.) لە مەڵبەندی هێزی سیاسی نزیک بۆتەوە تا گەیشتۆتە ئەوەی ببێتە یەکێک لە نزیکەکانی قازی محەمەد. لە پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان ماوەیێک خۆی شاردۆتەوە ئینجا لە ساڵی ١٩٤٨ وڵاتی بەجێ هێشتووە و لە بەغدا نیشتۆتەوە. بۆ دابینکردنی نانی ڕۆژانەی هەموو جۆرە کارێکی کردووە: شاگردی چایچی، شاگردی چێشتخانە، پالەیی، دانانی ستۆدیۆی وێنەگرتن.

لە ساڵی ١٩٥٣ لە فیستیڤاڵی لاوانی گێتی لە شاری بوخاریستی ڕۆمانیا بەشدار بووە. ماوەی دوو سێ ساڵێک لە ئاوایی توربەسپیان لە سووریا حاجۆ ئاغای دەوڵەمەندی کورد بەخێوی کردووە و لە سایەی ئەودا ژیاوە. لە ساڵی ١٩٥٧ لەوێ بووە، لە پاشانا گەڕاوەتەوە بەغدا. کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی بەغدای ١٩٥٨ دەرگای گوشادی لە ڕووی هەژاردا کردەوە، لە هەژاری ڕزگاری بوو، بەتایبەتی لە دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی لە ئاوارەییەکەی ڕووسیایەوە بۆ وڵات. ناسیاوی لەگەڵ بارزانی پەیدا کرد و بوو بەیەکێک لە هەرە نزیکەکانی. ماڵ و حاڵی لە بەغدا ڕێکخست و خۆشی لە هاتوچۆدا بوو لە نێوان بەغدا و شاخەکانی کوردستانی عیراق بەتایبەتی لە کاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٦١.



لە ساڵی ١٩٧٥ لەگەڵ هەرەسی شۆڕشی کورد ماڵی هەژار لە بەغدا تالان کرا و خێزان و منداڵەکانی لە ئێش و ئازار ڕزگارییان بوو و هەموو ڕوویان کردەوە مەڵبەندی ژیانیان لە ناوچەی موکریان. ئیتر لە دوای کوودیتا ئیسلامییەکەی خومەینی هەژار کاتی خۆی تەرخان کرد بۆ دانانی فەرهەنگی زمانی کوردی و وەرگێڕان و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردیدا. هەژار لە ساڵی ١٩٩١ کۆچی دوایی کرد و لە مەهاباد بەخاک سپێررا.

### بارزانی لە بیری هەژاردا

هەژار بەشێوازێکی تایبەتی بەخۆی کوردایەتی دەکرد، چارەنووسی کوردی دەبەستەوە بەسەرۆکی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، لە پێشانا لە کوردستانی ئێران ئەو سەرۆکەی لە کەسێتی قازی محەمەد دەدی. لە دوای ڕووخانی کۆمار و هاتنی خۆی بۆ بەغدا و گەڕانەوەی بارزانی بۆ نیشتمان، وێنەی ئەو سەرۆکەی لەودا دەدی. بۆیە لێی نزیک بووە و خۆشەویستی بەرامبەری گەیشتە پلەیێکی گیانی و بوو بەجۆرە پەرستنێک. جا هۆی ئەمە بێ گومان بیری کوردایەتییەکەی هەژارە، ڕەنگە ئایین و تەریقەتی دەروێشی نەقشبەندی بنەماڵەی بارزانییان دەوری هەبووبێ. شاعیر لە ساڵی ١٩٥٨ەوە تا کۆچی دوایی زۆربەی هەرە زۆری شیعری تەرخان کرد بۆ پێداهەڵدان و شانازی کردن بەکەسێتی مەلا مستەفای بارزان و بنەماڵەی بارزانییان.

### شیعری

هەژار شیعری کەم نییە، بەدرێژایی ژیانی شیعری وتووە. شیعر لای ئەو بۆ ڕووداوی سیاسییە، بۆ هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتییە. ئەگەرنا هەژار زیاتر ئامادە بووە لە پەخشاندا سەربکەوێ. مەبەس پەخشانی هونەرییە، کەچی تا ڕادەیێک ئەوەی پشتگوێ خستووە. لە کاتێکدا پەخشانی نووسیوە ئەگەر ڕۆژنامەنووسێک داوای وتارێکی ئەدەبی لێ کردبێ.

### شیعری هەژار لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری بەحری عەرووزی کلاسیکی لە بەرهەمی هەژاردا کەمە. ئەوەی هەیەتی ئەویشی بۆ دڵداری بەکار نەهێناوە بەڵکو بۆ بیری کوردایەتی. بەڵام شیعری میللیی خۆماڵی یەکجار زۆرە، کێشە بنچینەییەکانی شیعری میللی بەکارهێناوە، قافیەی جووتە (مەسنەوی). گەلێ لەم جۆرە شیعرەی لە بەیتی میللی سەرزار دەکەون (فۆلکلۆر)، ئەگەر لە ناوەڕۆکدا هەست بەهەندێ وێنەی ڕووداو و زانیاریی ڕۆشنبیرانە نەکرێ پیاو وا دەزانێ

ئەو شیعرانە بەشێکن لە ئەدەبی میللیی سەرزار. لەبەرئەوە ئەم جۆرە بەرهەمانەی هەژار دەچنە ناو شیعری پەروەردەییەوە (دیداکتیکی). هەندێ لەو شیعرانەی زۆر بڕ ناکەن، زوو بەسەردەچن، چونکە وەک برووسکەییێکی هەواڵی سیاسی دەکەونە بەرچاو پاش ماوەیێک جوانکارییەکەیان نامێنێ.

## شیعری هەژار لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

بەشێکی کەم لە بەرهەمی هەژار دەچێتە ناو خانەی دڵداری و وەسفی سروشتەوە. بەشی هەرە زۆری ستایش و پێداهەڵدان و شانازی کردنە، ئەمەی تێکەڵ کردووە بەسیاسەت بەمانای ئەو بەسەرهاتانەی بەسەر کورد هاتوون لە ڕۆژگارانی ژیانی شاعیردا. لەم ڕووەوە شیعری بەچوار قۆناغدا تێپەڕیوە:

١- سەرەتا تا ساڵی ١٩٤٨: لەم ماوەیەدا شیعری بریتی بووە لە ستایش و پێداهەڵدان. ئیلهامی لە خۆشویستنی قازی محەمەد و دامودەسگای کۆماری کوردستان وەرگرتووە. خۆی بە ستالین و سوپای سووری سۆڤیەتی کۆن خەریک کردووە، داس و چەکوشی کردووە بەرەمزی مرۆڤایەتی. چونکە دەسەڵاتی سۆڤیەت دەستی هەبوو لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان.

٢- قۆناغی بەغدا ١٩٤٨ - ١٩٥٨: لەم ماوەیەدا شاعیر دوو سێ ساڵ لە سووریا ژیاوە. لەم قۆناغەدا شیعری ڕەنگدانەوەی بیری کوردایەتییە. ئەگەر لە پێشانا زۆرتر خەریکی ئەوە بووبێ هێرش بباتە سەر عەجەم، لەم دەورەدا زیاتر باس لە خراپەی هەموو هاوسێکانی کورد دەکا وەکو تورک و عەرەب و عەجەم.

٣- قۆناغی بەغدا و کوردستان ١٩٥٨ - ١٩٧٥: ئەوی ڕاستی بێ ماڵی خێزانی هەژار لەم ماوەیەدا لە بەغدا بووە، خۆی لە هاتوچۆدا بووە لە نێوان بەغدا و ناو شاخەکانی کوردستانی عێراق بەپێی پلەی پێوەندی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ بەدەسەڵاتی بەغداوە، چونکە ئەو پێوەندییە لە هەڵبەزین و دابەزیندا بووە. لەم قۆناغەدا زۆربەی شیعری هەژار لە ستایشی بارزانی و شۆڕشی کورد بووە، هەروەها لە دژی خراپەی هاوسێیانی کورد بەتایبەتی عەرەب.

٤- قۆناغی دوایی لە ماڵی خۆی لە مەهاباد ١٩٧٥ - ١٩٩١: لەم قۆناغەدا هەژار خۆی بەشیعر وتن خەریک نەکردووە، بەڵام ئەو شیعرەی وتوویەتی هەمووی لەسەر بارزانییە، بەهۆی یادی کۆچی دواییەوە، لە یادی ساڵی یەکەمەوە ١٩٨٠ دەستی پێ



کردووە تا یادی ساڵی یازدەمین ١٩٩٠. واتە لە هەموو ساڵێکدا شیعرێکی داناوە بۆ یادی کۆچی بارزانی تا کۆچی دوایی هەژار خۆی.

هەژار لە بابەت شیعری خۆیەوە ڕاستییێک دەردەبڕێ کە دەڵێ هەرکەسێکی بێگانە لە هاوسێکانی کورد یا هەر دەوڵەتێکی گەورەی ئەورووپا ئەگەر چاکەی لەگەڵ کورد کردبێ ستایشی کردووە، لە پاشانا ئەگەر خراپەی کردبێ لە دژی نووسیوە، لەوانە بۆ بەڵگە دەوڵەتێکی وەکو سۆڤیەتی کۆن و ڕووسیا، یا دەسەڵاتێکی وەکو عیراق و عەبدولکەریم قاسم. ئەمە لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مافی مرۆڤەوە، بەڵام لە ڕووی جوانکارییەوە پلەی بەرزی و نزمی هونەری بەرهەمەکە بڕیار لەسەر ئەوە دەدا دەچێتە ناو ئەدەبی نەتەوەوە یا لێی دوور دەخرێتەوە.

## نموونەی بەرهەمی شاعیر

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «هەر کوردم» هەژار لە ساڵی ١٩٤٨ لە بەغدا نووسیویەتییەوە دەڵێ:

بە دەربەدەری یان لە ماڵی خۆم
لە خاکی عەرەب لە ئێران و ڕۆم
کۆک و پۆشتە بم ڕووت و ڕەجاڵ بم
کۆشکم دە قات بێ ویرانە ماڵ بم
ئازا و ڕزگار بم شادان و خەندان
یان زنجیر لە مل لە سووچی زیندان
ساغ بم جحێڵ بم بگرم گوێسوانان
یان زار و نزار لە نەخۆشخانان
دانیشم لەسەر تەختی خونکاری
یان لە کۆڵانان بکەم هەژاری
کوردم و لە ڕێی کورد و کوردستان
سەر لە پێناوم گیان لەسەر دەستان
بەکوردی دەژیم بەکوردی دەمرم
بەکوردی دەیدەم وەرامی قەبرم

بەکوردی دیسان زیندوو دەبمەوە
لەو دنیاش بۆ کورد تێهەڵدەچمەوە

هەژار لەم شیعرەدا سوورە لەسەر ئەوەی کوردە و هیچ شتێکی دیکە نییە. ئەگەر دەست کورت و بێنەوا بێ، ئەگەر دەربەدەر و ئاوارە بێ، ئەگەر ژێردەست و دیل بێ، واز لە کوردایەتی ناهێنێ و هەوڵ دەدا لەم هەموو مەینەتییە خۆی و میللەتەکەی ڕزگارییان بێ. لە پاشانا هەژار کوردایەتی دەکا بەبیروباوەڕ و ئیدیۆلۆجییەت دەیگەیەنێتە پلەی ئایین بەوەی بەکوردی دەژی و بەکوردی دەمرێ، ئەگەر لە ڕۆژی حەشردا جارێکی دیکەش زیندوو بێتەوە هەر کوردە، واتە لە بەهەشت و دۆزەخدا کوردایەتی دەکا.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «کوردم» نزیک لە مانای شیعرەکەی پێشوو لە بەغدا لە ساڵی ١٩٦١ نووسراوەتەوە دەڵێ:

برا زۆر سەیرە نەمناسی من هەر زۆر لە زوو کوردم
کە تۆ پێنج شەش کەرەت گۆڕاوی من بێ سێ و دوو کوردم
لە تەکیە بوویە جێگر ڕێگر و مێگر لە بن بەرماڵ
ئەمن لەوساوە جێ و بانم لە بانی بێشکە بوو کوردم
عەجەم بووی بوویە تورک و بوویە عارەب ئێستە سەرشێواو
ئەمن بێ گێلمە گێلم و کەشمەکەش بێ «چاشنو» کوردم
سپی بووی بوویە شین و بوویە سوور و ئێستە ڕوو زەردی
ئەمن یەک ڕەنگ و ڕوو وەک پیاوی خاوەن ئابڕوو کوردم
کە تۆ بۆ مز لە ناو مزگەوتی کوردستانە ڕووگەی من
کە تۆ دەروێشی زەرگ و مەرگی من بێ هایوهوو کوردم
کە تۆ پەل بۆ هەموو جێیێک ئەکێشی و بێ ڕەگ و بنجی
ئەمن گەر پەلپەلیشم کەن لەسەر یەک ڕێگەم و کوردم
دڵت بۆ پارە پارە بیر لە لیرەگیرە دەم بۆ دەم
سەراپا ڕەگ بەڕەگ ئێسقان بەئێسقان موو بەموو کوردم
کە تۆ دەرپێت فڕێدا و چاکەتی چاکت دەبەر خۆ کرد
ئەمن شەرمم بەخۆ و شاییم بەخۆمە جل شڕ و کوردم



کە تۆ گیرفان پڕی گیرفان بڕی من هەر (هەژار) ماوم
کە تۆ خۆت دا بەخواردن من لەگەڵ گاڵ و بەڕوو کوردم

لە شیعرەکەی پێشوودا هەژار سوورە لەسەر ئەوەی کوردە. ئەم شیعرە وەکو شیکردنەوەی شیعرەکەی پێشوو دەکەوێتە بەرچاو. لەمەدا دەیەوێ ئەو دەربڕێ ڕۆژێ ڕۆژان لە کوردایەتی خۆی خۆش نابێ و ناگۆڕێ. لێرەدا باس لەو کەسە بێبارانە دەکا، بیروباوەڕی چەسپاوی نەگۆڕاویان نییە. هەردەمە هەڵسوکەتێکیان هەیە بەتەرازووی بەرژەوەندی خۆیان دەیکێشن. لەم شیعرە جوانەدا شاعیر وێنە و مانای داهێنراوی تازەی دروست کردووە، هەندێ ڕەوشتی موتڵەقی هێناوەتە ناوەوە کەس لە ڕاستی و دروستی ئەو ئەخلاقە لاری نییە، ئەمە خاوەنی شیعرەکە و خوێنەریش دەگرێتەوە.

٣

لە وەسفی بەهاردا لە شیعرێکی بەناوی «بەزمی بەهار» هەژار دەڵێ:

مزگێنی دا بەسروە بای بەهاری
وا هاتەوە نەورۆزی کوردەواری
بەتیشک تێک شکا سوپای کرێوە
هەواری ڕۆژ گەیشتە خاکەلێوە
فەرمان درا بەسەوزە سەر هەڵێنێ
چیدی لە بەندی خاکی ڕەش نەمێنێ
با دەرکەون کوڵ و کەسەر بنێژن
با ڕۆژی ڕزگاری بکەن بەجێژن
شەماڵ گەواڵ گەواڵ هەور بنێرێ
ئاهەنگ و بەزمی جەژنی پێ بسپێرێ

ئەم شیعرە کورتە بەهارییە تام و بۆنێکی تایبەتی هەیە، لەو هەموو شیعرە زۆرەی لەم بابەتەوە وتراوە جیا دەبێتەوە. شاعیر باس لە شەڕ و زۆرانبازی زستان و بەهار دەکا، زستان وەک بەڵگەی ناخۆشی و بەهار وەک بەڵگەی خۆشی. لێکچواندنەکانی و هەندێ وێنەی دیمەنی زستان و بەهار کە بەراوورد دەکا و شەڕ لە نێوانیان دروست دەکا و لە دوا جاریش بەهار سەر دەکەوێ، وەکو بڵێی شاعیر شێوازێکی ڕەمزی (سیمبۆلی)

بەکارهێناوە و زستانی کردووە بەرەمزی دیلیەتی و بەهاریش بووە بەرەمزی سەربەستی. مانای دیار و مانای شارراوە لەم پارچە شیعرەدا هەردووکیان جوانن.

## ٤

هەژار بۆ قازی محەمەد لە شیعری «پاڵەوانان ناترسن»دا دەڵێ:

دەرگای شێران کرایەوە
دار و بەرد دەنگی دایەوە
گوێ لە زرەی زنجیر بگرن
پاڵەوان ناترسن بمرن
بۆ مەرگ دێن بەئازایی
دەڵێی دەڕۆنە سەرشایی
مەردانە هەنگاو هەڵدێنن
بەدکار بەتوندی دەدوێنن
ڕوو گرژن بەرامبەر دوژمن
دەم بە بزەن بەرەو مردن
وا پێشەوای کوردان قازی
پێشەوایە بۆ گیان بازی
گوڕەی ماتی شەو دەشکێنێ
دڵی زۆردار دەلەرزێنێ

شاعیر لە خاوەن بیروباوەڕێکی وەکو قازی محەمەد دەدوێ، دەیزانی لە خەباتیدا لە ڕێی کوردایەتی ئەگەر سەرنەکەوێ ئەنجامی مەرگ دەبێ. لەبەرئەوە ئازا و نەترس بوو. شاعیر باس لەو هێزە نهێنییە دەکا کە قازی محەمەد باکی بەمردن نەبێ و لە کاتی پێویستدا ئازایانە پێشوازی بکا. هەواڵێکی وا لە ناوەوەیە گۆیا پیلانیان بۆ دانابوو ڕزگاری بکەن بەوەی بۆ وڵاتی دەرەوەی ئێرانی بنێرن. بەڵام وتبووی: بۆ شەرمەزارم دەکەن بەرامبەر بەکورد، ئەگەر من ڕا بکەم ژیانی ئەوان دژوارتر دەبێ، ئەو کاتە چیم پێ دەڵێن!.

## ٥

هەژار بۆ مستەفا بارزانی بەهۆی یادی حەوتەمینساڵی کۆچی دوایی (١٩٨٦) لە شیعرێکیدا بەناوی «ئەستێرەییێکی گەش» دەڵێ:



دەڵێن ئەوانەی خۆشەویستمانن
تا لە بەرچاون لە بەردڵانن
یەکتر نەدیتن لێک دووربوونەوە
دەبن بەمایەی لە بیرچوونەوە
بەڵێ بۆ کەس و دۆستی ئاسایی
سەبووری دەرە مەودای جودایی
نەک بۆ مەردێکی بەلەش نەدیوە
ناوی تەواوی دنیای تەنیوە
ئەو مەردەی کە بۆ لە بیرچوون نابێ
با بەڕووالەت لە گڵکۆشدا بێ

لەم شیعرەدا هەژار بەراوورد لە نێوان دوو جۆرە مردن دەکا، یەکێکیان لە بیر دەچێتەوە زوو بێ یا درەنگ، ئەوی دیکەیان لە بیر ناچێتەوە. یەکێکی وەکو بارزانی هەرچەندە لەگەڵ ئەوانەیە کە لە بیر ناچنەوە، بەڵام لە ناو ئەوانیشدا جێگەی تایبەتی هەیە، هەژار لە ژیان و مردندا بەدیاردەییێکی تایبەتی دادەنێ وەکو لە سەرانسەری ئەو شیعرە زۆرانەی بۆ ئەوی وتووە دەردەکەوێ.

***

عەبدولڕەحمان هەژاری شەرەفکەندی موکریانی یا تەنیا هەژار. زۆرتر شیعر و کەمتر نووسینی ئەدەبی هەیە. لە ڕووی هونەرییەوە پەخشانی لە شیعری بەهێزترە، یا ڕاستتر شێوازی شیعری لە وتارە ئەدەبییەکانیدا بەکار دێنێ. پەخشانی نموونەی کوردی پەتییە، زۆرتر دەشکێننەوە سەر تەعبیر و لێکسیکۆنی کۆمەڵی گوندایەتی و کشتوکاڵی. بەگشتی شیعری لە شێوازی میللی فۆلکلۆرییەوە نزیکە، ناوەڕۆکی کوردایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕووداوی ڕۆژانەی بەسەرهاتی کوردە. بەشێکی زۆر لە شیعری بۆ ستایش و پێداهەڵدانی بارزانی و بنەماڵەی بووە. پێوەندی بەوەوە گەیشتۆتە پلەی سۆفیزم لەبەرئەوە دەکرێ بەشاعیر بارزانی ناو ببرێ.

جگە لە شیعر و پەخشانی ئەدەبی، دانانی فەرهەنگی زمانی کوردی، لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی و وەرگێڕان لە زمانانی بێگانەوە کاری بنچینەیی هەژار بووە لە دوا قۆناغی ژیانی لە مەڵبەندی لە دایکبوونیدا. تەنانەت قورئانیشی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

## بەشی بیست و نۆیەم

## دڵزار

**١٩٢٠ – ٠٠٠٠**

### ژیانی

ئەحمەد کوڕی مستەفا کوڕی محەمەد ئاغای حەوێزی لە ٨ی کانوونی دووەمی ١٩٢٠ لە شاری کۆیە لە دایک بووە. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا ماوەی دوو ساڵێک لە حوجرەی مزگەوت خوێندوویەتی و لە ساڵی ١٩٢٩ چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی، لە پاشانا قوتابخانەی ناوەندی و لە ساڵی ١٩٤١ کۆتایی بەم قۆناغە هێناوە و دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە. لەو کاتەوە کە دەستی کردووە بە شیعر وتن نازناوی «دڵزار»ی هەڵبژاردووە و بووە بەو ناوەی کە پێی دەناسرێتەوە.

لە ناوەڕاستی جەنگی دووەمی گیتی (١٩٤٢) بووە بەسەرباز لە تیپی تایبەتی «لیڤی». ئەم تیپە سوپاییە لە لایەن ئینگلیزەوە دامەزرا بوو لە دوای داگیرکردنی عیراق (١٩١٨). سەربازەکانی لە هەموو میللەت و کەسانی دانیشتوانی عیراق پێکهاتبوو، زۆریان لە ئاسوورییەکان بوون لە ناو کوردەواریدا تەیارییان پێ دەڵێن. دڵزار نزیکەی سێ ساڵ و نیو لە ڕیزی ئەم تیپە سوپاییە مایەوە. بەشێکی ئەم ماوەیەی لە فەلەستین بردە سەر.

لەو کاتەی لە خزمەتی سوپا ڕزگاری بوو لە ساڵی ١٩٤٦ گەڕایەوە کۆیە. لەو کاتەدا پێوەندی بەکۆمۆنیستانەوە کرد، لە دوای ماوەیێکی کەم لە لایەن دەسەڵاتەوە بۆ یەکەمین جار گیرا، لەوساوە تا ئێستا کار و پیشەی مووچەخۆری نەبووە بۆ دابینکردنی گوزەرانی، بەڵکو کادیرێکی حیزبی بووە، بەئاشکرا و نهێنی لە ڕیزی ڕێکخراوی کۆمۆنیستاندا کاری کردووە.

دڵزار بۆ جاری دووەم لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٨ گیراوەتەوە، لە کۆیەوە ڕەوانەی هەولێر کراوە. لە سەرەتای ١٩٤٩ دادگا فەرمانی شەش مانگ بەندکردنی دەرکردووە و نێرراوە بۆ بەندیخانەی نێوەندیی بەغدا. لە ناو بەندیخانە لەسەر جموجۆڵی سیاسی تاوانبار کراوە و دادگا فەرمانی سێ ساڵ بەندکردنی بۆ دەرکردووە و ناردوویانە بۆ



بەندیخانەی کووت. لە هاوینی ١٩٥٢ ئازاد بووە و گەڕاوەتەوە کۆیە. ئیتر دەستی کردووە بەژیانی نهێنی لە ڕیزی کۆمۆنیستاندا. لە ساڵانی ١٩٥٢ – ١٩٥٣ لە هەولێر بووە، ئینجا نێرراوە بۆ سلێمانی، لە پاشانا لە ئاغستۆسی ١٩٥٤ گوێزراوەتەوە کەرکووک. لەو ماوەیەدا دەسەڵات هەوڵی دەدا بیگرێ، بەڵام خۆی بەدەستەوە نەدەدا. لە دوای ماوەیێک چووە بۆ هەڵەبجە لەوێ گیراوە و بە بەندکراوی نێرراوەتە کەرکووک، ئینجا بەدەستبەسەری ڕەوانەی بەندیخانەی نوگرەت سەلمان کراوە لە سارای باشووری عیراق. لە ساڵی ١٩٥٦ ئازادبووە و گەڕاوەتەوە کۆیە و بەنهێنی ژیاوە تا کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا. لەم ماوەیەدا تا ساڵی ١٩٦٠ خەریکی کاروباری سیاسی کۆمۆنیستەکان بووە لە کۆیە. لەو ساڵەدا کراوە بەدەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی «ئازادی» لە بەغدا.

لە دوای کوودیتا فاشستییەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ چۆتە ناو ڕیزی کۆمۆنیستە چەکدارەکان کە بنکەیان لە گوندی کەڵکەسماق و لە پاشانا لە گوندی ئاوەگرد بوو لە ناوچەی کۆیە. لە ساڵی ١٩٦٧ بەملاوە چاوی دەسەڵات زۆر بەدوای کۆمۆنیستەکانەوە نەبوو، بە تایبەتی لە دوای بەیانی ١١ی مارتی ١٩٧٠.

لە ماوەی ١٩٧٠ – ١٩٧٢ بەشداری لە دەورەیێکی ڕۆشنبیری کردووە لە مۆسکۆ لە بارەی فیکری مارکسییەوە، هەروەها لە ئەکادیمیەی بولگاریا لە سۆفیا باوەڕنامەی زانستییە کۆمەڵایەتییەکانی وەرگرتووە و ئینجا گەڕاوەتەوە وڵات. لە ساڵانی ١٩٧٢ – ١٩٧٣ بووە بە وانەبێژ لە قوتابخانەی کۆمۆنیستەکان لە گوندی دەرگەڵە و مێژووی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت و بزووتنەوەی کرێکارانی گیتی وتۆتەوە.

لە دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٢ کە دەسەڵاتی عیراق بەدەست پارتی بەعسەوە بوو پەیمانی ستراتیجی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە مۆر کرد و لە بەهاری ١٩٧٤ لەگەڵ شۆڕشی کورد تێکچوو، شایلۆغان و دەست لە ملانێ بوو لە نێوان پارتی بەعس و پارتی کۆمۆنیست. بەرەی نیشتمانییان دامەزراند، دڵزار لەگەڵ نۆ کەسی دیکە بەناوی کۆمۆنیستەوە بوون بەئەندام لە ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی ئەڤتۆتۆمی کوردستان. ئیتر لەو کاتەوە حاڵ و باڵ و گوزەرانی دڵزار و کۆمۆنیستان باش بوو تا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٩، لەو کاتەی بەعس لەمانەش هەڵگەڕایەوە، ئیتر دڵزار ناچار بوو چووە پاڵ ڕێکخراوی کۆمۆنیستەکان لە ناوزەنگ و پشت ئاشان تا ساڵی ١٩٨٣. لەو ساڵەوە چووە

سووریا، ئینجا بولگاریا لە پاشانا سوید و بوو بەپەنابەری سیاسی تا ساڵی ١٩٩٤ و بەیەکجاری گەڕایەوە نیشتمان و هەولێری کردە نیشتەجێی هەمیشەیی خۆی و ئێستا خەریکی حەسانەوە و خوێندنەوە و نووسینی یادداشتەکانی خۆیەتی.

## شیعری

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

دڵزار لە ساڵی ١٩٤٠ دەستی داوەتە شیعر و لە هەموو بابەتەکانی وتووە ئەوانەی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا باو بوون، زۆربەی مەبەسە کۆن و نوێکانی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لەگەڵ ئەو بابەتە شیعرانەدا گونجاندووە. لە شیعری عەرووزیدا بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەل و موتەقاریب و ڕەجەز و سەریعی بەکارهێناوە. لە دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی ئەم دەنگانەی کردووە بەقافیە: ا ت د ر ز ل م ن (ە – ـە) و وو ی ێ. کۆمەڵێک وشەی کردووە بەپاش قافیە: ئەدەبین، ئەکا، بێ، نەبێ، ڕۆ (ڕۆیشت)، تۆ، من، کەم (بکەم)، محەمەد، گرتووە.

هەردوو جۆرە قافیەی لەم بابەتە شیعرەدا بەکارهێناوە، یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی). لە شیعری میللیی کێشی سیلابی خۆماڵیدا دڵزار دەوڵەمەندە، زۆربەی کێشەکانی بەکارهێناوە بەتایبەتی دە و هەشت و حەوت بڕگەیی. لە قافیەشدا گەمەی هونەری زۆرە. لەم بەشە شیعرەیدا یەکێتیی قافیە دەبینرێ، هەروەها قافیە خۆماڵییەکانی (ا ب ا ب)، (ا ا ب ب جـــ جـــ)، (ا ا ب ا)، (ا ا ا ا)، (ا ا ا ب) و هی دیکەی بەکارهێناوە.

شیعری لەم بابەتەی بەقەوارە کورتن دەچنە ناو لیریکەوە، قەسیدە (پۆیێم)ی کەمە. لە هونەرەکانی شیعر جگە لەم دوو بابەتە پێنجینی هەیە، دوو جۆرە قافیەی تێدا بەکارهێناوە (ا ا ا ا ب)، (ا ا ا ب ب)، هەروەها قەسیدەی شەشینیش بەرچاو دەکەون بەقافیەی (ا ا ا ا ب ب). لەمانەش زیاتر دڵزار بایەخی زۆری بەموستەزاد داوە و هەندێ دەسکاری هونەری تێدا کردووە لە ڕووی ڕوخسارەوە واتە ژمارەی دێڕە کورت و درێژەکانەوە.

دڵزار یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی سەردەقی «شیعری نوێ»ی کوردییان شکاندووە و ئەو جۆرە شیعرەیان هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا. شاعیر لە لیریکێکدا چەند کێشێک بەکار دێنێ، کێشە بنچینەییەکانی دە و هەشت بڕگەیی کەرت دەکا، خۆیان و کەرتەکانیان لە شیعرێکدا بەکار دێنێ. قافیەی ئازاد کردووە



و هارمۆنیای ناوەوەی پاراستووە. لە پێنج خشتەکیدا دەستی هەیە، شیعری نالی و ڕاجی کردووە بەپێنج خشتەکی.

وشەی فەرهەنگی زمانی شیعری ئاسان و ڕەوانە. لە بەپەتیکردنی شیعری کوردی دەوری هەیە. جار جارە وشە و لێکسیکۆنی دیالێکتی ناوچەیی شێوازی کۆیە بەکار دێنێ. هەندێ جار وشە بەفۆنێتیکی دەشت و ئاوەدانییەکانی کشتوکاڵی تۆمار دەکا. دڵزار بایەخی زۆری بەڕەوانبێژی داوە بەتایبەتی ئەو لایەنانەی پێوەندییان بەڕیتم و مۆسیقای دەنگەکانی وشەوە هەیە.

### شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

دڵزار شاعیرێکی خۆڕسکی ڕەسەنە، لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە زۆربەی مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی و شیعری سەردەمی خۆی وتووە. لە سەرووی هەموویانەوە دڵداری و وەسفی بووکی شیعر و سروشتی ڕەنگینی کوردستان. لەو کاتەی شیعری بۆ ستایش و پێداهەڵدانی ئیدیۆلۆجییەتی مارکسیزم و دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەت تەرخان کردووە لە ڕووی ئیستێتیکییەوە بووە بەدوو بەش:

١- بەشێکی شیعرە ڕەسەنە خۆڕسکییە سروشتییەکەیە کە دەستی پێ کردووە. لێرەدا شاعیر لە ئیلتیزامی جوانکاری نەچۆتە دەرەوە، لەبەرئەوە فیکر (ئیدیۆلۆجییەت) بووە بەملکەچی جوانکاری (ئیستێتیکی، شیعرایەتی) و شیعرێکی جوانی بەرهەم هێناوە.

٢- بەشێکی دیکەی شیعری بەپێچەوانەوە، ناوەڕۆکەکەی لە بیروباوەڕی ئەنتەرناسیۆنالیزمی و چینایەتی و مارکسیزم هەڵقولاوە، لێرەدا ئیستێتیکا بووە بەملکەچی ئیدیۆلۆجییەت و لە خەیاڵ و چێژی هونەری شۆراوە و لە شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) نزیک کەوتۆتەوە. ئەمەیان ئەو جوانکارییەی تێدا نییە، یا زۆر کەمە لەبەرئەوە تا پلەیێک لە شیعرایەتی کەوتووە.

دڵزار لەم جۆرە شیعرەیدا بەگشتی هەندێ تیۆری بەشیعر دەگێڕێتەوە، ڕووداوی ڕاستی مێژوو وەکو خۆی دەخاتە ڕوو، دروشمی سیاسی هێناوەتە ناو شیعرەوە، بۆ هاندانی خەڵک شۆڕش بکەن، تەخت و تاراجی کۆنەپەرست سەراوژێر بکەن، جەستەیان بپلیشێننەوە و لەناویان ببەن. داواکاری جەماوەر ئەوەیە نەیاری مارکسیزم تۆزیان نەمێنێ. بەم جۆرە زەبروزەنگ دەچێتە ناو شیعرەوە.

بەناوی سۆسیالیزمەوە هەڵوێست بەرامبەر بەڕەمزەکانی مارکسیزم گەیشتۆتە ڕادەی

پەرستن، بۆیە میللەتەکانیشیان وەکو رووس و چین و بولگار و ئەوانی دیکە، لە هەموو میللەتانی سەر رووی زەوی جیا دەکرێنەوە. ئەمانە ئادەمزادی سووپەرمانن چونکە سۆسیالیستن، ئەوانی دیکە کەم فام و دواکەوتوون چونکە بۆرجوازین! ئەم جۆرە شیعرانەی لای دڵزار و شاعیرانی دیکە دەوری پروپاگەندەیان بۆ ئیدیۆلۆجییەتێکی دیاریکراو هەیە، کاریگەرییان کاتییە و زۆر بڕ ناکەن.

بەشە رەسەنەکە لە شیعری دڵزار رەنگدانەوەی لایەنی رووناکی ژیانی ئادەمزادە، خۆی لەم وێنانەدا دەبینێ: دڵداری و وەسفی سروشت و ژیانی کۆمەڵایەتی و کوردایەتی و سۆزی مرۆڤایەتی بەرامبەر بەهاوڕێیەتی و ژیانی خۆشی و مردن و چەوساندنەوەی هەژاران و زوڵم و زۆری کاربەدەست و دەربەگی ناوەوە و ئەمپریالیست و کۆڵۆنیالیستی دوژمنی مرۆڤایەتی لە دەرەوە، وەکو دەسەڵاتە پڕ لە زەبروزەنگەکانی دەوڵەتانی بەریتانیا و فرەنسا و رووسیا و ئەمەریکا. شاعیر هەیە توانیویەتی ئەم بابەتانە بکا بەشیعری رەسەن و جوان. بەڵام دڵزار شیعری رەسەن و جوانی هەیە لە لایەکەی دیکە.

## نموونەی شیعری

١

لە کاتێکدا دڵزار لە ساڵی ١٩٤٥ سەرباز بووە لە فەلەستین بەناوی «دڵ و دڵزار» ئەم دیالۆجەی نووسیوە:

دڵ: دڵ دەڵێ دڵزار لە بۆچی سینە کوورەی ئاگری!
بۆچی فرمێسکت بەسروەی بەحری ئەبیەز ناسری!
بۆچی داری غەم بەتەوری کەیف و شادی نابری!
بۆچی بەرگی زیللەت سەر تا بەخوار دانادری!
بۆچی رێگەی رەوشەنی ژینی بەرز داناگری؟
دڵزار: ئەی دڵا بای بەحر و بەرِ ئەشکم ووشک ناکاتەوە
باغی رەنگینی فەلەستین دڵگەشیم ناداتەوە
کێوەکەی قودسی موقەددەس بەنیەتم ناباتەوە
حەسرەتی دووری وەتەن خوێنی جگەر دەخواتەوە
ناعیلاجم غەم دەخۆم کەس غەم لە بۆ خۆی ناکڕێ



دڵ:باشە گەر تۆ راست ئەکەی بۆچ ئەو غەمەت پەیدا دەکرد
بۆچی لەو خاکی بەهەشتی کوردگەلەت حاشا دەکرد
بۆچی بەقسەی ناحەز و بەد خۆت وەها ریسوا دەکرد
بۆچی سیرەی خۆت لە خاکی غوربەتا توونا دەکرد
رابەری لای خۆت لە زۆر کەس ماهیر و زاناتری
دڵزار: گەر موقەددەر بێ مرۆ بێهۆش و نابینا دەبێ
سەد هەزار جار مورشید و رابەر بێ هەر گومڕا دەبێ
راستەرێش بگرێ گەلێ جار تووشی چاڵی وا دەبێ
دوو بەشی عومری لە ناویا بەخت ئەکا و توونا دەبێ
چەشنی مردووی دێ بەسەر هەرچەند بەدیمەن نامرێ

دڵزار لەم دیالۆجەدا باس لە سۆزی ناوەوە و گیرۆدەیی خۆی دەکا بەخاکی نیشتمانەوە و ئەو دەردەبڕێ بەبێ ئەو ناتوانێ بژی. دڵ لێی دەپرسێ کەوا بێ بۆچ لێی دوور دەکەوێتەوە! لێرەدا دەڵێ: ئەوەیە بێهۆشی ئادەمزاد کە فیکری دەجووڵێ بیر لە دڵی ناکاتەوە. دەبێتە مەتریاڵێکی بە لەش زیندوو بەگیان مردوو.

٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «ئەفسانەی گوڵی شەرمن» دەڵێ:

دەڵێن کە خولقا گوڵ لە گوڵستان
سپی بوو سپی وەک بەفری کوێستان
بەڵام لەودەمەی دەمی کردەوە
بۆ ماچ کردنی رووناکی بەیان
هەستی کرد ئادەم تەماشای ئەکا
بۆیە روخساری سوور بوو لە شەرمان
راستی ئاوا بوو سەر کوڵمی یارم
پێش هەڵمژینی بەر لە رامووسان

شاعیر لەم وەسفە شیعرییە جوانەدا بۆ سووری سەر کوڵمی یار لەو ئەفسانەیە دەدوێ ئەوەی دەڵێ گوڵ لە پێشانا بەرەنگی سپی خولقاوە، لە دواییدا کە هەستی بەوە کردووە

سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاوە و تەماشای دەکەن لە شەرمانا سوور هەڵگەڕاوە، ئەو ڕوخسارەی یاریش وەکو دڵزار دەڵێ لە شەرمانا یا لە خۆشیانا سوور بووە.

٣

لە پێنجینێکیدا بەناوی «هەستە مەوەستە» لە ساڵی ١٩٨٤ لە دیمەشق نووسیویەتییەوە دەڵێ:

دە دەی هەستە مەوەستە دەستە بەستە
نیگارەی مەم هەنارەی دیدە مەستە
دڵم ئەمشەو بەڕاستی تەنگ و پەستە
لە ئەو ڕووحی ڕەزەی زۆر کۆن و خەستە
لە بۆم تێکە پەیا پەی بێنە هەستە

لە ئاواز و ڕیتمی ئەم هەموو وشانەی دەنگی «س»یان تێدایە و سێیەکی هەموو وشەکانی شیعرەکەن دڵزار سروودێکی وەسفی دڵداری دروست کردووە پێش ئەوەی قسە لەگەڵ بیر و خەیاڵدا بکا، وەک ئاوازێکی خۆش لە ناو گوێدا دەزرنگێتەوە.

٤

شاعیر لە لیریکێکیدا بەناوی «یەکگرتنی کورد» لە ساڵی ١٩٩١ هۆنراوەتەوە بیر لە دواڕۆژی کورد دەکاتەوە و ئامۆژگارییان دەکا:

زازا و کرمانج و سۆران    لوڕ و کەلهوڕ و گۆران
هەر شەش بەدەست و بردن    بڕبڕەی پشتی کوردن
گەر یەک دڵ بن ئەمانە    هەموو بەلای زەمانە
زۆردارانی سەر زەوی    سەرمان پێ ناکەن نەوی

شاعیر لە سەرەتای ساڵی ١٩٩١ کە هەستی بەوە کردووە لە ئەنجامی شەڕی عیراق و کوێت گۆڕانکارییێک لە کۆمەڵی کوردەواریدا ڕوو دەدا، لەبەرئەوە دەڵێ ئەگەر کورد بەهەموو تیرە و هۆز و توێژەکانی کۆمەڵ یەک نەگرن سەرناکەون، ئەگەر یەک بگرن هەموو زۆردارانی سەر ڕووی زەوی بۆیان ناکرێ سەریان شۆڕ بکەن.



٥

بەیادی بینینی شاعیری کورد سافی، دڵزار شیعرێک دادەنێ بەناوی «گەشتێک بۆ هیران» لە ساڵی ١٩٣٦:

ڕۆژمان کردەوە شەوێک لە هیران
بەشادمانی و سوحبەت و سەیران
ئینجا سبەینێ بەری بەیانی
کە تیشکی ڕۆژێ ڕەوشەنی هانی
وەحشی و دڕندە و حەیوانی کێوی
لە شاخ هاتنە دەر کەروێشک و ڕێوی
ئێمەش لە قیژە و قاسپە قاسپی کەو
چاومان کردەوە هەڵستاین لە خەو
سەرنجمان دایە دیمەنی باغان
دیمەنی گرد و سەر کێو و شاخان
سەراسیمە بووین لە جوانی بەهار
لە سنعەت و نەخشی پەروەردگار
سوولاوی شاخان دەبریقایەوە
بەتیشکی ڕۆژێ دەدرەوشایەوە
پاشی دیتنی ئەم دیمەنانە
ڕوومان کردەوە لای دیوەخانە
لە دوای نان خواردن چووینە ناو گوڵزار
دامان بەست یاری لە ناو مێرغوزار
ئەوێ ڕۆژێکە بەشادمانی
ڕۆژمان بەڕێ کرد لە دنیای فانی
جەنابی سافی قەدری زۆر گرتین
بەخوا بێ قوسوور خزمەتی کردین
(دڵزار) ئەو ڕۆژەی هەروا لە بیرە
کە چەندە خۆش و چەندە دڵگیرە

دڵزار وەک یادداشتێکی ڕۆژانەی ئەدەبی بەشیعر باس لەو گەشتە دەکا کە بۆ گوندی هیران کردوویەتی مەڵبەندی سافی. سروشتی بەهاری ڕەنگین و جووڵە و قاسپەی کەو و زریکەی کەروێشک و خوڕەی جۆگەکانی بناری شاخ بوون بەسەرچاوەی ئەم گەشتنامەیە. خانەخوێی شاعیر بوو بەهەوێنێکی گرنگ بۆ داهێنانی ئەم لیریکە لە وەسفی بەهار و هاوین.

٦

دڵزار وەک هەندێ لە شاعیرانی دیکەی کورد سەرسامی شیعرەکەی بێخود بووە «لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من». بەناوی «پەرێشانە دڵی من» قەسیدەیێکی بەندی چوارینی ڕێکخستووە بەم چوارینە دەست پێ دەکا:

قوربان وەرە ئەمڕۆکە پەرێشانە دڵی من
بێهۆش و بەبێگۆشە لە زیندانە دڵی من
بێئاگر و بێگڵپە لە سووتانە دڵی من
سووتاوی ڕوخ و کون کونی موژگانە دڵی من

بەم چوارینە کۆتایی پێ دەهێنێ:

دلبەر چییە بەم تاقی بڕۆت دڵ دەرفێنی
چیم کردووە خوێنم بەغەزەب وا دەڕژێنی
(دڵزار)ی هەژار بۆچی لە هیجران دەسووتێنی
نازانی کە پڕ ئاگری هیجرانە دڵی من!

لێرەدا دڵزار بەڕوخسار لاسایی بێخود دەکاتەوە، بەڵام ناوەڕۆک بابەتێکی دیکەیە. خەریکی لاواندنەوەیە بۆ شپرزەیی حاڵی لەبەر دووری لە دلبەری نازدار. شاعیر لە ڕێبازی شیعری لاسایی کلاسیکی دوور نەکەوتۆتەوە کە شاعیران لە جیابوونەوە و دووری لە دلبەر دەدوێن.

٧

دڵزار بەهۆی کوشتنی بەکر سدقی عەسکەری لە بیرەوەری چوارەمی شەهیدکردنی لە ١١ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٤١ بەناوی «شینی بەکر سدقی» ماتەمنامەی بۆ نووسیوە:

دیسان دووکەڵ و بوخاری ئەستەم
کوردستانی گرت چەشنی تۆز و تەم



باغی ژینی کورد دیسان ساوا بوو
ئەستێرەی بەختی لە کەل ئاوا بوو

***

بەگوللەی گەرمی دەستی دوژمن چوو
لە نامەی ژیندا ناوبانگی وون بوو
ئەسەف بۆ گەورەی شەهیدانی کورد
حەیف بۆ باوکی هەژارانی کورد
درێغ بۆ شێری نێری مەیدانم
بۆ بەکر سدقی ڕەئیس ئەرکانم
بۆ جەنگاوەری بەهێز و گوردم
بۆ ناپولیۆنی میللەتی کوردم

***

بڵێ ئەی (دڵزار) هەژاری غەمبار
بەڕۆڵەی ووردی کوردی سیاچار
گەر پرسیار ئەکەن لە مێژووی مەرگی
لە ڕۆژی ڕەشی پچڕانی جەرگی
لە چەرخی بیستەم ساڵی سی و حەوت
یازدەی ئاغستۆس لە ژێر خاکا خەوت

دڵزار لەم شیعرەدا شیوەن بۆ بەکر سدقی دەکا لەبەرئەوەی کوردە و وەک سوپاییێک لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی و عیراق ناوبانگی دەرکردووە. پیلانی کوشتنی ڕاستەوخۆ پێوەندی بەمەسەلەی بزووتنەوەی ڕزگاری کوردەوە نەبووە، بەڵام وەکو کوردێک لە ناو شۆڤێنیستە عەرەبەکاندا خۆشەویست نەبووە. تا ئێستاش دوژمنانی کورد بەپیاوخراپ لە قەڵەمی دەدەن تەنیا لەبەرئەوەی کورد بووە. هەستی دڵزار دڵسۆزانەیە و لە جێی خۆیەتی کە فرمێسکی بۆ کەسێک ڕشتووە کوردبوونی هۆیێکی گرنگ بووە بۆ کوشتنی.

٨

دڵزار لە ساڵی ١٩٨٧ لە لیریکێکیدا بەناوی «بۆ دەوڵەمەندێکی ڕەزیل» دەنووسێ:

سگەستووری وورگن بەرازی بەزیو
هەتاکەی دەنازی بەزێڕ و بەزیو
بەهارت بەسەر چوو ڕەزیلی ڕزیو
ژیانت لە دەس چوو بەرەو گۆڕ خزیو
لە بۆ کات و ڕۆژانی پڕ تەنگەبەر
شتێکی بەکەڵکت نەچاند بێتە بەر

لەم شیعرەدا دڵزار بەشێوازێکی داشۆرینی قەشمەری ئامێز وەسفی دەوڵەمەندێکی چاوچنۆک دەکا، نموونەی ئەم جۆرە دەوڵەمەندە لە ناو کۆمەڵدا زۆرە، تەنیا کەڵکیان بۆ خۆیانە لەو کاتەی توانای ئەوەیان هەیە کاری خێرخوازی لە هەموو ڕوویێکی ژیان بگەیەننە ئەنجام.

## ٩

لە شیعرێکیدا «بۆ هەڤالانی کوردستانی» لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٥ دڵزار دەڵێ:

هەڤالانی کوردستانی
گوێم لێ بگرن زۆر بەجوانی
ئەگەر ئێوە ڕاستە کوردن
بۆ کوردستان پەیژە و پردن
ئەبێ خزمەتکاری کورد بن
خاوەن هۆش و بیری وورد بن
ئازاردانی ئێمەی دڵسۆز
خزمەتە بۆ دوژمنی هۆز
گەر دژی سۆسیالیستی بن
دیارە ئەبێ فاشستی بن
پیاوی باش و دیمۆکراتی
هەرگیز نابێ بەشەللاتی
ڕێ لە جاسووس و جاش بگرن
ڕێگە لە پیاوی باش مەگرن



تکام وایە تاقمی شێرە
گوڵزاری گەل نەکا گێرە
هیوادارم ئەی هەڤالان
کەمێ عەقڵ نەختێ ویژدان
بەکاربێنن تا بێگومان
بکەونەوە سەر ڕێی ژیان

لەو ساڵەدا دڵزار لەگەڵ تیپی چەکدارانی کۆمۆنیستەکان بنکەیان لە گوندی ئاوەگرد بووە. لە پاش کوودیتا فاشستییەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ و سەرهەڵدانی دووبەرەکی لە ناو ڕێزی شۆڕش لە ساڵی ١٩٦٤ ناخۆشی و چەندوچوون کەوتە نێوان کۆمۆنیستەکان و بەڕێوەبەرایەتی شۆڕشی کورد. دڵزار گلەیی لەو فەرماندەیە دەکا گۆیا بەربەرەکانی کۆمۆنیستەکانی کردووە، بەلایەوە ئەمە کارێکی باش نەبووە، ئەوەی ئەمەی کردووە بەپیاوچاک ناژمێرێ. وەک لە شیعرەکە دەردەکەوێ ئەوەی دەوری ئازاردانیانی بووە تاقمەکەی شێرە بوون، مەبەسی خورشید شێرەیە لەو کاتەدا لە جموجۆڵی سوپایی دەوری بووە.

## ١٠

لە شیعرێکیدا بەناوی «هەژارین» لە ساڵی ١٩٤٨ لە کۆیە هۆنیویەتییەوە دڵزار دەڵێ:

برا وەرزێر و جووتیار و سەپانین
بێ بەرگ و نانین
ئەگەرچی هەڵگری هەوجاڕ و داسین
هەردەم کەساسین
لە چنگ ئاغا جگەرپارە و پەلاسین
***
گەنم چێنین و غەیری هەرزن و گاڵ
نابەینە ناو ماڵ
کەچی ئاغا بەزۆری قەندەهاری
بێ غەم دەهاری
لە سایەی ئێمە لیرەی بۆ دەباری
***

قوبوولْ ناكەين ئيتر ئەم ژينە تالْە
ئەم تەرزەحالْە
سەروسامانى خۆ ناخەينە بەرچنگ
دوژمنى دلْتەنگ
هەموو هاواركەين تێكڕا بەيەک دەنگ

***

هەژار و حەق خوراو و ڕووت و برسين
ئێمە ناترسين
لە گوللەی خائين و جاسووس و زۆردار
ياخۆ ئيستيعمار
ئەكۆشين بۆ نەمانى زولْمى زۆردار

***

لەسەر ڕێگەی ڕەوانى عەدل و دادا
ئێمە لانادا
تەقەی تۆق و زڕەی زنجير و زيندان
مەينەتى و لێدان
تەنانەت سەربڕين و گوللەباران

لەم شيعرەدا دلْزار باس لە چينەكانى خوارەوەی كۆمەلْ دەكا، ئەمانە ژيانيان هەژارانەيە، ڕەنجيان بۆ ئاغای دەرەبەگە. بۆ ئەوان ڕەنجى ئەمانە و بۆ ئەمانەش چەوسانەوە. شاعير چەوساوەكان هان دەدا بۆ تۆلْەسەندنەوە لە هەموو چەوسێنەرەوەكان، لە سەرووی ئەمانە هەموويان، ئەمپرياليستى ئەوروپايە، لە بەرژەوەندى خۆی دەگەڕێ. پێويستە ئەوەی لێ وەربگيرێتەوە و يەكسانى بالْى بەسەر خەلْكى كۆمەلْدا بگرێ.

***

ئەحمەد مستەفا دلْزار شاعيرێكى بەديمەنى ئەدەبى كوردييە. پێش ئەوەی لەسەر هەر بيروباوەڕێک بووبێ يا نەبووبێ شاعير بووە. شيعرى بۆ جوانى ژن وتووە، ژن هەوێنى دلْدارييە. ئينجا سروشتى ڕەنگينى بەسەركردۆتەوە چونكە سەرچاوەی ئيلهامى وەسفى بووە. دلْدارى و سروشتى تێكەلْ بەيەكترى كردووە. لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆكەوە لە



زۆربەی بابەت و هونەرەكانى شيعرى وتووە. بەحرى عەرووزى و كێشى سيلابى خۆمالْى و سيستێمى «شيعرى نوێ»ی كوردی و هەموو جۆرە قافيەكانيشى بەكارهێناوە.

لە دوای ئەوەی باوەڕی بەئيديۆلۆجييەتى كۆمۆنيزم هێناوە، شيعرى بۆ ئەم مەبەسە تەرخان كردووە. هەولْى داوە ئيديۆلۆجييەت بەسەر جوانكاريدا زالْ بێ لەم جۆرە شيعرەيدا، لەبەرئەوە بەرهەمى لەم بابەتەی لە شيعرى پەروەردەيى (ديداكتيكى) نزيک بۆتەوە. لە شيعرى ديكەيدا ڕەچاوی هەموو مەرجە پراكتيكى و مەعنەوييەكانى كردووە، بۆيە بە بەرهەمێک دەكەونە بەرچاو مێژووی ئەدەبى كوردی شانازييان پێوە دەكا.

## بەشی سێیەم

## مارف بەرزنجی

## ١٩٢١ - ١٩٦٣

### ژیانی

مارف کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ حوسێن بەرزنجی لە ١٠ی شوباتی ١٩٢١ لە ئاوایی قادر کەرەم لە دایک بووە. باوکی وەکو شێخێکی تەریقەتی قادری تەکیە و دامودەسگای دەروێشی بووە، بەڵام لە ڕووی داراییەوە دەوڵەمەند نەبووە. خوێندنی لە قوتابخانەی سەرەتایی قادر کەرەم دەست پێ کردووە، لەو سەردەمەدا خوێندنی ئەو قوتابخانەیە تا پۆلی چوارەم بووە. ئیتر لەبەرئەوەی باوکی نەیتوانیوە بینێرێ بۆ کەرکووک بەهۆی دەست کورتییەوە دوو ساڵ ماوەتەوە. ئینجا لەگەڵ شێخ حوسێنی برای چوونەتە کەرکووک و لە تەکیە کۆنەییێکی خۆیان ژیاون. گوزەرانیان زیاتر لە کوڵەمەرگییەوە نزیک بووە. لە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی ناوەندی لە کەرکووک پێوەندی لەگەڵ پارتی هیوا کردووە. لە ساڵی ١٩٤٣ قوتابخانەی ئامادەیی تەواو کردووە. لەو کاتەدا باوکی خوازبێنی کچێکی بۆ کردووە بەبێ ئەوەی چاوی پێی بکەوێ. لە دوای ژن هێنان بۆ ماوەی ساڵێک کارێکی مووچەخۆری بچووکی دەست کەوتووە، لە ساڵی ١٩٤٤ ڕووی کردۆتە بەغدا و لە کۆلێجی ماف (حوقووق) بووە بەقوتابی. لەبەر دەست کورتی ماوەیێک لە کارگێڕی تووتن لە بەغدا دامەزراوە بۆ ئەوەی خوێندنی کۆلێجی ماف بباتە سەر.

لە بەغدا پێوەندی ناسیاوی لەگەڵ ئازادیخواز و نیشتمانپەروەران کردووە. لە خۆپیشاندانەکانی ئەو سەردەمانەی بەغدا بەشدار بووە. لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٧. فەرمانی گرتنی لە لایەن دەسەڵاتی میرییەوە دەرچووە. ماوەیێک خۆی شاردۆتەوە. لە هاوینی ١٩٤٨ کۆلێجی مافی تەواو کردووە و لە پاییزی ئەو ساڵەدا فەرمانی ئەوقاتی بۆ دەرچووە و بوو بەمحامی. لە کاروباری ئەوقاتیدا شتێکی وای دەست نەکەوتووە پێی بژی، بۆیە کارێکی لە کۆمپانیای نەوت چنگ کەوتووە، بەڵام زۆری پێ نەچووە وازی لێ هێناوە چونکە کاربەدەستە ئینگلیزەکان بەچاوێکی سووک تەماشایان کردووە، بەوەی لە بن دەستی کابرایێکی ئاسووری نەخوێندەواریان داناوە وەک یاریدەدەرێکی.



لە مارتی ١٩٥٠ بەهۆی جموجۆڵی سیاسییەوە ناچار بوو چوار مانگ خۆی بشارێتەوە، بەدەربەدەری لە سەنگاو و قەرەداغ و شارباژێڕ ئەو ماوەیەی بردە سەر. وەکو خۆی دەیگێڕێتەوە لە ساڵانی ١٩٥١ - ١٩٥٢ تووشی گرییێکی سایکۆلۆجی بوو، واتە حاشاکردن لەو بیر و ئیدیۆلۆجییەتەی باوەڕی پێی هەبوو، بەڵام زوو خۆی دۆزییەوە. ئەم دان پێدانانەی مارف بەرزنجی لە مرۆڤێکی ژیر و زیرەک و دڵسۆز هاتۆتە دەرەوە، دوور لە بیری عەشایەری ڕۆژهەڵاتییانەی دواکەوتوو، ئەم جۆرە کردەوانە دەشارڕێنەوە بۆ ئەوەی لەسەری برۆن، بەڵام مارف ئاشکرای دەکا بۆ ئەوەی لەسەری نەڕوا.

لە ساڵی ١٩٥٦ لەبەرئەوەی پشتی میسری گرتبوو لە دەست درێژییەکەی مەسەلەی سوێس خرایە بەندیخانەوە. لە دواییدا ئازاد کرا. لە ساڵانی پێش کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە کەرکووک خەریکی کاری ئەوقاتی بوو. لە پاییزی ساڵی ١٩٥٧ەوە یەکێک بوو لە ئەندامە بەکارەکانی دەستەی نووسەرانی کۆواری «شەفەق» تا هاوینی ١٩٥٩.

لە دوای کوودیتاکەی تەمووزی ١٩٥٨ بەسکرتێری ڕێکخراوی ئاشتیخوازانی کەرکووک هەڵبژێررا. لە پاشانا کرا بەسەرۆکی شارەوانی کەرکووک، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند و لە دوای مانگ و نیوێک پاش ئاهەنگی بیرەوەری یەکەمی ١٤ی تەمووز، لە ساڵی ١٩٥٩ لەگەڵ ١٨ کەس لە نیشتمانپەروەران گیرا و هەموویانیان ڕەوانەی گرتووخانەی بەغدا کرد.

ئاژاوەی تەمووزی ١٩٥٩ لە شاری کەرکووک پیلانێک بوو کۆمپانیای نەوتی کەرکووکی سەر بەئینگلیز داینا بوو لە دژی بزووتنەوەی نەتەوەی کورد و دەسکەوتەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە سەرانسەری عیراق. ئەم پیلانە بەهۆی کۆنەپەرستانی عیراق و بەشێک لەو تورکمانانەی سەر بەدەوڵەتی تورکیا بوون و تا پلەیێک دەست تێوەردانی ئێران و سووریا و میسر گەیشتە ئەنجام. کارەساتێک بوو کورد لە هەموو کەسێک زیاتر زیانی لێ کەوت.

مارف بەرزنجی لە هاوینی ساڵی ١٩٥٩ەوە لە گرتووخانەی بەغدا مایەوە تا ڕۆژی ١٥ی حوزەیرانی ١٩٦٢ فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو لە دادگای بەغدا. لە دوای کوودیتا فاشستییەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ گوێزرایەوە بەندیخانەی کەرکووک و لە ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لە کەرکووک لە سێدارە درا.

## شیعری

مارف بەرزنجی لە ساڵی ١٩٣٦ کە لە پۆلی چوارەمی قوتابخانەی سەرەتایی بووە یەکەم شیعری هۆنیوەتەوە. بڵاوکردنەوەی شیعری دواکەوتووە، لە ساڵی ١٩٥٣ لە ڕۆژنامەی «ژین»ی سلێمانی دوو پارچە شیعری بڵاوکراوەتەوە. بەرهەمی شیعری دەوروبەری ٣٠ پارچە شیعری لیریکییە.

مارف بەرزنجی شاعیرێکی خۆڕسکی ڕەسەنە، لە کۆمەڵی دەوروبەری بەتایبەتی باوکی چێژی شیعری بەهێز بووە و خەیاڵی لە مەشق و تاقیکردنەوە بووە لە هەموو بابەتەکانی شیعری کوردی، بەحری عەرووزی بەکارهێناوە، کێشی میللیی سیلابی خۆماڵی بەشی زۆری شیعری گرتۆتەوە. لە شیعری نوێدا کێشی زۆر و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی لە لیریکێکدا بەکارهێناوە. گەمەی لە قافیەدا کردووە. یەکێتیی قافیە و مەسنەوی و هەمەڕەنگی هەیە. بەزۆری شیعری وێنەی لیریکی ئەوروپاییان وەرگرتووە. زمانی ئاسان و مانای لە ڕووە. هەندێ لە ڕۆمانتیکییەت نزیکە، بەڵام لە سیمبۆلیزم دوورە. لیریکی سەر بەقوتابخانەی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتین، هەندێ جار وەکو شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) دەکەونە بەرچاو.

١

لە شیعرێکیدا دڵداری دەکا بەهەوای غەزەلی کلاسیکی:

لە چاوی تۆوەیە تاریکی دڵ ئێستا چراخانە
لە جێی پەیمانە وو جەژنانە قوربان نێو نیگاتانە
بەئێمەی گەر ڕەوا بێتن غەریبین دڵ بریندارین
ڕەهەندەی دەستی جەورین سایەتان ئەمڕۆکە جێمانە
ئەزانم کەی منت دیوە لەبەر وەی وا پەسەندم لات
لە پۆلی پێشڕەوی گەل دا و لە جەنگی سەر شەقامانا
منیش لەوساوە تۆم دڵ خست کە غونچەت کردبوو ئیکلیل
بەبیست و حەوتی کانوونا لە پێش تەرمی شەهیدانا
دەمێکی دیش لە خۆ دەرخستنێکا چوویتە سەر مینبەر
بەدەنگ و ڕەنگ و کردار چووی بەدڵما قارەمانانە



ئەوا زانیم بناغەی خۆشەویستمانە ئازادی
وەکو سەرچاوەیی هەست و دروستی و بەرزی گیانمانە

مارف بەرزنجی لە کاتێکدا لە گوندی داریکەلی لە ساڵی ١٩٤٩ خۆی لە چاوی جاسووساندا دوور خستۆتەوە یادی خۆپیشاندان و ڕێڕەوەکانی سەر گۆڕی شەهیدانی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ی کردۆتەوە. لە گۆڕەپانی ئەو خەباتەدا چاوی بەکچە قوتابییێکی جوان کەوتووە، چۆتە دڵیەوە نەک تەنیا لەبەرئەوەی جوان بووە، بەڵکو لەبەرئەوەی هاوبیر و بەجەرگ و نەترسیش بووە. ئەو خۆشەویستییەی لە کۆڕی خەباتدا لە پێناوی ئازادی دروست بووە، ئەڤینی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییە.

٢

لە چوارینێکیدا مارف بەرزنجی دەڵێ:

شاخی بەرز و جوان وولاتی کوردان
قەڵا و سەنگەر و پشت و پەنامان
چەن هەزار ساڵە ژینمان تێکەڵە
بووی بەنیشانەی کورد و کوردستان

ئەم چوارینە لەساڵی ١٩٦٠لەگرتووخانەی بەغدا هۆنراوەتەوە. شاعیر ڕاستییێکی ژیانی کوردی خستۆتە بەرچاو، بەوەی بەدرێژایی مێژوو شاخ کوردی لە توانەوە و لەناوچوون پاراستووە، بۆیە شاخ بووە بەبەشێک لە کورد و نیشانە و دروشمی ئەو میللەتەیە.

٣

بۆ گەشتە ئاسمانییەکەی یووری گاگارینی ڕووس شاعیر دەڵێ:

ئێمەی دەستبەستەی ناو زیندان
وا باڵ ئەگرین
ئەفڕین لە خۆشیانا ئەفڕین
چونکە هاوڕێییێکی شیرین
وەک گاگارین
کوڕی جووتیارێکی زەمین
مژدەی سەرکەوتنی لینین

وەک فریشتە

ئەبا بۆ ئاسمانی بەرین

لە ڕۆژی ١٢ی نیسانی ١٩٦١ هاووڵاتی ڕووس فڕۆکەوان یووری گاگارین بەکەشتییێکی ئاسمانی و بە(١٠٨) دەقیقە بۆ یەکەم جار لە جازیبییەی ئەرز چووە دەرەوە و لە ناو کۆزمۆس بەدەوری زەویدا سووڕایەوە. ئەم شیعرە جوانەی مارف بەرزنجی ئاماژەییێکە بۆ دەست ڕەنگینی ئادەمزاد لە پێشکەوتنی زانستی و تەکنیکدا. ئەوەی شیاوی باسە لەو ڕۆژگارەدا یەکێتیی سۆڤیەتی کۆن و ئەمەریکا تەنیا لە سیاسەتدا بەرامبەر بەیەکتری نەچووبوونە مەیدانەوە، بەڵکو لە گۆڕەپانی دۆزینەوەی نهێنییەکانی ئەودیوی سروشت خەباتیان لە دژی یەکتری تیژتر بوو، لەبەرئەوەیە شاعیری کوردی ئێمە دەڵێ: گاگارین مژدەی سەرکەوتنی سیاسەتی لینین دەبا بۆ ئاسمانی بەرین. لە ڕووی بیروباوەڕەوە ئەم وێنە شیعرییە قسە هەڵدەگرێ، بەڵام هەرچۆنێ بێ داهێنانی تێدایە و جوانە.

٤

مارف بەرزنجی لە شیعرێکیدا بەناوی «پرتەوی لۆمۆمبا» بەهۆی کوشتنی ئەم نیشتمانپەروەرە ئەفەریقییە دەڵێ:

ئەستێرە نییە کە نەکوژێتەوە
ژیانێک نییە کە نەبڕێتەوە
کوژانەوەی پاتریس لۆمۆمبا
پرتەوێکی دا ناکوژێتەوە

***

شەوچرایێک بوون بۆ شەوی کۆنگۆ
درەخشان تابان وەک مانگی ئاسمان
نموونەیێک بوون لە بەرزی ئینسان
مەسیحی سەردەم بۆ ئەفریقای تۆ

***

بناغەی هێز و سەرچاوەی پرتەو
خواستی گەلەکەت هەموو ئەفریقا



بۆیە چەشنی کێو هەرگیز نەلەقا
گۆی مەردایەتیت بردەوە بەگڕەو

***

چونکە بەڕاستی ئازادیتان ویست
بۆیە ئیستیعمار ئێوەی نەئەویست
دەستەمۆ ئەکرێن کورسی پەرستان
ئێوە گەلخواز بوون نەک کورسی پەرست

***

کۆنگۆ وەک دڵی ئەفریقیایە
ئەو دڵەش دڵی کاک لۆمۆمبایە
نە کۆنگۆ ئەمرێ نە ئەفریقیا
تۆیش بۆیە ئەژیت هەتا هەتایە

***

دڵ پڕ لە کوڵە و دیدە پڕ گریان
لە هەموو لایێک سەراسەر جیهان
دەستی کرێکار جووتیار خوێندەوار
بۆ تۆڵەسەندن بەرزە تا ئاسمان

پاتریس لۆمۆمبا یەکێک بوو لە نیشتمانپەروەرەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەفەریقا لە کۆنگۆ. لە ڕۆژی ١٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦١ بەهۆی پیلانێکی ئەمپریالیستی ئەمەریکی لۆمۆمبا کوژرا. ئەو کاتە مارف بەرزنجی لە گرتووخانەی بەغدا بوو ئەم شیعرەی هۆنیبووەتەوە. سۆزی بەکوڵی شاعیر بەرامبەر بەم نیشتمانپەروەرە لەوەوە هاتووە مەسەلەی نیشتمانی کۆنگۆ و ڕەشەکانی ئەفەریقا هەندێ لە مەسەلەی نیشتمانی کورد دەکا، لەبەرئەوە ڕووداوەکە شاعیری کوردی وروژاندووە و نەفرەت لەو دوژمنە دەکا کە خراپەی بۆ ئەفەریقییەکان هەیە، چونکە هەر ئەویشە دوژمنایەتی کوردیش دەکا.

٥

مارف بەرزنجی لەگەڵ هەموو بایەخێکی بەدواڕۆژی ئادەمزاد دڵداری لە ناخی دەروونیدا بووە چونکە دڵداری ماک و هەوێنی ئازادی و بەختیارییە:

لە خەوما یارەکەی جاران لە تافی جوانییا ماوین
وەکو دوو کۆتری نەخشین بەتەنیا وا لە گوێی ئاوین
وەکو ئەم دەهری هیجرانە
وە یا ئەم لێک بەجێمانە
نە بووبێت و نە ڕووی دابێ
وەکو ئەم دەست لە یەکتر شوشتنە
ئەم بێ و لە دڵ ڕابێ
لە گوێی ئاوێ بەجووتە بێ خەفەت ڕاز و نیازمانە
نە ترسی چاوی بەدکار و نە ئازاری ژیانمانە
چ خۆشە دڵ وەها سادە
وەها پڕ خۆشەویستی بێ
لە ڕوخساری نیگارێکا هەموو ئاوات و هەستی بێ

شاعیر خەونی دیبێ یا نەیدیبێ کێشەیێک نییە پێویستی بەجێبەجێکردن بێ. شاعیر وزەی ئەوەندە بەهێزە لە ناو ئەم چوار دیوارە تاریکەدا بەتاوانی گەورەی وا تاوانبار کراوە سەری لەسەر دادەنێ کەچی یادی دڵداری دەکاتەوە، ئەوەی بەشێکە لە بوونی ئادەمزاد لەگەڵ ئازادی بوون بەو هیوایەی مرۆڤایەتی بەدوایانا وێڵە.

## چیرۆکی

مارف بەرزنجی لە تەمەنی هەژدە ساڵی دەستی بەنووسین کردووە، ماوەیێکی زۆر تەنیا خۆی زانیویەتی توانای نووسینی شیعر و پەخشانی هەیە. تا ساڵی ۱۹۵۷ بایەخێکی ئەوتۆی بەچیرۆک نەداوە، هۆی بنچینەیی بۆ مەبەسی چیرۆک نووسین لە پاییزی ساڵی ۱۹۵۷ لە لای دەرکەوتووە، لەو کاتەی ئەفسەری خانەنشین عەبدولقادر بەرزنجی بەهۆی کۆمەڵێک ڕۆشنبیرەوە خەریکی بڵاوکردنەوەی کۆواری «شەفەق» بوو لە کەرکوک. مارف بەرزنجی خۆی یەکێک بوو لە دەستەی نووسەرانی. ماوەی دوو ساڵ بەشێکی زۆر لە بەرهەمی ئەدەبی لەو کۆوارەدا بڵاوکرایەوە، بەتایبەتی چیرۆکەکانی. سەردەمی بڵاوکردنەوەی یەکەمین چیرۆکی دەکەوێتە ساڵی ۱۹۵۸.

چیرۆکی مارف بەرزنجی دەچێتە ناو ڕێبازی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی، مەسەلەی سەرەکی لای ئەو بیری کوردایەتی و ڕزگاری مرۆڤە لە چەوساندنەوە.



لە هەندێ لە نووسینەکانیدا ئەم دوو مەبەسەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. پیلانی هێزە ئەمپریالیستییەکانی ئەورووپا و فێڵ و فەنەری دەرەبەگ و کاربەدەستانی دەوڵەت و هەڵخەڵەتاندنی هەژار و ڕەش و ڕووتی ناو کۆمەڵ لە لایەن پیاوانی ئایینی و شێخی تەریقەتەکانی دەروێشی دەخاتە بەرچاو. سوودی لە چیرۆکی ئەورووپایی و میسری وەرگرتووە، شێوازی ئەوانی هێناوەتە ناو چیرۆکی کوردییەوە، بەمە پێشکەوتووە و دەوڵەمەند بووە. هەندێ لە چیرۆکەکانی ئەمانەی لای خوارەوەن:

### ئاواز و کەباب

نووسەر ئیلهامی ئەم چیرۆکەی لە هێرشە سێ قۆڵییەکەی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیسرائیل وەرگرتووە لە ساڵی ۱۹۵٦ بۆ سەر میسر، لە دواییدا بەهەرای قەناڵی سوێس ناوی دەرکرد. لە چیرۆکەکەدا فەلامورز ڕەمزی هێزی ئاشتییە، میرزاش ڕەمزی هێزی جەنگە. لە ئەنجامی خەباتی ئەم دوو هێزە، ئاشتی سەردەکەوێ. دیارە جەمۆلی چاپچی کە ڕەمزی میللەتە بچووک و ژێردەستەکانە ئەویش ڕزگاری دەبێ. ئیتر ئاسنی هەموو چەکەکان دەتوێنرێنەوە و دەکرێن بەشیشی کەباب و چەقۆی مەتبەق و ئامێری مۆسیقا.

### گای پیرۆز

تابلۆیێکی زیندووە لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی کوردستان. دووبەرەکایەتی کۆن و تازە لە ناوەوە بوو. مامۆستای قوتابخانە و حەمەڕەشید نموونەی هێزی تازەی کوردستان بوون. شێخ و کوێخا و پۆلیس نموونەی هێزی کۆن بوون. کەسایەتی شێخی تەریقەتی دەروێشیش بەگای پیرۆزی هیندستان دەچوێنێ.

### شەتڵ

موعادەلەیێکی سیمبۆلییە باس لە کۆمارە ساواکەی عیراق دەکا لە ئەنجامی کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا، کۆمەڵە ڕێکخراوە دیمۆکراتییەکان نەمام بوون تازە سەریان دەرهێنا بوو، قوتابیانی گوندەکان وەک شەتڵ وا بوون. جووتیارانیش لەوە دەترسان دیوەخانەکان وەکو جارانی لێ بێتەوە. ئەمە پێشبینییێکی هونەروەرانە بوو مارف بەرزنجی لەم چیرۆکەدا خستییە ڕوو. بەڵام لە دواییدا کۆماری تازە نەمام وا وێران کرا لە مێژووی میللەتانا کەم کارەساتی وا ڕووی داوە یەکێ لەوان مارف بەرزنجی و شێخ حوسێن بەرزنجی برای لە سێدارە دران.

### جەژنێکی شادی

نووسەر ئیلهامی ئەم چیرۆکەی لە بەسەرهاتی ژیانی گرتووخانەی بەغدای وەرگرتووە. وێنەی داهێنراوی لە واقیع وەرگرتووە و خەیاڵبازی تێدا کردووە و لەوەوە ڕووداوێکی تازەی دروست کردووە. ئەم بیروڕایە دەتوانرێ لە ڕستەی «هەژاران زوو نامرن... نامرن...» بەمانای ئەوەی هەزاران میر و شا بەرێ دەکەن کەچی خۆیان نامرن.

### سەرلەبەیانی نەورۆزێک

ئەم چیرۆکە بیری باوکێکە بەراووردی ژیانی سادە و ساکاری سەردەمی ڕابردوو دەکا کە نە کارەبا هەبوو نە ئۆتۆمۆبیل، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی شاد و دۆست بوون، بەڵام کە کارەبا و ڕادیۆ و سینەما پەیدابوون هەموو کەسێک دڵ تەنگ و شپرزەیە.

دنیا چڕوپڕ و هەڵاڵایە. ئەوسا باغەکان تەنیا بۆ خواردن بوون، ناوی فرۆشتن نەبوو، ئێستا هەرچی میوەی باشە بۆ فرۆشتنە و ڕەزای میوان گران بووە کە جاران زۆر ڕەزا سووک بوو. دنیای ئێستا چاولێکەری و چاوچوینی و خەفەتە. بێجگە لەمانەش سەرباز یاساغ و قەدەغە و ناو نووسین و گرتن و خەفیە وا زۆربوون ژیانیان تاڵ کردووە. کوڕە لاوەکە تێی دەگەیەنی مەسەلە کارەبا نییە. هیچ وەختێک قوتیلەی نەوت لە کارەبا خۆشتر نییە، بەڵام مەسەلە ئیستیعمار و دەست و پێوەندییەتی کە نایەڵن خۆشی لە شتی خۆش وەربگرین. بەئازار و گرتن و یاساغ و ڕاونان و خەفیە ژیانیان تاڵ کردووین.

## شانۆگەری

بەرهەمی ئەدەبی مارف بەرزنجی دوو کورتە چیرۆکی شانۆگەری دەور دەکاتەوە: «زەوی زەوی خۆمانە» و «کۆمیدیا ئادەم و هارووت».

### زەوی زەوی خۆمانە

چیرۆکێکی شانۆگەرییە لە چوار پەردە پێکهاتووە. ناوەڕۆکی بریتییە لە خەباتی ڕەنجبەرێک لە دژی بەگزادەیێکی دەسەڵاتداری سەر بەحوکوومەت. کابرایێکی درۆزن و تەڵاق خۆر و دەردەدارە، نەخۆشیی دڵ و گورچیلەی هەیە.

### کۆمیدیای ئادەم و هارووت

ئەم شانۆگەرییە لە یەک پەردە پێکهاتووە، بریتییە لە دیالۆجێکی فەلسەفی لە نێوان



خودا (کردگار) و هارووت. لە ئەفسانەی ئایینە کۆنەکانی میللەتانی سامی ناوی دوو فریشتە «هارووت و مارووت» هاتووە. لە کاتێکدا کردگار فەرمانی دەرکردووە ئادەم و حەوا لە بەهەشت دەربکرێن بۆ سەر زەوی، دوو فریشتەی هارووت و مارووتیش بنێرێتە ئەوێ. ئەمانە تکا لە کردگار دەکەن ئەم کارە نەکا، چونکە ئەوان لە ڕووناکی (نوور) دروست کراون، کەچی ئادەم و حەوا لە قوڕ. بەڵام بۆیان ناکرێ بەقسەی کردگار نەکەن. ناچار دێنە سەر ئەرز و لە فەرمانی خودا دەردەچن، ناکۆکی و ئاژاوە دەنێنەوە. کردگار ناچار دەبێ لە بیرێکدا لە وڵاتی بابل هەرەسیان پێ بێنێ و لە ناویان ببا.

مارف بەرزنجی دیالۆجێکی فەلسەفی دروست کردووە لە نێوان خودا و هارووت. شێوازی سیمبۆلی بەکارهێناوە، پەردەیێکی ڕۆمانتیکی بەسەردا گرتووە. نووسەر ئادەم و حەوا، واتە مرۆڤایەتی کردووە بەهێزی چاکە و هارووت و مارووتی کردووە بەهێزی خراپە. ئەم دوو هێزە لە ڕۆژی دروستبوونیانەوە بەرامبەر بەیەکتری چوونەتە مەیدان و تا ئێستا کێشەکەیان نەگەیشتۆتە ئەنجام.

## «ئەلف» و «یێ»

«ئەلف» و «یێ» پرۆژەیێکی ئەدەبی گرنگ بوو مارف بەرزنجی بەتەما بوو لەسەر لاپەڕەکانی کۆواری «شەفەق» بیگەیەنەتە ئەنجام، لەم بابەتەوە خۆی دەڵێ «لە ئەلفەوە تا یێ هەموو شتێکی لێ پێک دێ، نامانەوێ هەر بەووتن بێ، بەڵکو کردارمان ئەوێ، لەم دەرگایەوە لە گیروگرفتی ژیانمان ئەدوێین». پرۆژەکە ئەوە بوو لە هەر تیپێکی ئەلفوبێی کوردی چەند ووشەیێک هەڵبژێرێ و بیکا بەوتارێکی کورت و ناوەڕۆکی هەموو ووتارەکان خەریکی هەموو لایەنێکی ژیان بێ و بەشێوازێکی ئەدەبی و هونەری دەریان ببڕێ. ئەم جۆرە داهێنانە ئەدەبییە بابەتێکی تازە و تایبەتی بوو لە ئەدەبی کوردیدا.

نووسەر لە ژمارە یەکەمی شەفەقەوە خەریکی ئەم گۆشەیە بوو تا ژمارە حەوتەم. بەرپابوونی کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ی بەغدا بووە هۆی ئەوەی بۆی تەواو نەکرێ. لە نووسینەکەیدا لە تیپی ئەلفەوە دەستی پێ کرد تاکو تیپی ژێ. ئەو وشانەی بوون بەبەڵگەی تیپەکانی «ئە – تا – ژ» ئەمانە بوون: ئاو، ئاگر، بابەگوڕگوڕ، برادەر، پێ، پیاو، ترس، جیاوازی، جەژن، چەرمگە (چاڵکەی ڕۆمی)، حوکوومەت، خەبات، دەرد، دەرمان، دەستی بێگانە، ڕێگا، زەوی، ژن.

## نامەکانی

مارف بەرزنجی دەستێکی باڵای هەبوو لە نووسینی نامەی ئەدەبی، ئەو بەهرەیەی لەو کاتەدا دۆزرایەوە لە ساڵانی ١٩٦٠ – ١٩٦١ لە گرتووخانەی بەغداوە پێنج نامەی بۆ نووسەری ئەم کتێبە ناردووە لەودەمەی کە قوتابیی خوێندنی باڵا بوو لە مۆسکۆ و سانت پیترسبورگ (لینینگرادی ئەوسا). نامەکان لەوە دەرچوون تەنیا ڕەنگدانەوەی سۆزی قووڵی دوو هاوڕێی خۆشەویست بن، بەڵکو بوون بەبەرهەمێکی ئەدەبی داهێنراو لە ئەدەبی نەتەوەکانی گێتیدا بەچاوێکی بەرز تەماشا دەکرێن و بە بەرهەمێکی بەکەڵک لە قەڵەم دەدرێن.

## ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

جگە لە داهێنانی ئەدەبی بەشیعر و پەخشان مارف بەرزنجی لە سەرەتای ژیانی ئەدەبییەوە بایەخی بە ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی داوە. لەم لایەنەوە بەتوانا بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی وابوو لەو سەردەمەدا، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم کورد پێویستی بەداهێنان بوو لە مەیدانی پەخشاندا. واتە چیرۆک و ڕۆمان. بۆ ئەم مەبەسە پرۆژەی نووسینەوەی ڕۆمانی دانابوو هەندێکی لێ نووسیبووەوە بەڵام تەواوی نەکردبوو. ئەوەی نووسرابووەوە ئەم دەست و ئەو دەستی کرد و لە ئەنجامدا ون بوو.

مارف بەرزنجی لە ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا نووسینی هەیە، بەڵام زۆر نییە. هەندێکیان لە کۆوارەکاندا بەم ناوانە بڵاوکراونەتەوە: «کامەران و دیارییەکەی»، «بووکی پەردە» و «شانۆی کوردستان» دوو شانۆگەری عەبدولڕەزاق بیمار و وتاری «کۆن و تازەیی لە شیعرا» و وتاری «گۆرانی دووبارە نەمر» و «ئەرکی سەرشانی ئەمڕۆی ئەدەبەکەمان» و هی دیکە.

***

مارف بەرزنجی لە دوو لاوە دیاردەیێکی گرنگ بوو لە کۆمەڵی کوردەواریدا، یەکەمیان وەک مرۆڤ و دووەمیان وەک نووسەر. مرۆڤێک بوو لە واقیعی خۆی وەک ئادەمزاد گەیشتبوو، وەک نووسەرێک ئەوەندە بێ فیز بوو، هەمیشە دەیووت من هیچی لێ دەزانم! لە کەسێتی خۆیەوە دەستی بەشۆڕش کردبوو. کوڕی شێخێکی خاوەن تەریقەتی دەروێشی و خاوەن جێگە و ڕێگەی کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام پێی خۆش نەبوو شێخی پێ بڵێن، لە



مارف بەرزنجی بەولاوە خۆی بەهیچ شتێکی دیکە حسێب نەدەکرد. لە ناو ڕۆشنبیری کورد و هەموو خەڵکی ڕۆژهەلات، ئەگەر کەسێک هەڵەیێکی کردبێ کەس گوێی لەوە نەبوو بێ دان بەو هەڵەیەدا بنێ. مارف بەرزنجی دەڵێ ساڵێکیان لە خوو و ڕەوشتی خۆم وەرگەڕام، بیرم لەوە دەکردەوە چۆن خەریکی خۆم بم چۆن دەوڵەمەند بم، بەڵام زوو هوشیار بوومەوە. ئەگەر مارف بەرزنجی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ کورد و لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتی ڕاستگۆ نەبوایە پاڵەوانانە پێشوازی مەرگی نەدەکرد.

مارف بەرزنجی نووسەر و شاعیر نموونەی ڕۆشنبیری هاوچەرخی کۆمەڵی کوردەواری بوو. کولتووری ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای کۆ کردبووەوە و تێکەڵ بەکولتووری نەتەوەیی کورد کردبوو و کولتوورێکی تازەی لێ دروست کردبوو لەگەڵ هیوا و ئامانجی سەردەمی کورد بگونجێ.

بەرهەمی ئەدەبی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە دەوڵەمەندە. نموونەی شیعری کلاسیکی ڕەندە، ئەوەی خۆماڵی و شیعری نوێی بەرزە. چیرۆکی باڵایە، ئەلف و یێ و نامەکانی دیاردەی تازەن لە ئەدەبی کوردیدا.

# بەشی سی و یەکەم

## موحەڕەم محەمەد ئەمین

**۱۹۲۱ – ۱۹۸۰**

### ژیانی

موحەڕەم محەمەد ئەمین یەکێکە لە نووسەرە دیارەکانی نەوەی تازە کە لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا هاتنە ناو مەیدانی ئەدەبی کوردییەوە. نووسەر لە ساڵی ۱۹۲۱ لە شاری سلێمانی لە دایک بووە، هەر لەوێ قوتابخانەی سەرەتایی و ئامادەیی تەواو کردووە. لە ساڵی ۱۹٤۸ لە کۆلێجی ماف (حوقووق)ی بەغدا وەرگیراوە، بەڵام زوو لەبەر هەندێ هۆی سیاسی نەیتوانیوە لەسەر خوێندن بەردەوام بێ. ئیتر بووە بەمووچەخۆری میری و گوزەرانی لەسەر ئەوە بووە. لە ژیانی مووچەخۆریدا لە کارگێڕی ئازووقە (تەموین) و پەروەردە و نامەخانەی گشتیی سلێمانی و قەڵاچۆکردنی مەلاریا و شارەوانی و هی دیکە کاری کردووە.

نووسەر دەوری لە ڕۆژنامەگەری ئەدەبی کوردیدا بووە، لە ساڵانی ۱۹٦۰ – ۱۹٦۱ بەشداری لە دەستەی نووسەرانی کۆواری ئەدەبی مانگانەی «ڕۆژی نوێ» کردووە، هەندێ بەرهەمی تێدا بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لە زۆربەی ڕۆژنامە و کۆوارە کوردییەکانی ئەو سەردەمەدا بەرهەمی بڵاوکردۆتەوە و نووسینەکانی بۆنی ئازادی و سەربەستییان لێ دێ.

موحەڕەم محەمەد ئەمین کەسێکی کڕ و بێ دەنگ بوو، بەڵام لە ناوەوەی خۆی هوشیار بوو. گیانی نەتەوەپەرستی و ئازادیی بیروڕا لە لای بەهێز بوو. کاری مووچەخۆری تەنیا بۆ بەسەربردنی گوزەرانی ماڵەوەی بوو لە ڕووی دارایییەوە، دڵسۆزی کاری ئەدەبی خۆی بوو و کاتی بۆ تەرخان کردبوو. نووسەر لە ۲۳ی ئاغستۆسی ساڵی ۱۹۸۰ لە سلێمانی مەڵبەندی لە دایکبوون و ژیانی کۆچی دوایی کردووە.

### بەرهەمی

نووسەر لە تافی لاویدا هەردوو تای لەنگەری تەرازووی ژیانی یەکسان بوو، تایێکی کۆڕی تێکۆشان و جووڵانەوەی سیاسی بووە، لەم ڕێیەدا سزای چەشتووە و خراوەتە



بەندیخانەوە. تایەکەی دیکەی قەڵەم و داهێنانی ئەدەبی و نووسینی بەکەڵک بووە. هەر لە سەردەمی قوتابییەتیدا مەیلێکی تەواوی بووە لە خوێندنەوەی چیرۆک و ڕۆمان، ئەمە ڕێگەی بۆ نووسەر خۆش کردووە ڕوو بکاتە چیرۆک نووسین.

قارەمانی چیرۆکەکانی موحەڕەم محەمەد ئەمین نوێنەری هەژار و بێ دەرامەت و بێ دەسەڵاتی ناو کۆمەڵن. لەمانە چیرۆکی «مام هۆمەر». کە ئەمە ناوی کۆڵهەڵگرێکی هەژارە هەندێ تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی بەشێوازێکی ساکار دەخاتە ڕوو. ئەم چیرۆکە ڕەنگە بۆ کۆمەڵێکی پێشکەوتوو لە پلەی هونەرێکی بەرزدا نەبێ، بەڵام بۆ کۆمەڵی کوردەواری کە تازە بابەتی چیرۆک لە ئەدەبیدا پەیدا بووبوو دەوری هەیە. کۆڵهەڵگرێکی هەژار ئەگەر ڕۆژێک کار نەکا نان نابێ بیخوا. لەبەرئەوە مام هۆمەر ناچار بوو دزی بکا. جارێکیان لێی ئاشکرا دەبێ، سێ مانگ دەخرێتە بەندیخانەوە، لەو ماوەیەدا خێزانی بەناچاری لەشی خۆی دەفرۆشی بۆ ئەوەی نانی منداڵەکانی دابین بکا.

لە دوای بڵاوبوونەوەی ئەم چیرۆکە نووسەر پێشکەوتنێکی دیاری بەخۆیەوە دی لە نووسینی چیرۆکدا. لە ساڵی ۱۹۵۷دا نووسەر دوو چیرۆکی «سەیرانێک لە ئەزمڕ» و «زیندووی مردوو»ی لە کتێبێکدا بڵاوکردەوە بەناوی «گۆمی شڵەقاو»ەوە. چیرۆکی سەیرانێک لە ئەزمڕ نموونەی وەستایەتی نووسەرەکەیەتی. قارەمانەکان لاوی بێکاری ناو شارن. کاری تایبەتییان نییە، هەرچی کارێکی هەبێ دەیکەن، لەگەڵ دەست کورتی و هەژاریدا لە گیانی گاڵتەوگەپ و قۆشمەیی دوور نین، هەندێ جار وا دەکەونە بەرچاو بەتەنگ ژیانەوە نەبن، بیر لە ئەمڕۆ دەکەنەوە و لایان وایە بۆ سبەینێ خودا کەریمە.

موحەڕەم محەمەد ئەمین لە چیرۆکەکانیدا هەوڵ دەدا ڕووی ڕاستەقینەی ڕەنجبەر و کرێکاران بخاتە ڕوو، بەوەی هەمیشە لە ژیانی بێکاری و نەبوونی ئیش دەترسن. بەگشتی چیرۆکەکانی ڕەخنە لە ناهەمواری کۆمەڵایەتی و نەبوونی یەکسانی دەگرن.

توانای نووسەر لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ۱٤ی تەمووزی ۱۹۵۸ی بەغدا زیاتر کەوتە ڕوو. هەرچەندە زمان و شێواز و پێویستییەکانی چیرۆک لە لای نووسەر بەهێز بوون، بەڵام ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی دەتوانرێ هی چیرۆکنووسەکانی دیکەی ئەو ڕۆژگارەش بەدیاردەیێکی سیاسی ڕۆژانە دابنرێ. ناوەڕۆکی بەرهەمی ئەو سەردەمە بوو بەپڕوپاگەندە بۆ کوودیتاکە. لە لای موحەڕەم محەمەد ئەمین بەجوانی و ڕێکی ڕەنگیان لە چیرۆکی «ڕێگەی ئازادی» (۱۹۵۹) داوەتەوە. لێرەدا نووسەر دەسەڵاتی کۆمەڵی دەوری مەلیکی

پێش ١٩٥٨ تاوانبار دەکا بەوەی بۆتە هۆی دواکەوتوویی کۆمەڵ، ئەوەی خەڵکی دەڕووتاندەوە بۆ چاکەی کاربەدەستە دەوڵەمەندەکان و وڵاتانی بێگانەی دەرەوە. هەروەها نووسەر ئەو هۆیانە دەخاتە ڕوو کە بوون بەپاڵپشت بۆ سەرکەوتنی کوودیتا سوپاییەکە.

لە قۆناغی ژیانی ئەدەبیدا موحەڕەم محەمەد ئەمین دوو ڕێچکەی گرتبوو، یەکەمیان بەردەوام بوو لەسەر چیرۆک نووسین و لەو ماوەیەدا چیرۆکی «گردی شەهیدان» (١٩٥٨) و کۆمەڵە چیرۆکی «ئادەمزاد» (١٩٦٩)ی بڵاوکردەوە. دووەمیان خزمەتێکی گەورەی ڕۆشنبیری کوردی دەکرد لە ڕێگەی وەرگێڕان لە زمانانی بێگانەوە بۆ زمانی کوردی. لەمەشدا نووسەر بابەتی هەمەجۆری هەڵدەبژارد لەمانە چیرۆکی «یادی گۆڕستانەکە»ی نووسەری ڕووس دەستۆیێڤسکی. هەروەها بابەتی مێژوویی و فەلسەفی و ماف و کۆمەڵایەتی، بەمە بەڕاستی بەشدارییێکی بەهێزی دەکرد لە دەوڵەمەندکردنی نامەخانەی کوردی، بەتایبەتی لەو ڕۆژگارەدا وەرگێڕان دەوری گرنگی هەبوو، چونکە هەموو توانایێکی داهێنانی ئەدەبی و هونەری لەو کاتەدا تەرخان کرابوو بۆ پڕوپاگەندە لە پێناوی پاراستنی دەستکەوتەکانی کوودیتا سوپاییەکە، بۆیە وەرگێڕانی ئەو بابەتانەی ڕاستەوخۆ پێوەندییان بەکوودیتا و شۆڕشەوە نەبوو، نرخێکی تایبەتییان هەبوو لە ڕۆشنبیری کوردیدا.

زانینی زمانی کوردی و خۆ پەروەردەکردن لە خوێندەواری کوردیدا لە لای موحەڕەم محەمەد ئەمین وەکو زۆربەی نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیرانی دیکە لە خۆیانەوە بووە، واتە خۆیان خۆیانیان فێر کردووە. خوێندنی ڕێکوپێکی قوتابخانەیی لەو ڕۆژگارەدا بەزمانی کوردی نەبووە، لە هیچ لایێکی کوردستاندا دامودەسگای زانیاری و زانستی نەبووە بۆ فێربوون و لێکۆڵینەوە لە سامانی نەتەوەیی کورد. ئەوە هەبوو لە هەندێ وڵاتانی ئەورووپا لە دەسگا زانستییەکانیاندا لە مەیدانی ڕۆژهەڵاتناسیدا کولتوور و خوێندەواری کوردی پارێزرا بوو.

زمانی نووسینی موحەڕەم محەمەد ئەمین بەتایبەتی چیرۆکەکانی ئاسان و بێ گرێ و مانا لە ڕووە. لاکۆنیزم واتە کورتی و وردی لە دەربڕینی بیر لە نووسینیدا دیارە. نووسەر بەتوانا بوو لە دۆزینەوەی شتی تازە، ڕێگەی تازە، بەم پێیە لە دوارۆژدا گۆڕانی تێدا دیار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا نووسینی بەقەوارە لەگەڵ تەمەنیدا ڕێک ناکەون، واتە کەمترن، ئەمەش وەنەبی تایبەتی بێ بەموحەڕەم محەمەد ئەمین، بەڵکو ئەمە سیفەتی زۆربەی داهێنەرانی کوردە لە شاعیر و نووسەران. هۆی ئەمە بێ گومان ڕەنگدانەوەی سەختی ژیان



و نارێکی باری سیاسی کۆمەڵە. هەندێ جاریش زانست و زانیاری و هونەر و ئەدەب دەکەونە مەترسییەوە لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، وەکو ئەم دیاردەیە لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەم (١٩٦٣ - ١٩٦٧) لە کوردستانی عیراق کەوتە ناوەوە.

سەرجەمی بەرهەمی موحەڕەم محەمەدئەمین پێویستییان بەکۆکردنەوە هەیە، پێویستە ئەوەش بزانرێ بەرهەمی وای هەیە تا ئێستا بڵاونەکراوەتەوە.

# بەشی سی و دووەم

## هێمن

### ١٩٢١ - ١٩٨٦

### ژیانی

محەمەدئەمین کوڕی سەید حەسەن شێخەلئیسلامی موکری لە ساڵی ١٩٢١ لە گوندی لاچین لە نزیک مەهاباد (سابڵاغ) لە دایک بووە. لە دواییدا بەهۆی «کۆمەڵەی ژ. ک.»ەوە «هێمن» بووە بەناوی نهێنی بۆی و لە پاشانا وەک نازناوی شیعری بەکاری هێناوە، ئینجا لە ناو خەڵکدا بەم ناوەوە ناسراوە.

هێمن لە بنەماڵەیێکی دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو پەروەردە بووە. سەرەتای خوێندنی ئەلفوبێی لای عەبدوڵڵای مستەوفی (سەعید ناکام) بووە. لە پاشانا لە گوندەوە ناردوویانەتە مەهاباد بۆ خوێندن لە قوتابخانەی سەعادەت. چوار ساڵ لەم قوتابخانەیەدا بەفارسی خوێندوویەتی، هاوینان لە ماڵەوە لە گوند بەردەوامی خوێندن بووە. لە پاشانا وازی لە قوتابخانە هێناوە و چۆتە حوجرەی خانەقای شێخی بورهانی لەمەڕ خۆیان. چوار ساڵیش لەوێ خوێندنی بردۆتە سەر.

لە ساڵی ١٩٣٨ دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە، دەوڵەمەندی ماڵی باوکی وەکو جاران نەبووە، بۆیە دەستی بەکار و کاسبی کردووە. لە کاروباری کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕومالات لێزان بووە، لەبەرئەوە کە لە ساڵی ١٩٤١ دەستی داوەتە ئەم کارە سەرکەوتووە. لەگەڵ ئەوەشدا لە نزیکەوە ئاگاداری نێوەندی ئەدەبی و ڕۆشنبیریش بووە. لە ساڵی ١٩٤٢ کە کۆمەڵەی نهێنیی «ژ. ک.» دامەزراوە، هێمن بووە بەئەندام، ناوی نهێنی «هێمن» و ژمارەی ئەندامیەتی «٥٥» بووە.

لە ساڵی ١٩٤٦ کچی خاڵیان بۆ هێناوە بەبێ ئەوەی چاوی پێی بکەوێ. هەرچەندە لە سەرەتادا بەدڵی نەبووە بەڵام لە پاشانا خۆشیویستووە. لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان و لە سێدارەدانی قازی محەمەد و هاوڕێکانی، لە مەڵبەندی خۆی دوور دەکەوێتەوە و سنوور دەبڕێ و خۆی دەگەیەنێتە قەڵادزە، ماوەیێک لە مزگەوتێکدا بەنهێنی



دەژی، لە دواییدا کە سیاسەتی دەسەڵاتی ئێران بەرامبەر بەکورد هەندێ نەرم دەبێ و بڕیاری لێبووردن لە ساڵی ١٩٤٨ بۆ عەشرەتەکان دەردەکا، هێمن دەگەڕێتەوە زێدی خۆی و دەست دەکاتەوە بەکاسبی و بایەخدان بەشیعر و ئەدەب، هەروەها تا ساڵی ١٩٦٥ لە ژیانی سیاسیشەوە دوور نەبووە.

لە ساڵی ١٩٦٨ لەگەڵ ئەوەی گوزەرانی باش بووە و دەست ڕۆیشتوو بووە لە ڕووی داراییەوە، بەڵام نەیتوانیوە بەرهەڵستی دەستدرێژی دەسەڵاتی شای ئێران بکا بەرامبەر بەکورد، ناچار بووە سەری خۆی هەڵگرتووە و پەنای بردۆتە بەر کوردستانی عیراق. لەو دەمەدا بەشێکی زۆر لە ناوچە شاخاوییەکان لە ژێر کۆنترۆڵی هێزی چەکداری شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ بوون. هێمن لە ناوچەی حاجی ئۆمەران میوانی شۆڕش بوو.

لە دوای بەیانی ١١ی مارتی ١٩٧٠ هێمن توانی بەئازادی لە هەموو عیراقدا بسووڕێتەوە. گەشتی شارەکانی هەولێر و کەرکوک و سلێمانی کرد. لە پاشانا لە بەغدا نیشتەجێ بوو لەگەڵ پەنابەرە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران، ئەو کاتە مەڵبەندی لیجنەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران لە بەغدا بوو، لە ڕێزی ئەواندا کاری دەکرد. جموجۆڵی حیزبییان هەبوو، ڕۆژنامە و چاپەمەنی دیکەیان دەردەکرد.

لە ساڵی ١٩٧٥ لەگەڵ کارەساتی ڕووخانی شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ هێمن لە بەغدا تووشی نەخۆشیی مێشک بوو، ماوەیێکی زۆر لە نەخۆشخانە مایەوە. هەر لەو ساڵەشەوە ئەگەرچی پێوەندی ڕێکخراوەکەیان لەگەڵ دەسەڵاتی بەغدا وەکو خۆی مایەوە، بەڵام هەرچۆنێ بێ کاری کردبووە سەر جموجۆڵییان. ئیتر هێمن لەگەڵ هاوڕێکانی تا کوودیتا ئیسلامییەکەی خومەینی لە کوردستانی عیراق مایەوە، ئینجا گەڕایەوە مەهاباد. ماوەیێک لە کۆواری «سروە»ی کوردی لە ورمێ کاری کرد، تا لە ڕۆژی١٧ی نیسانی ١٩٨٦ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی مەهاباد نێژراوە.

### شیعری

هێمن لە منداڵییەوە شیعری وتووە، ئەو دەوروبەرەی تێیدا ژیاوە دۆستی شیعر بووە و کاری لێ کردووە. بەهرەی خۆڕسک لە هەموو شتێکی دیکە زیاتر بووە، شیعری بۆ خۆی نووسیوە، لە تەمەنێکی هەراش لە ساڵی ١٩٤٢ یەکەمین شیعری «کوردم ئەمن» لە کۆواری «نیشتمان»ی کۆمەڵەی «ژ. ک.» بڵاوکراوەتەوە.

ماوەی منداڵی لە گوند بردۆتە سەر و عەیامێکیش لە مەهاباد (سابڵاغ) ژیاوە، ئەم شارۆچکەیەش لە گوندەوە نزیکتر بووە نەوەکو لە شاری گەورە. لەبەرئەوە فەرهەنگی زمانی کوردی دەشت و دەر و ناوچە کشتوکاڵییەکان لە لای هێمن دەوڵەمەندتر و بەهێزتر بووە لە فەرهەنگی زمانی ناو شار. ئەم دیاردەیە لە هەموو بەرهەمە ئەدەبییەکانیدا لە شیعر و پەخشان ڕەنگیان داوەتەوە. ئەگەر ئەمە لە شیعردا کەڵکی بووبێ لە پەخشاندا بەگشتی ئەوە نەبووە.

## شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری بەحری عەرووزی لە دیوانی هێمندا کەم نییە، بەڵام ئەو بەحرانەی لە کێشی شیعریدا بەکاری هێناون زۆر نین. سێ بەحری بەکارهێناوە هەزەج و ڕەمەل و خەفیف. وەکو دیارە ئەم بەحرانە لە کێشە سووک و ڕەوانەکانی عەرووزن و لە کێشی سیلابی خۆماڵییەوە نزیکن.

لە قافیەی شیعرە عەرووزییەکانیدا ئەم دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە: ا ت د ر م ن (ە – ـە) ۆ ی ێ. پاش قافیەی هەیە، ئەو وشانەی بۆ ئەم مەبەستە بەکاری هێناون ئەمانەن: ئەمن، من، تۆ، کورد، نەبێ، کەم (بکەم)، هەڵاتم، دەگریم، نابێ، تر (دیکە)، دەوێ، چبکەم، دەکەم.

جگە لە یەکێتیی لە شیعرە عەرووزییەکانیدا جووت قافیە (مەسنەوی)شی بەکار هێناوە. لە هونەرەکانی شیعری عەرووزی بایەخی بەپارچەی کورت (لیریک) داوە. قەسیدەی کەمە، چەند پارچە قەسیدەی پێنجین لە دیوانیدا بەرچاو دەکەون لەسەر قافیەی (ا ا ا ا ب) و (ا ا ا ب ب) ڕێکخراون.

زۆرینەی شیعری هێمن لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی هۆنراونەتەوە. کێشی دە بڕگەیی لەم جۆرە شیعرەدا زاڵە بەسەر کێشەکانی دیکە. هەندێ کێشی حەوت بڕگەیی و هەشت بڕگەییشی هەیە، لەمانەدا بەگشتی قافیەی مەسنەوی (ا ا ب ب جـ جـ...) و (ا ب جـ ب)ی بەکارهێناوە. جگە لەوە هەندێ شیعری لەسەر دوو کێش داناوە، جاری وا هەیە تێکەڵ بەیەکتری دەبن بەتایبەتی ئەگەر کێشەکان لە ژمارەی بڕگە لە یەکترییەوە نزیک بن، وەکو بەکارهێنانی حەوت بڕگەیی و هەشت بڕگەیی لە شیعرێکدا.



## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

هێمن لەو ڕۆژەوە خۆی ناسیوە هەستی بەجوانی سروشت و ژن کردووە، لە پاشانا خۆشەویستی نیشتمان گەیشتۆتە پلەی ئەو دڵدارییە. هەرسێ جەوهەری ژن و سروشت و کوردایەتی لە بەرهەمیدا دیارە. زۆرجار تێکەڵی کردوون و هەندێ جاریش شیعری تایبەتی بۆ داناون. بەم جۆرە هێمن دەچێتە ناو بازنەی ئەو شاعیرانەی ژیانی ئادەمزاد بەهەموو لایەنەکانیەوە لە بەرهەمیاندا ڕەنگیان داوەتەوە، جا ئەم لایەنانە گرنگتر و گرنگترینیان نییە، بەڵام ئەوە هەیە ئەو لایەنانەی کاریان لە شیعری هێمن کردووە لەگەڵ سەردەمی ژیانیدا ڕێک دەکەون، بەتایبەتی لایەنی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری. بەم ڕەنگە بەهەناسەییێکی هونەری توانیویەتی شیعری بکا بەسەرچاوەییێکی گرنگ بۆ چاندنی سۆزی نیشتمانپەروەری لە ناو دڵ و دەروونی هەموو کوردێکدا.

هێمن سیاسەتی کردووە، چۆتە ناو ڕێکخراوی سیاسی نهێنییەوە، بەڵام بەوەی باش بووە شیعری نەکردووە بەپڕوپاگەندە بۆ حیزب. خۆ ئەگەر لە بنجدا حیزبایەتی نەکردایە باشتر بوو، چونکە هێمن شاعیر و نیشتمانپەروەر بوو، لە سیاسەتدا لەو هوشیارانە نەبوو ببێ بەئەندام لە دەستەی هەرە باڵای ڕێکخراوی سیاسی.

هێمن جگە لە شیعری لیریکی، چیرۆکی شیعری (پۆیێمی) فۆلکلۆر ئامێزی هەیە، واتە بەیتی ئەدەبی میللی. بەشێک لە بەرهەمە هەرە گرنگەکانی چیرۆکی شیعری ئەمانەن:

١- ناڵەی جودایی: لە زیاتر لە سەد دێڕە شیعر پێکهاتووە، لە ساڵی ١٩٧٤ لەو کاتەی لە بەغدا بووە هۆنیویەتییەوە، شێوازێکی سیمبۆلییانەی بەکارهێناوە ڕەنگدانەوەی دڵ و دەروونی شێواویەتی لە ئەنجامی تێکچوونی نێوان دەسەڵاتی بەغدا و شۆڕشی ئەیلوولی کوردستانی عیراق و دەستپێکردنەوەی شەڕ. لەو شیعرەدا موناجات لەگەڵ مەیگێڕ دەکا، بۆ ئەوەی سەرخۆشی بکا تا بتوانێ ئەوەی لە دڵی دایە هەڵیڕێژێ.

٢- ئێوارەی پاییز: قەسیدەییێکی درێژە لە ٣٦ چوارین پێکهاتووە (١٥٦ نیوە دێڕ شیعر)، ئەمەش لە ساڵی ١٩٧٤ لە بەغدا نووسراوەتەوە ئیلهامی لە دەستپێکردنەوەی شەڕ لە کوردستانی عیراقدا وەرگرتووە. هێمن لەم شیعرەدا ڕەشبینە، ڕۆژگار ناو دەروونی هەڵتەکاندووە لە حەژمەت ئەوەی لە ژێر ئازاری دوژمنان دەتلێتەوە. پاییز لە لای شاعیر بووە بەبەڵگەی لەناوچوون. لەم شیعرەدا هێمن وێنەی زۆر پیشانی خوێنەر دەدا، وەکو کوندەبوو، بێوەژن، برا کوژراو، خوشک هەتک کراو...

هتد. سروشتیش هەمووی هەورەتریشقە و بوومەلەرزە و هەرەس هێنانە، ژنانیش ئەوەی ماون پیشەیان واوەیلا و سنگ کوتانە، لە قوڕ دەگەڕێن بۆ ئەوەی بیکەن بەسەریانا.

٣- سووڕی دەوران: چیرۆکێکی شیعری درێژە لە زیاتر لە (٣٠٠) دێڕە شیعر پێکهاتووە، لە ساڵی ١٩٧٨ نووسراوەتەوە. سەرچاوەی ئەم کارە ئەدەبییە لە بەیتی فۆلکلۆری میللیدا هاتووە. رووداوی ساکارە، هێمنیش فۆلکلۆرییانە دایڕشتۆتەوە. کوڕێکی ڕەنجبەر و کچی میر پەیمانی دڵداری لەگەڵ یەکتریدا دەبەستن، لە ئەنجامدا دەکوژرێن. شاعیر رووداوی تازەی بۆ بەسەرهاتەکە دروست کردووە. هەوڵی داوە دڵداری ئەم دوو کەسە بخاتە قاڵبی سۆفیزمەوە و بە بەسەرهاتەکەی شێخی سەنعانی گرێ بدا. لەم شیعرەدا دەیەوێ بڵێ «دڵداری بەهێزترە»، مەسەلەی دەوڵەمەندی و هەژاری ڕەت کردۆتەوە، بەهەموو جۆرێ ئەم بابەتە بەرهەمەی هێمن دەچێتە ناو ئەدەبی میللیی نووسراوەوە.

## پەخشانی

گیانی شاعیری لە هێمندا خۆڕسکە، لەگەڵ ئەویشدا کوردی زان و پەخشان نووسێکی دیارە. شێوازی تایبەتی خۆی هەیە. زیاتر لە وتارە هونەری و ڕۆمانتیکییەکانیدا دەردەکەوێ، دەستێکی باڵای لەمەدا هەیە چونکە فەرهەنگی وشە و زاراوە لە لای دەوڵەمەندە بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بەئەدەب و هونەر و ژیانی گوندایەتی و کشتوکاڵەوە هەیە. لە فەرهەنگی وشە و زاراوەی زانستییە پراکتیکییەکاندا کزە، چونکە مەشقی ئەو جۆرە خوێندەوارییە لە کوردستانی ئێراندا نەبووە. ڕۆژێ لە ڕۆژان و تا ئێستاش کتێبێکی کوردی لە قوتابخانەکانی کوردستانی ئێران نەخوێندراوە.

بەگشتی بەرهەمی هێمن لە پەخشاندا لەم وێنانەی خوارەوە دەکەونە بەرچاو:

١- وتاری هونەری: نووسینی لەم بابەتەی هێمن بەرزە، کوردییەکەی پەتی و ڕەوانە، چونکە پێویستی بەوشە و زاراوەی زانستییە پراکتیکییەکانەوە نییە، دەکرێ ئەم جۆرە نووسینەی شاعیر لە پەخشاندا بەشێوازی شیعری بزانرێ، بەتایبەتی لە سەردەمێکدا ئەوە باو بوو لە پێشەکی هەموو شیعرێکدا پارچە پەخشانێکی کورتیان دەنووسی.

٢- وتاری زانستی: کۆمەڵێک وتاری لە بابەت مێژووی ئەدەبی و کوردی و ڕەخنەی



ئەدەبییەوە هەیە. نرخی ئەم وتارانە زیاتر لەوە دایە زانیاری بەکەڵکیان تێدایە لە بارەی مێژووی ژیانی شاعیران و مێژووی نووسینی هەندێ لە شیعرەکانیان و رووداوی نێوەندی ئەدەبی لە کوردستانی ئێران. بەڵام کە مەسەلە دێتە سەر ڕەخنە و دەربڕینی بیروڕا بەرامبەر بەشاعیر و خوێندەوار و ڕۆشنبیران بەرنامەیێکی زانستیی دیاریکراو لای هێمن نییە، هەروەها هەندێ لە بڕیار و بۆچوونەکانی سۆزی کەسێتی بەسەر بیری زانستیدا زاڵ دەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا نرخی خۆیان هەیە وەک سەرچاوەیێک بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی.

٣- وتاری گشتی: لەم وتارانەیدا هێمن دەست لە سیاسەت و ژیانی کۆمەڵایەتی و گوزەرانی خەڵکی و نایەکسانی لە کۆمەڵدا دەدا. ئەمانە بێ گومان زانیارییان تێدایە و بە سەرچاوە دەژمێررێن بۆ لێکۆڵینەوە، بەڵام خۆیان وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی داهێنراو نانوێنن، یەکێتیی بابەتیان تێدا نییە، گەلێ جار هەردوو بابەتەکەی پێشوو «وتاری هونەری» و «وتاری زانستی» تێکەڵ بەیەکتری دەکا و لە پاشانا بابەتی لاوەکی دێنێتە ناوەوە، ئەم هەموو مەسەلانە بەیەکتری دەبەستێتەوە، وەک بەرهەمێکی سەربەخۆی مەبەس دیاریکراو ناکەوێتە بەرچاو. ئەم جۆرە نووسینانەی زیاتر خزمەتی مێژووی ئەدەب و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی دەکەن.

## نموونەی شیعری

### دڵداری

١

لە غەزەلێکی بەناوی «ماچی شیرین» لە ساڵی ١٩٥٩ لە تەورێز نووسیویەتییەوە دەڵێ:

بەمنداڵی لە لێوی ئاڵی تۆم ئەستاندووە ماچێ
بەپیریش لەززەتی ئەم ماچە شیرینەم لە بیر ناچێ
بەسەد دوکتۆر و دەرمان و پەرستار ناکرێ چارەی
کەسێک تیری مژۆڵی ئەو کچە کوردەی لە دڵ ڕاچێ
دەکا گیرۆدەتر پیرانی دڵتەڕ ئەو کچە کوردەی
بچێتە مەکتەب و بسکی بەمۆدەی تازە هەڵپاچێ

غەم و دەردی زەمانە پیری کردم ووشک و بێ زەوقم
کە شاعیر ووشک و بێ شۆر بوو لە ناو خەڵکی دەبێ لاچێ
لە گۆشەی بێکەسیدا ئێستە وا دڵتەنگ و غەمبارم
نییە باکم ئەگەر ماڵم بەجارێکی بەقوڕدا چێ
بەشی کوردێکی زانا لەم وڵاتە مەینەت و دەردە
ئەوەی نەتویست بڵێ ڕەببی بەدەردی کوردی زانا چێ
لە ناو بازاڕی ئەوڕۆکەی ئەدەبدا شیعری تۆ (هێمن)
وەکو پوولی چرووکە هیچ ڕەواجێکی نییە ناچێ

ناوەڕۆکی ئەم شیعرە دڵدارییە، لە وێنە و قاڵبی کلاسیکی شاعیر لای نەداوە. بەڵام لێرەش دەیەوێ کوردایەتی بکا لە ناو ئەو ماچەی بەمنداڵی ئەو کیژۆڵەیە داویەتییێ، دەیەوێ لە پاشانا ئەو کچە کە گەورە بوو ئەو ماچە بۆ شاعیر ببێ بەماچی دڵداری. ئینجا گلەیی لە چارەنووس دەکا بەوەی زانای کورد لە کۆمەڵی شێواودا نرخی نییە، بۆیە کەسیش گوێ لە شیعری هێمن ناگرێ.

٢

لە لیریکێکیدا بەناوی «کچی مەهاباد» لە ساڵی **١٩٤٧** نووسیویەتییەوە دەڵێ:

لە باری نازەنینی نەرم و نۆڵی دڵتەڕی شادی
لە چاوی بەد بەدوور بی ئەی کچی جوانی مەهابادی
لە جوانیدا لە پاکیدا نییە هاوتان و نازانم
فریشتەی ئاسمانی یانە پەروەردەی پەریزادی!
سەری کوڵمت گەشە هەروەک گوڵی کوێستانی کوردستان
لەبەر بەژنت دەبێ سەر دانوێنی خەڵفی شمشادی
دڵی سەد عاشقت کردە نیشانەی تیری موژگانت
کچی کوردی لە تیر ئاوێتنا مەعلوومە ئوستادی
بەشمشێری دوو ئەبرۆت جەرگی خەڵکی لەت دەکەی دیارە
دەزانی چەک لە کار بێنی کچیش بێ تۆرمەیی مادی
لە سوێیانت وەها دێوانە بووم چاومەستی خوێن شیرن
لە قەڕنی بیستەما ڕەنگە ڕەچاو کەم کاری فەرهادی



ئەویستا تۆ لەوێ دیلی دەسی بێگانەی و ئەمنیش
لە دووری تۆ دەکێشم ڕەنج و دەرد و داخی بێ مرادی
زەمانە (هێمن)ی تۆی وێڵی دەشت و چۆڵ و سەحرا کرد
فەرامۆشی مەفەرموو جاروبارە هەر بکە یادی

لەم شیعرەشدا هێمن سوورە لەسەر ئەوەی بەشان و باهووی جوانی کچی کورد هەڵبڵێ. ئەمجارەیان کچەکە کوردە و خەڵکی شاری مەهابادی خۆیەتی. شاعیر بەبێ یادی نیشتمان ناژی. ئەم شیعرەی لە کاتێکدا وتووە کە لە مەڵبەندی خۆی دوور کەوتۆتەوە و ڕای کردووە بۆ کوردستانی عیراق و ماوەیێک لە مزگەوتێکی قەڵادزە خۆی شاردۆتەوە. لە شیعرەکەدا دەیەوێ باس لە دوو شتی ناو دەروونی بکا. یەکەمیان دڵداری لەگەڵ کچی مەهابادی و دوور نییە خێزانی خۆی بێ چونکە لەمێژ نەبوو هێنابووی، دووەمیان یادی نیشتمان کە هەرگیز لە مێشکی ناچێتە دەرەوە.

٣

لە چوارینێکیدا بەناوی «دڵی شاعیر» لە ساڵی **١٩٧٤** لە بەغدا وتوویەتی:

دڵی شاعیر وەکو ئاوێنە دەچێ
گوڵەکەم! تۆ دڵەکەم مەشکێنە
ڕاستە زۆر ناسکە ئەمما کە شکا
وەکو خەنجەر دەبڕێ ئاوێنە

شاعیر لەم چوارینەدا وێنەیێکی نوێی هونەری داهێناوە. دڵی وەک ئاوێنە وایە، بەڵام دلبەر ئەگەر ئەو دڵە بتۆرێنێ، دەبێتە خەنجەر و ئاوێنەکە دەبڕێ و دەیشکێنێ.

٤

لە چوارینێکی دیکەیدا بەناوی «بۆ کچە کوردێک» شاعیر دەڵێ:

کچە کوردێکی نەشمیل و لەباری
بەوەی نییە ماوەیێکە چوویە شاری
ئەگەر پێت خۆشە هەروا بتپەرستم
نەکەی لادەی لە دابی کوردەواری

شاعیر ئەوەندە گیرۆدەی داب و نەریتی کوردەوارییە ڕوو دەکاتە کچە کورد و پێی

دەڵێ، لە گوندەوە بۆ شار چووی، ئەگەر دەتەوێ لەسەر دڵداریی خۆم بمێنم، پێویستە تۆ لە خوو و ڕەوشتی کوردەواری دوور نەکەویەوە و شار ڕەوشتت نەگۆڕێ.

٥

لە پارچە لیرێکیکیدا بەناوی «سنوور» لە ساڵی ١٩٧٢ لە بەغدا هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

ئەی ئەو کەسەی دەتپەرستم و لێم وونی
تۆ خودا نی تۆ خۆشەویستی منی
لە ئاسمان نی تا وێت ڕانەگا دەستم
لە قاف نی کاڵەی ئاسنت بۆ هەڵبەستم
تۆی لە من وون کرد و منی لە تۆ دوور
ئەو بستۆکەی دوژمن ناوی نا سنوور

ئەو کەسەی هێمن ئەو شیعرەی بۆ نووسیوە سەلاحی کوڕیەتی. ئەو کاتە شاعیر لە بەغدا بوو. بەهەر ڕێگەیێکی نهێنی بێ کوڕەکەی لە شاری مەهابادەوە وێنەیێکی بۆ باوکی ناردبوو. ئەو ڕۆژە هێمن میوانی ماڵی نووسەری ئەم کتێبە بووە لە بەغدا، هەر لەوێ لە پشتی وێنەکە ئەم پارچە شیعرەی نووسییەوە و بەدیاری پێشکێشی نامەخانە و ئەرشیفی ئەو ماڵەی کردووە. ئەم شیعرە پڕ لە سۆز و هەست و نەستی باوکیەتی لە خەیاڵی شاعیرێک هەڵقوڵاوە ڕۆژگارێکە لە کوڕەکەی جیابۆتەوە. هۆی ئەو لێکدابڕانە ئاشکرا دەکا، هەردووکیان لەو کاتەدا (ساڵی ١٩٧٢) لە نیشتمانی کورد دەژین کە کوردستانە، بەڵام ئەو بستە زەوییەی دوژمن ناوی ناوە سنوور لێکیانی کردۆتەوە و هەریەکەیان سەر بەوڵاتێکن بەپێی ڕەوشتی نێودەوڵەتی بێگانەن و هەریەکەیان ناسنامەیێکی هەیە لە یەکتری ناکەن.

## کوردایەتی

١

یەکەمین شیعری هێمن بەناوی «کوردم ئەمن»ەوەیە:

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم مەردم ئەمن



ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خاڵ نیم
ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن
گەر لە برسان و لەبەر بێ بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم
نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر هەردم ئەمن
من لە زنجیر و تەناف و دار و بەند باکم نییە
لەت لەتم کەن بمکوژن هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن

هێمن ئەم شیعرەی لە گوندی شیلاناوێ لە ساڵی ١٩٤٢ وتووە و لە گۆواری «نیشتمان» بڵاوکراوەتەوە. لووتکەی بیروباوەڕی کوردایەتییە، باوەڕی بەشۆڕش هەیە، خۆی ئامادە کردووە بۆ خەبات، هیچ هێزێک ناتوانێ لەم بیروباوەڕەی بکا. لە ڕووی هونەرییەوە شیعرێکی بەرزە. جارێکی دیکەش ئەم شیعرە ئەو تیۆرییە هەڵەیە ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێ شاعیر وەک زانا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە دانانی شیعر توانای زیاتر دەبێ. پێچەوانەی ئەمە ڕاستە، هەموو شیعرێک بەرز بێ بەکامڵی لە دایک دەبێ. لە سەردەمی لاویەتی شاعیر بێ یا ڕۆژگاری پیری.

٢

لە شیعرێکیدا بەناوی«تۆم هەر لە بیرە» لەساڵی١٩٤٤ لە گوندەکەی خۆیان وتوویەتی:

لە شاییدا لە وەختی هەڵپەڕینا
لە خۆشیدا لە کاتی پێکەنینا
لە کۆڕی ماتەم و گریان و شینا
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لە بیرە
بەشەو تاکو بەسەرما زاڵ ئەبێ خەو
بەڕۆژ تاکو دووبارە دێتەوە شەو
لە کاتێکدا کە دەدوێنم ئەم و ئەو
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لە بیرە
زەمانێکی کە دەچمە سەیری گوڵزار
لەگەڵ پۆلی ڕەفیقانی وەفادار
تەنانەت وەختی دەسبازی لەگەڵ یار
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لە بیرە

له کویستانێ دەمی ڕاووشکارێ
له مەزراییێ کە خۆم هەڵکرد له کارێ
له جێژوانێ کە دەگوشم مەمکی یارێ
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر له بیره
دەکەم تەرخان له ڕێی تۆدا ژیانم
له سەنگەردا بەرەو ڕووی دوژمنانم
بەخاکی تۆ دەمی ئاویلکەدانم
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر له بیره

لەم شیعرەدا هێمن دەیەوێ بڵێ تەنیا نیشتمانی خۆش ناوێ وەک هەوەسێک ناوە ناوە سەری لێ دەدا، بەڵکو هەمیشە له بیریەتی له هەموو دەمێکدا، له هەموو هەڵسوکەوتێکدا. له شین و شایی، له خۆشی و ناخۆشی، بەشەو و بەڕۆژ، له سەیرانا، له دەسبازی لەگەڵ یارا. بێ گومان له ناو سەنگەریشدا هەر له بیریەتی چونکە لەوێ بۆ نیشتمان دەجەنگێ.

٣

له شیعری «ڕەق هەڵاتم» له ساڵی **١٩٦٨** وتوویەتی:

من له داخی خزمی خوێڕی و ئاشنای ئەحمەق هەڵاتم
من له ترسی زاق و زووقی ئەمنیەی چاوزەق هەڵاتم
کوا بەخۆشی خۆم بەجێ دێڵم وڵاتی خۆشەویستم
من له ترسی زلله وو باتووم و دار و شەق هەڵاتم
هەر بەر پێیان و بەکۆمە کۆمە گەیمە ئەم وڵاتە
ڕەنگە پێت وابێ بەسواری مایەنی گوێ لەق هەڵاتم
(نۆکەری بێگانە ناکەم) هاتە جێ فەرمایشی خۆم
وا له برسان و لەبەر بێ بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵاتم

هێمن ئەم شیعرەی له کوردستانی عیراق وتووە، لەو کاتەی له دەست تیرۆری شای ئێران پەنای بۆ شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کوردستانی عیراق بردبوو له ناوچەی حاجی ئۆمەران وەک پەنابەرێک میوانی شۆڕش بوو.



باس له ئاوارەیی خۆی دەکا. هەڵاتنی لەودیوی کوردستانەوە بۆ ئەمدیو، له ترسی خزمی خراپ و تیرۆری دەسەڵاتی ئێران بوو. بەپێ سنووری دەسکردی بڕیوە تا خۆی ڕزگار کردووە. لێرەدا ئاماژە هەیە بۆ شیعرێکی خۆی کە دەڵێ «نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر هەردم ئەمن»، بەم کارەی وەکو خۆی دەربڕیوە ئەو بەڵێنەی داویەتی بەهەر نرخێک بێ لەسەری دەڕوا.

٤

له شیعرێکیدا بەناوی «ڕقی پیرۆز» له ساڵی **١٩٧٤** له بەغدا نووسیویەتی دەڵێ:

دەمگرێ ئەمما له گرتووخانە ڕق ئەستوورترم
لێم دەدا ئەمما لەسەر داوا ڕەواکەم سوورترم
دەمکوژێ ئەمما بەگژ جەللادەکەم دادێمەوە
کوردم و ناتوێمەوە ناتوێمەوە ناتوێمەوە

ئەم شیعرە ئەستووری بیروباوەڕی کوردایەتی هێمنە، هێز نییە له گێتیدا له کوردایەتی بکا.

٥

له شیعری «مەحکەمەی ئیستیقلال» له ساڵی **١٩٤٣** هۆنیویەتییەوە بەناوی یادی له سێدارەدانی شێخ عەبدولقادری نەهری له لایەن دەسەڵاتدارانی کۆماری تورکیای خوێنڕێژ:

دوێ شەوێ گریام هەتا ڕۆژ پێت بڵێم بۆچی برا
مەحکەمەی مەنحووسی ئیستیقلال وەبیرم هاتەوە
ڕێزەیان بەستبوو له پێش چاوی منا گشتی هەموو
ئەم شەهیدانەی کە خنکاون بەسەد ئاواتەوە
پاک بەکفنێکی له خوێنا شەتڵ و لێوێکی بەبار
پاک بەڕەنگێک و قیافێکی پەڕیوو و ماتەوە
هاتە گوێم لێکرا دەیان گوت: ئێمە کوژراین بێ خەتا
میللەتی کورد تا بەکەنگێ تۆڵەمان ناکاتەوە
من لەسەر لووتکەی بڵندی کێو له حەق داوا دەکەم
تۆش بپاڕێوە جەنابی شێخ لەسەر ڕووی تاتەوە

بەڵکو ڕوحمێکی بکا پێمان خوداوەندی ڕەحیم
چیدیکە ژێردەس نەبین دیسان وەسەرمانخاتەوە
(هێمن)ا پێت وا نەبێ یەزدانی بێ هاواڵ و فەرد
کەیفەری ئەم زوڵم و زۆرە بێ حیساب ناداتەوە

هێمن و زۆربەی شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیری کوردستان لە هەر پارچەیێکی کوردستان بووبن هەمیشە کوردیان بەیەک میللەت داناوە و کوردستانە پارچە کراوەکەیان بەیەک نیشتمان ژماردووە. کارێکی ئاساییە شاعیری کوردی کوردستانی ئێران بۆ شەهیدانی کوردستانی تورکیا بلاوێنێتەوە و هیچی بۆ نەمێنێتەوە ئەوە نەبێ لە خودا بپارێتەوە تۆڵەی ئەم کوردە لێقەوماو و مافخوراوە بکاتەوە.

***

محەمەد ئەمین کوڕی سەید حەسەن شێخەلئیسلامی موکری ناسراو بەهێمن شاعیرێکی بەدیمەنی سەدەی بیستەمە، شاعیر و نووسەر و کوردپەروەر بوو. بۆ ئەم ئامانجە بوو بە سیاسی، بەڵام بەڕاستی نەدەبوو سیاسەت بکا، چونکە بۆ ئەم کارە ئامادە نەبوو، دەبوو تەنیا خەباتی شۆڕشگێڕی بەشیعر و پەخشان بێ. ئەگەر سیاسەتی ڕۆژانە هیچی لێ قازانج نەکردبێ، خۆشی هیچی لە سیاسەت قازانج نەکرد. لە ژیانیدا ئەوەی قازانجی خۆی و نەتەوەی بوو دیوانی شیعر و نووسینە پەخشانییەکانی دیکەی بوون.

لە شیعردا بەتوانا بوو، بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی و یەکێتیی قافیە و مەسنەوی بەکارهێناوە. لەو کاتەی شیعری بۆ زۆرترین خەڵکی کوردی نووسیوە، هەر لەو کاتەدا لاسایی قوتابخانەی کلاسیکی کوردستانی باشووری کردووە، واتە بۆ چینی ڕۆشنبیری ناو کۆمەڵی نووسیوە.

هێمن شیعری بۆ دڵ و بیری خۆی هۆنیوەتەوە، ڕەنگدانەوەی ناو دەروونی هەموو کەسێک بووە، چونکە ئادەمزاد لە هەموو ڕۆژگارێکدا بەبێ دڵ و دڵداری هەڵناکا. لە کۆمەڵی کوردەواریشدا زۆربەی خەڵک بەبێ بیرکردنەوە لە چارەنووسی کورد ناژی.

لە پەخشاندا دەوری گرنگی هەیە، تابلۆ ڕۆمانتیکییەکانی نموونەی وتاری هونەری کوردین. بەزمانێکی ئاسان و خاوێنی کوردی پەتی نووسراون. سەرچاوەی بەکەڵکن بۆ مشتوماڵ کردنی بیری لاوی کورد، هەروەها بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردیدا.

# بەشی سی و سێیەم

## هەردی

**١٩٢٢ - ....**

### ژیانی

ئەحمەد کوڕی حەسەن بەگ کوڕی عەزیز بەگ لە ساڵی ١٩٢٢ لە سلێمانی لە دایک بووە. لە ساڵی ١٩٣٨ نازناوی «هەردی» هەڵبژاردووە بۆ شیعری و لە دواییشدا هەر بەم ناوە ناسراوە. خوێندنی بەرایی لە قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندییەکانی سلێمانی بووە، ئینجا خانەی مامۆستایانی گوندایەتی لە بەغدا تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٤١ کراوە بەمامۆستای قوتابخانە لە هەندێ لە ئاواییەکانی ناوچەی هەورامان، ئەوجا گوێزراوەتەوە سلێمانی. لە ساڵی ١٩٤٩ بەهۆی جموجۆڵی سیاسی و کاری نهێنیی حیزبایەتی لە ڕێزی کۆمۆنیستانی عیراق لە مووچەخۆری لابراوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٢ گەڕاوەتەوە سەر کاری جارانی. ماوەیێکی زۆر مامۆستایەتی قوتابخانە سەرەتاییەکانی کردووە.

هەردی لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٣ - ١٩٧٤ لە زانستگای سلێمانی وانەی ڕەخنەی ئەدەبی پێ سپێرراوە. لە دوای چەند مانگێک لە بەهاری ١٩٧٤ بەهۆی سیاسەتی دوژمنانەی دەسەڵاتی عیراق بەرامبەر بەکورد و داخستنی زانستگای سلێمانی ئەم کارەی لە دەست چوو.

شاعیر تا ساڵی ١٩٨١ وەک مامۆستاییێکی قوتابخانەی سەرەتایی مایەوە، لەو ساڵەدا خانەنشین کرا. لەوە بەدواوە ژیانی خێزانی ئاسایی نەبوو. لە جێگەیێکی دیاریکراو ئۆقرەی نەدەگرت. دەمێ لە ئێران و دەمێ لە وڵاتانی ئەوروپا تا لە دواییدا لە لەندەن نیشتەوە. ماوەیێکی زۆر وەکو پەنابەری سیاسی لەوێ مایەوە تا ساڵی ٢٠٠٢ بەیەکجاری گەڕایەوە نیشتمان و ئێستا لە شاری سلێمانی دەژی، خەریکی خوێندنەوە و پێشوازیکردنی ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەرانی ئەم سەردەمەیە.



### شیعری

هەردی لە تەمەنی لاویدا لە ساڵی ١٩٤٤ دەستی بەشیعر وتن کردووە، بەڵام وەکو خۆی دەڵێ نەیکردووە بەپیشە، بەهرەی خۆڕسک و توانای هونەری و ڕۆشنبیری هەبووە، بەبەڵگەی ئەو بڕە شیعرە کەمەی هەیەتی خۆی بکا بەکەسێک وەک شاعیر ناو دەربکا، ماوەی دانانی شیعری کەم بوو لە سنووری نیوەی دووەمی چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەم نەچووبووە دەرەوە. بۆیە هەردی لە شاعیرانی ئەو سەردەمە کورتەی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم دەژمێررێ.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

بەرهەمی شاعیر لە ڕووی ڕوخسارەوە لە چوارچێوەی مەرجەکانی شیعری کلاسیکی لاسایی نەچۆتە دەرەوە. ئەدگاری شیعری لەم وێنانەی خوارەوە دەکەوێتە بەرچاو:

١- شیعری هەردی بەگشتی لەسەر بەحری عەرووز هۆنراوەتەوە، زۆربەیان لەسەر بەحری هەزەج و سێ چوارێک لەسەر بەحری ڕەمەل هۆنراونەتەوە. لە موزاریع و ڕەجەزیش لە هەریەکەیان پارچە شیعرێکی هەیە. کێشی شیعری لەم بابەتەی لەبەرئەوەی لەسەر بەحرە سووکەکانی عەرووزن بەکێشی سیلابی خۆماڵی حەوت و هەشت و دە بڕگەییش دەکێشرێن، لە هەندێ شیعریدا دوو کێشی بەکارهێناوە.

٢- لە قافیەدا یەکێتیی قافیەی کەمە، جووت قافیە (مەسنەوی) زۆرە. هەندێ جار لە شیعرێکدا لە یەک قافیە زیاتر بەکار دێنێ تا دەگاتە چوار قافیە.

٣- بەگشتی شیعری لیریکییە، لە ڕووی قەوارە و ژمارەی دێڕەکانیەوە کەم و کورتن.

٤- تەنیا یەک پێنج خشتەکی هەیە لەسەر شیعرێکی نووری شێخ ساڵح.

٥- بەشێکی زۆر لە شیعری هەردی لەسەر بنچینەی بەند (کووپلە) ڕێکخراون. وێنەی ئەم شیعرانە بەم جۆرە دەکەونە بەرچاو:

(أ) قەسیدەی پێنجین (ا ا ا ب ب).

(ب) قەسیدەی شەشین (ا ا ا ا ب ب)، لەم بابەتەی زۆرە.

(ج) قەسیدەی شەشین، نیوە دێڕی یەکەم و شەشەم کورتن، چوارەکەی دیکە درێژن (ا ا ب ب جـ د).

(د) قەسیدەی بەندی حەوت نیوە دێڕی (ا ا ا ب ب جـ جـ).

(هـ) قەسیدەی بەندی هەشت نیوە دێڕی، دوو نیوە دێڕی کورت لەگەڵ شەش نیوە دێڕی درێژ، هەمووی جووت قافیەیە (مەسنەوی) (ا ا ب ب جـ جـ...).

(و) قەسیدەی بەندی نۆ نیوە دێڕی (ا ا ا ا ا ا ب ب ب).

(ز) قەسیدەی بەندی نۆ نیوە دێڕی، شەشی درێژ، لەگەڵ سێی کورت (ا ا ب ب جـ جـ د د د).

٦- زمانی شیعری هەردی دەوڵەمەندە، لە بە پەتیکردنی زمان دەوری باڵای هەیە. وشەی بێگانە کەم بەکار دێنێ، زاراوەی شیعری ڕێبازی ڕۆمانتیکی و سیمبۆلی ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژئاوا لە بەرهەمیدا دیارە. بەم جۆرە شیعری هەردی بەشێکە لەو شیعرە نوێیەی کوردی کە لە ڕووی زمانەوە لە وشەی فەرهەنگی شیعری عەرووزی ئیسلامەوی دوور کەوتۆتەوە.

٧- لە ڕەوانبێژیدا دەستێکی درێژی هەیە. ئەو شیعرەی هەردی کە بەنوێ ژمێرراون لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ئەو جۆرە وێنە ڕەوانبێژییانەیان تێدایە هەندێکی لە ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی کوردی و زیاتریش لە شیعری ڕۆمانتیکی ڕۆژئاواییی وەرگیراون و شاعیر وەستایانە گیانی کوردی پێ بەخشیوون.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شیعری هەردی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە دوو مەبەس یا ڕێبازی سەرەکی نەچۆتە دەرەوە. یەکەمیان شیعری ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی موتروبە کراو بەهەناسەی ڕۆمانتیکی لە دەوروبەری ئیدیۆلۆجییەتی جیاوازی چینایەتی و ئەمپریالیستی گێتی و کێشەی نەتەوەیی کورد دەسووڕێتەوە؛ دووەمیان شیعری ڕۆمانتیکی (وەک قوتابخانە و ڕێباز) قانگدراو بەسیمبۆلیزم لە دەوری چێژ و خەیاڵی دڵدارییێکی بێ هیوا و ئەنجام لە کۆمەڵێکی پڕ لە ئاژاوە و تەنگوچەڵەمە دەسووڕێتەوە.

بەڕاستی ئەم دوو جۆرە شیعرە ڕەنگدانەوەی ئیدیۆلۆجییەتی هەردییە لەو دوو قۆناغە پێچەوانە یەکترییەی بیروباوەڕی.

١- قۆناغی یەکەمی شیعری هەردی بابەتی شۆڕش و هەڵمەت بردن بوو. سەرەتا بەدانانی شیعری دڵداری دەستی پێ کرد بەڵام زوو لە دوای جەنگی دووەمی گێتی وەکو بەشێک لە لاوانی عیراق بەگشتی و لاوانی کورد بەتایبەتی بوو بەهەڵگری



بیروباوەڕی مارکسیزم و ئەنتەرناسیۆنالیزم، کۆمەڵێک شیعری داناوە ناوەڕۆکیان بریتییە لە دروشمی سیاسی ئەوەی لە خۆپیشانداندا هەڵدەکران. هەڵمەت و هێز و زەبروزەنگ و هاندانی تێدایە بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش و لەناوبردنی دەسەڵاتی دواکەوتوو لە عیراق و هێزی دەوڵەتە ئەمپریالیستەکان لە هەموو گێتیدا. ئەو شیعرانە لە سروودی شۆڕشگێڕی دەکەن، لەبەرئەوە بەزۆری دەچنە ناو شیعری پەروەردەییەوە (دیداکتیکی).

دەتوانرێ ئەو ماوەیەی هەردی ئەم شیعرانەی تێدا هۆنیوەتەوە بەنیوەی دووەمی چلەکانی سەدەی بیستەم دیاری بکرێ. لە دوای ساڵی ١٩٥٠ کە سەردەمی گواستنەوەی بیروباوەڕی بووە لە هەردوو شیعری «ست فاتیمە» و «دڵداری کچی تازە» هێشتا شوێنەواری بیری جیاوازی چینایەتی تیایاندا دیارە.

٢- قۆناغی دووەمی شیعری هەردی ڕەشبینی و دوورکەوتنەوە بوو لە شۆڕش. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا ئینقیلابی گەورە لە بیر و خەیاڵی شیعری هەردی ڕووی دا، لە بابەت لایەنی بیربیەوە هەموو تاقیکردنەوە کۆنەکانی مارکسیزمی پراکتیکی لە بیری خۆی بردەوە و بوو بەهەڵگری بیری ناسیۆنالی (کوردایەتی). ئەم کوردایەتییە لە دەوروبەری پێش کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا لە ناو هەندێ لاوانی کوردی عیراق پەیدا بوو. ئەمە نە «کوردایەتی کۆمۆنیستە کوردەکان» بوو، وە نە «کوردایەتی لیبیرالی دیمۆکراتی کوردەکان» بوو. ئەمانە خۆیان بەهێزی سێیەم دادەنا لە ڕووی تیۆری و پراکتیکییەوە لە کۆمەڵی کوردستانی عیراقدا. هەردی هەڵگری ئەم بیروباوەڕە بوو لەو ماوەیەدا خەریکی خوێندنەوەی کتێبی فەلسەفی و مێژووی ئیدیۆلۆجییەتی ئەو حیزبانەی ئەوروپا بوو کە باوەڕیان بەسیستێمی تاکە حیزبی هەبوو، ئەوانەی هەریەکەیان تەنیا دانی بەخۆی دەهێنا و فەلسەفە و حیزبی دیکەی ڕەت دەکردەوە.

ئەمە لە ڕووی ئیدیۆلۆجییەوە، بەڵام لە ڕووی خەیاڵەوە هەردی خەریکی ئەو شیعرانە بوو کە لە ساڵی ١٩٥٧ بەناوی «ڕازی تەنیایی» بڵاوکرانەوە. کۆمەڵە شیعرێکە لە دەوروبەری دڵدارییێکی ناکامی بەئەنجام نەگەیشتووی خنکاو لە ناو ڕەشبینیدا دەسووڕێتەوە.

لە کاتی چاپکردنی «ڕازی تەنیایی» هەردی دوودڵ بوو لە چاپکردنی کۆمەڵە

شیعرەکەی، وای دەزانی بیرە تازەکەی کە پێچەوانەی بیرە کۆنەکەیەتی دژی بیروباوەڕی ئەم شیعرە ڕەشبینییانەیە، لەبەرئەوە نەیدەزانی چۆن بڕیار بدا. هەڵوێستی سیاسی و ئیدیۆلۆجی تێکەڵ بەچێژی هونەری و ئیستێتیکی بوو، هەوڵی دەدا خۆی دوور بخاتەوە لەو جۆرە شیعرە چونکە بەلای هەڵگرانی بیروباوەڕە کوردایەتییە تازەکە ئەو شیعرانە جوان نەبوون. بەڵام لە دوای چاپکردنی شیعرەکان و بڵاوبوونەوەیان، بەڕاستی دەنگی دایەوە، ئینجا هەردی کەوتە ئەوەی شانازییان پێوە بکا و جارێکی دیکە «ڕازی تەنیایی» لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٨٤دا چاپ بکاتەوە. بەڵام ئەوە نازانرێ بۆچ شیعری قۆناغی یەکەمی شاعیرییەتی لەو چاپەدا بڵاو نەکردەوە؟!

هەرچۆنێ بێ لە ڕووی جوانکارییەوە هەرچەندە شیعری قۆناغی یەکەمی هەردی لە پلە و پایەی شیعری قۆناغی دووەمی نین، بەڵام بەزیادەوە لە مێژووی ئەدەبدا بەنموونەی شیعری سەرکەوتووی کوردی دەژمێررێن.

ماوەی شاعیرییەتی هەردی دیاریکراوە، لە نیوەی دووەمی چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەم بووە. دوا شیعری «پەیامی یار» لە ساڵی ١٩٥٨ هۆنراوەتەوە. ئەو شیعرە کەمەی هەردی کە لە چوارچێوەی ناوەڕۆکی دڵداریی بەئومێد نەگەیشتووی ڕەشبینی دایە، لووتکەی داهێنانی هونەرییە و دەلاقەیێکی دیکەی لە مێژووی ئەدەبی کوردی پڕکردۆتەوە، ئەو دەلاقەیە بەتاڵ بوو هەردی فریای کەوت.

## نموونەی شیعری

### هێرش و شۆڕش

١

هەردی لە بەندی یەکەمی سێ بەندەکەی سروودی «ئازادی خوا» دەڵێ:

ئازادیخوای کوردین ئێمە
شوورەی پۆڵا و بەردین ئێمە
پشتی جووتیاری زەبوونین
ئالای بەرزی چون یەک بوونین
شێری دەستی لێقەوماوین
لە ڕووی زوڵما هەڵکێشراوین



ئاغا و بەگزادانی زۆردار
جەردەی گیانی گەلی هەژار
خوێن خۆری ئەم نیشتمانەن
ئالەتی دەستی بێگانەن
ڕۆژی خۆی گیانیان دەردێنین
تۆڵەی گەلیان لێ ئەستێنین
ئازادیخوای کوردین ئێمە
شوورەی پۆڵا و بەردین ئێمە

کوردە کۆمۆنیستەکانی عیراق ئەم شیعرەیان کردبوو بەسروودی ڕەسمی خۆیان. بەرامبەر بەمە کوردی دیکە شیعری «ئەی ڕەقیب»ی دڵداریان کردبوو بەسروودی ڕەسمی وەکو پاشماوەییێکی کۆماری کوردستانی ئێران لە مەهاباد (١٩٤٦)، ئەو کاتە ئەم شیعرە ناوبانگی دەرکرد.

لەم شیعرەدا هەردی جەنگاوەرێکی تووڕەیە، هەڕەشە لە دوژمن دەکا، چوونە مەیدانی لەم لایەنەوە لە پلەی کردەوە نابەجێ و نامرۆڤایەتی دوژمن بەرامبەر بەبێ دەسەڵات و هەژاران زیاترە. بێ نەوایان دڵنیا دەکا لە دواڕۆژدا دوژمنان لەناودەچن و تۆڵەی زۆربەی میللەتیان لێ دەکرێتەوە.

٢

لە دوای ئەم هەڕەشەیە لە دوژمنان ڕوو دەکاتە کرێکاران:

کوڕانی ڕۆژی مەیدانی شەڕ و ئاشووب و ئاژاوە
براکانم! کرێکاری هەموو ئەم لانە ڕووخاوە
هەموو دایکێ کە تاقانەی لەسەر سێدارە خنکاوە
بەکورتی میللەتی برسی پەنای بۆ ئێوە هێناوە
دەسا تۆ حەققی ئەم خاکەی کە خاکی ئەشک و خوێناوە
هەتا خوا هێزی پێ داون هەتا دنیا خرۆشاوە
هەموو پڕ دەم بقیژێن کە ئیستیعماری ئینگلیسی
بڕووخێ تەفروتوونا بێ سەر و فەسساڵی نەگریسی
بڕووخێ تەخت و تاراجی بتۆپێ نۆکەری پیسی

لە ڕۆژێکی وەها سووری کە تەئریخی شەهیدانە
چ تەئریخێ! ئەوی جەرگی نیگاری خوێنی لاوانە
چ خوێنێ! هەر دڵۆپێکی نموونەی خوێنی ئینسانە
چ ئینسانێ ئەوەی گیانی لە لا بێ نرخ و هەرزانە
لە تاو بێدادی ئیستیعمار هەڵاتووی کێو و هەردانە
هەرا بۆ ڕۆژی وا چاکە کە دڵ وەک جۆشی بورکانە
دەسا پڕ دەم بقیژێن کە ئیستیعماری ئینگلیسی
بڕووخێ تەفروتوونا بێ سەر و فەساڵی نەگریسی
بڕووخێ تەخت و تاراجی بتۆپێ نۆکەری پیسی

شاعیر باوەڕی بەهێزە بەوەی لە ناو کۆمەڵدا هیچ هێزێک نییە جگە لە چینی کرێکار شایانی ئەوە بێ ئەمپریالیستی ئینگلیزی لەناوببا. ئەوەی ئاشکرایە تا کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ئینگلیز فەرمانڕەوا بوون لە عیراق، لەو سەردەمەدا ئەوان و کاربەدەستانی دەوڵەتی عیراق گەورەترین دوژمنی بیروباوەڕی کۆمۆنیزم بوون.

٣

لە شیعرێکی دیکەیدا هەردی بانگی خەڵکی دەکا هەڵمەت بەرن و ئاگری شۆڕش هەڵگیرسێنن:

بەیادی ئەو شەهیدانەی کەوا بێ ناز و بێ گیانن
لە ژێر پۆستاڵی پۆلیسا هەموو پێخوستی کۆڵانن
بەیادی ئەو هەتیوانەی کە برسی و ڕووت و عوریانن
بەیادی ئەو پلێنگانەی کە دیلی کونی زیندانن
وەرن ئەی میللەتی برسی ئیتر وا ڕۆژی مەیدانە
بچینە سەر تەلار و کۆشکی ئەو میللەت فرۆشانە
کە خوێنی ئێمەیان بەخشی بەپارە و زێڕی بێگانە

شاعیر بەناوی شەهید و چەوسێنراو ئازاردراو هەتیو و ئەو پلێنگانەی لە بەندیخانەن (مەبەسی کۆمۆنیستە بەندکراوەکانە) جەماوەری میللەت بانگ دەکا هێرش ببەنە سەر کۆشک و باڵەخانەی میللەت فرۆشان و تەفروتوونا و خاپووریان بکەن.



٤

ئینجا شاعیر بەرنامە دادەنێ بۆ لەناوبردنی سەرداری ناشایستە:

ئەوی خوێنی هەژارانی مژی و ناموسی ژێر پێ نا
بەفێڵ و جەردەیی پارەی لە چنگی خەڵکی دەرهێنا
بەزۆر تۆ ناوت نا (سەردار) و ئیمانیشت پێ هێنا
هەتا خاکی بەدیل گرتیت و ئیستیعماری تێ هێنا
قوڕی بۆت گرتەوە و ئەوسا سەری بەدبەختی تۆی تێنا

شاعیر دەڵێ ئەو سەرۆکەی خوێنی هەژاران دەمژێ، خەڵکی دەڕووتێنێتەوە، خاکی نیشتمان پێشکێش بە ئەمپریالیستەکان دەکا، پێویستە ئەو جۆرە سەردارە لە فەرمانڕەواییدا نەمێنێ.

**دڵداریی ناکام**

١

لە شیعرێکیدا هەردی دەڵێ:

بناغە و چینی دیواری
تەلاری بەرزی دڵداری
بەسەر لانەی دڵا ڕووخا تەپوتۆزی غەمی هێنا
بەدووی باڵداری ئاواتی فڕیوی بێ سەروشوێنا
دەسا ئەی پاییزی ماتەم ئەوەندەم تاسە پێ ماوە
هەموو ئەو یادگارەی لەو ژیانی عەشقە جێ ماوە
بەجارێ وەک گەڵا سروەی خەزانت گشتی ڕامالێ
بە ووردی هەر گەڵایێکی ببا بۆ قوژبن و چاڵێ

شاعیر خۆی دان بەوە دادەنێ ئەم شیعرە زادەی دەم و ساتی هەڵسوکەوتێکی سایکۆلۆجییە، گرێییێکی لا دروست کردووە. لێرەدا وێنەی هەستی دڵدار دەگرێ لە کاتێکدا ڕاستییێکی شاراوە لە دلبەردا دەدۆزێتەوە. ئەو دڵدارییەی بەرەو ڕووی دڵداری دەکاتەوە بەڕاستی نییە. ئیتر شاعیر ئەم هەموو درۆیەی کراوە بەشێوەیێکی داهێنەرانە ڕەتی دەکاتەوە و بیرەوەرییەکان لە بیر خۆی دەباتەوە.

٢

قەسیدەی «دڵێکی شکاو» لە سی و سێ دێڕ پێکهاتووە، شاعیر لە دوو دێڕی سەرەتاییدا دەڵێ:

بەسەرسامی لەسەر لووتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم
شریتی عومری ڕابردووم وەکو خەو دێتە بەرچاوم
شریتی چی! سەراپا سەرگوروشتەی نائومێدیمە
فلیمی پڕ لە ناسۆری هەرەس هێنانی لاویمە

لە دوو دێڕی دواییدا دەڵێ:

لە پاشا گەرد و تۆزقاڵی کە وەک کەرتی دڵی من بوو
یەکی ڕووی کردە سووچێک و لە تاریکی شەوا وون بوو
بەڵێ ئێستا ئەوی جێ ماوە بۆ من یادگارێکە
بەسەرهاتی دڵی وورد و بەسەرچوونی بەهارێکە

هەردی ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩٤٦ هۆنیوەتەوە، ئەو کاتە حەوت دێڕە شیعر بووە. لە پاش ٣٧ ساڵ لە ساڵی ١٩٨٣ تەواوی کردووە. ئەوی ڕاستی بێ دەبوو تەواوی نەکا. لە دوای ئەم هەموو ماوە درێژەدا شاعیر خەیاڵ و مێشکی ٣٧ ساڵ گەڕاندۆتەوە پاشەوە، بۆ شیعرێک لیریکییە، کات و جێگەی تێدا نییە، لەبەرئەوە تەواوکردنی ئاسانە لە هەموو کات و ساتێکی شاعیر ئارەزوو بکا. وا دیارە هەردی پێی ناخۆش بووە کە پێیان وتووە لە دوای پەنجاکانی سەدەی بیستەم وازی لە شیعر هێناوە، ئەویش دەیەوێ بڵێ ڕاستە وازم هێناوە، بەڵام لە شاعیری نەکەوتووم. هەرچۆنێ بێ نەدەبوو لەبەر ئەم قسانە شیعرەکە تەواو بکا. کە تەواویشی کردووە کارێکی چاکی کردووە و ئەو شیعرە نایاب و جوانە تەنیا بۆ ساڵی ١٩٤٦ حسێب دەکرێ، بەڵام بۆ هەموو کات و سەردەمێک دەست دەدا. بەهەموو جۆرێک ئەم شیعرە و هەموو شیعری دیکەی لەم بابەتەی هەردی لاپەڕەیێکی زێڕینیان لە دیوانی شیعری کوردیدا ڕەنگین کردووە.

٣

لە شیعری «خەرمانە» هەردی لە ساڵی ١٩٥٣ دایناوە لەگەڵ فریشتە نادیارەکەی موناجات دەکا:



چ سرڕێکت لە ناو دڵدا حەشار داوە بەپەنهانی
کە چاوت چەشنی ئاوێنە وەها بێ پەردە درکانی
ئەزانم دڵ هەیە وەک مس کە ژەنگ دێنێ بەئاسانی
دڵی تۆ زێڕی تیزابە لە کوێوە ژەنگی هەڵهانی
ئەمانە گەرچی تێ ناگەم بەڵام پێویستە بیزانی
هەتا ماوم لە دنیادا فریشتەی باغی ئاواتم
بەدڵ هەر چەشنی خەرمانە لە دەوری مانگی گۆناتم

ئەوەی ئەم شیعرەی بەرزکردۆتەوە ئەو تەنگوچەڵەمانەیە شاعیر هەوڵ دەدا بەشێوازی سیمبۆلیزم چارەسەریان بکا، بەڵام ئەم شێوازە زیاتر گیروگرفت دەخزێنێتە ناوی. نهێنی لە ناو دڵی دلبەردا هەیە. دڵ ئەگەر لە مس بێ زوو ژەنگ دەگرێ، بەڵام دڵی دلبەر زێڕی تیزابە، ئەمە ژەنگ هەڵناهێنێ، کە ژەنگیش هەڵێنێ مانای ئەوەیە دڵدار لێڵ بووە. جگە لەمە وێنەی شیعری کلاسیکی ئاسایی لەم لیریکەدا هەیە، بەڵام شاعیر هەندێ چێژی ڕۆمانتیکی ئەوروپایی تێ ئاخنیوە.

**ست فاتیمە**

لە شیعری «چەپکە گوڵێک بۆ ست فاتیمە» لە ساڵی ١٩٥٠ لە سلێمانی هۆنراوەتەوە. شاعیر دەڵێ:

فاتیمە! دوو چاوی مەستت پڕ تەلیسمی جوانییە
پڕ شەرابی خۆشەویستی و عارەقی یەزدانییە
بەژن و باڵاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانییە
لار و لەنجەت مۆسیقایە بەستەیە گۆرانییە
بووکی ڕازاوەی خەیاڵم گیانەکەم ست فاتیمە
تاقە پرشنگێکی چاوت ئەوپەڕی ئاواتمە
گەرچی دڵداری لە خاکی ئێمەدا ئەفسانەیە
هەر بەتەنیا بۆ کوڕی خاوەن تەلار و ئانەیە
گیانەکەم! ئەمما دڵی من لەو دڵە شێتانەیە
بێ ئەوەی هیچ شک بەرێ کوژراوی ئەو چاوانەیە
هەر بە تەنیا خۆشەویستی شک ئەبەم ست فاتیمە
سەروەتم ناوێ بزەی تۆ ئەوپەڕی ئاواتمە

خۆشەویستی وا کە نامەی خوایە بۆ پێغەمبەران
بەرز و ناسک وەک هەناسەی پڕ گوڵاوی دلبەران
نەک وەکو حەزکردنی دینار و گەوهەرپەروەران
ئەو کەسانەی بۆ قرانێ چەندە دڵیان هەڵوەران
خەڵقی تر پارە پەرستی با بکەن ست فاتیمە
من بەتەنیا تۆ پەرستی ئەوپەڕی ئاواتمە
زۆر کەرەت هانم ئەدا داخی دەروونی پڕ گڕم
بۆتی هەڵڕێژم سکاڵای ناسکی گەرم و گوڕم
داخەکەم کاتێ کە دێمە بەردەمت واقی وڕم
وام ئەشێوێنێ بەجۆرێ نایەڵێ هیچ دەربڕم
بووکی ڕازاوەی خەیاڵم! گیانەکەم ست فاتیمە
گوێیە بۆ ئەم ڕازە شل کەی ئەوپەڕی ئاواتمە

هەردی موناجات لەگەڵ کیژێک دەکا تازەپێگەیشتوو و تازە دەرچووی خانەی مامۆستایانی قوتابخانەی سەرەتایی کچانە لە بەغدا. ئەو کیژە مامۆستایە لە یەکێ لە قوتابخانەکانی کچان لە سلێمانی، هەردی خۆشی ویستووە و ئەم شیعرەی بۆ نووسیوە.

ئەمەیە بۆچوونی ئەو کەسەی شیعرەکەی دەخوێنێتەوە. ئەمە ئەگەر ڕاستیش بێ ڕاست نییە، چونکە لە مەبەسی داهێنانی شیعری دەردەچێ. ئەو ست فاتیمەیە موتڵەقە، بووکێکی تازەیە خەیاڵی شیعری هەردی دروستی کردووە. ئەو ست فاتیمەیە پەرییێکی بەهەشتە بۆ ئەو کەسەی ئیلهامی لێ وەرگرتووە کە هەردییە و ئەم شیعرەی بۆ داناوە هەروەها بۆ هەموو خوێنەرێکی کە شیعرەکە دەخوێنێتەوە. ئینجا لەو سەردەمەدا، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا شاعیر دەتوانێ ئیلهام لە کامە کچ وەربگرێ و ببێتە هۆی ئەوەی شیعری بەسەردا هەڵبلێ؟! دەبێ لە مامۆستاییێکی قوتابخانەی کچان وەربگرێ، چونکە تەنیا ئەوانن لە دەرەوەی ماڵ بەرچاو دەکەون. بەم جۆرە هەردی بووکێکی دیکەی بەناوی «فاتیمە»وە خستۆتە ناو پۆلی بووکە شیعرییەکانی کورد لە فاتیمە لەرەی بابا تاهیرەوە تا شیرینی محەممەد ساڵح دیلان.



## پەیامی یار

دوا شیعری هەردی بەناوی «پەیامی یار»ەوە لە ساڵی ١٩٥٨ لە سلێمانی هۆنیویەتییەوە، لە بەندی یەکەمیدا دەڵێ:

لە یارەوە
لە شۆخ و شەنگی پارەوە
لە ڕازی پڕ نیهانی یا
لەتەک شنەی بەیانییا
پەیام لە یاری جوانەوە
گەیشتە لام

ئەمە سروودێکە شاعیر بۆ گۆرانی دایناوە، لە وێنە و مانا ساکارە وەکو هەموو شیعرێکی بۆ ئاواز دادەنرێ، دەنگی گۆرانیبێژ و ئاوازی مۆسیقا نرخی هونەری بەرز دەکاتەوە.

***

ئەحمەد حەسەن هەردی جێگەیێکی دیاری هەیە لە ئەدەبی کوردیدا، دوو هۆی سەرەکی سنووری ئەو جێگەیە دیاری دەکەن:

١- شاعیر لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە گەیشتۆتە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم، کەچی کەسایەتی شیعری لە نیوەی دووەمی چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەم بووە (١٩٤٥ - ١٩٥٨) لەو ماوەیەدا بڕێک شیعری نووسیوە.

٢- ئەو برە شیعرە داهێنانێکی ڕەسەنە لە ئەدەبی کوردیدا. لە ڕوخساردا بێ کەموکووڕییە، لە ناوەڕۆکدا بەشداری لە داهێنانی «شیعری نوێ»ی کوردی کردووە، بەوەی جەوهەری شیعری ڕۆمانتیکی و سیمبۆلی ئامێزی ئەوروپایی تێکەڵ بەداهێنانی خۆی کردووە. لە دوو مەبەسی پێچەوانەی یەکتری شیعری شۆڕشگێڕی و دڵداریی ڕۆمانتیکی ڕەشبینی سەرکەوتووانەی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. هەردی لە شاعیرە ناودارەکانی کوردی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم دەژمێررێ.

## بەشی سی و چوارەم

# شامی

**١٩٢٣ - ١٩٨٧**

له ڕۆژی ترسم ئەجـــەل بدەی زەنگ
عومرم تەمام بوو له دونیای دوو ڕەنگ

### ژیانی

شامراد موشتاق ناسراو بەشامی لە ساڵی ١٩٢٣ لە کرماشان لە دایک بووە. لە تەمەنی سێ ساڵیدا لە ئەنجامی نەخۆشیی ئاوڵە (خوریکە) هەردوو چاوی کوێر بووە. لەم لانەوە دەڵێ:

هەنووز نەشناسوم چەپ ڕاسْ دەست
دەستْ جەهاندار جەهانبینم بەست

هێشتا منداڵ بووە بەمردنی دایکی لە سۆزی دایکێتی بێ بەش بووە. کارەسات لە دوای یەک ڕووی تێ کردووە. لە دەوروبەری تەمەنی دوازدە ساڵیدا باوکیشی مردووە و بێ کەس ماوەتەوە، ناچار مامۆژنی خۆی کردووە بە بەرپرسیار و گرتوویەتییە خۆی و پەروەردەی کردووە. لە پاش ماوەیێک مامۆژنی دەینێرێ بۆ ماڵی حاجی ئەمانوڵڵای موعتەزیدی و لە ژێر چاودێری ئەو خێرخوازە دەمێنێتەوە تا دەبێ بەپیاو.

لەبەر کوێری نەیتوانیوە فێری خوێندن و نووسین بێ، لە لایێکی دیکەوە ئەم دیاردەیە بووە بەهۆی ئەوەی گوێی مۆسیقی بەهێز بێ و چێژ لە خوێندنەوەی شیعر وەربگرێ. بەشەوانی زستان کە هاوڕێ و برادەران لە ماڵاندا کۆڕیان بەستووە گوێی لە دەمەتەقێ و حیکایەت خوێندنەوە گرتووە. گفتوگۆی ئەدەبی بەدڵ بووە و شیعری ئەڵماس خان و غولام ڕەزای لوڕ و سەید ساڵحی نیعمەتوڵڵاهی بزواندوویەتی. وەکو لە گێڕانەوەکانی خۆیدا دەردەکەوێ توانای ئەوەی بووە ئەگەر نیوە دێڕە شیعرێکی بۆ بخوێنرابایەوە نیوە دێڕەکەی دیکە خۆی بیڵێ.

کە بەتەمەن گەورە دەبێ ماڵی ئەمانوڵڵاخان بەجێ دێڵێ و خۆی خەریکی کاسبی دەکا.



وردەواڵە لە قەسری شیرین دەکڕێ و دەیبا لە کرماشان دەیفرۆشێ. لەگەڵ ئەم هەژارییەی چاو تێر بووە، بەو کاسبییەی توانیویەتی خانوویێکی بچووک پێکەوە بنێ، چەند ژوورێکی تێدا بووە، ژوورەکانی بەکرێ داوە و لە سەردەمی پیریدا بەو کرێیە ژیاوە.

وەکو خۆی دەیگێڕێتەوە شیعری زۆری وتووە، لەبەر کوێری بۆی نەنووسراوەتەوە، کەسیش نەبووە بۆی بنووسێتەوە، بۆیە زۆریانی لە بیرچۆتەوە، ئەوەی لە بیری ماون تۆمار کراون و لە پاشانا بڵاوکراونەتەوە. ئەمەو کارێکی بەجێیە شاعیرێکی کوێر دیوانی شیعری هەبێ، هەروەها ڕۆشنبیریش بێ. شامی یەکێکە لەم جۆرە شاعیرانە تەنیا ئەوە هەیە لەبەر کوێری خوێندن و نووسینی نەبووە. ئەو دیوانەی لە بەردەست دایە ماجید ڕووحانی لە دەمی شامی خۆی وەریگرتووە و تۆماری کردووە و لە پاشانا بڵاوی کردۆتەوە. شامی لە هاوینی ساڵی ١٩٨٧ لە کرماشان کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە.

### شیعری

زۆربەی شیعری شامی لە ڕووی کێشەوە خۆماڵی سیلابی دە بڕگەیی و قافیەی مەسنەوییە. شیعری بەحری عەرووزی هەیە، ئەگەرچی بەژمارە کەمە بەڵام لە ڕووی هونەرییەوە بەهێزە. ئەم جۆرە شیعرە عەرووزییەی شامی لە ئەدەبی کوردی ناوچەی کرماشان کەمە، لەبەرئەوە بوونەتە نموونەی نوێگەری لە ئەدەبی کوردی ئەو ناوچەیەدا.

زمانی شیعری شامی ئاسایی و ساکارە، وشە و تەعبیری میللی بەکار دێنێ، لە زمانی ئەدەبی میللییەوە (فۆلکلۆرەوە) نزیکە. زمانی تێکەڵاوە تایبەتییە لە دیالێکتە گەورە و بچووکەکانی زمانی کوردی وەکو گۆرانی و لوڕی و بەختیاری و فەیلی و لەکی و کەلهوڕی پێکهاتووە.

شیعری شامی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە باس لە تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی دەکا. شیعرێکە وێنەیێکی ڕاستی ڕێبازی ڕیالیزم دەخاتە ڕوو لە کۆمەڵی ئێران بەگشتی و کوردەواری ئەوێ بەتایبەتی. لە ساڵی ١٩٥٢ شامی شیعرێک بە ناوی میللەتی ئێرانەوە دادەنێ. ڕوو دەکاتە محەمەد موسەددەق (١٨٨١ - ١٩٦٧) و داوای لێ دەکا ئێران لە دەسەڵاتی بەگ و ئاغا و خان ڕزگار بکا و نەوت و سامانی وڵات لە دەست دەرەبەگ و کۆمپانیای دەوڵەتە ئەمپریالیستەکان دەربێنێ.

## نموونەی شیعری

### کرانشینی (کرێچیەتی)

شامی قەسیدەییێکی درێژی بەناوی (کرانشینی)یەوە لە ساڵی ١٩٥١ دایناوە، لە ٢٨ بەندی هەشت نیوە دێڕ شیعری پێکهاتووە، کێشی دە بڕگەیی و قافیەی (ا ا ا ا ا ب ب ب)یە. هەندێ لە بەندەکانی ئەم شیعرە بەم شێوەیە خۆیان دەنوێنن:

بەندە یەی نەفەر کرانشینم
چو عەزیز مردی دایم غەمینم
نە خاریج مەزەب نە جوداش دینم
ئەر دوعات گیراس بکەر نفرینم
شایەد لەی دونیا دیتر نەمینم
راحەت بووم لە دەس کرانشینی
چ بکەم وە دەس کرانشینی
داد وەهەر کەس بەم حەقم نیەسینی

بەس کە کرادام لەی تەویلە چوخەر
عومر وە بەدبەختی هاوردم وەسەر
بیمەسە موونس چەن گر و بەشەر
لوڕ لە لوڕستان کورد لە دینەوەر
سنەیی و پاوەیی جاف و کەمانگەر
کورد و لوڕ و فارس تورک قەزوینی
چ بکەم وە دەس کرانشینی
داد وەهەر کەس بەم حەقم نیەسینی

یەی شەو دوو نەفەر بینە میمانم
نیم ساعەت بیشتر لە بەرق سووزانم
سوب بینە ئاگر ڕشیانە گیانم
ئاغای ساحێو ماڵ وە گەرد خانم
ئاو پاشینە بان تەپڵ ئامانم
هەم لافە شڕە دریا وە شانم
ووتن: تا غرووب لەیردا نەمینی
چ بکەم وە دەس کرانشینی
داد وەهەر کەس بەم حەقم نیەسینی

چوکاوڕ وە گورگ لەلی ڕەم کردم
یەی پا هاتە وەر سێ یا دوور گردم
وە هەوڵ گیانم سلامی کردم
ووت: کاری داشتی! ناو ئۆتاق بردم
ووت: تۆسرکانیت؟ ووتم: نە کوردم
ووت: کورد کورەیت؟ ووتم: هەرسینی
چ بکەم وە دەس کرانشینی
داد وەهەر کەس بەم حەقم نیەسینی

لەم دێڕانەدا شامی گیروگرفتی کرێچیەتی دەخاتە ڕوو لە ناو چینە هەژار و بێ دەرامەتەکانی کۆمەڵ. ئازاری خۆی لەم لایەنەوە دەگاتە پلەییێک ئاواتەخوازی ئەوە دەبێ بمرێ چونکە لەو گێتییەدا کرێچیەتی نییە. هەموو تەمەنی بەفیڕۆ چووە لەبەرئەوەی خانووی خۆی نەبووە، لەگەڵ خەڵکی جیاواز ژیاوە، سنەیی و پاوەیی و جاف و تورکی قەزوینی. ئەگەر شەوێک میوانێکی بوایە خودا خۆی دەیزانێ لە ڕۆژی دواییدا خاوەن ماڵ چی بەزمێکی پێ کردووە. شامی ئەوە دەردەبڕێ هاوار بەماڵی ئەوەی بیەوێ ژوورێک بەکرێ بگرێ. بۆ بەڵگە دەڵێ ئارەزووی ئەوەم هەبوو ژوورێک بەکرێ بگرم. سلاوم لە خاوەن ماڵ کرد لە ناو ژوورەکە، وتی: کارت هەیە؟ وتم: بەڵێ. وتی: تۆسرکانی؟ وتم: نا کوردم. وتی کوردی کوێیی؟ وتم: هەرسینی. ئەم هەموو پرسیارانە دەسەلاتی شای ئێران لێی داوا کردووە بۆ پاراستنی ئاسایشی دەوڵەت.

شاعیر لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی کرێچیەتی دەڕوا و دەڵێ:

سێ مانگم پەس کەفت کرایەی خانی
یە سێ مانگی تر هات نیشتە بانی
باورو پیم نیەوت خودا خۆی زانی
چشتی کەشک بەم مەجمە و قازانی

ئەویش دی نیەیلم ژنم بزانی
سوب هەراجی کەم نیەیلم بمینی
چ بکەم وە دەس کرانشینی
داد وەهەر کەس بەم حەقم نیەسینی
کەس خەوەر نییە وەحاڵ دەردم
گووشی کەس نییە وە ئاهی سەردم
چل ساڵ وە ئیران زندگی کەردم
کرای زەمین دەم وەبانی گەردم
ڕۆزگار موحتاج کرد وە نامەردم
نە ڕۆمی ڕۆمیم نە چینی چینی
چ بکەم وە دەس کرانشینی
داد وەهەر کەس بەم حەقم نیەسینی
ئۆتاقی گردم بی بەرق و بی ئەو
دەر و پەیکەر خویرد چوار دیوار خرەو
داغی پیرم کرد کردمە قولەو
ڕۆژ نیمەڕۆ وە لیم کردە شەو
دی چەتوای وەلیم؟ ئاسمانْ کەو
حەققی من تا حەشر لە لات بمینی
چ بکەم وە دەس کرانشینی
داد وەهەر کەس بەم حەقم نیەسینی
چو سەگْ وڵگەرد دەروەدەر وەخۆم
شەو تا سوب نەخەف ڕەنج بیوەر وەخۆم
دڵگیر وە دونیای دوون پەروەر وەخۆم
لە دەس ساحێو ماڵ خوون جگەر وەخۆم
مشتی خاک نەیرم خاک وەسەر وەخۆم
لە زیندەی ئایەم بی خەوەر وەخۆم
نیەزانم (شامی) دی تاکەی مینی



چ بکەم وە دەس کرانشینی
داد وەهەر کەس بەم حەقم نیەسینی

شاعیر بەڵگە و کێشە و ئازارەکانی کرێچیەتی لە گەلێ وێنەدا دەبینێ. سێ مانگ کرێی خانوو کۆبۆتەوە، ناچار بووە بەدزییەوە قاپ و قاچاغ بفرۆشێ بەبێ ئەوەی خێزانی پێی بزانێ. ئەوەندە لە گیانی خۆی بێزارە دەڵێ چل ساڵ لە ئێران زیندەگانیم کردووە کرێی ژوورم نەبووە بیدەم، لەو کاتەی ئەو ژوورە نە ئاوی لێ بووە نە کارەبا. دیواری ڕزی و ڕووخاو. ئەم حاڵە پیری کردم و ڕۆژم لێ بوو بەشەو. لە دواییدا شامی داوای مردن دەکا و بۆ خۆی دەلاوێنێتەوە: وەک سەگی بەرەڵڵا دەربەدەرم، شەو تا بەیانی ناخەوم، لە دەست خاوەن ماڵ جگەرم بووە بەخوێناو، بستێک خاکم نییە بەسەر خۆمی داکەم، نازانم تاکەی لەم پەرێشانییەدا دەبم.

لەم شیعرەیدا بەشێوازێکی هونەری شامی گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتی دەخاتە ڕوو لە بەرهەمێکدا نزیک لە شیعری میللی.

**باغەوان وەفای بۆ کەس نییە**

بەناوی «باغەوان وەفای بۆ کەس نییە» شامی پۆیێمێکی (١٥٠) دێڕی هەیە. کێشی خۆماڵی سیلابی دە بڕگەیی و قافیەی مەسنەوییە لە ساڵی ١٩٥٨ دایناوە. ناوەڕۆکی بریتییە لە گێڕانەوەی ڕابواردنی شەوانی زستان لە دەوری ئاگردان و سەماوەر و گۆرانی و حیکایەتی میللی.

سەرەتا بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

بنام بی چوون جەهاندار فەرد
موخبیر جە هەر کار تەبیب جە هەر دەرد
زاتەش بی زەواڵ لوتفەش بی پایان
خودایش وە خەلق عالم نمایان

لەسەر دەستووری شیعری کۆن، بەتایبەتی بەیت و قەسیدەی درێژ، شامی بەموناجات لە ستایشی خودا دەستی بەشیعرەکەی کردووە.

لە پاشانا دەڵێ:

سەحەر وە نەغمەی مورغْ خۆش ئاواز
سەبا مەجوونباد گەهوارەم وە ناز

لالەی سوپاخیر سەحرا و کووە و دەر
وە فەرش دیبا پووشا و سەراسەر
گولان سەف کیشاون لە ئەترافْ جوو
هەر گولی ڕەنگی هەر ڕەنگی یەک بوو
خار وێنەی سەرباز سوپای پیادە
سەرتاسەر گرتو ئەترافْ جادە
بوو عەتر گول سورخ غونچەی نەشکوفتە
نەغمەی ڕەوان بەخش مورغْ ئاشفتە

لەم دێڕانەدا شامی وەسفی جوانی سروشت دەکا، بەهار بەخۆی و باڵندەی خۆش ئاواز و فەرشی سەوزی مێرغوزار و گوڵاڵەی کەنار جۆبار و دڕک و داڵ وەکو سەرباز پاسەوانی ئەم جوانییە دەکەن.

بەم دێڕانە کۆتایی بەپۆیێمەکەی دێنێ:

یەی دەستەی گووش کوو خەستەی گووشتْ گاو
چوار جامی رووحێن یەی سەتڵ جا ئاو
لافەکەی (شامی) فەسلی تاوسان
وە ناو سەوەتە بایەس بوەیدەی بان

## غەزەلی کلاسیکی

بەڕاستی شامی لە سەرانسەری دیوانی شیعری خۆی بەشاعیری میللیی ڕاستەقینە پیشان دەدا لە ڕوخسار و ناوەڕۆکدا. کەچی ئەو شیعرە کەمە عەرووزییەی بەڵگەی شاعیرییەتێکی ڕەسەنی شارەزای خەیاڵ و چێژی شیعری کۆنی کلاسیکی ئەدەبی کوردی و نەتەوەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە.

١

لە غەزەلێکیدا لە پاییزی ساڵی ١٩٧٥ وتراوە دەڵێ:

خیش و بیگانە بزانن قاتڵ گیانم تونی
باعیسی ئاە و فەغانی شامی هیجرانم تونی
بی سەبەب بارانی دیدە دامەنی کەس تەڕ نەکرد
مایەیی ئەشکی عەیان و ئاهی پەنهانم تونی



خوەم شناسم دو زووخاو دیدە وو ئارامْ دڵ
توهمەتی ناحەق وەکی کەم! بی وەفا زانم تونی

لەم شیعرە ڕەوانەدا شامی مەرجەکانی ئەم جۆرە شیعرەی بەکارهێناوە، بەحری عەرووزی و یەکێتیی قافیە و تەنانەت پاش قافیەشی هەیە، «تونی» بەواتای (تۆی، ئەتۆی). لە شیعرەکەدا شامی ئاه و ناڵەی گەرم دەپژێنێ لە ڕاست دووری و بێ وەفایی دلبەر.

٢

لە غەزەلێکی دیکەیدا لە ساڵی ١٩٧٣ وتوویەتی دەڵێ:

دڵ وە زنجیری فیراقت ڕاهی ئازادیش بەنە
کاری دڵ هەر دەم وە دووریت داد و ئاه و شیوەنە
داد و بەد عەهدی خووبان هەر کەسی دیریت وەلی
گووشی گەردوونی ستەمگەر کەڕ وە فەریاد مەنە
دڵ وە فەریاد و فەغان کرخیش و بیگانە مەلوول
بی وەفا یایا دڵی تو سەنگ سەخت یا ئاهەنە
سەنگی ئومێدی ویساڵت شیشەیی سەبرم شکاند
بەرقْ شمشیری فیراقت قاتڵی گیان و تەنە
خوەم عەجەب دیرم وەتاڵەی شوومی کەچ بنیادی خوەم
میهرەبانی گەردی هەر کەس کەم وەگەردم دوشمەنە
بی سەبەب سەرگەشتە مەجنوون چی وەسەحرایی جنوون
مەر نە زانست ڕەسمی خووبان بی وەفایی کەردەنە
تا دەمی مردن دەما دەم دەم وەدیدار تو دەم
تا بزانی دڵ ئەسیری چاهی تورک چون بیژەنە
گیان وە چەنگاڵْ فەراقی دەرینەکەی (شامی) نەکە
داد وە بەد عەهدی خووبان مایەی خوون خوەردنە

شامی لەم لیریکەیدا موناجات لەگەڵ دلبەر دەکا. هەولی داوە بەرگی تازە لەبەر هەندێ وێنەی شیعری کلاسیکی بکا. شیعرەکە وەکو دیاردەیێکی نوێ دەکەوێتە بەرگوێ بەتایبەتی شیعری بەحری عەرووزی لە شیعری شامی و هەموو شاعیرانی هەورامان و

ناوچەکانی کرماشان و لوڕستان باو نەبووە. جگە لەوە وێنەی ڕەوانبێژی و شارەزایی خوێندەوارانەی شیعری کلاسیکی لەم بەرهەمەدا دەبینرێ، شاعیر لەگەڵ ئەوەی خوێندن و نووسینی نەبووە بەڵام ڕۆشنبیر بووە. هەندێ وێنەی جوان لەم شیعرەدا بەرچاو دەکەون وەکو: بەردی هیوای گەیشتن بەدیدەنی تۆ شووشەی سەبرمی شکاند؛ ڕووناکیی شمشێر دووری تۆ گیان و تەنی من لەناودەبا.

***

شامراد موشتاقی کرماشانی ناسراو بەشامی بەشیعرە جوانەکانی لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی کوردی ڕەنگین کردووە. کابراییێکی کوێری دوور لە خوێندن و نووسین، دەست کورت و هەژار، بۆ دابینکردنی نانی خۆی سەربلّندانە لە دژی سروشت و ناگزووری کۆمەڵایەتی و بێ چاوی چۆتە مەیدانەوە. دێوەرەیی کردووە، شتومەک و وردەواڵەی لێرە کڕیوە و لەولا فرۆشتوویەتی. مەیدانی کڕین و فرۆشتنی لە ئاوایییەکانی دەوروبەری شارانی کرماشان و کرند و قەسری شیرین بووە.

شیعری شامی ڕەنگدانەوەی لایەنێکی نالەباری ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەواری ئێران بوو، هەروەها بەڵگەی ناسکی دڵ و ئاوەدانی دەروونی بوو. لە ڕووی ڕوخسارەوە مەرجەکانی شیعری بەحری عەرووزی و کێشی خۆماڵی پاراستووە، ئەمە ئەوە دەگەیێنێ شامی ئەگەرچی خوێندن و نووسینی نەبووە، بەڵام ڕۆشنبیر بووە لەبەرئەوە توانیویەتی شیعری نالییانە بڵێ، بۆیە چۆتە ناو مێژووی ئەدەبی کوردییەوە.

# بەشی سی و پێنجەم

## ع ح ب "عەین حێ بێ"

**١٩٢٣ - ٢٠٠٠**

### ژیانی

محەمەد کوڕی حوسێن کوڕی محەمەد بەرزنجی لە ساڵی **١٩٢٣** لە گوندی بەرزنجەی سەر بەقەزای چوارتای سلێمانی لە دایک بووە. هێشتا منداڵ بووە ماڵی باوکی گواستوویانەتەوە گوندی سەرکان نزیک بەرزنجە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە. لەو کاتەی دەستی بەنووسین و بڵاوکردنەوە کردووە «ع ح ب»ی بۆ خۆی داناوە وەک ڕەمزێکی نهێنی. لە ڕاستیدا تیپی یەکەمی ناوی سێیانی برای خۆی «عەلی حوسێن بەرزنجی» وەرگرتووە و کردوویەتی بەناوی خاوەنی ئەو نووسینانەی بڵاوی دەکردنەوە بەمەبەسی ئەوەی لە لایەن دەسەڵاتی میری نەناسرێتەوە و لە چاوی سانسۆر ڕزگاری ببێ.

سەرەتای خوێندنی لای شێخ ئەمینی باپیری بووە (باوکی دایکی) لەسەر بەرنامەی حوجرەی مزگەوت. لە ساڵی **١٩٣٢** ماڵیان گواستراوەتەوە سلێمانی و لەوێ قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەنجی تەواو کردووە و لە ساڵی **١٩٤٦** بەمووچەخۆری میری دامەزراوە تا ساڵی **١٩٦٣** لەسەر ئەو کارەی ماوەتەوە. لە دوای کوودیتا کۆنەپەرستییەکەی ٨ی شوباتی **١٩٦٣** وەکو زۆری مووچەخۆرانی کورد لە کار دوور خرایەوە، بەدرێژایی شەستەکانی سەدەی بیستەم دوور بووە لە ژیانی ئاسایی، دەستی کورت بووە، ماوەی بڵاوکردنەوەی نەبووە. ئەو ڕۆژگارە نالەبارترین سەردەمێک بووە لە مێژووی کوردی کوردستانی عیراق بەتایبەتی لە ڕووی خوێندەوارییەوە. لە ساڵی **١٩٦٨** وەکو زۆربەی خەڵکی دیکە گەڕاوەتەوە سەر کارەکەی پێشووی خۆی.

ع ح ب بەهێمنی و لەسەرخۆ دڵسۆزی بیروباوەڕی بووە، شیعر بەشێکی گرنگ بووە لە ژیانی گیانی ئەو شاعیرە تا ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٠ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.



### شیعری

شاعیری ئەم ماوەیە ع ح ب لە ساڵی **١٩٤٦** دەستی داوەتە شیعر، لە ساڵی **١٩٤٧** لە کۆواری گەلاوێژ بەرهەمی بڵاوکردۆتەوە. شاعیرێکە لەسەر سیستێمی لیریکی نوێی کوردی شیعری داناوە، فرە کێشی سیلابی خۆماڵی و فرە قافیەیی ڕەنگیان لە شیعری داوەتەوە. بەلای شیعری عەرووزی نەچووە و بەدەگمەن هەندێ دێڕە شیعری خۆماڵی جووت قافیەی مەسنەوی لە ناو لیریکیدا دەبینرێن، ئەم جۆرە دێڕانە لە ناو لیریکەکاندا بزر دەبن.

بەگشتی دێڕی شیعری ع ح ب کورتە چونکە بەزۆری کێشی حەوت بڕگەیی و هەشت بڕگەیی بەکار دێنێ، تەنیا بەمە ناوەستێ ئەمانەش کەرت دەکا واتە دێڕی کورتتر لە حەوت بڕگە و هەشت بڕگەشی زۆرە. شیعری ع ح ب لە ڕووی کێش و قافیە و زمان و لێکسیکۆنی شیعرییەوە کاری ئەدەبی میللیی سەرزاری پێوە دیارە. زمانی ساکارە، وشە و زاراوەی کوردی پەتی بەکار دێنێ، قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و ئیدیۆمی هەیە. ئەم هەموو ئەدگارانە خوێنەر حەیران دەکەن بەوەی شاعیرییەتی ع ح ب توانیویەتی بەناوەڕۆک هێزێکی ئەوتۆ بداتە شیعرەکەی وەک بەرهەمێکی داهێنراوی بەرز بکەوێتە بەرچاوی خوێنەر. واتە بەڕوخسار میللییانە (فۆلکلۆرییانە) و بەناوەڕۆک بەرز مێشک و خەیاڵی زۆرینەی خەڵکی کورد زمان دەبزوێنێ.

بەگشتی شێوازی شیعری ع ح ب دەچێتە ناو خانەی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتییەوە. بۆ ئەم مەبەسە وەستایانە ماکی سیمبۆلی و ڕۆمانتیکی بەهەناسەی شیعری ڕۆژهەڵاتییانە و هەندێ جاریش ڕۆژئاواییانە (ئەوروپاییانە) دەخاتە ناو شیعرییەوە، لەبەرئەوەیە وێنەی ڕۆمانتیکییانەی ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپا لە شیعریدا بەرچاو دەکەوێ.

مەیدانی شیعری ع ح ب فراوانە، سەرچاوەی دەوڵەمەندە، بەشێکی زۆری ژیانی ئادەمزادی گرتۆتەوە. ژن و دڵداری لە لای ئەو بایەخێکی تایبەتی پێ دراوە. سروشت بۆ سروشت خۆی و بۆ زۆربەی شیعری دیکەی هەوێنێکی گرنگە. میللەتی کورد و نیشتمانی کوردستان و چەوساوەکانی سەر ڕووی زەوی جێگەی دیاریان لە شیعریدا هەیە. شاعیر بەهەناسەیێکی پڕ لە سۆزی مرۆڤایەتی لە پێناوی بەرگری لە چەوساوەکان هێرش دەباتە سەر چەوسێنەرەکان لە کاربەدەست و دەرەبەگ و دەوڵەمەندی ناوەوە و ئەمپریالیست و کۆڵۆنیالیستەکانی دەرەوە لە ئەوروپایی و ئەمەریکییان.

شاعیر هەندێ لە بەسەرهاتنەکانی سەردەمی ژیانی خۆی دەور کردۆتەوە. ڕاپەڕین و ڕووداوە سیاسییەکانی عیراق و کوردستانی عیراق. شینی بۆ کۆماری کوردستانی ساڵی ١٩٤٦ و کۆچی دوایی شێخ مەحموود کردووە، لە کوردستانی تورکیا دواوە، نەورۆزی پیرۆز کردووە، گەلێ بۆنەی لەم ڕووەوە لە بیر نەچۆتەوە.

ئاوڕی زۆری لە دەرەوەی نیشتمانی خۆی داوەتەوە. بەگیانێکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی لەسەر مافی نەتەوەکانی گێتی کردۆتەوە، وەکو ڤیتنام و فەلەستین و میسر. باسی قارەمانیەتی سپارتاکۆس و لۆمۆمبا و گیڤارای کردووە، میهرەجانی لاوانی بەرلینی (١٩٧٢) پیرۆز کردووە، لە دژی بەکارهێنانی بۆمبای ئەتۆم بووە.

بەپێی تاقیکردنەوەی خۆی شاعیر لەسەر ئەو باوەڕە بووە شیعر وتن بەهرەیە. لەم لایەنەوە زۆر جار ویستوویەتی شیعر بلێ بۆی نەهاتووە، لە جاری دیکەدا شیعر لە خەیاڵیدا نەبووە کەچی لەپڕ بۆی هاتووە. هەروەها بیروڕای دیکەشی دەربڕیوە لە بارەی شیعرەوە وەکو ئەوەی شاعیر هەرچەندە بچێتە ساڵەوە توانای شیعر وتنی کەمتر دەبێتەوە. ڕەنگە ئەمە حاڵەتێک بێ بۆ ع ح ب خۆی، چونکە شاعیریش هەیە لە شیعر ناکەوێ، هەندێ جار شاعیری پیر بەرهەمی بەرز دادەهێنێ بەپێی ئەو تیۆرییەی دەڵێ بەرهەمی جوان و ڕەسەن بەکاملی لە دایک دەبێ لە هەر قۆناغێکی ژیانی شاعیردا بێ.

زۆرینەی شیعری ع ح ب لە بابەتی لیریکی کورتە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ قەسیدەی درێژی هەیە (پۆیێم). ئەمانە لە بەرهەمە جوانەکانی دەژمێررێن. لە ناویاندا پێویستە ئاماژە بۆ بڕێکیان بکرێ:

١- ڕەنجی فەرهاد: ئیلهامی ئەم شیعرەی لە چیرۆکی شیعری «شیرین و فەرهاد»ی خانای قوبادی وەرگرتووە، لە دەوروبەری ٣٥٠ دێڕە شیعر پێکهاتووە. بەشێوازێکی سەردەمانە بەرهەمێکی تازەی لە ئەوەی خانای قوبادی دروست کردووە.

٢- داستانی دمدم خانۆی لەب زێڕین: لە نزیکەی ١١٠٠ دێڕە شیعر پێکهاتووە. گێڕانەوەی ئەدەبی میللیی سەرزار بووە بەسەرچاوە بۆ دانانی ئەم پۆیێمە.

٣- مەم و زین: لە دەوروبەری ٣٨٠ دێڕە شیعر پێکهاتووە. شاعیر ئیلهامی لە گێڕانەوەی میللیی سەرزار وەرگرتووە.

٤- برایمۆک: لە دەوروبەری ٣٣٠ دێڕە شیعر پێکهاتووە. ئەمەش لە بەیتی ئەدەبی میللیی (فۆلکلۆری) وەرگیراوە. شاعیر ئەو سێ کارەی دوایی لەو بەرهەمە ئەدەبییانە وەرگرتووە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمان ئۆسکار مان لە



ناوچەی موکریانی کوردستانی ئێران کۆی کردبوونەوە و لە پاشانا لە بەرلین لە ساڵی ١٩٠٤ بەچاپی گەیاندبوون.

٥- سلێمانی: لەم پۆیێمەدا بەنزیکەی ٢٤٠ دێڕە شیعر ع ح ب باس لە دایکبوونی شاری سلێمانی و پەرەسەندنی دەکا کە بەڕاستی لە مێژووی کورد و کوردستاندا شایانی ئەوە بوو بە«شاری هەڵمەت و قوربانی» ناوی پیرۆز بکرێ.

## نموونەی شیعری

### نیشتمانپەروەری

١

شاعیر بەشێوەیێک هۆگری کوردستانە لە چوارینێکیدا دەڵێ:

کەسێ لێی پرسیم ئەم خاکە جوانە
پێم ووت ئەوەتەی زەمان زەمانە
ئێمە پێشێلی دڕندە و دەعباین
بەڵام کوردستان هەر کوردستانە

لەم چوارینەدا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ لە خۆشی و ناخۆشیدا نیشتمانی خۆش دەوێ و قەت لە ئاسۆی بیریدا ئاوا نابێ، هەمیشەییە و هەر دەمێنێتەوە.

٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «ئەختەر»ەوە دەڵێ:

دوارۆژێکی خۆش
پڕ جۆش و خرۆش
ئەختەری نازدار
گەڕایەوە بۆ شار
لەوێ شالاو
گرتیە ناو
کە لە تەرمی شێخی گەورە
درا بوو دەورە

خەڵکی بەشان
بەرەو سەیوان ئەیانفڕان
لە بەردەمی سەرا
ئەبێ بەهەرا
ئەختەر سنگ
لە دەزگای کوشتن ئەکا تونگ
خوێنی ئەڕژێتە داوێنی
ئەختەر شۆڕەژنی سەختی وەک قولە
سینە و مەمکی ئەداتە بەر
ڕەهێڵەی گوللە
ئەو ئافرەتە
گەردنی بەرزی ئامادەی پەتە
لە زوڵم و زۆری هەراسانێ بوو
شۆڕەسواری مەیدانێ بوو
کچە قارەمانێ بوو
هەڵکەوتووی سەردەم و زەمانێ بوو
یەکێکە لەو تاکە تاکە
فیداکاری ئاو و خاکە
ئەختەر

لە ساڵی **١٩٥٦** شێخ مەحموود لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، کە تەرمەکەیان هێنایەوە سلێمانی. جەماوەری شار بەخۆپیشاندانێکی گەورە تابووتی شێخیان گرتە باوەش. دەسەڵاتی عیراق تەقەی لە خەڵکی کرد. یەکێک لە کوژراوەکان ئەختەر بوو. ع ح ب لە ساڵی **١٩٨٣** بەیادی کوژرانی ژنە کوردی قارەمان ئەختەر خان ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە. ئەم لیریکەی بۆ ئەختەری نازدار داناوە، مایەی ژیان بوو، نەرم و ناسک بوو، سنگ و مەمکی دایە بەر گوللە لە پێناوی ئەو قارەمانەی لە پشت بەردە قارەمان لە بازیان وەکو سەربازێک بریندار کرا. دەسەڵاتی کۆنەپەرستی عیراق دەبوو کچە قارەمانی سلێمانی ئەختەر بکوژن، چونکە لایەنی شێخ مەحموود بوو. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە تاوان لەوە گەورەتر نییە سنگ و مەمکی ئەختەر بدرێتە بەر گوللە.



## کوردی کوردستانی ئێران

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «سکاڵای لاوێکی کوردی ئێران» دەڵێ:

ڕوو ئەکەمە هەر کوێ
ئاگرە و بۆم دێ
دەستم سووتا هەستم سووتا
ماڵم سووتا مناڵم سووتا
ژوور سەرم تارە
کراسی بەرم ژارە
دەمم پڕ لە خۆڵە
دەوروپشتم چۆڵە
نازانم ڕووی دەم
لە کام و کێ کەم
هەرچی ئاوە
ژاری تێ ڕژاوە
هەرچی نانە
هۆی مردن و ژانە
ئەی وولاتی پڕ ئاگرم
جێت ناهێڵم هەتا ئەمرم

هەڵوێستی دوژمنانەی دەسەڵاتی ئێران بەرامبەر بەکورد بەگۆڕینی ئەوەی فەرمانڕەوایە ناگۆڕێ. ع ح ب ئەم شیعرەی لە ساڵی **١٩٨٤** نووسیوەتەوە. ئەو دەمە ماوەیێک بەسەر کوودیتا ئاینییەکەی ساڵی **١٩٧٩**ی ئێران تێپەڕی بوو، کەچی هەڵوێستیان بەرامبەر بەکورد هەر ئەوەی سەردەمی فەرمانڕەوایی شا بوو، بەچاوێکی سووک تەماشای کوردیان دەکرد. شاعیر لەسەر زمانی کوردێکی کوردستانی ئێران سوورە لەسەر ئەوەی نیشتمان بەجێ ناهێڵێ، ئەمە تەنیا زمانی حاڵی ئەو کوردەی ئەوێ نییە، بەڵکو هەست و نەستی شاعیریشە.

۲

له چوارینێکیدا شاعیر لەم بابەتەوە دەڵێ:

شایێکی ڕەوشت وەک گورگی ئێران
کوردێکی لەسەر ئاگر ئەبرژان
ئەیانویست وولات جێبێڵێ و بڕوا
تا مرد هەر ئەیووت خاکمە کوردستان

ئەم هۆگرییەی شاعیر بەخاکی کوردستانەوە، لە ئەنجامی پارچەکردنی خاکەکەیە، هەر پارچەی میللەتێک داگیری کردووە، تورک و عەجەم و عەرەب، ئەگەرچی ئەوانیش لە ناوخۆیاندا لەگەڵ یەکتری ڕێک نین بەڵام بۆ مەسەلەی بزووتنەوەی بیری کوردایەتی یەک دەنگن. مەبەسی هەموویان دەرکردن یا توانەوەی کوردە. ئیتر شاعیر پەیمان دەدا لە خەبات نەکەوێ و خاک بەجێ نەهێڵێ.

**دادی کۆمەڵایەتی**

لە شیعرێکیدا ع ح ب بەناوی «نرخی پارە» دەڵێ:

بۆت هەیە چوار ژن بێنی
یا ئەگەر پیاوێکت کوشت
بەپارە ئەکڕی خوێنی
پارەیە بڕبڕەی پشت
***
بەسووژن سەد چاو کوێر کە
بەدزی پارە پەیدا کە
چەند دینارێکی کەم خێر کە
بۆ باغی بەهەشت ڕاکە
***
فێڵ و دەست بڕین و سوو
تاوانێکی وای نییە



مەگەرە سی ڕۆژەی ڕۆژوو
تێر کە دوو سێ برسییە
***
لێرە ڕابواردن و گەشت
بۆ خاوەن دەسەڵاتە
بۆ پارەدارە بەهەشت
جەهەننەم شوێنی لاتە
***
لە وولاتی وێرانا
لە ناو کەڕ و کوێرانا
ئەمە ڕای ڕابەرانە
بۆیە مردن هەرزانە

لەم شیعرەدا ع ح ب باس لە ڕەوشت و نەریت و دەستوورێک دەکا هەندێکی نەنووسراوە و دروست کراوە، هەرچۆنێ بێ ئەوەی نووسراوە بخرێتە پراکتیکیشەوە ڕێی تێ دەچێ، بەڵام ئەوەی نەنووسراوە خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێنرێ. نویشکی بیروڕای ئەوەیە پارە هەموو شتێکە، ناهەقیشی پێ دەکرێ، پیاوی فاسق بەپارە خێر دەکا، چوونە بەهەشتی مسۆگەرە.

۲

لە شیعری پێشوویدا ع ح ب باسی لەو کۆمەڵە کردووە بەزەبری پارە دەستوور دادەنرێ بۆ چاکەی دەوڵەمەند، کەچی لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «شیعر و هات» باس لە سایکۆلۆجییەتی ناوەوەی ئادەمزاد دەکا لە دابەشکردنی جەوهەرەکانی مەتریاڵی و گیانی لە ژیانیدا:

کە ئافرەتێکی ناشیرین
لە کەسێ ئەبێ بەهەنگوین
ئەبێ بەحەڵوا
کەس ئەموستی پێوە ئەخوا

وە یا ئافرەتێکی شەنگ
ئەبێتە هاوسەری کەسێ
هەمیشە ئاژاوەیە و جەنگ
هەردەم هاواری لێ هەڵدەستێ
یا پیاوێکی دانا
ئەبێتە هاوەڵی ژنێ
لە یەک نان دانانا
ڕۆحی ئەجنێ
وا ئەکا پیاوە
ژەهری باشتر بێ بەلاوە
لەو نانە
پڕ لە ئاشووب و ژانە
وە یا گەمژە پیاوێ
بەپلارێکی هات
ئەوەندەی لێکنانی چاوێ
سامانی بە کەشکەشان ئەگات
زانایێکی ووریاش
ئەبێتە ئاشەوانی ئاش
شیعریش ئاوایە
شیعری گەن
نووزەی دەرنایە
دەسا و دەس ئەیبەن
کەچی شیعری جوان
ئەوەی لە ناخەوەیە بۆ هەموان
وەک بەئەنقەست
تێناپەڕێ لە یەک دوو دەست



کا لە بەردەمی سەگایە
بۆ ئەسپیش ئێسکی ڕووت
ژیان بەشی زۆری وایە
زێڕ بۆ کەرە و بۆ دانا زەقنەمووت

لەم بەرهەمەدا وێنەی هونەری داهێنراو دەبینرێ. بەڵگەکانی لە دابەشکردندا هەمووی ئاوەژوو و پێچەوانەیە. «کا و سەگ» و «ئێسقان و ئەسپ» هەمووکەس دەیزانێ. یا لە ڕۆژانی ئەمڕۆدا دەڵێن: دەسەڵات بەدەست پیاو بۆ کار نادۆزێتەوە، بەڵام بۆ پیاو کار دەدۆزێتەوە، دیارە ئەو پیاوەش شایانی ئەوە نییە. ع ح ب ئەم بیروڕایە دێنێتە ناو گێتیی شیعرەوە. ڕاستییەکەی ئەوەیە شیعر شیعرە، چاک و خراپی نییە. کە شیعر بێ مانای چاکە. کە چاک نەبوو مانای ئەوەیە شیعر نییە. بۆیە کورد وتوویەتی ئەمە میعرە و شیعر نییە!.

٣

لە چوارینێکیدا شاعیر دەڵێ:

مـن ئێســـتـــه دیلم لە بیـــابانێ
سک هەڵئــەگــوشم بۆ پارچە نانێ
ڕۆژی چەن جـارێ فـەلاقـەم ئەکـەن
ئـەڵێـن وا ئەبـی تـا دێر زەمـــــانێ

لەم چوارینەدا شـاعـیـر باوەڕی بەگـۆڕان هەیە، ئەو شـیـعـرەی بۆ ئەوە وتووە هەژاری و زۆرداری هەتا هەتایە نامێنن، ڕاستە تا ڕۆژگارێکی درێژیش دەمێننەوە، بەڵام یەکسانی و داد و ئازادی لە دواڕۆژدا باڵیان دەکێشنە سەر هەموو لایێکی ڕووی زەوی.

٤

لە چوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

داغــیــان ئەکـردم بەشـیــشی ئاسن
ناوی خــۆم گــۆڕی بەڵکو نەمناسن
ناســیــاوێکی خـۆم ئاشکرای کـردم
ســینەیان کـێــلاّم بەلووتی گـاسن

لەم چوارینەدا شاعیر باس لە تاوانی جاسووسی دەکا. کەسێکی بێبار خراپە بە نزیکێکی خۆی دەگەیەنێ. بۆ بەڵگە نیشتمانپەروەرێکی کورد ناوی خۆی دەگۆڕێ بۆ ئەوەی دوژمن نەیناسێتەوە، کەچی ناسیاوێک ناوی ئاشکرا دەکا بۆ دەسەڵات بەدەست.

### کچی قارەمان

لە شیعرێکیدا بەناوی «کچە عارەبێ» شاعیر دەڵێ:

بەبەستەڵەک و نسێوا
هەڵئەزنا بەکێوا
کچە عارەبێکی چاو ڕەش
وەک گوڵاڵە گەش
لە ڕۆژئاواوە
گەیبوە ئەم ناوە
وەک قارەمانێکی وێنەکەم
شیری هەڵکێشا بوو لە ستەم
کچە عارەبێکی شاخەوان
تا دڵ حەز ئەکا جوان
وەک میوان
هاتبووە لامان
شەیدای سەربەستی بوو
دڵی لەسەر لەپی دەستی بوو
کچە عارەبێکی ئاسک
نازدار و ناسک
لە بنارێکی بێدەنگا
بۆ کورد ئەجەنگا
لە ڕۆژێکی ئاڵۆزا
پڕ تەپ و تۆزا
بێچوە گورگی شاخ
کرد و دەماخ



لەناکاو
خستییە داو
کچە عارەبێکی ئازا
کوژرا بەسزا

ع ح ب شاعیری ڕاستە، لەبەرئەوە عەوداڵی ژنە، ئەگەر قارەمانیش بێ دەبێ جوان و ناسک و نازدار بێ. ئەو کچە عارەبە بەپێی فیکری ئەنتەرناسیۆنالیزمی هاتۆتە کوردستان و بۆ کورد جەنگاوە. بیری مرۆڤایەتی و وەکیەکی هەموو ئادەمزادێک بووە بەهەوێنی ئەم شیعرە. کچێکی جوان پێش هەموو شتێک سەرچاوەی داهێنانی شیعری دڵداری بووە، کەچی بوو بەقارەمانی کارەساتێک بۆ سەندنی مافی میللەتێک. کچێکی عەرەب لەسەر مەسەلەی کورد شەهید دەکرێ.

***

محەمەد حوسێن بەرزنجی ناسراو بە ع ح ب (عەین حێ بێ) شاعیرێکی کورد بوو، بەشیعری نوێی کوردی دەستی پێ کرد، هەر بەئەویش کۆتایی پێ هێنا. کێشی سیلابی خۆماڵی و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی بەکارهێناوە. زمانی ئاسان و کوردی پەتی بوو، لیریکی تازە بابەت بوو، بەو مانایەی دڵداری ژن و بزووتنەوەی سروشتی وەک سەرچاوەییێک بەکار دەهێنا بۆ هەموو جۆرە شیعری کە لایەنێکی زۆری ژیانی گرتبووەوە. ئەو لایەنانە لەم بابەتانەدا دەکەوتنە بەرچاو: نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و مرۆڤایەتی و ئەنتەرناسیۆنالیستی و دژی دەرەبەگ و سەرمایەدار و ئەمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم و بەرگری کردن لە جووتیار و کرێکار و هەژار و ڕەش و ڕووت لەبەر ڕۆشنایی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی و شێوازی ڕۆمانتیزمی و سیمبۆلیزمی.

## بەشی سی و شەشەم

# تیریژ

**١٩٢٣ - ٢٠٠٢**

### ژیانی

نایف کوڕی حەسۆ لە ساڵی ١٩٢٣ لە گوندی نەجمۆک (نجیمێ) لە ناوچەی قامیشلی لە دایک بووە. لە تەمەنی شەش ساڵی ماڵی باوکی چۆتە گوندی تووکی لەو ناوچەیەدا. ئەوجا ڕووی کردۆتە گوندی سێ مەتکی لە نزیک شاری عاموودە. سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت بووە، زانستییەکانی ئایینی ئیسلامی و زمانی عەرەبی فێر بووە، لە تەمەنی مێردمنداڵی لە ساڵی ١٩٣٨ وازی لە خوێندنی حوجرە هێناوە. لە شاری عاموودە نیشتەجێ بووە، نزیکەی پێنج ساڵ لە قوتابخانە خوێندوویەتی، لەم ماوەیەدا مەیلی لەسەر ئەدەب بووە، هۆگری شیعر بووە، لە پێشانا خوێندوویەتییەوە و لە پاشانا مەشقی هۆنینەوەی کردووە. ئەوجا وشەی «تیریژ»ی هەڵبژاردووە، بەمانای (تیشک) و (بڵێسە) هاتووە، کردوویەتی بەنازناوی شیعری.

تیریژ لەبەر هەژاری و دەست کورتی خوێندنی تەواو نەکردووە، بەتەمەن زۆر گەورە نەبووە کە دەستی داوەتە خەباتی سیاسی و جموجۆڵی کۆمەڵایەتی و هۆنینەوەی شیعر. ئەندامێکی زیرەک و کار ڕاپەڕێنەر بووە لە «یانەی دیدەوانی و وەرزینی کوردستان» لەگەڵ جیگەرخوێن و عوسمان سەبری و ڕەشیدی کورد و یووسف حرسان و قەدری جان هاوکار بووە لەو ڕێکخراوەدا. پێوەندی لەگەڵ ڕۆشنبیر و نووسەر و شاعیرانی کوردی ئەو سەردەمەی سووریا بەهێز بووە. لە دوای دەرچوونی فەرەنسا لە سووریا و دەستپێکردن بەعەرەبکردنی کورد لەوێ تیریژ سوور بوو لەسەر خەباتی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و سیاسی. بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لە مەیدانی کوردایەتیدا دوورنەکەوتەوە.

شاعیر مەقامێکی بەرزی لە ناو کۆمەڵی کوردی سووریا هەبوو، خەڵکی وەکو شاعیرێکی میللی تەماشایان دەکرد، ڕۆشنبیران بەشاعیرێکی بەرزی داهێنەر لە قەڵەمیان دەدا. شیعری لەسەر زاری هەموو کەسێک بوو. گۆرانیبێژە میللییەکان بەئاوازەوە شیعریان دەچڕی.



لە بەهاری ساڵی ٢٠٠١ کوردی ئاوارەی ئەڵمانیا میوانداری تیریژیان کرد، لە مانگێک زیاتر گەشتی چەند شارێکی گەورەی ئەو وڵاتەی کرد. شیعری بۆ دەخوێندنەوە، ئامۆژگاری ڕۆشنبیرانی دەکرد بگەڕێنەوە نیشتمان، چونکە سیاسەتی سووریا هەرچەند خراپ بێ بەرامبەر بەکورد، ناوەوەی وڵات جێی خەباتی ڕاستەقینەیە. لەو گەشتەدا تیریژ شاد دەبوو کە لە ئاهەنگەکاندا شیعری خۆی بەئاوازی خۆشی دڵڕفێنەوە دەبیست.

تیریژ لە ڕۆژی ٢٣ی مارتی ٢٠٠٢ لە شاری حەسەکە کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمی گوێزرایەوە گوندی کرکفتار و لەوێ نێژرا.

### شیعری

تیریژ خوێندەواری کۆنی حوجرەی مزگەوت و خوێندەواری تازەی قوتابخانەی وەرگرت، لەگەڵ ئەوەی لە سەرەتادا ناوی بەمەلا نایف ڕۆیشتبوو بەڵام بەتەواوی لە ڕووی پراکتیکەوە لە گێتیی خوێندنی حوجرە پچڕا، لەگەڵ ئەوەشدا سوودی لێ وەرگرتبوو. شیعری تیریژ لە هەموو ڕوویێکەوە دەچێتە خانەی «شیعری نوێ»وە. دیاردەیێکی داهێنەرانە و هونەروەرانەی دروست کردووە لەو کاتەی شیعری لەسەر بەحری عەرووز و یەکێتیی قافیە و پاش قافیە وتووە بەناوەڕۆکێکی زۆر تازە لە شیعری باکووری کوردستاندا باو نەبووە. لەو قاڵبە کۆنەدا وەستایانە شیعری کۆمەڵایەتی و سیاسی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی وتووە. کێشی خۆماڵی و هەموو مەرجەکانی شیعری نوێ لە بەرهەمیدا بەدی دەکرێن.

وەک لە ڕەخنەی ئەدەبیدا هاتووە شاعیری بەهێز ئەو کەسەیە بتوانێ چەند ڕێبازێکی ئەدەبی تێکەڵ بەیەکتری بکا و لە بەرهەمێکدا وێنەیان بکێشی. لە شیعری تیریژدا بەگشتی هەست بەتەمومژی ڕۆمانتیکی دەکرێ لە ناو قاوغی ڕیالیزمدا، سیمبۆلیزم وەک شێواز لە هەندێ شیعریدا بەرچاو دەکەوێ.

تیریژ لە هەموو ناوەڕۆکەکانی شیعری کلاسیکی کوردی دوور کەوتۆتەوە، بەتایبەتی ستایش و پێداهەڵدان و شانازی کردن و داشۆرینی نییە. دڵداری لە ناو سروشت تواندۆتەوە.

ڕەمزی سروشتی کوردستان کەژی بەهارە. شێتی بەهارە، ئەم خۆشەویستییەی لە ناخەوە بۆ ئەوەیە لە کورد بدوێ، لە دواکەوتوویی، بۆ ئەوەی پێش بکەوێ؛ لە دیلیەتی بۆ ئەوەی

ئازاد بێ. لە شیعریدا هەست بەدڵداری و وەسف و لەرزی سایکۆلۆجی دەروونی دەکرێ، دەتوانرێ لە خانەی تایبەتی شیعر دابنرێ لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە هەمووی لە ناو مەبەسی سەرەکی تیرێژ تواوەتەوە کە میللەتی کورد دلبەریەتی لەسەر خاکێک ناوی کوردستانە.

تیرێژ بەرهەمی شیعری کەم نییە. لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا هەوڵی بڵاوکردنەوەی هەندێکیانی داوە بەنهێنی و ئاشکرا گەیشتوونەتە خوێنەری کورد. بەشێ لەم بەرهەمانە لە دوای چاپکردن قەدەغە کراوە، لەسەر هەندێکیان گیراوە و خراوەتە بەندیخانەوە. هەرچۆنێ بێ لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەم کۆمەڵە شیعرەکانی بەناوی «خەڵات» و «زۆزان» و «جوودی» لە دیمەشق و بێرووت بڵاوکراونەتەوە. جگە لەم بەرهەمانە تیرێژ «مەلوودنامە»ی کوردیشی هەیە.

## نموونەی شیعری

١

لە شیعرێکیدا تیرێژ دەڵێ:

گەر ڕا نەبی تو سەر خوە وەلات ب پێشڤە ناچی
ئەو ڕێبەرێن مللەتان ئەڤ وەک تەنەب هەمەت
وەلاتێ خوە ب زۆرێ ژ بن دەستان دەرئانین
کەتن ڕوو پەلێ تاریخ ب مێرانی ب شوهرەت
هەتاکو ئەم وسا بن دێ تم حالێ مە ئەڤەبە
پەریشان و بەلەنگاز ژار و بێ سەر و سیککەت
تو گوهـ دێری ل (تیرێژ) پەسن د دەژ بۆتە
دەست هلینی ب مەردی خۆش بژی ئەڤ دەم و وەخت

شاعیر لەم لیریکەدا ئامۆژگاری کورد دەکا. ڕەنگە ئەو قسانەی دەیکا هیچ شتێکی تازەی تێدا نەبێ لە ڕووی ماناوە. دەڵێ ئەگەر ڕانەپەڕی وڵات پێش ناکەوێ. توانای تۆ لە میللەتانی دیکە کەمتر نییە. ئەوان سەربەخۆییان وەدەست هێنا، تۆش چاو لەوان بکە. شاعیر توانیویەتی بەگیانێکی هونەری ئەم ئامۆژگارییانە قانگ بدا و کار بکاتە سەر خوێنەر و بەقسەی شاعیر بکا و ڕاپەڕێ.



٢

لە بابەت بەهارەوە تیرێژ دەڵێ:

بوهار دەم و دەورانا منێ
سەرپشک هەم یارا منێ
باغ و گولیزارا منێ
مێرگ و گولیستانا منێ
خەملاتە نیشانا زەمین
کولیلک ب سەد ڕەنگ و ب بین
شاعیر ل سەر تە هار و دین
ئادار و نیسانا منێ

شاعیر بەسروشت کەژی بەهاری خۆشویستووە. بەسەرچاوەییێکی لە بن نەهاتووی ئیلهامی شاعیرانی داناوە. بەهار بەمانای سەربەستی و ئازادییە، ڕەنگدانەوەی بەهار بەشێوەییێکی فراوان لە بەرهەمی شیعری تیرێژ زەمینە خۆش دەکا بۆ شیعر دۆستان بۆ ئەوەی بلێین لەم لیریکەدا بەهار ڕەمزە بۆ نیشتمانی کورد، چونکە گومان لەوەدا نییە، مەبەسی سەرەکی لە شیعری ئەو شاعیرەدا هەڵسوکەوتی ئێستای کوردە و هەوڵ و تێکۆشینە بۆ گەیشتن بەئامانج، بۆ ئەوەی خۆی خاوەنی خۆی بێ.

٣

لە شیعرێکی درێژی چوارین بەند تیرێژ بەم جۆرە دەست بەقسەکردن دەکا لەگەڵ بلبل:

ئەی بلبلێ دلشادی هەلا وەرە بکە فیغان
دەردێ مە گرانە هەی برا برینامە کوورە
گۆری تە بکن جەرگ و دل و مێلاک و هەم جان
دەنگێ تەیە خوەشتر ژ نەی و بلوورە

***

سێ هاوێ تە دەنگەک ژ سران بایێ سبێیە
هاوێ دی ژ دەنگی خوەشینا دەهل و ڕەزایە

هاویێ سیێ ژ بێهنا شمامۆک و گولایە
لەورا کو ل دنییێ تو ب ناڤ و تو مەشهوورە

***

مەیدان مە ژ بۆ هرچ و چەقەل رۆڤی و کەفتار
گۆری تەمە بلبل ژ سەرێ داریێ تو وەرخوار
دا تێکدە مژوول بن ب خوە چەند رۆژێن د دژوار
ئیرۆ ل مە فەرمانە ل سەر گەردەنێ شوورە

***

دەستێ تەوقێیە یێ ئیرۆ کو ئەم هەرد و بدن هەڤ
چەند سال و زەمانن دخەراب ژین ئەم دگەل هەڤ
دنیا ب خوە دەورانە بزان گەهـ رۆژە گەهـ شەڤ
گەهـ تاری و دومانە و گەهـ رەوشەن و نوورە

بلبل و تیرێژ و کورد هەرسێکیان دڵدارن، دلبەری بلبل گوڵە، دلبەری تیرێژ و کورد ئازادییە. گوڵستان کوردستانە مەڵبەندی ئەو سێ دڵدارەیە. لە لێکدانەوەی ئەم شیعرە ئەبستراکت دروست دەبێ. دەکرێ وێنەکە ڕەنگدانەوەی هەستی دەروونی شاعیر بێ. تەنیا ئەو خۆی لە جێی بلبل دانەناوە، گەلێ لە شاعیران ئەمەیان کردووە. هەروەها دەکرێ وێنەکە ڕەمز بێ بۆ ئازادی کە کورد دەمێکە خەبات دەکا بۆ گەیشتن بەخاکی ئازادیستان. وێنە هونەرییەکانی لەم بەشەدا تیرێژ دایهێناون لە زەمینەیێکی واقعییەوە هەڵقوڵاون لە کۆمەڵێکدا چاکە و خراپە لە جەنگ دان و بۆ یەکتری چوونەتە مەیدانەوە. شاعیر پارچە شیعرەکەی بەهەندێ بیری دانایانە لە قاڵبی ئامۆژگاریی ڕۆژهەڵاتیانە ڕازاندۆتەوە.

تیرێژ شیعرەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

بیهنا خوە ددەنک بایێ بارین ئەی برادەر
ستێرکا سبێ ئیرۆ ژ شەرقێ ل مەدا دەر
رەوشەن کری کوردستان ب جارەک وێ سەرانسەر
نیشانا سبێیە فەرەجا خێرێ نە دوورە

***

پشتی وێ ستێرێ ب خوە بەربانگا سبێیە
وێ رۆژهلێ رۆهنی دکەڤێ شوونا شەڤێیە



کاروانێ مە وێ بگهێ جێ و وارێ مەقسەدێیە
چەرخا فەلەکێ هەردەم ب فتل و گەر و دەورە

***

کاروانێ مە ڤا ب ریکەتی لێ شەڤرەش و تاری
سەرمایە تەرەز کولی یێ بەرفێ هەر دیاری
بەهرۆزە چەلپەک تێنەمە ژ هەر چار کەناری
وارێ مە وەلاتە ئەی هەڤال رێگا مە دوورە

***

چەرخا فەلەکێ هەردەم ب فتل و گەر و دەوران
هێڤی و هەوارا مە ژ یەزدانێ دلۆڤان
قەت جار و ئومێدا مە ل سەردارێن د کوردان
وەک (تیرێژ) دبێژە ژین دڤێ کۆتەک و زۆرە

شاعیر کە بیر لە چاکە و خراپە دەکاتەوە، لەوەدەمەی کۆمەڵی کورد لە خانەی خراپەدا دەبینێ ڕەشبینە. بەڵام کۆڵی نەداوە و باوەڕی بەدوارۆژ هەیە، لەبەرئەوە لە ڕەشبینییەوە وەردەگەڕێتە سەر گەشبینی، بەخەونیش بێ ئەستێرەی دوارۆژی کورد لە ئاسۆی ڕۆژهەڵاتدا هەڵدێ و کوردستان ڕووناک دەکاتەوە. دڵسۆزی تیرێژ لەوە دایە ژیرانە ئامۆژگاری کورد دەکا بەو مانایەی «بیناکردن لە ڕووخاندن قورسترە» پێویستە بکەونە خۆ بۆ دروستکردنی ئەو کۆمەڵەی کورد تێیدا دەحەسێتەوە.

لە ڕووی هونەرییەوە تیرێژ لەم لیریکەدا واقیعێکی سیاسی دەخاتە قالبێکی شیعرایەتییەوە، پەنا بۆ شێوازی جیاواز دەبا، وێنەی ڕۆمانتیکی دروست دەکا، هێمای سیمبۆلیزمییانەی هەیە خوێنەر دەتوانێ بەڕووکەش لە سەرەوە بگاتە مانایێک لە وشەکان، هەروەها بەقووڵی لە ژێرەوە بگاتە مانایێکی دیکە لە وشەکان.

٤

لە لیریکێکی دیکەیدا تیرێژ دەڵێ:

ئەڤ بەغچێ پر خوەش یێ منە
تەڤدە گولێ سۆر و زەرن

تەیر و تلۆر پر تێ هەنە
هەردەم دگەل هەڤد و شەرن

***

تێدە دژی هەودەکا ئاڤ
هەردەم دلبەری ژێ خناڤ
ژ وان چاڤێن هوور و زراڤ
هۆستا د نیڤ هەود چێکرن

***

رەوشا دنێ کێفا دلان
ئاڤێن زەلال بەغچێ گولان
ئاواز و دەنگێن بلبلان
وەختا سەحەر سەیران کرن

***

گەر شا بە دل جهان خوەشە
گەر گول هەبی بلبل گەشە
نەوەک (تیرێژ) ئەو بەخت رەشە
دەرد و غەمان ژێ هش برن

شاعیر لە گێتیی خەیاڵی ڕۆمانتیکی و ڕەمز و ئیشارەت و بەهار و بلبل و گوڵ نایێتە دەرەوە. ئەم سرووودەش وەکو زۆربەی شیعری دیکەی لە دەوری وشە و زاراوە و وێنەی پرناسی دەسوورێتەوە، ئەگەر بشێ پرناسی بۆ ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەکار بهێنرێ! باغچە و بەهار نیشتمانی شاعیرە، بەڕاستی بەهار هی هەموو کەسێکە تەنیا هی شاعیر نییە، بەڵام کوردستان هی هەموو کەسێک نییە تەنیا هی تیرێژە بەو مانایەی ئەویش کوردە. مانا ڕووکەشی ئەم لیریکە وەسفی بەهارە، بەگوڵ و موڵ و جۆگە و جۆباریەوە، بەبلبلی دڵدارییەوە، ڕەنگە هەموو کەس بەبەهار گوشاد بێ، کەچی تیرێژ بەدبەختە و دەرد و غەم بێهۆشی کردووە.

***

نایفی حەسۆی ناسراو بەتیرێژ شاعیرێکی خۆڕسک و دڵسۆزی بیروباوەڕی خۆی بووە.



خوێندەواری هەردوو گێتیی مەلایەتی کۆن و قوتابخانەی تازە بابەتی وەرگرتووە. لە خاکی کوردستانی سووریا لە دایک بووە، هەموو ژیانی لەوێ بردۆتە سەر. بەشداری لە جموجۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردی کردووە. شاعیرێکی نوێخوازە، شیعری کلاسیکی ئاسایی تازە کردۆتەوە و بۆ مەبەس و ناوەڕۆکی نوێ بەکاری هێناوە. هەناسەی لە «شیعری نوێ»ی کوردیدا درێژە. بایەخی زۆری بەجوانکاری داوە لە شیعردا، یەکێکە لەو شاعیرە کەمانەی توانیویەتی جەوهەری ئیستێتیکی لە شیعری سیاسی و نیشتمانپەروەری و کۆمەڵایەتی بچەسپێنێ و ئاسۆیێکی بەرفراوانی بداتێ.

# بەشی سی و حەوتەم

## محەمەد مەولوود (مەم)

### ١٩٢٧ - ١٩٨٧

### ژیانی

محەمەد مەولوود لە ساڵی ١٩٢٧ لە ناوچەی ساباڵاغ (مەهاباد)ی موکریان لە دایک بووە. لە تەمەنی منداڵی بەهۆی هەژاری و دەست کورتی خێزانی کەوتۆتە دیوی کوردستانی عیراق و بەهەتیوی گەورە بووە. زۆربەی ژیانی لە شەقڵاوە بردۆتە سەر. خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردووە و لە ساڵی ١٩٤٤ بووە بەمووچەخۆری میری لە برادۆست. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا بەهۆی مووچەخۆری میرییەوە لە کۆیە و پیرمام (هاوینەهەواری سەلاحەدین) و شەقڵاوە ژیاوە. لە سەرەتای شەستەکانەوە گوێزراوەتەوە هەولێر و مووچەخۆری میری بووە لە کارگێڕی شارەوانی.

محەمەد مەولوود لەو کاتەی دەستی بەنووسین کرد بیری لەوە کردەوە نازناو بۆ خۆی دابنێ، ڕاستییەکەی هەڵبژاردنی ناوی «مەم» بۆ ئەم مەبەسە ئەوەیە وشەی «مەم» هیچ مانایێک ناگەیەنی، لە کۆبوونەوەی هەردوو «میمی» ناوی خۆی و باوکی وشەی «مەم»ی دروست کردووە و لەگەڵ ناوی خۆی و باوکی یا بەتەنیا بەکاری هێناوە.

مەم لە پاڵ کاری ڕەسمی لە شارەوانی هەولێر ماوەییێکیش خەریکی دەرکردنی کۆواری «هەولێر» بوو بەزمانی کوردی شارەوانی دەری دەکرد. وا بوو لە ساڵانی ١٩٧٠ - ١٩٧١دا چەند ژمارەییێکی لێ بڵاو کردەوە. زۆری پێ نەچوو گیروگرفت کەوتە ناوەوە لە نێوان کارگێڕی شارەوانی و مەم بەهۆی ئەوەی سانسۆریان خستە سەر ئەو نووسینانەی تێیدا بڵاو دەکرانەوە لە ئەنجامی ئەوەی مەم لە چەند نووسینێکدا ڕەخنەی لە بیرۆکراتییەتی دەسەڵات گرتبوو. جگە لەمە مەم کۆششی دیکەی هەبوو لە ڕۆژنامەگەری. لە ساڵی ١٩٧٠ دەوری دیاری هەبوو لە یارمەتیدانی بڵاوکراوەی «دەفتەری کوردەواری» لە بەغدا. لە هەرسێ ژمارەی ئەم بڵاوکراوەیە نووسینی هەبوو بەتایبەتی چیرۆکی «پێشوازی» لە ژمارە دووەمیدا لە ساڵی ١٩٧٠ بڵاوکرایەوە.



مەم وەکو خوێندەوار و ڕۆشنبیرێک بیری دەکردەوە، نەک وەک سیاسییێک، ئەمە هەندێ کێشەی بۆ دروست دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی لە نزیکەوە بێ لایەن بوو و دوور بوو لە حیزبایەتی تووشی سەرێشەی بەندیخانە و ئازار نەبوو، بەتایبەتی لە شەستەکاندا بەهۆی شۆڕشی ئەیلوولەوە کەم کەس لە ناو ڕۆشنبیرانی شارەکاندا ڕزگارییان لە گرتووخانە و بەندیخانە بووبوو. مەم لە منداڵیدا ئازاری برسیەتی و نەخۆشی چەشتبوو کەچی لە ماوەی ژیانیدا لە هەولێر لە سەرەتای شەستەکانەوە تا کۆچی دوایی هەڵسوکەوتی دارایی و گوزەرانی ماڵی باش بوو. ئەمە بەفریای نەکەوت و نەخۆشی کۆنی تەنگی پێ هەڵچنی بوو تا لە ڕۆژی ٧ی مایسی ١٩٨٧ لە هەولێر کۆچی دوایی کرد و تەرمیان بردەوە شەقڵاوە و لەوێ نێژرا.

### مەمی مرۆڤپەروەر

بیرکردنەوەی مەم لە مرۆڤ هەمیشەیی بوو. دواڕۆژی مرۆڤ لە ئاسۆی بیریدا ئاوا نەدەبوو، چارەنووسی مرۆڤ بەتایبەتی مرۆڤی هەژار و دەست کورت و بێ دەسەڵات دڵ و دەروون و مێشکی داگیر کردبوو، وێنەی ئەو هەژارانەی لە خۆیدا دەدی، لەبەرئەوە هەستی ڕاست و پاک و بێگەرد بوو بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەی ڕۆژگار یاریدەی نەدابوون توانای بیر و بازوویان بۆ چاکەی ژیانی خۆیان و کۆمەڵ بەکار بێنن.

بێ کەسی و ئاوارەیی و دەست کورتی هەندێ گرێی سایکۆلۆجی لە ئادەمزاددا دروست دەکەن، هەزاران هەزار کەس دێنە سەر ڕووی ئەم زەوییە و ئەو گرێیە لە ژیاندا دەیانتلێنێتەوە. لە ئەنجامدا بەهێمنی و بێ دەنگی، بەبێ ئەوەی کەس ئاگادار بێ مەرگ کۆتایی بەژیانیان دێنێ، بەڵام تەنگوچەڵەمەی گیانی کە تووشی مەم بووە لەبەر بێ کەسییە، کۆمەڵ دەتوانێ ئەم بۆشایی و بێ کەسییەی بە«بەکەسی» پڕ بکاتەوە، مەبەس لە کۆمەڵ خوێندەوار و ڕۆشنبیر و ئەدەبپەروەرانن. ئایا خوێندەواری کورد دۆخێکی وایان ڕەخساندبوو مەم هەست بەبێ کەسی نەکا ؟!

مەم ناحەزی هەبوو، ئەمانە خەڵکی جیاواز بوون، یەک ئیدیۆلۆجی کۆی نەدەکردنەوە، هەریەکەیان بەبەڵگەیێکەوە لە ناخەوە مەمی بەناحەزی خۆی دەکەوتە بەرچاو. لە سەردەمی ژیانی ئەودا باو باوی «پێشکەوتنخواز» و «کۆنەپەرست» و «پرۆلیتار» و «ئەمپریالیزم» و شتی دیکە بوو. لەبەرئەوەی مەم لەو ڕێکخراوانەی ئەم دروشمەیان هەڵگرتبوو، دوورەپەرێز بوو، لایەنگری ئەو ڕێکخراوانە بە چاوی گومانەوە تەماشای مەم

و هەموو بێ لایەنەکانیان دەکرد، واتە ئەو کەسانەی ناسنامەی هیچ ڕێکخراوێکیان لە گیرفانا نەبوو. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ مەم وەکو کەسێتی بەگشتی و بەرهەمە ئەدەبییەکەی بەتایبەتی بەتەرازووی «پێشکەوتنخوازی» و «کۆنەپەرستی» ناکێشرێن. نووسینی لە پلەیێکی بەرزی داهێنان دان، بۆ مشتومالْ کردنی بیر و هەست و نەست و خەیاڵی خوێندەوار لە ڕووی ئیستێتیکییەوە بوون بەسەرچاوەییێکی گرنگ. بەمەش گەلێ خزمەتی چاک کردنی باری ژیانی ئادەمزادی کردووە، هەروەها لە پێناوی هێنانە دی هەموو ئامانجە نەتەوەییییەکاندا بووە، لەبەرئەوەیە مەم ڕۆڵەی دڵسۆزی نەتەوەی خۆی بوو، هەمیشە ئەوەی لە بەرچاو بوو نەتەوە دەبێ تێر و ئازاد بێ. ئەمە دروشمێکی ڕاست بوو.

لەو کاتەی تەنیایی دڵ و دەروونی مەمی داگیر کردبوو، بەوەی باش بوو بەهوشیارییەوە ئەمەی بەکۆمەڵەوە بەستبووەوە. واتە خۆی و کۆمەڵ هەردووکیان هەستیان بەتەنیایی دەکرد، ئەمە بەجۆرێک کاری تێ کردبوو بیری لە قەڵەمی تیژتر و بەهێزتر بێ. هەرچەندە زمانی قسەکردنی مەم پاراو و ڕێکوپێک بوو، نووسینیشی لە قسەکردنی پاراوتر و ڕێکوپێکتر بوو، بەڵام نووسینی لە پلەی بیرکردنەوەی دانەبوو، ئەمیان لەویان بەهێزتر بوو.

مەم یەکێکە لەو چیرۆکنووسانەی بەرهەمی لە پلەیێکی بەرزی هونەری دایە، بەڵام لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە لە نێوەندی ئەدەب دۆستاندا بەختی یار نەبوو، هەندێ کەس خۆشیان نەدەویست چونکە دەیانزانی چیرۆکنووسێکی باشە، ئەوەی ئەو دەیکا ئەوان بۆیان ناکرێ، هی دیکەش پشتیان تێ دەکرد چونکە پارێزگاریی ناوی بەرزی «نووسەر»ی دەکرد. بێ گومان نەبوونی ناسنامەی ڕێکخراوێکی سیاسی لە گیرفانیدا بووە هۆی ئەوەی ئەم دڵ پڕ لە گرێیانە ئەگەر بەسەریشیدا هەڵنەڵێن، لەسەری نەکەنەوە.

## مەمی چیرۆکنووس

لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی بیستەم مەم دەستی کردووە بەچیرۆک نووسین. ساڵی **١٩٥٧** ساڵێکی گرنگ بووە لە ژیانی ئەدەبی نووسەر، لەو ساڵەدا لە تشرینی یەکەم چیرۆکی «پەنجا فلس»ی بڵاوکرایەوە. چیرۆکەکە دەنگی دایەوە و بوو بەبەڵگە بۆ ناوی مەم. واتە چیرۆکی «پەنجا فلس» و ناوی «مەم» بوون بەیەک مانا. ناوی هەریەکێکیان بهاتایە ناوەکەی دیکە دەهاتەوە یاد.

چیرۆکەکانی مەم لە کۆوار و ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرانەوە، بەزۆری لە دوای



نووسینەوەیان پێشکێش بەچاپەمەنییەکان دەکران. لە پاشانا چیرۆکەکان لە دوو بەرگدا بڵاوکرانەوە. یەکێکیان لە ساڵی ١٩٧٠، ئەوی دیکەیان لە ساڵی ١٩٨٤.

مەم بەگشتی لە چیرۆکەکانیدا جەوهەرە بنچینەییەکانی پاراستووە، هەندێ جار تێکەڵ بەحیکایەتی میللی (فۆلکلۆری) دەکا، هەندێ جاری دیکەش بەپێچەوانەوە پەنا بۆ سیمبۆلیزمی چیرۆکی ئەوروپایی دەبا و تووشی تەمومژ و گرێی سایکۆلۆجی دەبێ، بەهەموو جۆر شەقڵی کوردەواری و کوردایەتی بەسەر چیرۆکەکاندا زاڵە، ناوەڕۆک هەرچی بێ، ڕوخسار نەتەوەییە، واتە کوردییە.

لای مەم بەگشتی جێگەی چیرۆک کوردستانی گەورەیە، بەڵام بەزۆری لە کوردستانی عیراق لە دایک دەبن. کات بەزۆری لە دوای جەنگی دووەمی گێتییەوە دەخایێنێ تا کۆتایی حەفتاکان. مەم هوشیارانە سەردەم بە بەسەرهات و مێژووی کۆنی کورد دەبەستێتەوە. قارەمان چینە هەژارەکانی خوارەوە و چینە دەوڵەمەندەکانی سەرەوەن، هەروەها ئەمپریالیستی ئەوروپا و دەوڵەتە دراوسێکانی عیراق لە تورک و عەجەم، بێ گومان دەسەڵاتی سیاسی عیراقیش کە لە دەستی عەرەب دایە دەچێتە ڕیزی ئەم دوژمنانەوە.

لە ڕووی ڕاگەیاندنی ناوەوە چیرۆکەکانی مەم خوێنەریان لە کوردستانی عیراق و ئێران هەبوو، بەشەوقەوە پێشوازی دەکران، بۆیە وەک نووسەر ناوبانگی دەرکردبوو. لە ڕاگەیاندنی دەرەوەش تا پلەیێک بەختەوەر بوو. هەندێ لە چیرۆکەکانی دەکران بەعەرەبی و لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی عیراق بڵاو دەکرانەوە. جگە لەوە مەم یەکەمین چیرۆکنووسی کورد بوو سێ چیرۆکیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ڕووسی. لە ساڵی **١٩٦٥** لە مۆسکۆ لە کتێبی «کۆمەڵە چیرۆکی نووسەرانی عیراق» چیرۆکەکانی «پەنجا فلس» (**١٩٥٧**) و «ئاوارەکان» (**١٩٦١**) و «بێ وولات» (**١٩٦١**) بڵاوکرایەوە. ئەو کتێبە لە نێوەندی ئەدەبی ڕووسی و ئەدەبی نەتەوەکانی یەکێتی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە دەنگی هەبوو.

لە ساڵانی دوایی ژیانیدا دوو کاری هونەری گرنگی بەدەستەوە بوو، ڕۆمانەکانی «پایزە خەون» و «ڕێگا». ئەم دوو ڕۆمانە شیکردنەوە و فراوانکردنی ئاسۆی چیرۆکەکانیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا گرنگییەتی خۆیان پاراستووە و وەک نموونەیێکی داهێنراو لە ڕۆمانی کوردیدا دەکەونە بەرچاو.

لە گفتوگۆیێکیدا لەگەڵ دۆستێکی مەم وتی:

– راستە هەر رێییێک شێوەیەکی هەیە، «رێگا»کەی منیش شێوەی تایبەتیی خۆی هەیە.
– «رێگا»کەی یەڵماز گۆناییش بابەتێکە.
– هەموو شت رێگەی هەیە.
– گرنگ سەرەتای رێگە نییە، بەڵکو ڕووداوەکانی، لەویش گرنگتر ئەنجامە.
– بەڵێ! ژیان رێگەیە، رێگەی بێ ئەنجامیش کارەساتە.

## ناسینی چەند چیرۆکێکی مەم

### پەنجا فلس

نووسەر باس لە دوو منداڵی هەژاری شاگردی قوتابخانەی سەرەتایی دەکا، یەکێکیان خوێبەتی. ئەو ژەمەی دوو منداڵەکە نان و چایان هەبوایە خۆیان بەبەختەوەر دەزانی. بەرێکەوت لە رێگەی قوتابخانە پەنجا فلس دەدۆزنەوە. ئەو پارەیە بۆ دەوڵەمەند هیچ نەبوو، بۆ هەژار زۆر بوو. رۆژانەی پاڵەییێک بوو. دەست کورتەکان دەیانتوانی دوو رۆژ یا سێ رۆژ بەم پارەیە بژین. دەبێ چی گۆڕانێکی سایکۆلۆجی لە دڵ و دەروونی ئەم دوو منداڵە هەژارەدا پەیدا بووبێ! بەم جۆرە خەونیان بەهەموو شتێکی خۆشەوە دەدی بەهۆی ئەم پەنجا فلسەوە بۆ یەک دوو رۆژ ئەوەی دڵیان ئارەزووی دەکرد دەستیان بکەوێ. وەستایەتی نووسەر لە هونەری چیرۆک نووسین لەوەدایە راستییێک دەردەبڕێ، بەوەی شتێکی کەم لە جێییێک کەمە و لە جێییێکی دیکە زۆرە.

### بێ وڵات

لەم چیرۆکەدا مەم لە دابەشکردنی خاکی کوردستان دەدوێ، گۆڕەپانەکە پارچە کراوە و دابەش بووە. خەڵکی هەر لاییێکیان بووە بەبێگانە لە لایەنەکانی دیکە. پیرەمێردێک خەڵکی ناوچەی بیتوێنە لە کوردستانی عیراقدا. لە گرانی گەورە خۆی و خێزانی لە برسانا ڕوویان کردۆتە کوردستانی ئێران و لە دەشتی مەرگەوەڕ شەش ساڵ رەنجبەری و جووتیاری کردووە. لەوێش هەژار و دەست کورت بووە، لە شەپۆلی نەخۆشییێکی گشتیدا ژن و کوڕ و کچی گەورەی مردوون، تەنیا خۆی و کچێکی ساوای ماونەتەوە. ناچار هاتوونەتە شنۆیە. لەوێ دەکەونە تۆڕی ئاسایشەوە. بەناوی سنوور بەزاندنەوە کە کارێکی قەدەغەیە پیرەمێرد و کچە منداڵەکەی سنووربەزاش دەکرێن. لە دیوی عیراق پێشوازی ناکرێن و دەیانگێڕنەوە ئێران، بەم جۆرە حەوت جار ئەمبەر و ئەوبەریان پێ دەکەن.



سەیرە! لە پێش پێنسەد شەشسەد ساڵ بەر لە ئێستا (پێش جەنگی چالدیران ١٥١٤) خەڵکی کورد لە شنۆ و سابڵاغەوە دەچوون بۆ وان و باشقەڵا، لە سلێمانی و خانەقینەوە ڕوویان دەکردە دیاربەکر و مرعش.

لەم سەین و بەینەدا کیژۆڵەی بچووکی بەستەزمان لە باوکی دەپرسی: بابە ئەوە بۆچ هەر دەڕۆین؟ کەنگێ دەگەینە ماڵی خۆمان؟ کەینێ دایکم دەگەڕێتەوە؟ بابە ئەوە بۆچ خانوومان نییە؟ لە دایە توورە بووی؟ وەرامی قسەی ئەم کچە نەخۆشە بێچارەیە ئەوەیە ئەم سنوورە دەسکردە بەدفەڕە بشکێنرێ و تێکومەکان بدرێ.

### ئەگەڕێمەوە وڵاتم

لە دوای جەنگی دووەمی گیتی ئەمەریکا دەستدرێژی کردە سەر وڵاتی کۆریا. بۆ بەشداربوون لەم جەنگە تورکیای دۆستی ئەمەریکا لەشکرێکی نارده کۆریا لە دژی ئازادیخوازانی میللەتی کۆری بجەنگێ. زۆربەی لەشکرەکەی تورکیا کورد بوون. لەم کارەدا دەسەڵاتی تورک دەیویست دوو چۆلەکە بەبەردێک بکوژێ. یەکێکیان ئەوە بوو ئەوەی دەکوژرێ قیروسیا بە لەناوبچی چونکە کوردە. ئەوی دیکەیان هەر جۆرە سەرکەوتنێکیش بەدەست بێنن بەناوی تورکەوەیە.

سەربازێکی لەشکری تورک بەدیل دەگیرێ و دەیبەن بۆ سەر سنووری کۆریای باکوور لەگەڵ مەنشووریای چین. لەوێ کۆری و چینییەکان دەکەونە گفتوگۆ و پشکنینەوە، بەڵام ناگەنە هیچ ئەنجامێک چونکە سەربازەکە لەوان ناگا، ئەمانیش لەو ناگەن. سەربازەکە تەنیا لەوە دەگا ئەوان کە پێی دەڵێن تۆ سەربازی تورکی. لە وەرامدا دەڵێ: نا تورکیش، ئەز کوردم، ئەز کوردیش نا تورکیش. خەڵکەکە وا بۆ مەسەلەکە دەچن، ئەم دیلە لەوانەیە پیاوی چاک بێ، بەزۆر دەسەڵاتی وڵاتی خۆی بەفیتی ئەمەریکا ناردبێتی بەشداری لەو جەنگەدا بکا.

ئیتر گەنجۆی دیل لەسەر سنووری کۆریای باکوور و چین هەر کوردستان، کوردستانی بوو، خەڵکەکە نەیاندەزانی «کوردستان» چییە! یەکێ دەیووت ئەمە ناوی باوکیەتی. یەکێکی دیکە دەیووت ناوی دایکیەتی. لەولاوە دەنگێک دەیووت دەزگیرانیەتی. یەکێکی دیکە لە هەموویان ڕاستتر بوو دەیووت خۆشەویستترین کەسیەتی.

### نامەیێک بۆ بەندیخانە

کوردێک لەسەر بیروباوەڕی کوردایەتی دەگیرێ، کە دەخرێتە بەندیخانە ژن و کوڕ و کچێکی بێ کەس و بێ دەر دەمێننەوە، کوڕەکەی منداڵ بوو ناوی ڕەشکۆ بوو. کچەکەی لەو بچووکتر بوو ناوی نازێ بوو. دایک کارەکەری و ئیشی ماڵانی دەکرد، ڕەشکۆ بەپێخاووسی و جلی پیناوییەوە هاتوچۆی قوتابخانەی دەکرد. توانای ئەوەیان نەبوو نازێ بخوێنێ، یارمەتیی دایکی دەدا لە کارەکەری ماڵاندا. لە دوای هەشت ساڵ ڕەشکۆ دەگاتە پۆلی پێنجەم، دەست دەداتە قەڵەم و نامە بۆ باوکی دەنووسێ بۆ بەندیخانە. بە ووردی ئەوەی لەو هەشت ساڵەدا بەسەر ئەو خێزانەدا هاتووە بۆ باوکی دەنووسێ. ئەوەی گرنگ لە چیرۆکەکەدا ئەوەیە ڕەشکۆ باوکی زۆر خۆش دەوێ، لە نێوان قسەیێک و قسەیێکی دیکەدا «بابە گیان» و «تۆم خۆش دەوێ» و «دەستت ماچ دەکەم» دووبارە و سێ بارە دەکاتەوە. لەم نامەیەدا خوێنەر لەوە ناگا ئەم باوکە ماوەی بەندی تەواو بووە و بەم زووانە ئازاد دەبێ، یا وەکو نوقلانەیێک ڕەشکۆ داوای دیاری لێ دەکا کە ئازاد بوو بۆی بێنێتەوە! ڕەشکۆ باس لە هەژاری ماڵیان دەکا، جلوبەرگیان پیناوییە، خۆی پێڵاوی نییە، ئەگەر بۆی نەکرا هیچی بۆ بێنێتەوە پێڵاوەکە زۆر پێویستە.

چیرۆکنووس سوورە لەسەر ئەوەی ئەم بنەماڵەیە یەکگرتوون لە سۆزی بنەماڵەییدا، لە ناو یەکتریدا لە سۆزی دایکییەتی و باوکییەتی تواونەتەوە، لەگەڵ سەرداری خێزانیانن. پشتیان گرتووە، لایەنگری بیروباوەڕی ئەون، بۆیە لە پاش بەندکردنی سەرداریان لە لایان خۆشەویستتر بووە.

### مۆمەکەی شەماشە دنحە

کات لەم چیرۆکەدا ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەمە. لە کوردستانی عیراق شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ لە جموجۆڵی و چالاکیدا بوو. دەسەڵاتی نێوەندی بەغدا سەرەڕای شەڕی سەختی زەمینی و بۆمبابارانی فڕۆکەی جەنگی ئابڵوقەی ئابووریشی خستبووە سەر هەرێمی کوردستان.

ئۆتۆمۆبیلێکی گواستنەوە بەڕێوە بوو لە هەولێرەوە بۆ شەقڵاوە. خەڵکی ناو ئۆتۆمۆبیلەکە ئاغایێکی دەرەبەگی کورد بوو لەگەڵ غولامی، شەماشە دنحەی مەسیحی شەقڵاوەش لەگەڵیانا دەگەڕایەوە ماڵی خۆی. ئاغا بۆڵە بۆڵی بوو، لەبەر خۆیەوە دەیووت: چیان دەوێ؟ بۆ وا دەکەن؟ مەبەسی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بوو. بەڵام خەڵکی کورد



ئەم پرسیارە ڕەت دەکەنەوە، بەپێچەوانەوە دەڵێن: دەسەڵاتی بەغدا چی لە کورد دەوێ؟!

شەماشە دنحە هەندێ شتومەکی بۆ دیاری کڕیبوو، لەناویاندا چەند مۆمێکی ڕەنگاوڕەنگی بۆ سەر گۆڕی پیرۆزی ووسوو ڕەحمان کڕیبوو ئەوەی لە ناو ئەشکەوتێکی چیای سەفین نێژراوە و کەسێکی پیرۆزە لە لای هەموو ئایینە ئاسمانییەکان.

لە نێوان ئاواییەکاندا دەسەڵات بنکەی پشکنینەوەی دانا بوو. شووفێر ڕووی کردە دانیشتوانی ناو ئۆتۆمۆبیل پێی ووتن شتومەکی قەدەغە فڕێ بدەنە خوارەوە. شەماشە دنحە پرسی: چی قەدەغەیە! شووفێر وتی: شەکر، چای، گەنم، دەرمان، قەڵەم، کاغەز، نەوت، ڕووناکی... شەماشە دنحە کە ناوی نەوت و ڕووناکی بیست، دڵی کەوتە خورپە! پرسی: خۆ مۆمیش قەدەغە نییە؟ شووفێر ڕاچڵەکی و قیڕاندی: هەی هاوار نەمووت، ڕووناکی، مۆم، نەوت، چاکە، پیاوەتی، شەڕەف، غیرەت، ناموس، بەزەیی، مرۆڤایەتی هەمووی قەدەغەیە! شەماشە دنحە هەموو مۆمەکانی فڕێ دا.

شەماشە دنحە لە ناو ئۆتۆمۆبیل بیری دەکردەوە، بڕیاری دا شەوی یەک شەموو لە دار و دەوەنی زۆری شەقڵاوە ئاگرێکی گەورە لەسەر لووتکەی سەفین بکاتەوە بەناوی پیرۆزی ووسوو ڕەحمانەوە، ئاگرەکە بێ گومان دەبێتە ڕەنگدانەوەی هەزاران مۆمی ڕەنگاوڕەنگ.

***

محەمەد مەولوودی مەم سەرەتا بەشیعر دەستی پێ کرد، بەڵام هیچی بڵاو نەکردەوە. لە پاشانا وازی لە شیعر هێنا و بوو بەیەکێ لەو چیرۆکنووسانەی تاقیکردنەوەی شیعری نەبووە. لەبەرئەوەی خوێندنی ڕێکوپێک و هەموو قۆناغەکانی تەواو نەکردبوو بەتەواوی بەسەر زمانی نووسیندا زاڵ نەبوو، کەچی بەپێچەوانە هەستی هونەری و تێگەیشتنی ناگزووری کۆمەڵایەتی و بەهرەی دۆزینەوەی گیروگرفتی دڵ و دەروونی هەژاران یارمەتیی داوە ناوەڕۆکی لەبار هەڵبژێری و بیکا بەچیرۆکێکی هونەری سەرکەوتوو. ژیانی تایبەتیی نووسەر و سەردەمی زیندەکانی، سنووری ناوەڕۆکی چیرۆکەکانیان کێشاوە، لە ژن و دڵ و دڵداری هەندێ دوور بووە و لە گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و کوردایەتی نزیک بووە.

## بەشی سی و هەشتەم

# دیلان

**١٩٢٧ - ١٩٩٠**

دیلان بەخەیام دەڵێ:

تۆ لەسەر باکەی شووشەکەی شکاند
لەگەڵ خودادا کردت بەزۆران
هەڵسە بەرەو ئەم ناوە هەڵتووتێ
نەک شووشە شکاوا ڕەز ئەسووتێ

## ژیانی

محەمەد ساڵح کوڕی مەلا ئەحمەد دیلان کوڕی مەلا ساڵح کوڕی مەلا قادری شەوخوێن. ماڵی باپیری لە قەلاچۆلانەوە هاتوونەتە سلێمانی. لە ساڵی **١٩٢٧** لەو شارە لە دایک بووە. لەقەبی باوکی «دیلان»ی کردووە بەنازناوی شیعر و ناوی هونەری خۆی. سەرەتا لە مزگەوتی بابا عەلی لە سلێمانی خوێندوویەتی، ئینجا قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردووە تا پۆلی سێیەمی خوێندووە، بەهۆی دەست کورتی و خۆ خەریک کردن بەسیاسەتەوە لە پێناوی مافی کورد و دژی دەسەڵاتی عێراق و دەست تێوەردانی ئەمپریالیستی ئینگلیز لە کاروباری وڵات وازی لە خوێندن هێناوە. لە ساڵی **١٩٤٧** لە کارگێڕی تووتن لە سلێمانی بەمووچەخۆر دامەزراوە. زۆری پێ نەچووە هەر لەو ساڵەدا لەسەر خۆپیشاندان گیراوە و لە پاشانا ئازاد کراوە. لە ساڵی **١٩٤٨** جارێکی دیکە گیراوەتەوە و لە کاری میری دەرکراوە.

لە ساڵی **١٩٤٩** لە سلێمانی گیراوە و بردوویانە بۆ بەغدا تا لە ساڵی **١٩٥٠** دادگایی کراوە و بەکەفالەت بەردراوە. لە کاتێکدا بردوویانە بۆ کارگێڕی لێکۆڵینەوەی تاوانباری (ئاسایشی ئەو سەردەمە) ڕەفیق چالاک لەوێ پیاوی ئاسایش بوو بەگرتنی داوە و ئیتر بردوویانە بۆ ژوورێکی تاریکی بەندیخانەی ئەبوغرێب لە بەغدا، هەشت مانگ لەوێ ماوەتەوە. ئینجا دراوە بەدادگا و ساڵێک بەند و ساڵێک دەستبەسەری بۆ دەرچووە. ئەو ماوەیەی لە بەندیخانەکانی بەغدا و کووت و سلێمانی بردۆتە سەر. لە دوای ئەمە



جارێکی دیکەش گیرایەوە دادگا فەرمانی ساڵێک دەستبەسەری بۆ دەرکرد، لە شاری عەمارە ئەم ماوەیەی بردە سەر و لە دوا ڕۆژانی ساڵی **١٩٥١** گەڕایەوە سلێمانی. هەر لەو ساڵەدا بەئەندامی لیجنەی ئاشتیخوازانی سلێمانی هەڵبژێررا. لەسەر ئەمە گیرایەوە بەڵام زوو ئازاد کرا. لە ساڵی **١٩٥٢** بەهۆی ڕێکخراوی ئاشتیخوازانەوە نێررایە شاری ڤیەننا لە نەمسا بۆ ئامادە بوون لە «کۆنگرەی نەتەوەکان بۆ بەرگری لە ئاشتیخوازی». لەوێ ئاشنایەتی لەگەڵ نووسەری ڕووس ئیلیا ئەهرینبورگ پەیدا کردبوو، لەو گەشتەیدا سەردانی ئیتالیا و سویسرە و چیکۆسلۆڤاکیا و ڕۆمانیای کردبوو. کە لە ئەورووپا گەڕایەوە فەرمانی گرتنی دەرچووبوو. خۆی شاردەوە ئەو ماوەیەی لە بەغدا و کەرکووک و گوندی دەرگەزێن و مورتکەی لای سلێمانی بردە سەر. لە پاشانا لە ساڵی **١٩٥٣** خۆی ئاشکرا کرد و بەدەستبەسەری نێررایە بەغدا و لە ئەنجامی دادگا ئازاد کرا.

لە ساڵی **١٩٥٤** جارێکی دیکە گیرایەوە، لە کەرکووک دادگایی کرا و فەرمانی ساڵ و نیوێک دەستبەسەری بۆ دەرچوو، ماوەکەی لە نوگرەت سەلمان بردە سەر و لە ناوەڕاستی ساڵی **١٩٥٦** گەڕایەوە سلێمانی. لەو ساڵەدا بەهۆی هێرشە سێ قۆڵییەکەی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیسرائیل بۆ سەر میسر دیلان دادگایی کرا و فەرمانی دوو ساڵ دەستبەسەری بۆ دەرچوو، ماوەکەی لە سلێمانی بردە سەر.

ساڵی **١٩٥٧** هەنگامێکی گرنگ بوو لە بیری سیاسی و ئیدیۆلۆجییەتی دیلان، تا ئەو ساڵە بیری سوسیالیزمی (ئیشتیراکی) و ئەنتەرناسیۆنالیزمی کردبووە ڕێباز لە پێناوی هێنانە دی ئامانجی بیری کوردایەتی. ئەو ساڵە ماوەی گواستنەوەی فیکری بوو، لەوەوە دەرباز بوو بۆ بیری ناسیۆنالیزمی (قەومی) و فیکری دیمۆکراتی. دیلان ئەم گۆڕانەی بەشتێکی بنچینەیی دادەنا لە ژیانی سیاسی تایبەتی خۆیدا. ئەوەی پێویستە لەم لایەنەوە ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە کۆمەڵێک ڕۆشنبیر و نووسەر و شاعیر و سیاسی کورد ئەو گۆڕانە لەو کاتەدا لە فیکریان ڕووی دا.

لە سەرەتای ساڵی **١٩٥٨** لە کارگێڕی بەڕێوەبردن لە پارێزگای سلێمانی بەمووچەخۆر دامەزرا. ڕۆژگاری پاش کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی **١٩٥٨**ی بەغدا سەردەمی پشوودانی بەندیخانە بوو بۆ دیلان، ماوەی حەسانەوە دەستی پێ کرد، لەبەرئەوە لە ناوەڕاستی ئەو ساڵەدا ژنی هێنا، لە ساڵی **١٩٥٩** جارێکی دیکەش لە «میهرەجانی گێتیی لاوانی دیمۆکراتی» لە شاری ڤیەننا بەشداری کرد. لە دوای ئەمە جارێکی دیکە دەرگای بەندیخانەکان لە ڕووی دیلاندا کرانەوە. لە ساڵی **١٩٥٩** لە جموجۆڵیی دەستەی

دامەزراندنی یەکێتیی لاوانی دیمۆکراتی کوردستان بەشدار بوو، لەسەر ئەوە گیرا، بەڵام زوو ئازاد بوو. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٠ بەتاوانی ئەوەی لە دژی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم خەبات دەکا گیرایەوە بەڵام زوو ئازاد بوو. لە ساڵی ١٩٦١ دیسانەوە هەر بەو تاوانە گیرایەوە و نێررایە شاری کووت. لە ساڵانی نەهاتی کورد ١٩٦٣ - ١٩٦٤ دیلان لە گرتووخانەکانی کەرکووک و بەغدا بە دەستبەسەری مایەوە.

لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەم دیلان گەڕایەوە سەر کاری پێشووی لە کارگێڕی بەڕێوەبردن لە پارێزگای سلێمانی. ئەمجارە کارگێڕی نامەخانەی گشتیی شاری سلێمانییان پێ سپارد. خزمەتێکی زۆری ئەم دەسگا زانستییە گرنگەی کرد. تا ساڵی ١٩٨٣ لەم کارەیدا مایەوە ئینجا لەسەر داوای خۆی خانەنشین کرا.

دیلان لە دەنگخۆشە بەناوبانگەکانی شاری سلێمانی بوو. شارەزای ئاوازی مەقام و گۆرانی و بەستە میللییەکان بوو. ئەم هونەرەی لە باب و باپیرانییەوە بۆ مابووەوە. دوا ساڵانی ژیانی خانەنشینی بەشیعر وتن و دۆستایەتی برادەرە نزیکەکانی بردە سەر لە ڕۆشنبیر و نووسەر و شاعیران.

دیلان تەنیا شاعیر و دەنگخۆش نەبوو، نووسەر و ڕەخنەگر بوو، پسپۆڕی ئەدەبی کوردی بوو. لەبەر کاری نهێنی زۆربەی بەرهەمی ئەدەبی بەناوی خواستراو بڵاو دەکردەوە. لە ڕۆژنامە و کۆوارەکاندا گەلێ نووسینی بەم ناو و ڕەمزانە بڵاوکردۆتەوە: (م. ص. د.)، (د.)، (دیلان)، (م. ص. دیلان)، (ژیل)، (نالید)، (ص.).

دیلان لە ڕۆژی یەک شەمووی ٢٨ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠ لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژرا.

## شیعری

### شیعری دیلان لە ڕووی ڕوخسارەوە

دیلان یەکێکە لە گەورە شاعیرانی کوردی سەدەی بیستەم، ئەوانەی بابەتە جیاوازەکانی ڕێباز و قوتابخانەکانی شیعری کوردی دەور دەکەنەوە. شیعری لە هەر یەکێک لەو قۆناغانەدا لە ڕووی هونەری و جوانکارییەوە گەیشتۆتە لووتکە. دیلان بەگۆڕان و پەرەسەندن لە ڕێبازێکەوە دەربازی یەکێکی دیکە نەبووە، بەڵکو لە سەرەتاوە مەشقی لە هەموو ڕێبازەکاندا کردووە، دیارە سەرکەوتنی هەرە گرنگیش لەوەدا بووە کە ئەو ڕێبازانەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە و تا دوایی ژیانی لەگەڵ هەموویاندا بووە. بۆ بەڵگە بەشێوازی



کۆن لەسەر بابەتی تازەی نووسیوە، یا پێچەوانەوە بەشێوازی تازە لەسەر بابەتی کۆنی نووسیوە. لای دیلان ئاسایی بووە لە دوا ساڵانی ژیانیدا شیعر لەسەر بەحری عەرووزی دابنێ، ناوەڕۆکەکەی کلاسیکی کۆن بێ یا ڕووداوی تازە و سەردەم بێ. دیلان هەرسێ قوتابخانە شیعرییەکەی ئەدەبی کوردی دەور کردۆتەوە.

### شیعری عەرووزی

شیعری عەرووزی دیلان لەسەر بەحری هەزەج و ڕەمەل و موجتەس و موزاریع ڕێکخراون. بەشێک لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی کردووە بەقافیە. پاش قافیەی زۆر نییە. ئەوەی جێی تێبینییە دەبوو بەشێک لە شیعرە عەرووزییەکانی یەکێتیی قافیەیان هەبێ، کەچی لەسەر جووت قافیە (مەسنەوی) ڕێکخراون و کەمیان لەسەر یەکێتیی قافیەیە.

### شیعری کێشی سیلابی خۆماڵی

دیلان هەموو کێشە خۆماڵییەکانی شیعری کوردی لەم جۆرە بەرهەمەیدا بەکاری هێناون:

١- حەوت بڕگەیی (٤ + ٣)، (٣ + ٤).

٢- هەشت بڕگەیی (٤ + ٤).

٣- دە بڕگەیی (٥ + ٥).

٤- یازدە بڕگەیی (٤ + ٤ + ٣).

٥- دوازدە بڕگەیی (٤ + ٤ + ٤).

٦- سێزدە بڕگەیی (٥ + ٥ + ٣).

٧- پازدە بڕگەیی (٥ + ٥ + ٥).

بەشی هەرە زۆری ئەم جۆرە شیعرەی لەسەر کێشی دە و هەشت و حەوت بڕگەیی داناوە، لە قافیەدا مەسنەوی (ا ا ب ب جـ جـ...)ی بەکارهێناوە. جگە لەمە ئەو شیعرانەی لەسەر بنچینەی بەند ڕێکخراون، ئەم جۆرە قافیانە دەکەونە بەرچاو (ا ا ا ا)، (ا ا ا)، (ا ب ا ب). هەروەها سیستێمی یەکێتیی قافیە لە شیعری خۆماڵیدا لای دیلان زۆرە. بەپێچەوانەی شاعیرانی دیکە بەزۆری یەکێتیی قافیە بۆ شیعری عەرووزی و جووت قافیە (مەسنەوی) بۆ شیعری خۆماڵی بەکار دێنن.

## شیعری نوێ

ئەم جۆرە شیعرە لە ڕووی کێش و قافیە گەڕاوەتەوە سەر ئەو دەستوورانەی لە شیعری میللیی نووسراو و شیعری میللیی نەنووسراو (فۆلکلۆر) بەکار دەهێنران، واتە کێشە سیلابییە میللییە خۆماڵییەکان، تەنیا ئەوە هەیە کێشە میللییەکانیشیان وەکو خۆی بەکاریان دەهێنان، هەندێ جاریش کەرتیان دەکردن و دێڕە شیعریان لەو کەرتانە دروست دەکرد، دەسکاری شاعیر دەگەیشتە ئەو ڕادەیەی دێڕی شیعر لە وشەیێکی یەک بڕگەیی دروست بکا. لە شیعری نوێی دیلاندا ئەم دیاردانە لە ڕووی کێشی خۆماڵی دەکەونە بەرچاو. شاعیر بەم جۆرە کێشە خۆماڵییەکانی لە شیعری نوێدا کەرت کردووە.

١- حەوت بڕگەیی (٤، ٣)، (٣، ٤).
٢- هەشت بڕگەیی (٤، ٤).
٣- نۆ بڕگەیی (٢، ٣، ٤).
٤- دە بڕگەیی (١، ٢، ٣، ٤).
٥- دوازدە بڕگەیی (٤، ٨).
٦- چواردە بڕگەیی (٢، ٣، ٤، ٥).

تاقیکردنەوەی دیلان لە مەیدانی شیعری نوێدا بەردێکی بنچینەیی بوو لە بناغەی کۆشک و تەلاری بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردی کە بەڕێبازی ڕۆمانتیکیش ناو دەبرێ. ئەم جۆرە شیعرەی دیلان و هەندێ لە شاعیرانی دیکە بوون بەسەرچاوەی ئیلهام بۆ ئەو شیعرە نوێیە کوردییەی کە ناوی بە«لیریکی نوێ» دەبرێ و بووە بەدیاردەیێکی عالەمی لە ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی گێتیدا.

## زمانی شیعری

فەرهەنگی وشە و زاراوەی شیعری دیلان تایبەتە بەخۆی. لە دوو گێتیی پێچەوانەی یەکتری دەسووڕێتەوە. هەندێکیان ئاسان و ساکارن، مانایان لە ڕووە لەگەڵ وێنەی تیپی وشەکاندا خۆیان بەدەستەوە دەدەن، لە زمانی ستانداردی قسەی خەڵکی کورد وەرگیراون؛ هەندێکی دیکەیان قورس و دژوار و داخراون، لە زاراوەی دەشتی کوردەواری و کۆمەڵی کشتوکاڵی وەرگیراون، یا لە هەندێ دیالێکتی گەورە و بچووکی دەرەوەی سلێمانی بەکارهێنراون. جا لەو کاتەی دیلان ئەم وشە قورسانە بەکار دێنێ لە شیعرێکدا بەشێوازی



سیمبۆلی دەیهۆنێتەوە تێگەیشتنی مانای شیعرەکە قورستر دەبێ. هەرچۆنێ بێ بەگشتی مانای شیعری دیلان لە ڕوو نییە، شارەزای ژێری گەرەکە بۆ ئەوەی لە ماناکانی بگا.

## ڕەوانبێژی

دیلان وەستا و لێزانی ڕەوانبێژییە بەو مانایەی خۆی وێنەکان دروست دەکا. هەندێ جار لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەریان دەگرێ، لە جاری دیکەدا وێنەکان وەک پەندی پێشینان و قسەی نەستەق دەکەونە بەرچاو، جگە لەوە تەعبیری فۆلکلۆری کۆمەڵی کشتوکاڵی کوردەواری لە بەرهەمی دیلاندا بۆ یەکەمین جار لە ئەدەبی نووسراودا دەبینرێ. هەروەها شارەزایی قووڵی لە نەریت و خوو و ڕەوشتی کورد لە شار و دێهاتدا یارمەتی ئەوەی داوە گەلێ جەوهەری تازە لە ناو شیعریدا ببینرێ و لەوە پێش بەنووسین نەکەوتوونەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

## لیریک

بەشی زۆری بەرهەمی دیلان لە بابەتی غەزەل و قەسیدەیە بەپێی زاراوەی کلاسیکی، واتە شیعری کورت و شیعری درێژ. شیعری لە هەر بابەتێک بێ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، ئێستا کورتەکە بەغەزەل (لیریک) ناوی دەبرێ و درێژەکە بەقەسیدە (پۆیێم) دەناسرێ.

## پێنج خشتەکی

لە ناو سێ دامەزرێنەرەکەی شیعری کوردستانی باشوور نالی و سالم و کوردی، دیلان تەنیا شیعری سالمی کردووە بەپێنج خشتەکی. شاعیر لە هەموویان زیاتر لە سالمەوە نزیک بووە زیاتر لەبەر شیعرە نیشتمانپەروەری و کوردایەتییەکانی بووە.

## موستەزاد

بابەتی موستەزاد لای دیلان نوێیە، کورتە، کێشی خۆماڵییە. بەڕاستی لیریکێکە و شاعیر گەمەی هونەری لەگەڵدا کردووە، هەر نیوە دێڕێکی درێژ نیوە دێڕێک یا دوو نیوە دێڕی کورتی داوەتێ. چەند شیعرێکی لەم بابەتەی هەیە.

## شیعری دیلان لە رووی ناوەڕۆکەوە

دیلان لە ساڵی ١٩٤٩ دەستی کردووە بەشیعر هۆنینەوە تا ڕۆژی کۆچی دوایی لەگەڵ شیعردا ژیاوە. ناوەڕۆکی بنچینەیی شیعری دیلان لە ناخی سۆزی کەسێتی و مەسەلەی نیشتمانی کورد و هیوا و ئامانجی دواڕۆژی مرۆڤایەتی هەڵقوڵاوە. بەرهەمی شیعری دەچێتە خانەی داهێنانی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتییەوە. لەم ڕێبازەدا شێوازی سیمبۆلی و ڕۆمانتیکی بەکار دێنێ. لەبەرئەوەیە هەندێ شیعری داخراوە تا دەگاتە پلەیێک ئەوەی شارەزای ئەدەبی کوردی و نەریت و سامانی ڕۆشنبیری نەبێ ناتوانێ گرێی ئەو تەلیسمانە بکاتەوە کە شاعیر بەستوویەتی، بۆیە هەر لێکۆڵینەوەیێک لە شیعریدا کرابێ تا ئێستا سەرکەوتوو نەبووە.

نووسەری ئەم کتێبە دەتوانێ شانازی بەوەوە بکا لە پێش کۆچی دوایی دیلان هەموو هۆی وتنی شیعری و سەرچاوەی ئیلهامی بۆ گێڕاوەتەوە بەتایبەتی شیعرە سیمبۆلی و داخراوەکانی.

## بابەتەکانی شیعری دیلان

دڵداری کان و بنکەی سۆزی ناو دڵی دیلانە. لە سێ پەیکەردا پیشانیان دەدا. یەکەمیان کچێکی جوان ناوی شیرین یا نازەنین یا ئەختەر بێ گرنگ نییە؛ دووەمیان کوردستان و سێیەمیان مرۆڤایەتی. لە زۆربەی شیعریدا هەرسێکیانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە بەتایبەتی لە سەرەتای شیعر نووسینەوەیەوە تا ساڵی ١٩٥٧، لەمە بەملاوە هۆش و بیر و خەیاڵی تەنیا بۆ کچی جوان و کوردستان مایەوە. ئەگەر بەرهەمی شیعری دیلان ورد بکرێتەوە ئەم مەبەسانە بەرچاو دەکەون:

١- دڵداری: ئەم جۆرە شیعرەی سۆزێکی کوڵیوە بەرامبەر بە ژن. مەسەلەکە لەبەر ڕۆشنایی دڵداری زەمینییەوە تەماشا دەکا.

٢- کۆمەڵایەتی سیاسی: ناوەڕۆکی ئەم بەشە شیعرەی تێکەڵ بەنیشتمانپەروەری و کوردایەتی دەکا.

٣- ئەنتەرناسیۆنالیزمی و مرۆڤایەتی: ئەمەی بۆ چاکەی هەژار و بێ نەوایان وتووە، لەسەریانی کردۆتەوە، لە دژی چەوسێنەرانیان لە دەوڵەمەند و کاربەدەست و دەرەبەگ و ئەمپریالیست و کۆلۆنیالیستی ئەورووپا و ئەمەریکا وەستاوە. لەم شیعرانەی دیلاندا



داهێنان بەدی دەکرێ لەو وێنە ڕەوانبێژییانەی سیمایان لە خەیاڵی فراوان و بیری قووڵ وەرگرتووە، نەک دروشمی سیاسیی ڕۆژانەی دوور لە داهێنان.

## ڕووداو و مەبەس و کەسانی شیعری دیلان

ناوەڕۆکی بەشێکی زۆر لە شیعری دیلان لە ڕووی مەبەسەوە تا پلەیێک ئەم مەسەلە و دیاردانە ڕوون دەکاتەوە:

١- لە ساڵی ١٩٥٠ تا ١٩٥٧ لە لیجنەی ڕێکخراوی ئاشتیخوازانی سلێمانی ئەندام بووە، بەشێک لە شیعری لە بابەت بزووتنەوەی ئاشتیخوازییەوەیە.

٢- لە ساڵی ١٩٥٣ شیعری بۆ مردنی ستالین وتووە.

٣- شیعری بۆ کچە ئەڵمانی دەنگخۆش پۆڵدی نووسیوە، لە ساڵی ١٩٥٣ گۆرانی بۆ کۆنگرەی ئاشتیخوازان چڕیوە لە شاری ڤیەننا.

٤- لە ساڵی ١٩٥٤ بەهۆی هێرشی ئەمەریکا بۆ سەر گواتیمالا شیعری هۆنیوەتەوە.

٥- لە ساڵی ١٩٥٦ بۆ کۆچی دوایی بێخود شینی کردووە.

٦- لە ساڵی ١٩٥٧ بۆ کۆچی لاوی جوانەمەرگ ڕۆشنبیر حەسەن تۆفیقی هاوڕێی شینی کردووە.

٧- بەشیعر پیرۆزبایی نووسیوە بەهۆی دەرچوونی کۆواری «شەفەق» لە ساڵی ١٩٥٨ لە کەرکووک.

٨- بەشادییەوە پێشوازی لە کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدای کردووە و شیعری بۆ نووسیوە.

٩- لە ساڵی ١٩٦٠ بۆ ستایشی پاتریس لۆمۆمبای کۆنگۆ شیعری داناوە وەک قارەمانێکی نەتەوەیی لە ئەفەریقا.

١٠- ستایشی نیشتمانپەروەری کوردستانی ئێران غەنی بلووریانی کردووە کە لە ساڵی ١٩٥٩ فەرمانی خنکاندنی بۆ دەرچوو بوو لە لایەن حوکوومەتی کۆنەپەرستی شای ئێرانەوە. لە دواییدا فەرمانەکە بوو بە بەندیخانەی هەتا هەتایە.

١١- لە ساڵی ١٩٥٩ شینی بۆ هاوڕێیێکی خۆشەویستی کردووە، ناوی جەمیل بووە، لە تەمەنی لاویدا جوانەمەرگ بووە.

١٢- لە ساڵی ١٩٨٤ شینی بۆ عەزیزی مەلا خالیدی مەحوی کردووە.

## قەسیدە درێژەکانی دیلان

دیلان کۆمەڵێک قەسیدەی درێژ (پۆییەم)ی هەیە، لە کارە ڕەند و هونەرییەکانی شیعری کوردی دەژمێررێن، لەوانە:

١- شەڕ و ئاشتی: داستانی مامەی پیرەیە بەشیعر. چیرۆکێکە بەزمانی پیرێکی سەفەربەرلک (ڕۆژگارانی جەنگی یەکەمی گێتی) دەگێڕێتەوە. لە زیاتر لە سەد و بیست دێڕە شیعر پێکهاتووە. لە ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ١٩٥٤ لە سەیرانێکی قەراغ شاری سلێمانییی ئەو کاتە تووی مەلیک خوێنراوەتەوە و دیلان لەسەری گیراوە.

٢- چیرۆکێ: لە زیاتر لە دووسەد و چل دێڕە شیعر پێکهاتووە. بەسەرهاتی ژنێکی نانکەری لێقەوماوی بۆردوومانەکانی کوردستان دەگێڕێتەوە. شاعیر لە ساڵی ١٩٦٩ ئەم بەرهەمەی هۆنیوەتەوە.

٣- سلێمانی: ئەم شیعرەی دیلان لە قەوارەی زیاتر لە هەشتا دێڕ دایە. شاعیرانە حیکایەتی دروستکردن و بەسەرهاتی سلێمانی دەگێڕێتەوە. بەندەکانی بەم ناوانەوە هاتوون: سەرچنار، شاری تازە، لاپەڕەیێکی شاردراوە، وەڵام، شادی، ناسۆر و داخ.

٤- شێخ مەحموودی زیندوو: مەلحەمەیێکە لە سەد دێڕە شیعر پێکهاتووە. دیلان لە ساڵی ١٩٥٦ بەهۆی کۆچی دوایی شێخ مەحموود دایناوە.

## گەشتی گوڵزاری دیلان

### شیرین

یەکێ لە ڕەمزەکانی دیلانی کردووە بەشاعیر لیریکی «شیرین»ە. ئەمە شیعرێکە لەوانەی شاعیری پێ دەناسرێ. کە ناوی «شیرین» لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لە سلێمانی دەهات دیلان بیر دەکەوتەوە. شیرین لووتکەی سیمبۆلی شاعیرە، نێوەندی ئەدەبی خەریک کردووە. گەلێ بۆچوون لەم لایەنەوە کەوتوونەتە ناوەوە، دیلان مەبەسی هەموو ئەو بۆچوونانەیە و زیاتریش. «شیرین» لە پێش هەموو شتێکدا ڕەمزی نیشتمانە، ئینجا چیای شیرینی سەرکەش، لە پاشانا کیژێک ناوی شیرینە، ئەگەر شیرینی فەرهادەکەش بێ لەگەڵ ناوەڕۆکی شیعرەکە دەگونجێ، بەمەرجێ دیلان فەرهاد بێ. لەو سەردەمەی ئەم شیعرەی وتووە (١٩٥٤) ئازادی مەسەلەیێکی گرنگ و سەرەکی بوو لای شاعیر، لە ئاشتی و ئازادی دەگەڕا بۆ هەموو کەسێک. جارێکیان لێیان پرسی بوو ئەم



شیرینە دەبێ ناوی نهێنیی کیژێکی خەڵکی سلێمانی نەبێ و دیلان حەزی لێ کردبێ و ئەم شیعرەی بۆ وتبێ؟ لە وەرامدا بزەیێک لەسەر لێوی هەڵفڕی بوو. وا زان دەکرێ ئەم شیعرەی بۆ ئەو کچە وتبێ لە دوای سێ چوار ساڵ بوو بەهاوسەری.

شیعرەکە بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

شیرین بەستەی گوڵاڵەی سوور    تریفەی مانگم<br>
شیرین گەشەی ئەستێرەی دوور    گفتوگۆ و بانگم<br>
شیرین تیشکی ڕۆژی دەم کەل    بۆ ویرانەی دڵ<br>
شیرین هاژە و جریوەی مەل    بۆ وەنەوشە و گوڵ<br>
شیرین ئەوپەڕی جوانی شێوەی    نیگاری سروشت<br>
شیرین تۆ ئەو تاقە سێوەی    کە فەرهادی کوشت<br>
شیرین تۆ بووی یەکەم بینین    کارەبای نازت<br>
چاو هەڵبڕین زەردەخەنەت    سروەکەی ڕازت<br>
لێی شێوانم تەلی تاری    هەڵبەست و خەیاڵ<br>
بووم بەو مەلەی بێ لانەیە    زامدارە و بێ باڵ

لەم دێڕانەدا دیلان موناجات لەگەڵ شیرین دەکا. سروشتی ڕەنگین لە ناو جوانی ئەودا دەتوێنێتەوە. لە یەکەم بینیندا گرفتاری بووە، سەری لێ شێواوە وەک ئەو مەلەی بریندار بووە و هێلانەی رووخاوە.

لەسەر شیعرەکەی دەڕوا و دەڵێ:

ئیتر نە مانگ نە ئەستێرە    نە گزنگی زەرد<br>
نە فووی شمشاڵ قاسپەی کەو    لەم بەرد و لەو بەرد<br>
نە بریقەی شەونمی سەر    چیمەنی قەراغ<br>
نە خەندەکەی تازە غونچەی    درەختانی باغ<br>
نە کەرویشکەی دەغڵی بنار    نە هاژەی چاوە<br>
نە ئەو بۆنە سەرمەست کەرەی    ئەگریجە خاوە<br>
نە کرنووشی سەوز و سووری    پەلکەزێرینە<br>
نە بەهاری کە خەریکی    عیشوە کرینە

نە تەبیعەت نە جوانییەکەی          نە فەڕ و نرخی
جارێکی تر وای تەما بێ          خۆش بکا مرخی
وا بزانێ بە پەڕەی گوڵ          بەسیحری جوانی
ڕاچڵەکێنێ ئا ئەو دڵەی          کە تۆی میوانی
چونکە لەگەڵ هەچ کامێکیان          بەراوورد بکرێی
تۆ پێی بەرزی بەرەو ئاسمان          بەسەریا ئەنێی

شاعیر وێنە و دیاردەکانی سروشت بۆ شیرین دەژمێرێ، ئەمانە هەموویان ئەگەر لە ناو تەرازوو بنرێن و تایەکەی دیکەی دڵی شاعیری تێدا بێ کە شیرین لێی میوانە، بێ گومان تایەکەی شیرین قورستر دەبێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ هیچ جوانییێک لە ناوەوە نابێ ئەگەر جوانی شیرین لە گۆڕی بێ.

دیلان لەسەر شیعرەکەی بەردەوامە:

ئیتر شیرین داری فیزت          باش ڕاوەشێنە
تۆ جێگاکەت هەرچەندە وا          لەسەر گلێنە
تا ئێوارێ شەپۆڕم بێ          و ناڵەی جگەردۆز
ئۆقرە نەگرێ کاتێ ساتێ          دڵەکەی گرۆز
منی کەساس منی کلۆڵ          یا منی هەژار
چۆن ئەتوانم ئاشی هیوات          بۆ بخەمە کار!
چۆن ئەتوانێ پشت کۆماوەی          زنجیری دوژمن
دەستی لەرزۆک بەئاسانی          بنێتە گەردن
چۆن ئەتوانێ دەمی ووشکی          چەوساندنەوە
لێوی قرچی ووشک هەڵاتووی          ڕووتاندنەوە
نزیکی خا لە دوو لێوێ          دەوری تەنراوە
بەدڕکەزی چاولێکەری          ئەم بەند و باوە

لە لای دیلان کەس لە شیرین خۆشەویستتر نییە، لەبەرئەوە هەرچی بکا بەلایەوە خۆشە، ئەگەرچی خۆشی هیچی بۆ ناکرێ، چونکە زنجیری دوژمن لە ملیەتی. کەسی دیل چۆن دەتوانێ دەمی بۆ دلّداری درێژ بکا!.



دیلان بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

هەیهوو! هەیهوو! ماوە پانە          ڕێ پڕ لە خێوە
کۆسپی بەر لووت بڵندترە          لەو شاخ و کێوە
ئەبێ شیرین پەلەقاژەی          دڵەی مندالّم
نوێنی لێژ و شەو بێداری          شەوگاری تالّم
هەڵیگرم بۆ ئەو کاتەی          ڕژێمی ڕاستی
ئەگاتە دەس ئەو کەسانەی          بەخوێنی خواستی
ئەوسا منیش بەداخی دڵ          تێر تێر ئەرێژم
لەو هەنگوینەی گوڵی لێوت          تۆزێ ئەچێژم
یا وەک بلبل هەر بەتەمای          گەیین بەئاوات
بەرەو هیوا باڵ ئەکوتم          بمبات و بمبات

بەلای دیلانەوە دلّداری لە وڵاتی تالّانستاندا ناچێتە سەر، لەبەرئەوە دوای دەخا تا ڕژێمی ڕاستی سەردەکەوێ، مەبەسی کۆمارەکەی ئەفلاتوونە. شاعیران خەون بەو سۆسیالیستی و یەکسانییە دەبینن. ئەگەر لە ژیاندا نەیەتە دی، خەونەکە دەبێتە ئەفسانە، ئەفسانەش شادی بەئادەمزاددا دەگەیەنێ. دیلان سوورە لەسەر ئەوەی ڕژێمی ڕاستی باڵی بەسەر مرۆڤایەتیدا دەکێشی، لەبەرئەوەیە دلّداری دوا دەخا تا ئەو کاتە، چونکە دیلان لەسەر ئەو باوەڕەیە هەموو شتێک کۆتایی پێ بێ، دلّداری نەمر و هەمیشەییە، بۆیە تەنیا بۆی هەیە دوا بخرێ.

### شێخ مەحموودی زیندوو

دیلان کە شیعری «شێخ مەحموودی زیندوو»ی هۆنییەوە شەش حەوت ساڵ بوو دەستی دابووە شیعر، ناوبانگی پەیدا نەکردبوو و لە لایەن هەموو کەسێکیشەوە نەبووبوو بەشاعیری تەواو. لە دوای ئەم شیعرە دۆستانی ئەدەب وتیان دیلان بوو بەشاعیر. دەبێ چی نهێنییێک لە ناو ئەم شیعرەدا هەبێ! پێش هەموو شتێک سۆزی کەسێتی دیلان بەرامبەر بەشێخ مەحموود. پێوەندی ئەو بەشێخەوە زۆر لە تەمەنی باوکی دیلان و باوکی شێخ کۆنترە، ئەمە دەگەڕێتەوە سەردەمی ژیانی باپیرە گەورەی هەردوو لایان و کاتی دروستکردنی شاری سلێمانی. هەرچی مەسەلەی شێخیشە لە ڕووی سیاسی و وەک

دەروێشێکی تەریقەتی قادری و نەوەی کاک ئەحمەدی شێخ ئەمەیان لە لای دیلان لە پلەی دووەم دەوەستێ و کاریگەری کەمترە لە سۆزە کەسێتییەکە.

هەرچۆنێ بێ خۆشەویستی بێ سنووری دیلان بۆ شێخ مەحموود بووە هۆی لە دایکبوونی ئەم شیعرە بەرزەی یەکێکە لە نموونە هەرە جوانەکانی شیوەن و ماتەمنامە لە ئەدەبی کوردیدا.

دیلان بەم جۆرە دەست بەشینەکەی دەکا:

پاییز خەزانی تەماوی و مەنگە
گەڵا لق و پۆپ غونچە بەژەنگە
ئاسمان نە شینە نە پیرۆزەیی
نە شەو جریوەی ئەستێرەی شەنگە
نە سروەی شەماڵ نە سەدای مەلە
چاوە ووشک و ڕەش بەبێ ئاهەنگە
ڕۆژ کە ڕووناکی دەری سروشتە
تەرازووی تیشکی نەوی و لاسەنگە
تەلی تار خاوە بێ سۆز و سازە
شمشاڵ لەگەڵ فوو بەشۆر و جەنگە
ئەگەر پێکەنین ببێ بەخەنجەر
لای گوڵخەندەران شەق بردن نەنگە
پۆلە چۆلەکەی مۆلی ئێواران
کڕ و کش و مات وڕ و بێدەنگە
سەرچنار ڕەشە ڕەشتر ئاسمانی
پرچی ژاکاوە چڕە زەبەنگە
بلبل بێ ئارام بەبێ سرەوتە
دنیای فراوان لای گۆڕی تەنگە
خاڵ خاڵی لووتکەی شیرین و هەڵگورد
لەگەڵ فرمێسکا تواوەی پەنگە



پشتکۆ تەمی نارد بۆ ئارارات
هەناوی ئەزمڕ بە کاژاو بەنگە
بەڵام کوردستان با لە شینا بێ
گوێ هەڵخراوی ئاوازی زەنگە
کورد با سەراپا ماتەم دایگرێ
جۆش و خرۆشی وەک پوورە هەنگە

دیلان بەسەر پاییزدا هەڵدەڵێ چونکە ڕەمزی مردن و لەناوچوونە. سروشت هەمووی بەگوڵ و گوڵاڵەوە ڕەشپۆشە، تەنانەت گوڵخەندەرانیش شەق نابا، چونکە یەکێک بەدەمیەوە پێنەکەنێ ناکرێتەوە. چۆلەکە کش و ماتە، سەرچنار ڕەش هەڵگەڕاوە، لووتکەی شاخەکانی شیرین و هەڵگورد لە حەژمەتانا فرمێسک دەڕێژن، بەفری سەر لووتکە و قەدپاڵ دەتوێنەوە. شاخەکانی پشتکۆ و ئارارات و ئەزمڕ و کورەکاژاو لەگەڵ هەموو کوردستانا لە ماتەم دان.

ئەوجا دیلان دەڵێ:

سیا کەژ سیا سیا کێوانە
سیا بەرگ دیارە هەر هەورامانە
لە کێ بپرسین سۆراغی ڕاستی
دیارە نزیکتر هەر بەرانانە
بەرانان دەخیل دراوسێی دڵسۆز
ئێستە ئەوپەڕت کێی لا میوانە
هەواڵی پرسە لە داریکەلی
شێخ لەوێ ماوە یا لە سەیوانە
ئێستە سێبەری سەر جەستەی کفنی
هەتاوی سوورە یا ئەرخەوانە
ئێستە پێخەفی نەرم و نۆڵی شەو
بەردە یا خاکی کانی ئاسکانە
بەردە قارەمان لە جێی خۆی ماوە
هەر لە دەربەندە یا لە پیرانە

ئێستە ئاوباریک وەک بوومەلەرزە
هەر هەڵئەلەرزێ یا لە وەستانە
کوا شێخ! کوا نەوەی ئەحمەدی کاکی
کوا نەبەردەکەی ئەم نیشتمانە
بەرانان دیارە قوڕگت گیراوە
چاوت لیخنی خوڕی گریانە
سەرت چەپۆکی کۆچی بێ وادەی
شێخ خولی داوە سستی فغانە
بەڵام بەرانان گوێم لێ ڕاگرە
من کوردم کوردیش گەلە ئینسانە
هەزار ئەوەندە بخرێتە بینی
دەستی گەردوون و چنگی زەمانە
کورد شۆڕەسواری وەک شێخی بووبێ
سەر نەوی ناکا لە بۆ بێگانە

دیلان لەسەر دەستووری گۆرانیی «سیاچەمانە = چاوڕەشان»ی هەورامانیان دەڵێ، هەورامان ڕەشی پۆشیوە. لە شاخی بەرانان دەپرسێ ئایا شێخ مەحموود لە گوندی داریکەلی ماوە یا لە گۆڕستانی گردی سەیوانە. داریکەلی جێی زیندەگانیی شێخ بوو لە قەدپاڵی شاخی بەرانانە. هەروەها دەپرسێ ئایا شێخ ئێستا لە کانی ئاسکانە! ڕاستییەکەی ئەوەیە شێخ لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی نێژراوە. ئەو مزگەوتە لە گەڕەکی کانی ئاسکانە و ماڵی شێخیش لە کۆڵانێکی ئەو گەڕەکەیە و بەناوی کۆڵانی شێخان ناسراوە. دیلان لەسەر پرسیارەکانی دەڕوا و دەڵێ بەردە قارەمان لە جێی خۆیەتی یا لە ئاوایی پیرانە. بەردە قارەمان لە دەربەندی بازیانە، پیران گوندێکە لە مەریوان، شێخ ماوەیێک لەوێ ژیاوە. لە شیعرەکەدا ئاماژە هەیە بۆ گوندی ئاوباریک لە نزیک کفری. شێخ مەحموود لەو جێیەدا بەشداری لە شەڕێکدا کردووە.

شاعیر لەو دێڕانەدا جارێکی دیکە ڕوو دەکاتەوە چیای بەرانان لە پێشانا بۆی دەلاوێنێتەوە، ئەوجا هانی دەدا، تێی دەگەیەنێ کورد هەیە، کورد ئادەمزادە، هەزار ئەوەندە گەردوون خراپەی لەگەڵدا بکا، شۆڕەسواری وەک شێخی هەبێ سەری نەوی ناکا.



شاعیر دەگەڕێتەوە لای پاییز:

پاییز خەزانی تاریک و تاڵە
یا فڕە قەلە یا هاشەی داڵە
ترونتەی دەوران تیژ و بەباڵە
بە سەر شەهێنی کوردانا زاڵە
سەروو دەمێکە باغی هیوامان
گۆپکەی درەختی هەر کرچ و کاڵە
ڕێگەی بەردەممان ماوەیێ تەختە
ئەوەندەت زانی پڕ چۆڵ و چاڵە
نە شەو ئاسوودەین ڕۆژیشمان درێژ
بەخت سەرنگوون ماڵمان نا حاڵە
هێشتا برینێ تیمار ناکرێ
کەچی شەبەقێ هاوار بەحاڵە
بەڕاستی چەرخ بێ بەزەییانە
بەم گەلی کوردە باش ئەکا گاڵە
بەڵام ئەی پاییز ئەی گەڵاڕێزان
تۆش گوڵی ئاڵی سەرداری ژاڵە
شێخ با ماڵ ئاوا لە کوردستان کا
ئەم خاک و خەڵکە بخاتە ناڵە
ئێستە کوردستان ئامانج و سەودای
لە بۆتەی سەختی دواڕۆژا قاڵە

سەردەمی ناخۆشی بۆ کورد بەدرێژایی مێژوو زۆر بووە، کاتی گوشادی کەم بووە. تیماری برینێک ناکرێ، برینێکی دژوارتر دەردێنێ، بەڵام کورد کۆڵ نادا، کە شێخ ماڵئاوایی لە کوردستان دەکا کورد ئازاتر دەبێ بۆ ئەوەی هیوا و ئامانجی شێخ بهێنێتە دی.

دیلان بەم دێڕانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

پاییز ئاخری گەڵاڕێزانت
وورووژمی تیژ و توندی خەزانت

کزەی بای ساردی دەمە و بەیانت
گەردەلوولی ڕەش سەر لووتکەکانت
ئالآیە گەردن سەرۆکی ناشاد
کردی بەنێچیر مەرگی دەورانت
کەوا بوو سەرۆک مەحموودی کوردان
سووک لێکی بنێ پێڵووی چاوانت
بنوو لە باوەش دایکی دڵسۆزا
بۆی هەڵبژێرە دەرد و هیجرانت
لەگەڵ یەکتری بکەونە گفتار
ئەو بەئیشارەت تۆ بەزمانت
بۆی بگێڕەوە ڕەنجووری کوردان
پیشانی بدە برینی گیانت
بنوو نووستنی دوای هیلاکی ڕێ
پرخەت بگاتە گشت کوردستانت
ئەو ڕێیەی کە تۆ گرتت لە ژینا
ئێستەش بەجێت هێشت بۆ ڕۆڵەکانت
کوردستان بگرە چەپکە نێرگسێ
سووک داییهێڵە و بیخە گوڵدانت
با بۆنی خۆشی هەتا هەتایە
ببێ بەمایەی شەوکەت و شانت
با هەنگی لاوی نیشتمانپەروەر
ئەو بۆنە ببا بۆ دەردەکانت
لێی دروست بکا شانەی هەنگوینی
مەبەست و بڕوا و جۆش و فەرمانت

شاعیر دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو پاییزەی دوایی بە ژیانی شێخ هێنا، ئینجا ڕوو دەکاتە شێخ و پێی دەڵێ: لە باوەشی خاکی کوردستان بنوو و بحەسێوە، پێکەوە گفتوگۆ بکەن، بەسەرهاتی ڕەنجەڕۆیی کوردان بۆ خاک بگێڕەوە. دیلان ئەم هەموو فرمێسکە لە



دواییدا دەکاتە نوقلانە بۆ دوارۆژی نەتەوە. شێخ مەحموود وەکو ڕەمزێک دەبێتە هۆی هاندانی لاوان بۆ خەبات لە پێناوی ئەو هیوا و مەبەسەی بەدرێژایی تەمەنی بۆی لە جەنگدا بوو.

### مامە کوڕنوو

لە شیعرێکیدا دیلان مامە کوڕنووی کردووە بەبەڵگە بۆ دوان لەو ئاژاوە و تیرۆرەی دەسەڵاتی عیراق نابوویەوە بەگشتی لە کوردستانی عیراق و بەتایبەتی لە سلێمانی:

مامە کوڕنوو ڕاکشاوی گردەکەی سەیوانەکەم
سەر ڕەحەت دڵ بێگرێ گوێ شلکە بۆ داستانەکەم
سەیرە بەزمە هەڵپەڕینە پڕ لە قاقا و خەندەیە
نەعرەتەی گوێ کەڕ ئەکا جۆش و کوڵی سەیرانەکەم
ئەرخەوان سوورە بەهارە گوڵشەنە ڕازاوەیە
دەشت و کۆ ڕەنگین و پڕ شۆیە وەنەوشەی یانەکەم
خەرمەنی لالە لە کۆساران و پێدەشت و نشێو
سوورترە لەو خوێنە باریوەی کوڵی گریانەکەم
دلبەران سرک و بە ناز و ڕەوتی نەرم و ئیستەکەی
سەد توانج ئەگرێتە ئاهووی دەشتەکەی شێروانەکەم
هەڵبڕە چاوی نومایش تێر سرنجی وورد بدە
وەک بەجێت هێشت وا نەماوە شارەکەی جارانەکەم
ئەو بەهارەی تۆ بەجێت هێشت پڕ برینی تازە بوو
پڕ لە ئافاتی لەپڕ بوو بۆ گوڵی ئینجانەکەم
ئەو گوڵەی ئاواتی کورد بووبێتە پشکووتن دەمێ
ڕایوەشێنێ بای شەماڵی نەرمی کوردستانەکەم
ئەو کەسەی دەستی ئەنایە بین و قوڕگی ئەو گوڵە
چنگی خوێناوی ئەنایە ناو دڵە پڕ ژانەکەم
ئێمە ئارەق ڕشتن و بازوو وەشاندن بێخەوی
ئەو گڕ و پشکۆی ئەخستە ژێر بنی خەرمانەکەم

ئێستە وا خۆی دائەنێ بۆتە فریشتەی ئاسمان
بۆتە دوکتۆر و برین پێچی برینی گیانەکەم
مامە کورنوو! چی بڵێم زیاتر لەوەی خالیس ئەڵێ
(فێست و ڕێوی و مێزەر و مەیموونە سەیری بانەکەم)
وەک ووتم سەیرە لە بانە یا وەکو نالی ئەڵێ
زیندەگیم تاڵە کە زەلکاو بێ بەتیمارخانەکەم

ئەم شیعرە نموونەیێکی دیکەی بەرهەمە سیمبۆلییەکانی دیلانە بەهەناسەیێکی درامی تێکەڵ بەکۆمیدی لە ساڵی ١٩٥٧ نووسیویەتییەوە. مامە کورنوو، ئەحەی کورنوو کەسێکی بەناوبانگ بووە لە سلێمانی لە سەدەی نۆزدەمدا. کابرایێکی قسە خۆش و بەتوێکڵ و نوکتەچی بووە. کردەوە و قسەی بوون بەمایەی بەراوورد بۆ دەرخستنی خراپە و ناگزوورییەکانی کۆمەڵ.

لە دوای جەنگی دووەمی گێتییەوە دەسەڵاتی نێوەندی لە بەغدا لە پێناوی بەربەرەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد چاوی لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراق بوو بەتایبەتی سلێمانی. لە پەنجاکاندا عومەر عەلی ناوێکی کۆنە ئەفسەری سوپای بە موتەسەریفی ئەو شارە دامەزراند. کابرا تورکچی و تۆرانی بوو، کوردی خۆش نەدەویست کینی بەرامبەر بەکورد لە پەنای ئیسلامەتی و نزیکی لە عەرەب شاردبووەوە. جۆرە تیرۆرێکی نابووەوە لە دژی خەڵکی ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی بنەماڵەی شێخ مەحموود. لەو ڕۆژگارەدا ناو نووسینی ئەو کەسانە لە ناوەوە نەبوو کە لە نێوان شارەکاندا هاتوچۆیان دەکرد، تەنیا لە سلێمانی نەبێ هەر ئۆتۆمۆبیلێک لە کەرکووکەوە بهاتایە سلێمانی کە لە بەکرەجۆ و سەرچنار ڕەت دەبوو پۆلیس خەڵکی دەپشکنییەوە و ناونووسی دەکردن.

لەو شیعرەدا دیلان یادی ئەحەی کورنوو دەکاتەوە، ئەوەی تێدەگەیەنی شار وەکو سەردەمی ئەو نەماوە. ئەوانەی لە ئازادی دەگەڕان بۆ کورد ئێستا بوون بەدژی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان بەپیاوچاک دەزانن. شیرازەی کۆمەڵ تێکچووە، ئاژاوەیە دار لەسەر بەرد نەماوە. دیلان ئەوە بەئەحەی کورنوو دەگەیەنێ هیچی پێ نەماوە پێی بڵێ نیوە دێڕە شیعرەکەی خالیسی کوڕی شێخ ڕەزا نەبێ کە فێسی لەسەری ڕێوی و مێزەری لەسەری مەیموون داناوە.



## سروودی کوردستان

دیلان لە ساڵی ١٩٥٧ مارشێکی بۆ لاوانی کورد هۆنیوەتەوە بەناوی « سروود»ەوە:

کوردستان بەهەشتی زەمین
جێی تێکۆشان و ڕاپەڕین
مەڵبەنی کاوەی قارەمان
کوردستان کوردستان
ئەی نەتەوەی کوردی دلێر
ڕۆڵەی نەبەرد و بێچوە شێر
هەستە هەستان دەرمانە بۆ
دەرد و ئازاری جەستەی تۆ
کوردستان کوردستان
وا نەورۆزە جەژنی گەلە
ئاسۆ ڕازاوەی دەم کەلە
با نەورۆز و بەهاری کورد
پێگەیێنن بەدەست و برد
کوردستان کوردستان

ئەم سروودە مارشێکی بەناوبانگی ناو کۆمەڵی کوردەوارییە. دیلان لەم شیعرەدا ڕەچاوی لایەنی گەشبینی ژیانی کردووە، لەو کاتەی ئاماژە بەمێژووی میتیۆلۆجی دێرینی کورد دەکا و ناوی کاوەی ئاسنگەر دەبا و بە جەژنی نەورۆزی دەبەستێتەوە کە پێوەندی لەگەڵ هەڵسانەکەی کاوە هەیە. ئەم نەورۆزە هەموو ساڵ تازە دەبێتەوە.

## من ئینسانم

دیلان ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩٦٠ وتووە بۆ ئەوەی خۆی لە ئادەمزادی سەر ڕووی زەوی جیا نەکاتەوە:

پێستم ڕەشە وەک شەوەزەنگ
لێوم ئەستوور لچم زەقە
نیگام ماتە وەک گۆمی مەنگ
بزەم نەرم و سەرم ڕەقە

من ئێستاش لە هەندێ جێگا
ڕەشیم مایەی تێز و بێزە
لەم کۆڵان بێ و لە ئەو ڕێگا
سپی لێم دوورەپەرێزە
بەڵام من ئیمڕۆ شێرانە
پێم لە زەوی گیر کردووە
ئەنەڕێنم دلێرانە
زراوی سپیم بردووە

شاعیر بەزمانی ڕەشێکی ئەفەریقی دەدوێ، باس لە ڕەنگ ڕەشی و لێو ئەستووری خۆی دەکا. هەندێ بزووتنەوە و کردەوەی خۆی ڕوون دەکاتەوە، ئەوە دەردەخا هەرچەندە کەسی لەش سپی بەچاوێکی سووک تەماشای دەکا بەڵام ئەو خۆی سەپاندۆتە سەری و وای کردووە لێی بترسێ.

ئینجا بەزمانی ڕەشەکە دیلان دەڵێ:

من لە کۆنگۆ یا لە کینیا
ئەڵێم وەک سپی ئینسانم
دەنگم چوو بۆ بنی دنیا
ئیتر خۆم خاوەن فەرمانم
من ڕەنگم زەرد و لووت پانم
ڕووم پڕ بوو لە لۆچ و چرچی
تفت و تاڵ بوو گوزەرانم
بەری ژینم هەر بەکرچی
دوژمن ئەیبرد منی نەخۆش
جێی زۆر بەم بەندیخانە بوو
دیلی ڕژێمی خۆفرۆش
بەشم توانج و تانە بوو

بەزمانی ڕەشی دوو وڵاتی ئەفەریقا کۆنگۆ و کینیا شاعیر قسە دەکا، ئەوە دەردەبڕێ ئادەمزادە وەک سپی، ئازاری زۆری چەشتووە، ژیانی دیلی لە بەندیخانەکاندا بردۆتە سەر.



ئینجا دیلان بەزمانی خەڵکی هەندێ لە نەتەوەکانی ئاسیا قسە دەکا و دەڵێ:

بەڵام ئیمڕۆ منی ڕەنگ زەرد
خۆم خاوەنی کاروبارم
سکم تێرە و دوورم لە دەرد
سەرفرازە لادێ و شارم
من بووم لە شەش یەکی جیهان
ئاواتم گرتە باوەشم
ڕەگی دوژمنم هەڵتەکان
بەزەبری شۆڕ و شۆڕشم
منم لە چین من ئینسانم
من ڕێکخەری ژیانم
فێرکردنە تێکۆشانم
خۆم گەورەی نیشتمانم

لەم دێڕانەدا دیلان باس لە ڕزگاربوونی کۆمەڵێکی دیکەی خەڵکی ئاسیا دەکا. ئەم قسانەی بەزمانی ڕەشی ئەفەریقا و زەردی ئاسیایە، چونکە هەردوو لایان ئادەمزادن، بەشێکن لە مرۆڤایەتی. باس لە ڕزگاربوونی شەش یەکی خەڵکی سەر ڕووی زەوی دەکا، مەبەسی وڵاتی سۆڤیەتی سۆسیالیستی کۆنە (١٩١٧ - ١٩٩١)، هەروەها وڵاتی چینیش کە دەوڵەتی سۆسیالیستیان دامەزراند.

ئینجا شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

منم بەتەنیا و بەتاکی
لێم قەدەغەیە و تاوانە
دووان بە ووشەی زگماکی
ئەنجامی کۆت و زیندانە
منم لە کوێ! لە تورکیا
سەیر گۆڕاوە ناونیشانم
بەمن ئەڵێن تورکی چیا

وەک ڕووچوو بێ کوردستانم
بەڵام منی کورد ئینسانم
وەکو تۆ ئەی برای ڕەشم
خاوەنی ترکە و هەستانم
هەرچەندە ئێستا دابەشم
منیش وەکو تۆ ئینسانم
ئەی کاکە ئەی برای زەردم
دۆستی گەلانی جیهانم
ڕۆڵەی مەیدان و نەبەردم
سا ئیمرۆ بێ یاخو سبەی
ئەگەمە سەودا و مەبەسم
هەڵئەکێشم پشووی ئۆخەی
تێر لەو بایەی کە پێی مەستم

لەم دێڕانەدا دیلان باس لە ئادەمزادی کورد دەکا. دەڵێ ئەفەریقا ڕزگاری بووە، بەڵام کورد هێشتا بەدیلی ماوەتەوە. لە هەندێ جێگە قسەکردن بەزمانی خۆی لێی قەدەغە کراوە. لە تورکیا نابێ کورد بەزمانی خۆی قسە بکا، هەروەها نابێ کوردیش بێ، لەوێ پێی دەڵێن «تورکیا چیا» وەکو کوردستانەکەی ڕووچوو بێ.

لە دواییدا دیلان ڕوو دەکاتەوە برا ڕەشە ئەفەریقاییەکەی ئینجا برا زەردەکەی (نەتەوەکانی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی باشووری ئاسیا) پێیان دەڵێ منی کوردیش وەکو ئێوە ئادەمزادم و بەڵێنیان دەداتێ ئیمرۆ بێ یا سبەی وەکو ئەوان بای ئازادی هەڵدەمژێ.

### تاوان

ئەم شیعرە دانەیێکی دیکەیە لە شیعرە سیمبۆلییەکانی دیلان لە ساڵی ١٩٦١ هۆنیویەتییەوە. بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

تاوان سەختە تاوان باری گرانە
بارکردنی لە ئەستۆدا هەرزانە
کام سەر گەورە کام مل بەرز و بڵندە
کام دەم و لێو مەست و پڕە لە خەندە



ئەتوانرێ بەیەک بزەی ژەهراوی
تیری توانج بەردی تانەی بۆ هاوی
وەک چۆن پووشێ بای تیژ ئەیبا بەپەلە
بەو شێوەیە ناوبانگ بخەیتە مەلە
ئا ئەتوانی سەر لە سەرین بسێنی
تۆوی نەفرەت بێزکردنەوە بچێنی

دیلان دانایانە وێنەی بەرزی هونەری دادەهێنێ. تاوان کردن کارێکی قورسە، بەڵام بۆ ئەو کەسەی دەیکا ئاسانە. ئینجا کچێکی شۆخی نازەنین دەکا بەڕەمزی بزووتنەوەی نەتەوەی کورد و دەڵێ:

ئەی نازەنین! ئەی بەرگ ئەرخەوانی
ووتەی گەرمم لەگەڵ تۆیە و ئەیزانی
سەوداسەری ئەو گفتوگۆ دێرینەم
لەپ سووتاوی ئەو یەکەم دەس گوشینەم
لەو دەمەوە تۆم کردووە بەتاسە
بێ مەودایە کۆی دووکەڵی هەناسە
بێ دواییە ئەشک با سوور و سوێر بێ
نایێ لە بن ئەگەرچی دیدە کوێر بێ
ئیتر بۆچی ئەمدەیتە بەر تیغی دەم
هیچ ناترسی بتسووتێنێ هەناسەم

شاعیر گفتوگۆ لەگەڵ نازەنین دەکا، ڕەمزی ئازادی کوردستان، بەرگی لە ڕەنگی خوێن دایە، لەو ڕۆژەوە ئەو ئازادییەی ناسیوە، خەباتی بۆ دەکا، ڕەنجی بۆ دەدا. هەرگیز کۆڵ نادا.

ئینجا شاعیر باسی هەڵسوکەوتی ناهەمواری گێتی بۆ دەکا:

ئەی نازەنین! ئەی ڕوو جوانتر لە شەست پەڕ
ئەی گوێچکەی دڵ هیچ نەمبیستووە تەمەن شەڕ

هێجگار سەیرە هەروەک ترازوو وایە
هەڵسەنگاندن لە لای ئا ئەم دنیایە
دنیا سەیرە و سەیر شێواوە پۆی کێشان
قورس بۆ زەوی و سووکە ئەچێ بۆ ئاسمان
زەهر شیرە مار ئەهێنن بۆ بێرە
گا لە شۆخی و خاوەن خەرمان بۆ گێرە
گورگ پاسەوان شوان دانی لە گۆشت جیرە
مر بۆ چەقەڵ مل درێژە بێ قیرە

لەم دێڕانەدا دیلان بەئازادی دەڵێ، خوم شێواوە، هەموو شتێک لە کۆمەڵدا ئاوەژووە، بەڵام بۆ خاوەنی بەچاکە دەگەڕێتەوە. گورگ پاسەوانە کارێکی باشە بۆ خۆی، مەڕ دەخوا، بەڵام بۆ خەڵکی کارەساتە. مریشک بۆ چەقەڵە، بۆ کۆمەڵی خەڵک ماڵ وێرانییە.

لە دواییدا شیعرەکە بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

ئەی نازەنین! ئەی بەرگ ئەرخەوانی
ووتەی گەرمم لەگەڵ تۆیە و ئەیزانی
لەگەڵ ئەوەی دڵ پەرۆشی رووی ئاڵە
دەروون سەودای لووتکەی بەرز و خاڵ خاڵە
خەیاڵ ووری بینینێکی چیایە
لەبەر دووری لە مێرگ و سەوزە گیایە
ڕەنگی گەڵای تێکەڵ بەشۆی نزاران
ئەکسیرێکە بۆ دڵی دەردەداران
بەکورتی فەڕ لەگەڵ جوانی وولاتم
هۆی تروسکەی ئامانجمە و ئاواتم
کە نەتەوەم گەیشتە دوا مەبەستی
نامەی کردار هەچ کەمی درایە دەستی
ئەوسا ئەگەی لە خەبات و تێکۆشان
کە بۆ کوردە و بۆ ڕزگاری کوردستان

دیلان لەم دێڕانەدا وێنەی ڕەوانبێژی جوان دەکێشێ، سۆزی بەرامبەر بەنیشتمان لە پلەی



شاخە بەرزەکانە، وزەی خەباتی لە بەردی چیاکان بەهێزترە. دوا ئامۆژگاری بۆ نازەنین ئەوەیە دەڵێ ئەو کاتەی کوردستان ڕزگاری دەبێ ئەوسا لە مانای خەباتی من دەگەی و دەزانی بۆچی من هەمیشە لە مەیدانی جەنگدا بووم.

**ڕەز**

ئەم شیعرە بەرزەی دیلان لە ساڵی ١٩٦٢ هۆنراوەتەوە، لە کاتێکدا دەسەڵاتی عیراق لە بەغدا لە دەست عەبدولکەریم قاسم بوو. ئەم کابرا سەرلێشێواوە کوردستانی بۆمباباران دەکرد.

شاعیر بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

بەهار! ئەی مەی ئەڵوەن و سادە
نەتدیوە پەترۆی پیاڵەی بادە
جەستەکە شەنگە هەناسە سوارە
سەر ووڕی لەپە دڵ بریندارە
هەناسە ڕەشە هەست پلیشاوە
بانگ لەبەر بێن و قوڕگا خنکاوە
پێست بەسەر ئێسکا قرچ هەڵگەڕاوە
لەشە جنراوە سەرە بڕاوە
لە کوێیە شەراب! لە کوێیە شەراب!
بۆ لە ئێمە بوو بەرێچکەی سەراب!

لەم شیعرە سیمبۆلی ڕۆمانتیکییەدا شاعیر لە ڕەز و ترێ و شەراب دەدوێ، ئەم دیاردەیە بەفەلسەفەی ئەفلاتوون و بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەی کورد دەبەستێتەوە. مەینەتی کوردی عیراق بەلای دیلانەوە گەیشتۆتە ئەوەی هەناسە و هەست و قسە کۆتاییان هاتووە، لەش دارزاوە، سەر لە لەش جیا کراوەتەوە. چارەسەری ئەمە تەنیا مەیخانە دەیکا.

شاعیر دەڵێ:

ئەبێ لە کوێ بێ بۆن و بەرامەی
ئەو ڕەنگە ئاڵ و ئەو تفتە تامەی

ئەبێ لە کوێ بێ درەوشەی سووری
ڕووناکی تیشک و بڵێسەی دووری
وا دیارە هەڵپە و ئاوات و ئۆخەی
ئەبێ ببەینە پەنا شووشەی مەی
ئەی گەردن ڕەوان وێنەی نازداران
ساف هەروەک نیگای چاوی خوماران
بێگەرد هەر وەکو دەروونی مەردان
بێخەوش وەک گوڵی سای پەنا بەردان
لە کوێیە شەراب! لە کوێیە شەراب!
بۆ مەزەی ئەوا گیان بوو بەکەباب
وا دیارە هەڵپە و ئاوات و ئۆخەی
ئەبێ ببەینە پەنا کووپەی مەی

لەم دێڕانەدا شاعیر وەسفی جوانی مەی دەکا. لێی دەگەڕێ، وێنەی ڕەوانبێژی هونەرییانە دادەهێنێ، ڕەنگە تارمایی ئەم وێنانە لە ئەدەبی کلاسیکیدا بەرچاو بکەون، بەڵام دیلان بەشێوەییێکی نوێ و بەکوردییێکی پەتی و تەعبیرێکی تازە دەریان دەبڕێ. لە پاشانا بەم جۆرە لە کووپەی شەراب دەگەڕێ:

سەبوو! ئەی کانگای بیری ئەفلاتوون
پیاڵە و شووشە وا بوون بە هەپروون
وورن هەروەکو ئەستێری نالەبار
خاشن بەوێنەی زنجیری زۆردار
وونن بەوێنەی تۆزی با بردوو
تەفرن بەوێنەی کەسی پەک کەوتوو
لە کوێیە شەراب! ئەوا تاسەی مەی
هەست نوقوم ئەکا وەک زەریای بێ پەی

سەبوو کووپەی شەرابە. دیلان ئاماژە بۆ «بیری ئەفلاتوون» دەکا. لە ئەفسانەی گریکی کۆن ئەوە هاتووە، ئەم فەیلەسووفە ئەگەر ئارەزووی کردبێ تیۆریی فەلسەفەییێکی تازە بدۆزێتەوە چۆتە ناو کووپەییێکی بەتاڵی مەی و لەوێ بیری کردۆتەوە و فەلسەفەییێکی



تازەی بۆ هاتووە، کە لە کووپەکە دەرکەوتووە لە ناو خەڵکی جاڕی داوە. دیلان لە کووپەییێکی وا دەگەڕێ بۆ ئەوەی ڕێگەییێک بدۆزێتەوە بۆ چارەسەری مەینەتی کورد، بەڵام شاعیر هێشتا نەیدۆزیوەتەوە.

ئینجا دیلان دەڵێ:

ئەی داری مەمک پڕ لە شیلەی ئاڵ
کۆرپەی مێشکی برسی شیری تاڵ
گرۆزە بۆ یەک مژ و یەک دڵۆپ
بۆ شەوی خەیاڵ ببێ بەگڵۆپ
ڕۆشن کا دنیای هەستی من هەروەک
چرایە بۆ ناو بیرێکی نووتەک
ئای کێ بێ بانگ و هاوار و پەیام
بگەیێنێتە گوێی گۆڕی خەیام
بڵێ هەی سەرشێت کوشتەی گڕی تەڕ
گەر تێتا ماوە یەک تۆز نرخ و فەڕ
تۆ لەسەر باکەی شووشەکەی شکان
لەگەڵ خوددا کردت بەزۆران
هەڵسە بەرەو ئەم ناوە هەڵتووتێ
نەک شووشە شکا وا ڕەز ئەسووتێ

شاعیر لە داری مێو دەپرسێ، مەمکی پڕە لە شیلەی تاڵ، ئارەزوو دەکا هەندێکی پێشکێش بکا، بۆ ئەوەی سەرخۆش بێ و هەموو شتێکی لە بیر بچێتەوە، بەڵام کوا ئەو شەرابە! ئینجا دەقیژێنێ و بەدەنگی بەرز دەڵێ کێ بێ بگاتە لای گۆڕی عومەر خەیام لە شاری نیشابوور و پێی بڵێ: سەرشێتی بێهۆش، تۆ لەگەڵ کردگار کردت بەهەرا لەبەرئەوەی شووشەی شەرابەکەی شکاندی، هەڵسە وەرە ئەم ناوە، شەرم لە خۆت بکە تەنیا شووشە نەشکاوە، ڕەز دەسووتێ. عەبدولکەریم قاسم بەفرۆکەی ڕووس و ئینگلیز و فرەنسی و ئەمەریکی کوردستان دەسووتێنێ و لە ناوی دەبا.

دیلان بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

سروشت بەپێچە خوار و چەپ گەردە
لە جێیێ ئاو بێ ڕەقەن و بەردە
لە جێیێ زەوی نەرم و هەڵۆڵ بێ
ئەبێ خورەی ئاو تۆزێ دەهۆڵ بێ
ئەگینا شەراب لە مامۆستای ماف
بۆ ئەگەیشتە ئەوپەڕ قولەی قاف
قاتی شەرابە گیانی ئەفلاتوون
سەر دەرکە هەتا نەبووی بەمەیموون
بەرەو مەڵبەنی کوردستان ڕەوتێ
نەک کووپە شکا وا ڕەز ئەسووتێ

کێشەی کورد پڕ لە تەنگوچەڵەمەیە، دەردێکە دەرمانی نییە، تیۆری ئەگەر هەبێ بۆ مەسەلەی کورد ناخرێتە پراکتیکەوە، ئەگەر نا لەبەرچی شەرابەکە گەیشتە قولەی قاف و ئەفلاتوونیش هیچی بۆ نەکرا. ئینجا گفتوگۆ لەگەڵ گیانی فەیلەسووف دەکا و پێی دەڵێ: سەر دەرکە بۆ ئەوەی نەبی بەمەیموون، وەکو خەیام وەرە بۆ کوردستان و بەچاوی خۆت ببینە تەنیا کووپەکەت نەشکاوە، ڕەز سووتاوە.

**برسیمە**

لە ساڵی ١٩٦٩ دیلان کارگێڕی نامەخانەی گشتیی شاری سلێمانی بوو. بۆ مەبەستی ڕێکخستنی نامەخانەی قوتابخانەکان کۆبوونەوەییێک بەسەرۆکایەتی دیلان لە قوتابخانەی ناوەندی کچاندا کرا بوو. لە پاش کۆبوونەوە مامۆستا ژنەکانی قوتابخانە میوانداری دیلانیان کردبوو. شاعیر لیریکێکی بۆ خواردنە خۆشەکان و لەشولاری مامۆستا ژنە جوانەکان هۆنیبووەوە:

برسیمە من! دەکوڵمت بێنە وەکو تەماتە
با قاشیکەم بەتیغی دانی وەکو سمارتە
لا مل لە دەم نزیکخە بۆ ماچی لێوی زبرم
توێژاڵ کرینە هەروەک چەقۆ بۆ سەر پەتاتە
ئای چەندە سوور و سوێرە دڵۆپی ئەشکی دیدە
وەک گۆشتی ناو قەزاقە کەچی لە ئێمە قاتە



بەرۆژ مەمک ئەبینم شەو گیپەیە لە خەوما
بەیانی دەستەوئەژنۆ درۆ هەمووی هەلاتە
کراسی کورت لەبەردا دوو ڕانی گردی تێدا
سپی هەروەک پلاوی مەولوود بەسوور و ساتە
پووز چی بلێم خڕ و پڕ پتەو بەزەرد و زۆڵی
وەک کفتە سەر شکێنە بەئەرک و شاتە شاتە
قوربانی ئەو دەمەت بم بچووک و ئاڵە هەرگیز
مزر وەکو هەڵووژە شیرین ئەڵێی نەباتە
حەیرانی باغی سینەم پڕ بۆن و پڕ بەرامە
وەک شیلەیی مورەببای بەهێیە یا کەباتە
بۆ نالەبار بەجێی لەوەڕ لە هەردوو جێدا
بۆ ئێمەش ئاو لە دەم چووت لە ڕێگایی نەهاتە

لەم وەسفە جوانەدا تارمایی کۆمیدیاییێکی نەرم و ناسک بەرچاو دەکەوێ. دیلان لەو لیریکەدا بەراووردێک دەسازێنێ لە نێوان هەندێ لە ئەندامە جوانەکانی لەشولاری ئەو مامۆستا ژنانە و خواردەمەنییەکان لە چێشت و میوە و شیرینی. بەو هۆیەوە پێویستە ئەوە بزانرێ دیلان کەسێکی نەوسن بوو، حەزی لە خواردنی خۆش دەکرد. لەسەر ئەو باوەڕە بوو خۆشی لە ژیاندا لەوەدایە پیاو خواردەمەنی خۆش بخوا و ژنی جوان ببینێ. بۆ ئەو لەو میواندارییەدا ئەگەر یەکەمیان دەست کەوتبێ دووەمیانی بۆ نەبووە، چونکە بۆی نەکراوە ئەوەی جوانە لەو ژنانە ماچیان بکا.

**شیوەن**

دیلان شیعرێکی لە ساڵی ١٩٧٧ بۆ هەموو شەهیدانی کوردستان وتووە:

ئەو گوڵانەی دەشت و کێوانە بەرەو سامانی دڵ
ڕەنگی ئاڵی هەڵمژیوە سەر هەتا دامانی دڵ
ئەرخەوان سوورە شەرابی کۆنی خوێنی چێشتووە
بۆیە یاقووتە هەموو بەردێکی گۆڕستانی دڵ
هێندە تفتە کامی لێوی نەوشکۆفەی غونچەیی
بۆیە سوێرە ئەشکی چاوی بێ پەیی گریانی دڵ

دەک نمەکگیر بی بەهار وەک ئەو گوڵەت زوو هەڵوەران
خۆت لەبەر پێدا بنێژە کوشتنە دەرمانی دڵ
مەی مەزەی برژاوە برژانە هەمیشە کاری ئەو
بۆ چرووکی مەست ئەکا هەرگیز جزەی بۆرانی دڵ

دیلان لەم شیعرەدا دیمەنی بەهاری بۆ دڵتەنگی و ناسۆری دەروونی بەکارهێناوە. بە بینینێکی هونەری ورد خوێنی شەهیدانی کوردستانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. هەموو گوڵە سوورەکانی بەو خوێنانە ئاودراون، بەردی یاقووتی ڕەنگیان لەو وەرگرتووە. ئەم لیریکەی دیلان شایانی ئەوەیە لە ژێر پەیکەری ڕەمزی شەهیدانی کورد تۆمار بکرێ یا لە ژێر ئاگردانی هاڵاوی سەربازی نەناسراوی کورد بنووسرێ.

**درەخت**

دار بەڕوو کۆنترین و دێرینترین درەختێکە لەو خاکەی ئێستا کوردستانی پێ دەڵێن ڕواوە. تۆفیق وەهبی بەدارێکی پیرۆزی داناوە، چونکە یەکەمین ڕووەکە لەسەر ئەم خاکەدا شین بووە. دیلان لە شیعرێکیدا لە ساڵی **١٩٦٢** لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی **١٩٦١** وتوویەتی، بەم جۆرە دەستی پێ دەکا:

دار بەڕوو
گەڵای ئەستوور
لقی دوایی ئەبێ بەموور
ئەیپەڕێنن
ئەیشکێنن
شەتەک ئەدرێ
ئەیجەڕێنن
ئەیکەن بەبار
ئەیهێنن بۆ بازاڕی شار
ئەیفرۆشن
بەوەی بۆ ماڵ بەپەرۆشن
ئەیسووتێنن
نانی پێ هەڵئەبرژێنن



ئەیکەنەوە بەگڕی سوور
ئەیکەن بەچاووگ بۆ تەنوور

لەم دێڕانەدا دیلان وەکو خەڵکی دیکە سەرپێیی تەماشای ئەم درەختە دەکا. بۆ ژیانی ڕۆژانە کەڵکی هەیە، بۆ گەرمایی و نان کردن و چێشت لێنان سەرچاوەییێکی گرنگە. تەنووری ماڵی کوردەواری بەبێ دار نابێ، بەڵام دار بەڕوو لەمە گەورەترە، بەشان و شکۆترە، پیرۆزترە، شاعیر دەڵێ:

بەڵام ئێستا
ئەی کتێبەکەی ئاڤێستا
سێبەری تۆ
ئاخۆ ئاخۆ
بۆ چەن بریندار دەرمانە
پەنای چەندەها خێزانە
بەڵام ئێستا
ئەی کتێبەکەی ئاڤێستا
سێبەری تۆ
لەم پەڕ ئەو پەڕ پێیا برۆ
لەو شاخانە
لەو ملە و لووتکە بەرزانە
سێبەری خەست
جێگەی دوانە بۆ مەبەست

لێرەدا شاعیر دار بەڕوو لەبەر ڕۆشنایی تیۆرییەکەی تۆفیق وەهبی تەماشا دەکا. بووە بەڕەمزێک وەکو کتێبەکەی ئاڤێستا، بەڵکو لەویش کۆنترە. ئەوەی لەو کتێبەدا نووسراوە دەستوورێکە لە هەموو سەردەم و کاتێکدا دەبێ بەرێ پیشاندەر بۆ ئەو قارەمانانەی خەریکی خەباتن لە پێناوی هێنانە دی ئامانجی بزووتنەوەی ڕزگاری کوردستان. ڕێ پیشاندەرێکە بۆ ئەوانەی خەریکی خەباتی چەکدارین لە ناو دارستان و لووتکەی بەرزی شاخەکاندا. شیعرێکی سیمبۆلییە لە ساڵی **١٩٦٢** بۆ کوردستان و دەستدرێژی و دیکتاتۆرییەتی عەبدولکەریم قاسم لە دژی کورد وتراوە.

## تەپڵ

«تەپڵ» ناوی شیعرێکە دیلان لە ساڵی ١٩٥٧ هۆنیویەتییەوە. ئەگەر لایەنی جوانکاری و هونەری لەم شیعرەدا ڕەچاو بکرێ و شێوازی سیمبۆلی و ڕۆمانتیکی بخرێتە سەری دەبێ بەداهێنانێکی بەرز لە ئەدەبی کوردی نوێدا، نموونەی وا کەم دەکەوێتە بەرچاو. دیلان ئەم شیعرە باڵایەی بۆ ئەوە داناوە باس لە گواستنەوەی بیری (ئیدیۆلۆجی) خۆی بکا، دان بەوە دادەنێ لە فیکری ئەنتەرناسیۆنالیزمییەوە دەرباز بووە بۆ ناسیۆنالیزم (کوردایەتی). ئەمە ئەوە ناگەیەنی وازی لە یەکەمیان هێناوە، بەڵکو دووەمیانی کردووە بەیەکەم، واتە لە پێش هەموو شتێکدا مەسەلەی نیشتمانی کورد و کوردستان.

دیلان لە لیریکی «تەپڵ»دا دەڵێ:

کام گێژە کەوتوومە ناوی
بۆ کام گێژە مەلەی سستم!
پەلەی باڵی لە گۆ کەوتووم
کام چڵە کەوتۆتە مستم!
بۆچی بوو هەڵپەی جارانم
بۆ کوێ بوو بازرەقەی بەستم!
بۆ کام ڕیسی بەخوری بوو!
هەڵم تەکان شان و باڵم
بۆ کام نیوەڕۆی ڕووناک بوو
بێداری شەوگاری تاڵم
یا بۆ کام هەنگاوی دوور بوو
تەووژمی ئاواتی کاڵم
وام پێ ئەڵێ وای ئەژەنێ
تەپڵی ئەو تەشیەی ڕستم
خڕ بیژەنە دنیا کپە
ماوە تەخت و فراوانە
بشێرێنە نەک بەچپە
کوتەک بۆ سەری تاوانە!



تاوانم کرد نرا پێما
مۆری ئەو جووتە چاوانە
هەرچیم هەیە لێم وەرگرە
لەشم ناوم جوولەم تینم
بیگروو پێستی ئەندامم
بیکە بە بەیداغی ژینم
بەرەڵڵای کە هەوری توانج
بۆ ئەستێرەی بەختی شینم
بەڵام شتێ لە مۆخمایە
ئەتۆم نایهێننە دەرێ
هیچ دەسەڵاتێ ناتوانێ
پەنا و زەفەری پێبەرێ
ئەزانی چی! ئەمن کوردم
گەڵای کوردانەم ناوەرێ
دەبیژەنە دنیا کپە
دڵ لە تووێی ئاراما خپە

دیلان ئەوە دەردەبڕێ بۆ ماوەیێک خۆی لە گێژاوی ڕێ بزرکردندا دیوە، پڕوپاگەندەی کردووە، تەپڵی بۆ مەبەستێک لێداوە، مەبەسێکی گرنگتر لە ناوەوە بووە. پووزشت دەخوازێ، داوای لێبووردن دەکا. ئەوە دەردەبڕێ، هەرچی بووە و چۆن بووە و چۆن نەبووە گرنگ نییە. لەوە پاش تەنیا یەک شت لە مێشکیدا ماوە، هێزی ئەتۆم نایهێنێتە دەرێ، هیچ کردارێک کپی ناکا، ئەویش ئەوەیە کوردە و گەڵای ئەو کوردایەتییە هەتا هەتایە ناوەرێ.

## پاییزی جاران

دیلان شیعری «پاییزی جاران»ی لە ساڵی ١٩٦٨ نووسیوە بۆ ئەو درز و دووبەرەکییەی کەوتە ناو شۆڕشی کوردستانی عیراقەوە لە ساڵی ١٩٦٤، لە پێشانا فیکری و تیۆری و لەسەرخۆ بوو. لە پاشانا شەرەنگێزانە گۆڕانی بەسەردا هات، هەردوو بەرە بوون بەدوژمنی یەکتری و کەوتنە شەڕی چەکداری و خوێنڕشتن.

دیلان شیعرەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

شەوی جاران شەوگاری پاییزی درێژ
تا سوورایی ئەپەڕیە چاوی گێژ و وێژ
ئەم وولاتە پڕ لە پیت و پڕ سامانە
جێگای فەڕ بوو پڕ بوو لە شەقڵی پیاوانە
ئەوا دیسان پاییز هات گەڵاڕێزانە
هەوری پەڵە ڕووەو شاخ و بەرەو کوێستانە
بەڵام ئێستا و شەوی ئێستا چۆن بەجۆش کەم
گڕی کۆڕی ساردەوە بوو بەچی خۆش کەم
شەوگاری تاریک و نووتەک چۆن ڕۆشن کەم
ئەم سەرە گێژ و شێواوە چۆن هۆشن کەم
ئەی هەورەکە دایرێژە سەری تشرینە
وادەی پەڵە و ناشتنی تەرمی هاوینە
نۆرەی تۆیە بگری بەسەر هەمووما نا
بەسەر ئێسک و پرووسکی ڕابردوومانا
بیشۆرەوە با سەر لە دەسی دیاری بێ
با قوڕ خەست بێ بۆ سەری شەرمەزاری بێ

دیلان ژیرانە پاییز دەکاتە ڕەمزی خۆشی و ناخۆشی. شەوانی پاییزی درێژ هەنگامی دڵداری بوو. شەوی یەڵدا لە پاییزدا بەڵگەی دەست لە مل یەکتری کردنی دڵدار و دلبەران بوو. شەوی درێژ ماوەی گێڕانەوەی بەسەرهاتی نەتەوە بوو. ئەمە لایەنە جوانەکەی پاییز، لایەنە ناخۆش و ناشیرینەکەی، گەڵاڕێزانە ڕەمزی مردن و لەناوچوونە. شاعیر لە هەوری پەڵە داوا دەکا بەسەر هەموو کوردێکی کە ماوە ببارێنێ، هەروەها گوزەر کاتە شوێنی ئێسک و پریسکی هەموو ئەوانەی نەماون، بۆ ئەوەی ئەوانەی دووبەرەکییان نایەوە لە ناو شۆڕشی کوردی عیراق (١٩٦١ – ١٩٧٠) شەرمەزار بن. هەردوو لا هیچ بەڵگەیێکی مێژوویی و لۆجیکییان بەدەستەوە نەبوو ببێتە هۆی نانەوەی دووبەرەکی.

***



محەمەد ساڵح دیلان یەکێکە لە شاعیرە مەزن و بەدیمەنەکانی سەدەی بیستەم لە کوردستانا. خاوەنی شێوازی خۆیەتی، قوتابخانەییێکی سەربەخۆیە، بەگشتی شیعری دەچێتە ناو خانەی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی قانگ دراو بەسیمبۆلیزم و ڕۆمانتیزم. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ لە شیعری داخراو و تەموموژاوی بن. فەرهەنگی زمانی شیعری دەوڵەمەندە، زۆر جار وشەی قورس و کەم بەکارهێنراو دەخاتە ناو شیعرییەوە، ئەمە زیاتر تەماوی دەکا و وەک تەلیسمێک دەکەوێتە بەرچاو، پسپۆرێکی شارەزا نەبێ ناتوانێ لە مەبەسی شاعیر بگا، مەگەر خۆی مانای ئەو شیعرانە بۆ خوێنەر لێک بداتەوە.

لە بەرهەمی دیلاندا هەرسێ قۆناغی شیعری عەرووزی و شیعری کێشی سیلابی خۆماڵی و شیعری نوێ (ڕۆمانتیکی) کۆبوونەتەوە. هەموویانی تاقی کردۆتەوە و داهێنانی هونەری و جوانکاری تیایاندا بەرچاوە. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دیلان ئیلهامی لە سۆز و ترپەی دڵ و هەست و نەستی ناوەوەی دەروونی خۆی وەرگرتووە. ژنی پەرستووە لە ناو سروشتدا تواندوویەتیەوە، ئینجا بۆ مەسەلەی ڕزگاری نەتەوەی کورد دەرباز بووە. ئەمەیان بووە بەمەسەلەی سەرەکی لە لای. لە پاشانا ئاسۆی خەیاڵی فراوانتر بووە تا هەموو گێتیی گرتۆتەوە، لەگەڵ هەموو هەژار و بێ نەوا و بێ دەسەڵاتان بووە. هیوا و ئامانجی ڕەشی ئەفەریقا و زەردی ئاسیای لە شیعریدا دەور کردۆتەوە. لە ئەنجامدا لەبەرئەوەی نەتەوەی کوردی خۆی لە هەموو کەسێکی دیکەی سەر ڕووی زەوی بەدبەختتر بووە، لە هەموویان زیاتر خۆشی ویستووە و یادی کردۆتەوە.

# بەشی سی و نۆیەم

## هێدی

**١٩٢٧ - ٠٠٠٠**

### ژیانی

خالید کوڕی حەمەد ئاغای موکری لە ساڵی ١٩٢٧ لە گوندی شێخاڵی لە نێوان مەهاباد و بۆکان لە دایک بووە. لەقەبی بنەماڵەی «حیسامی»یە، لە عەشرەتی دیبۆکرین. ناوی «هێدی» وەک نازناوی شیعری بۆ خۆی هەڵبژاردووە، لە ناو خەڵکی بەخالیدی حیسامی ناوبانگی دەرکردووە. سەرەتای خوێندنی لە گوندی خۆیان لای مامۆستای تایبەتی بووە. دەوڵەمەندی بنەماڵەی بۆتە هۆی ئەوەی هیچ جۆرە کارێک نەکا بۆ بەڕێوەبردنی خۆی، لە ڕووی ئابوورییەوە. لە ساڵی ١٩٤١ کە کۆمەڵەی «ژ. ک.» دامەزراوە لێی نزیک کەوتۆتەوە. هەر لەو ساڵەدا سوپای سووری ڕووسیا (سۆڤیەتی کۆن) بەهۆی جەنگی دووەمی گێتییەوە هاتۆتە ناو ئازربێجان و کوردستانی ئێرانەوە. لە ڕێگەی باوکیەوە لە سیاسەت نزیک بووە، بەشداری لە ڕووداوەکاندا کردووە تا ڕووخانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٦، بەڵام لە ئەنجامی ئەم کارەساتە بنەماڵەی هێدی زیانی لێ نەکەوتووە. دووجار هەوڵ دراوە بگیرێ، خۆی بەجێ گۆڕین و چوونە ناو شاخ ڕزگار کردووە.

لە ساڵی ١٩٤٥ بۆ یەکەمین جار لە مەهاباد مەلا مستەفا بارزانی ناسیوە و ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا کردووە، ئەمە بووە بەسەرەتای سۆزی کەسێتی تا ئێستا هێدی ئەو سۆزەی پاراستووە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەکوڵتر بووە بەرامبەر ئەم بنەماڵەیە.

لە ماوەی پەنجاکانی سەدەی بیستەم لە مەڵبەندی خۆی مەهاباد بووە، هاتوچۆی تەورێزی کردووە، دوور و نزیک ئاگاداری بزووتنەوەی چەکداری نهێنی کوردستانی ئێران بووە. لە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کوردستانی عیراق هێدی چۆتە ناو شۆڕشەوە بۆ دووەمین جار چاوی بە بارزانی کەوتۆتەوە لە دوای بینینەکەی ساڵی ١٩٤٥ لە مەهاباد. لەسەر دەستی ئەو بووە بەخەباتگێڕی چەکدار لە ناو شۆڕشدا. ماوەیێک لە ڕانیە و سەنگەسەر و قەڵادزە ژیانی پێشمەرگەیی بردۆتە سەر.



لە ماوەی گفتوگۆکەی نێوان شۆڕشی کورد و دەسەڵاتی عەبدولڕەحمان عارف لە بەغدا، هێدی لە لایەن شۆڕشەوە کراوە بەقایمەقامی قەڵادزە، لە پاشانا گواستراوەتەوە ڕانیە، ماوەیێکیش لە ڕادیۆی «دەنگی کوردستانی عیراق»دا کاری کردووە. لە دوای وەستانی ڕادیۆ گواستراوەتەوە ناوچەی باڵەک، چاپخانەی شۆڕشی لێ بووە و کاری لە چاپکردنی ڕۆژنامەی خەباتدا کردووە.

لە دوای بەیانی ١١ی مارتی ١٩٧٠ گەشتی بەغدای بووە، دوکتۆر حەسەن حیسامی برای لە ئەڵمانیا دەژیا هاتبووە بەغدا و پێکەوە چووبوونەوە ئەڵمانیا. گەشتەکەی هێدی زیاتر لە دوو مانگی خایاندبوو، لەوێوە ڕووی کردبووە سوید، لە پاشانا گەڕابووەوە کوردستان.

لەگەڵ کۆتایی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ لە بەهاری ساڵی ١٩٧٥ هێدی گەڕابووەوە ئێران، ماوەیێک ئاسوودە بوو. پێشنیازی بۆ کرا بوو لە ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆنی بەشی کوردی تاران کار بکا. بەینێک کاری کردووە و لە پاشانا بەجێی هێشتووە. لەو ماوەیەدا پێوەندی لەگەڵ بارزانییان بووە لە ئێران تا ڕاپەڕینی ١٩٩١ و لەگەڵ ئەوانا گەڕاوەتەوە کوردستانی عیراق. لەو کاتەوە تا ئێستا لە شاری هەولێر نیشتەجێ بووە و خەریکی هۆنینەوەی شیعر و خوێندنەوەی چاپەمەنی و نووسینی یادداشتەکانیەتی.

### شیعری

هێدی لە سەرەتای ژیانیدا ئەوەندەی خوێندووە فێری خوێندن و نووسین ببێ و خوێندەواری لێ بکەوێتەوە. نەیویستووە ببێ بەمەلا و پێی بژی. لە ماڵی باوکی کە ژیانی باشی بۆ مەیسەر بووە هەوڵی داوە بەکۆششی خۆی لە ڕووی خوێندەوارییەوە خۆی پێ بگەیەنی. کاری سیاسی و پارتیبایەتی و خەباتی نهێنی و نیوە نهێنی لە کوردستانی ئێران و عیراق یارمەتی داوە وەک خوێندەوارێک پێ بگا و بەهرەی شیعری بیکا بەشاعیر.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

هێدی شیعری بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی وتووە. لە بەحری عەرووزیدا تەنیا کێشەکانی هەزەج و ڕەمەل و موزاریعی بەکارهێناوە. دەنگەکانی قافیە و وشەکانی پاش قافیەی کەمە چونکە شیعری لەم جۆرەی زۆر نییە. لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی ئەم تیپانەی بەکارهێناوە: ا س م ن (ە - ـە) ۆ ی ێ. لە پاش قافیەشدا ئەم

وشە و ڕستانەی بەکارهێناوە: تۆ، نەدەبوو، نەبێ، دێ، دەکەم، هەیە، بڵێ چی، دەبێ، دەبوو، هێمنە، بوو، بڵێ، دەچێ، بەسەری تۆ، هەیە.

شیعرە عەروزییەکانی بەگشتی بریتین لە پارچەی بچووکی غەزەل (لیریک) لە هۆنینەوەیاندا یەکێتیی قافیەی بەکارهێناوە. لە هونەری شیعرییەکانی دیکە قەسیدەی پێنجین (ا ا ا ا ب) و قەسیدەی شەشینی هەیە (ا ا ا ا ب ب). کۆمەڵێک چوارینی کلاسیکیشی داناوە. شیعرە میللییەکانی زۆربەیان لەسەر کێشی دە بڕگەیی و هەشت بڕگەیین و قافیەیان مەسنەوییە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شیعری هێدی لە دەوروبەری دوو مەبەسە سەرەکییەکەی شیعری کوردی ئەو سەردەمە دەسووڕێتەوە، دڵداری و کوردایەتی، ئەمانەی تا پلەیێک تێکەڵ بەیەکتری نەکردووە. لە وەسفدا داهێنانی هەیە. لە شانازی و ستایش و پێداهەڵداندا شیعری کەم نییە، بەشی زۆری ئەم جۆرە شیعرەی بۆ مستەفا بارزانی وتووە وەک خەباتگێڕێکی بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد. دەتوانرێ بەڕاستی بەشاعیری بنەماڵەی بارزانی بژمێررێ. بەم جۆرە کەمتر ستایشی چەکدار و شۆڕشگێڕانی بزووتنەوەی کوردی کوردستانی ئێران و عیراقی کردووە. جگە لەمە ستایشی هەندێ لە شاعیرانی کوردی هەیە، وەکو: خانی، حاجی، قانیع، بێکەس، گۆران، هێمن، جیگەرخوێن.

لە ناو شیعرە میللییەکانیدا کۆمەڵێک چیرۆکی شیعری (پۆیێم) بەرچاو دەکەون، لەوانە:

١- خدرە شێت: لە زیاتر لە سەد دێڕە شیعر پێکهاتووە، لە بەیت و باڵۆرەی ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) دەکا. باس لە گێلە پیاوێک دەکا هەرچی ڕەوشتی شێتی هەیە لەگەڵی دەکەن کەچی تووڕە نابێ و هەر پێدەکەنێ، وەکو بڵێی شاعیر دەیەوێ ئەوە دەربخا شێتی وا ڕەمزی ئاسوودەیییە.

٢- نامەیێک بۆ کاوە: لە هەشتا دێڕە شیعر زیاترە. بەیتێکە هێدی لە ساڵی ١٩٧٩ لە دوای کوودیتا ئیسلامییەکەی خومەینی دایناوە بە ناوی «کاوە»وە. ئەمە منداڵێکی خزمی شاعیرە، لە شیعرەکەدا ئامۆژگاری دەکا، ئەوە دێنێتەوە یادی کە بە ناوی کەسێکی گەورە کراوە، کاوەی ئاسنگەر، هەروەها کوردایەتی دەکا و یادی ماد و میدیا دەکاتەوە وەک باپیرانی دێرینی کورد.



٣- چیرۆکی خۆش: لە زیاتر لە دووسەد دێڕە شیعر پێکهاتووە. لە ساڵی ١٩٩٤ لە هەولێر هۆنیویەتییەوە. بە حیکایەت هەڵگیرسان و ڕووداوەکانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کوردستانی عیراق دەگێڕێتەوە.

## نموونەی شیعری

### دڵداری

١

لە شیعرێکیدا بەناوی «ئاوات»ەوە لە شاری ورمێ لە ساڵی ١٩٨٦ دایناوە دەڵێ:

ناسرەون هەست و خەیاڵ خۆزگە من دێوانە بام
خۆزگە دەست و پێم لە ناو زنجیری بایە و وا نەبام
زوڵفی سەرشانت عەزیزم کاتێ هاتی شانەکەی
من گوتم سەد خۆزگە دەنکی شانە بام و شا نەبام
کەس وەک ئاوێنە بە ووردی ناژمێرێ خاڵی ڕووت
بۆیە ئاواتم بوو ئەو ئاوێنە بەسەزمانە بام
شەو جەق و جۆی جووتێ بەی وام دەگرێ ڕۆژێ ڕەنگە من
وا نەلەرزی بام لەسەر سینگی ئەگەر لەرزانە بام
نابێ ڕزگارم لە دانەی خاڵ و داوی کەزیەکەی
من کە دەمویست قەت لە گیری داو و دانەدا نەبام
زەردە خەندەی لێوەکانت هەر هەناسێکی دەوێ
ئەو تەلیسمەم پێ نەدەشکا من کە وەک شەوبا نەبام
تا پەرەنگ و پیاڵە وا لاجانگ و لێوت ماچ دەکەن
من دەڵێم قەیدی چبوو خوایە یەکێ لەو دووانە بام
کێ هەبوو وەک شەم بسووتێ بۆ منی شەیدا ئەگەر
خۆم لە دەوری وی وەکو پەروانە بێ پەروا نەبام
شەو بوو ئەو بوو مەی بوو بسکی باوەشێنی ڕووی دەکرد
هەر منی بێچارە لەو ناوە دەبوو بێگانە بام

خۆزگە بۆ ئەو پێنج و دوو ڕۆژەی ژیانی خۆم منیش
هەروەکو (هێدی) مەلی تۆفانی بێ هێلانە بام
ماڵ و سەر ویستم بەجارێ وا فیدای تۆ کەم وەتەن
ئەورۆ چیرۆک بێ لە ناو گەلدا سبەی ئەفسانە بام

ئەم شیعرەی هێدی لە قاڵبی غەزەلی کلاسیکی نەچۆتە دەرەوە، بەڵام هەندێ وێنەی ڕەوانبێژی کلاسیکی جوانی تێدایە، لە غەزەلە لاساییەکان جیای دەکاتەوە. شاعیر ئەوە دەردەبڕێ دەنکی شانە بێ لە لای خۆشترە لەوەی شاهنشا بێ، چونکە شانە پرچی دلبەر شانە دەکا. هەروەها ئاوێنە بوایە بۆ ئەوەی خاڵەکانی ڕوومەتی بژماردایە. وێنەی جوانی دیکەش لەم شیعرەدا دەست دەکەوێ.

٢

لە غەزەلێکی دیکەیدا بەناوی «گۆوەند»ەوە لە کەرەجی ئێران لە ساڵی **١٩٨٦** هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

ئەو دەم کە ئەتۆ دوگمە بەرۆکت دەترازێ
سەیری دڵی دێوانە کە چم لێ دەخوازێ
خۆی دی لەبەر ئاوێنە بزەی هاتێ کە یانی
گوڵ بەو دوو گەڵا سیسەوە با هێندە نەنازێ
کەس نەیدی لە تۆ هاتن و ڕۆیشتنی بێ ناز
چبکەم لە ڕوانینی تۆپێک نایە نیازێ
من چم کەمە لەو شەمعە کە شەوگاری جودایی
ڕووناکییە بۆ کۆڕ و بەسووتانێ دەسازێ
نە ئەتۆ چت کەمە لە جوانی نە گەنجی مەحموود
حەوجێ بوو بەژیری و دەم و ڕاوێژی ئەیازێ
دنیایەکە سەرلەنوێ بەبووک بەرنەوە تازە
هەر مەگێرانی دەکا و شیرنی وەک تۆ نازێ
من باڵی هومای تۆم بەسە بۆ بەختەوەری سەر
وەک لووتکە چیا نابەمە بەر شاپەڕی بازێ



تۆ دێی و سەما دێن ووشە لەو ناوەکە ئاوا
ئاوێتە دەبن بەستە لە من ناڵە لە سازێ
ڕیسوا دەبێ بەو نامەیە مەیخوێنەوە (هێدی)
هەر بەیتێ دەنا هەڵدەگرێ پەردە لە ڕازێ

لەو شیعرەدا هێدی باس لە هەندێ بزووتنەوە و ئاوڕدانەوەی پڕ لە ڕاز و نیازی دلبەر دەکا. وێنەی شیعری زۆرە لەوانەی شاعیرانی کلاسیکی دایانهێناوە و بوون بەنموونەی قسەی جوان، یەکێ لەوانەی ناو ئەم شیعرە ئەوەیە، شاعیر لەگەڵ دلبەر دەدوێ و پێی دەڵێ: ئەوەندە جوانی پێویستیت بەجوانی دیکە نییە، خەزێنەی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی ئەوەندە پڕە پێویستی بەزێڕی دیکە نییە، ئەگەر سوڵتان پێویستی بەهەیاسی خاس بێ، تۆ پێویستیت بەڕاوێژکار نییە.

٣

لە وەسفی مەمکی دلبەر لە چوارینێکیدا لە هەولێر لە ساڵی **١٩٩٥** دایناوە، دەڵێ:

ئەوەی سەیرە نە نارنجن نە لیمۆ
لەوانیش خڕترن جووتە مەمی تۆ
کە نرخی وان کەسیش نەیزانێ چەندە
لە دەس منیان بنێ و ئیتر مەڵێ بۆ

بە دلبەر دەڵێ مەمکەکانت ئەوەندە جوانن کەس نازانێ نرخیان دیاری بکا، تەنیا من نەبم، تۆ بیانده دەست من، تەنیا من نرخیان دەزانم.

**کوردایەتی:**

١

لە شیعرێکیدا هێدی بەناوی «سروود»ەوە لە ساڵی **١٩٤٣** هۆنیویەتییەوە موناجات لەگەڵ نیشتماندا دەکا:

مەزرەعەی قەلبی مە ویشکە ئەی وەتەن کوا ئاوی تۆ!
بێ زەوادن ڕۆڵەکانت کوانی شەکری خاوی تۆ!
زەردە ڕەنگی غونچەکانت سێبەری زوڵم و جەفا
لادە بەو هاوینە کوانێ تیشک و تینی تاوی تۆ

بێ سروودی جاویدانی بولبولت بێ نەشئە بوون
دەستە دەستە لاوەکانت وەک گوڵی تێراوی تۆ
لێم دەپرسێ دڵ بەدایم بۆچی سەرگەردانی تۆ
ژەهری تاڵی چی دەچێژی هەرکە سەر شێواوی تۆ
دەردی دڵ ناکەم دەزانم دەردی بێ دەرمانی من
خەستەمە کەس بێ دەوای کا غەیری بەرزی ناوی تۆ
ئەی وەتەن کەنگێ ڕەوایە مەستی خەو بێ پاسەوان
گورگی دوژمن کەوتە کۆزی مێگەلی پاراوی تۆ
شەرتە هەر خاری دڵم بێ هەرچی عەیش و شادییە
تا لە دەس دەگرم وەنەوشە و سووسن و لاولاوی تۆ
دڵ ئەگەر بۆ تۆ بناڵێ چۆن ئەبێ ژێر بێتەوە
تا لە ژێر پێمدا دەبینێ دوژمنی خنکاوی تۆ
ئەی وەتەن گریانی تۆمە و بۆت دەڕێژم ئەشکی سوور
ئێشی تۆیە زامی جەرگ و شیوەنی شێواوی تۆ

لەم شیعرەدا هێدی سۆزی بەکوڵی دەردەبڕی بەرامبەر بەنیشتمان، ئەوەندەی خۆش دەوێ نایەوێ بەدڵ شکاوی چاوی پێی بکەوێ. پەنا بۆ سروشتی بەهار دەبا، دەیکا بەیەکێ لەو هۆیانەی نیشتمانی جوان کردووە، کە جوان بێ دەبێتە دلبەر، کە دلبەریش بێ لەو خۆشەویستتر لەسەر ڕووی زەوی نییە. شایانی ئەوەیە بەشادی بژی.

٢

لە شیعرێکیدا بەناوی «ئەشکەوتی خەزاڵێ» هێدی دەڵێ:

ڕێ سەرەوژوورە گەلێک بڕ ناکەم
بۆ ووچان جێیێک ئەبێ پەیدا کەم
لەسەر ئەشکەوتی خەزاڵیش تاوێ
با خەیاڵی سەرەڕۆ خۆی باوێ
سێبەری فێنکی هەیە بۆ ڕێبوار
وەکو یەک ڕادەگرێ پیادە و سوار



ماڵی بۆ دەربەدەران ئەنوایە
خانەخوێی دەربەدەر هەر وایە
زگی پڕ سووچ و کەلێن و قوژبن
سەر بەڵام پووچەک بێ نێو ئاخن
کەچی بەو حاڵەوە چی بێتە گوێ
ئەویش ئەیڵێتەوە بۆت سەرلەنوێ
هێشتە هەر ئەیڵێ کە عەولڵا ناسر
پێی لە خۆبوردنی نا ناو ئاگر
کاتێ وا دەستی لە ژینی خۆی شوت
چەند بەسەربەرزی دەمرد و دەیگوت
حەز دەکەن نەبنە مەکۆی داخ و دەرد
پشت مەبەستن بەهەڤاڵی نامەرد

ئەشکەوتی خەزاڵێ لە ئاوایی «ئەڵوەتان»ی ناوچەی سەردەشتە. لەو ناوەدا شەڕێک لە نێوان چەکدارانی شۆڕشی کوردستانی ئێران و سەربازی دەسەڵاتی شا ڕووی داوە. لەو شەڕەدا عەولڵا ناسڕی چەکداری شۆڕشگێڕ لەگەڵ هاوڕێییێکی لە سەنگەردا جەنگاون، لە ئەنجامدا هاوڕێکە لە ترسانا هەڵاتووە و خۆی شەهید کراوە. لەم شیعرەدا هێدی ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە.

٣

لە شیعرێکیدا بەناوی «نەورۆز»ەوە بۆ نەورۆزی ساڵی **١٩٦٦** لە گەلاڵەی کوردستانی عیراق دایناوە، بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

جێژنی کۆن و ساڵی تازەی کوردەواری هاتەوە
هاتەوە ئاگری خەباتی ئەو گەلە خۆش کاتەوە
هاتەوە جوانتر لە جاران جێژنی کاوەی قارەمان
شوێنەواری میدیا باپیرە گەورەی کوردەکان
هاتەوە بگرێتە باوەش کوردەواری سەرلەبەر
هاتەوە نەورۆز و بۆ زستانە ئیتر چارەسەر

جێژنی نەورۆزە وەتەن وا کاتی پیرۆزباییە
جێژنی لاو و کیژ و کاڵی تۆیە ڕۆژی شاییە
هەر هەڵاڵەی زەردە بۆنی دێ لە ڕێگەی دوورەوە
هەر چڵوکی دارەزەردەی دێ بەغونچەی سوورەوە

شاعیر لەم دێڕانەدا باس لەو جەژنە هەمیشەییە دەکا لە کۆنەوە بووە و لە دوارۆژیشدا هەر دەمێنێ، یادی کاوەی ئاسنگەر و شارستانییەتی میدیا دەکاتەوە، بەسەر سروشتی ڕەنگینی بەهاردا هەڵدەڵێ، چونکە لووتکە هەرە جوانەکەی لە ڕۆژانی جەژنی نەورۆزدا دەبێ.

بەم دێڕانە شاعیر کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

دڵ کە ڕۆژ و شەو دەسووتێ ئاگری تۆی تێبەر بووە
بۆیە پیاوانە لەگەڵتا مەرجی خوێنی بەستووە
باسی خوێنی پاکی تۆیە و شۆڕشی ڕزگارییە
یان بەسەربەستی ژیان یا مردنی یەکجارییە
گەر تۆ ئەورۆ نی لە نێومانا کوڕی دڵسۆزی تۆ
هەڵگری ئاڵای خەبات و شۆڕشی پیرۆزی تۆ
قارەمانی کوردی ئازا ماوە کاوەی بارزان
ئەو کوڕە کوردەی بناغەی دوژمنی تۆی هەڵوەشان
دڵنیا بە جێژنە پیرۆزەی دوای نەورۆزی من
جێژنی ئازادی گەلە و سەرکەوتنی پیرۆزی من

لە ساڵی ١٩٦٦ هێدی لە ناو شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کوردستانی عیراق بووە. لەو شیعرەدا لە نەورۆزی شۆڕش دەدوێ. شۆڕش ئەگەر بۆ ڕزگاری کورد بێ، نەورۆزیش ڕزگاری دەبێ، چونکە ڕۆژگارێکی دوورودرێژ نەورۆز قەدەغە بووە، لەبەرئەوەی میللەتەکەی دیل بووە. شاعیر ئومێدی بەسەرکەوتنی شۆڕش و ئازادبوونی نەورۆز هەیە، زیاتریش بەهۆی ئەوەی شۆڕشەکە لە ژێر چاودێری و فەرماندەی کاوەیێکی وەکو بارزانییە. لە دواییدا کورد سەردەکەوێ و نەورۆزیش پیرۆز دەبێ.



## ٤

لە ساڵی ١٩٩٤ کە کوردستانی عیراق لە ژێر کۆنترۆڵی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو شەڕ لە نێوان دوو هێزی سیاسیی چەکداری کورد هەڵگیرسا. بۆ ئەم ڕووداوە هێدی لە ١٠ی ئاغستۆسی ١٩٩٥دا چوارینێکی هۆنیوەتەوە:

ئەمن جاران لە دەس دوژمن دەناڵیم
چەکی دوژمن دەهات ئێسکی دەهاڕیم
بە دەستی کورد ئەوەی پێم دەکرێ ئەورۆ
ئەوەی دوێنێ لە دەستی دوژمنان دیم

شاعیر سەری سوڕماوە لەوەی ئەگەر دوژمن زۆری کردبێ لە دژی کورد ڕەنگە کارێکی ئەوەندە گران نەبووبێ چونکە دوژمنی بێگانە کردوویەتی، بەڵام ئەوەی کورد بەکوردی دەکا چی پێ دەووترێ!.

لە چوارینێکی دیکەیدا هێدی لە دوای نۆزدە ڕۆژ پاش چوارینەکەی پێشوو نووسیویەتییەوە (٢٩ی ئاغستۆسی ١٩٩٥) دەڵێ:

هێندی دیومە ڕۆژێ تورک و ڕۆژێ عارەب دەمکوژێ
ڕۆژێ فارس دێ بەفەتوای دین و مەزهەب دەمکوژێ
گەر لەسەر ئەو بستە خاکە هەرچی دێ پێم دادەدا
کوردەکەی خۆم چی دەوێ! ئەو بۆچی یارەب دەمکوژێ

لەم چوارینانەدا شاعیر ناوی ئەو دوژمنە یا دوژمنانە ئاشکرا دەکا، لە چوارینی پێشوودا ناویان هاتووە، ئەمانە تورک و عارەب و عەجەمن. شاعیر دەڵێ ئەمانە و خەڵکی دیکەش ئەوەی دێ لە کورد دەدا، ئەمە هەمووی ئەگەر ڕێی تێ بچێ، کورد لە کورد بدا ئەمەیان هەر نابێ!.

## ٥

لە شیعرێکیدا بەناوی «چلەی بارزانی» هێدی لە مانگی نیسانی ١٩٨٠ ماتەمنامەی بۆ مستەفا بارزانی نووسیوە:

کە هات هەواڵی جەرگ بڕ
باوک هۆشی بڕا لە کوڕ

خەفەت ئەباری لەو ناوە
باوکی کورد سەری ئەناوە
ئەو ڕۆژە باوکی خۆشەویست
سروێک ئەهات تۆ نەت ئەبیست
هەناسەی پێشمەرگەی تۆ بوو
ڕووحیان لەسەر گڵکۆی تۆ بوو
چل ڕۆژ تێپەڕی لەو کاتە
بەڵام کوردستان هەر ماتە
هەڵگورد و پێرس و مەتین
قەندیل و کوڕەک و سەفین
هەڤالانی بەوەفای خۆت
ئامێزیان ئاواڵەیە بۆت

***

تۆ بووی شانازی گەلی کورد
زۆر شانازیت لەگەڵ خۆت برد
کۆچت دەردێکی بەسۆ بوو
کوردستان حەوجێی بەتۆ بوو
گڵ تۆ لە دڵ دەرناهێنێ
خاکی کورد نۆ ناشەمزێنێ
دایک کوڕ لە باوەش ئەگرێ
سەد جاریش لەبەری ئەمرێ

ئەمە شیعرێکی پڕ لە سۆزی کەسایەتییە، پێش ئەوەی بۆ گەورەپیاوێک وترا بێ. بێ گومان هێدی هەردوو لایەنی بارزانی مەبەست بووە، بارزانی وەک خۆشەویستێک و وەک گەورەپیاوێک. لەم شیعرەدا هەندێ داهێنانی شاعیر لە بەرچاوە. بڕێکی لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەرگرتووە. وێنەی ڕەوانبێژی جوانیش لە دێڕی دواییدا خۆی دەنوێنێ: خاک کوردستانە و بارزانی کوڕیەتی، کۆچ کردووی گرتۆتە باوەشی.

***



خالیدی کوڕی حەمەد ئاغای موکری، ناسراو بەخالیدی حیسامی، نازناوی شیعری «هێدی»یە، لە پێشانا شاعیری کوردایەتی ئینجا شاعیری دڵداری و غەزەل. هێدی ئەوەندەی لە شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتیدا گەرمە ئەوەندە لە شیعری دڵداریدا ساردە، مەبەس لێرەدا سۆزە نەوەکو داهێنانی شیعری.

شاعیر بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی لە شیعریدا بەکارهێناوە، لە هەموو جۆرە قافیەکانی شیعری کلاسیکی و قافیەی مەسنەوی خۆماڵی هەیە. بەهۆی ئەوەی هەموو ژیانی لە ڕیزی ڕاپەڕین و هەڵسان و شۆڕش بردۆتە سەر. زۆربەی شیعری ڕەنگدانەوەی خەباتی میللەتی کوردە لە هەموو کوردستانەکاندا بەتایبەتی لە کوردستانی عیراقدا، چونکە ماوەیێکی زۆری ژیانی لەو خاکەدا بردۆتە سەر. دیارە بۆ هێدی و هەموو کوردێکیش هەموو جێیێکی کوردستان ماڵی خۆیانە.

# بەشی چلەم

## شکۆی حەسەن

**١٩٢٨ - ١٩٧٥**

### ژیانی

شکۆ کوڕی ئەحمەد کوڕی حەسەنی مدۆیە لە گوندی جامووشوانی بچووک لە ناوچەی ئاقبارانی ئەرمەنستان لە ساڵی ١٩٢٨ لە دایک بووە. ماڵی باوکی لە بنجدا لە گوندەکانی ناوچەی قارس لە کوردستانی عوسمانی ژیاون. شکۆ لە تەمەنی پێنج ساڵی بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە. سۆفی کوڕی حەسەنی مدۆی مامی گرتوویەتییە خۆی و بەخێوی کردووە. خوێندنی سەرەتایی بەچوار ساڵ لە گوندی خۆیان تەواوی کردووە. قۆناغی ناوەندی لە قوتابخانەی ئەلەگەزی کوردان گەیاندۆتە ئەنجام. لەگەڵ تەواوکردنی خوێندنی ناوەندی لە ساڵی ١٩٤٨ بووە بەقوتابی زانستگای یەریڤان لە بەشی ڕۆژهەڵاتناسیدا لە ساڵی ١٩٥٣ باوەڕنامەی ئەو دەسگا زانستییەی وەرگرتووە.

لە ساڵی ١٩٥٤ لە گوندی باگنار لە ناوچەی گاگرا (ئەبخازیای گورجستان) شکۆ بووە بەمامۆستا لە قوتابخانەی ئەو گوندەدا، وانەی زمان و ئەدەبی ئەرمەنی وتۆتەوە تا ساڵی ١٩٥٧ لەو کارەیدا ماوەتەوە. لە ساڵی ١٩٥٩ لە بەشی کوردی ڕادیۆی ئەرمەنستان لە شاری یەریڤان دامەزراوە، کاری نووسینەوە و وەرگێڕان و ئامادەکردنی بەرنامە ئەدەبییەکانی پێ سپێرراوە. لە ساڵی ١٩٦١ لە تاقیکردنەوەی تایبەتی سەردەکەوێ وەک قوتابی خوێندنی باڵا لە ئەکادیمیەی زانستی ئەرمەنستان وەردەگیرێ. بەمەبەسی تەواوکردنی خوێندن ڕوو دەکاتە شاری سانت پیترسبورگ (لینینگرادی ئەوسا) لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی، لە بەشی کوردناسیدا دادەمەزرێ. لە ساڵی ١٩٦٥ خوێندنی باڵا تەواو دەکا. لەم ماوەیەدا تووشی نەخۆشی گەدە دەبێ. ئازاری زۆر دەچێژێ و بێ ئارامی دەکا. بەدەم نەخۆشییەوە لە کار ناکەوێ تا دوایی ژیانی. لە ساڵی ١٩٧٥ کۆتایی بەژیانی دێ و کۆچی دوایی دەکا.



### شیعری

خەیاڵی شیعری لە لای شکۆ لە سەردەمی قوتابیەتیدا پشکووتووە. هەندێ شیعری لە ڕۆژنامەی زانستگای یەریڤان بڵاوکراوەتەوە. هەروەها ڕۆژنامەی «ریاتازە» مەیدانی مەشقی شکۆ بووە لە شیعر نووسیندا. لە پاشانا شیعرە بڵاوکراوەکان و شیعری تازەی دیکەی لە دیوانی تایبەتیدا بڵاوکردۆتەوە. لەوانە کۆمەڵێک شیعر بەناوی «قالچیچەک» (١٩٦١) و «تەمەبوورا کوردا» (١٩٦٥) و «مەرەمێ دلێ کورد» (١٩٧٠)ی بڵاوکردۆتەوە. بەشێک لەم بەرهەمانەی بەزمانی ڕووسی و گورجی و ئەرمەنی لە سانت پیترسبورگ و تفلیس و یەریڤان بڵاوکراونەتەوە.

### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری شکۆ لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی هۆنراونەتەوە، هەموو جۆرە کێشەکانی بەکارهێناوە بەتەواوی و بەکەرت کراوییەوە. لە ڕووی کەمی و زۆری برگەکان (تەفعیلەکان) شاعیر دێڕە شیعری زۆر کورت و زۆر درێژی هەیە، لەم لایەنەوە لە دابەشکردنی ئەو بیرانەی دەیانخاتە ناو شیعرییەوە سەرکەوتووە، بۆ بەڵگە دێڕە شیعری هەیە لە دوو برگە پێکهاتووە، دێڕی دیکەی بریتییە لە پازدە برگە.

شکۆ لە هەموو بابەتەکانی شیعری نوێکردنەوەیدا وشە و زاراوەی فەرهەنگی پێوە دیارە، ئەگەر شاعیرانی دیکەی ئەو وڵاتە نوێکردنەوەیان لە وشەی تازە بابەت بێ لە ئەنجامی دامەزراندنی کۆمەڵی سۆسیالیزم، نوێکردنەوەی شکۆ لە هەموو بەرهەمەکەیەتی بەگشتی واتە بەکارهێنانی ئەو وشانەی ڕۆشنبیر و خوێندەوار دەیکەنە کەرەستە بۆ بیروباوەڕ و بینینێکی لە مێشکێکی تەرکیبییەوە هەڵقوڵا بێ دوور لە بینینی ڕووکەشی شاعیری میللیی نەخوێندەوار. شاعیر ئەدگاری هەستی نەتەوەیی پاراستووە، بەڵام تێکەڵ بەبینینی هەستی شیعری ڕۆژئاوایی کردووە لە ڕێگەی ئەدەبی ڕووسییەوە، تا پلەیێکیش لە ڕێگەی ئەدەبی گورجی و ئەرمەنییەوە.

زۆربەی بەرهەمی شیعری دەچێتە ناو بابەتی لیریک و پۆیێم. لیریکەکانی لە ڕووی قەوارەوە ئاسایین، بەزۆری کورتن و درێژیان کەمە. هەرچی پۆیێمەکانیشن بەقەوارە ناوەنجین درێژیان زۆر نییە. جگە لەمە لە ناو شیعری کوردی قەفقاسی ڕووسیا بابەتی چوارین بەرچاو ناکەوێ. شکۆی حەسەن یەکێکە لەوانەی ئەم بابەتە گرنگەیان هێناوەتە

ناو شیعری خۆیانەوە. زیاتر لە پەنجا چوارین لە کۆمەڵە بڵاوکراوەکانی شکۆ دەکەونە بەرچاو، لە کێشدا ڕەنگاوڕەنگن لە ڕووی کورتی و درێژی بڕگەدا، کورتترین دێڕە شیعری چوارینەکان چوار بڕگەیە، درێژترینیان پازدە بڕگەیە. لە قافیەدا لاسایی چوارینی شیعری کلاسیکی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کردووە لەسەر سیستێمی (ا ا ب ا) دامەزراندووە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

ئەوەی بەرهەمی شیعری شکۆ لە شاعیرانی دیکەی ئەو وڵاتە جیا دەکاتەوە ئەوەیە لیریکی بەرزی شیعری ئەوروپایی ئامێزی لە وەسفی سروشت و دڵداری تێکەڵ بەغەزەلی کلاسیکی ڕۆژهەڵاتی کردووە و بابەتی تازەی هێناوەتە ناوەوە لەگەڵ چێژی مرۆڤی سەردەم دەگونجێ. ئەم داهێنانەی شکۆ ئینقیلابێکی گەورەیە لە ناوەڕۆکی شیعری کوردی لە قەفقاسی ڕووسیا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. کچە کوردی ڕەخنەگر ئێما بەکۆیێڤا لە پێشەکی کۆمەڵە شیعری شکۆی حەسەن «مەرەمێ دلێ کورد» (۱۹۷۰) دەڵێ: «دوشورمیش بوونا شاییر ب شکل و سفەتن. تەبیەت و عەمرێ جمەعەتا مە، سفەتێ مێرخاسێ شاییرە لیریکی یێ راست تێنە نتراندنێ، بە ژن و بالا دۆتا کوردایە ب شووتک و شراڤ و رەشکالێ کوردایی چەک و رحالێ ملەتێ یێ، کو راستی مە تێن عەفراندنێد شکۆیێ حەسەن دا، نە خوەش نە رند ددنە شیێرا». ئەم جۆرە شیعرەی شکۆ لەو کۆمەڵەدا ئاسایی نەبوو، چونکە لە شیعری نووسراو گوێیان بەوە ڕانەهاتبوو بەم جۆرە دڵداری لەگەڵ کچدا ببەسترێ و دەست لە ملی بکرێ. لەبەرئەوە هەرچەندە ئەوانەی شیعری شکۆیان بەداهێنان لە قەڵەم دابوو زۆریان لەسەر نووسیبوو و ستایشیان کردبوو بەڵام چەند کەسێکیش دەنگی بێزارییان دەربڕی بوو. بێ گومان هۆی ئەو بێزارییە زیاتر لەوەوە بووە، ئەوەی شکۆ کردبووی ئەوان پێیان نەکرابوو، ئیتر تووشی گرێی سایکۆلۆجی بوون لە ئەنجامی داهێنانەکەی شکۆ.

شیعری شکۆ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە دەوروبەری ئەم مەبەسانە دەسووڕێتەوە:

١- وەسف و دڵداری: مەبەسێکی تازەیە شاعیر ئەدەبی کوردی قەفقاسی ڕووسیای پێ بەرز کردۆتەوە. گێتییێکی ڕۆمانتیکی دروست کردووە. وەسفی شیعر و دڵداری و باران و کەژەکان و شەو و ڕۆژ و بەیانی و ئێواران دەکا. ماچی تەنیا لە کچی کورد ناوێ، لە کچە جوانەکانی قەفقاس و ئەوروپاش داوا دەکا.



٢- کوردایەتی: مەسەلەی نیشتمانی کورد کێشەیێکی گەورە بووە لە ناو دڵ و دەروونی شکۆ، وەک مەبەسێکی سەرەکی لە بەرهەمیدا دەکەوێتە بەرچاو، دیاردەی کوردایەتی لە سەرانسەری شیعری شکۆ بەدی دەکرێ، لە هەموو ئەو شیعرانەی بۆ مەبەسی دیکە هۆنراونەتەوە. لە پێش هەموو شتێکدا کورد و کوردستان وەک زاراوەیێکی مێژوویی و جوگرافی شیعری شکۆی داگیر کردووە. کوردستانی من، کوردستان دەسووتێ، کوردستانی عەزیز. یادی ڕەمزەکانی کورد دەکاتەوە فەقێ تەیران، ئەحمەدی خانی، ئەمینی عەبدال. ئەلەگەز و جەژنی نەورۆز و زمانی کوردی و دڵداری مەم و زین و گوڵناز و کەلەش و گەلێ دیاردەی دیکە سەرچاوەی داهێنانی شیعری شکۆ بوون. شاعیر پڕ باوەڕ بوو لە دوارۆژی ڕووناکی کورد، دەیووت لەبەرئەوە شیعری بۆ دەڵێم، ئەگەر بزانیایە ئەو دوارۆژە - خودا نەخواستە - نایەتە دی شیعرم نەدەوت.

٣- نیشتمانی سۆڤیەتەکان: شکۆ وەکو شاعیرانی دیکەی کوردی ئەو وڵاتە بەشێ لە مەبەسەکانی شیعری بۆ دەسەڵات و سۆسیالیزم تەرخان کراوە. جا ئەم شیعرانە بەزۆر سەپێنرابنە سەر شاعیر یا لە ناخی دەروونی ڕاستی خۆی هەڵقوڵا بن گرنگ نییە. بەشێک لەو بەرهەمانە داهێنانی جوانکارییان تێدا هەیە، بەتایبەتی ئەوانەی پێوەندییان بەوەسفی سروشت و ڕەنگینی شار و جوانی ژنانەوە هەیە. لەم جۆرە شیعرانەیدا یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و جەژنی کرێکاران و لینین و سوپای سوور دەکاتەوە. سانت پیترسبورگ (لینینگراد) وەک شارێکی یەکجار جوان لەسەر ڕووی زەوی و ئەبخازیا وەک سروشتێکی زۆر جوان لە گورجستان جێگەی بایەخی شاعیر بوون، لەو شار و ناوچانەدا ژیا بوو. شاعیر لە دوای پەنجاکان و سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەم لەسەر خەباتی دەوڵەتە عەرەبەکانی کردۆتەوە لە دژی ئەمپریالیستی ئینگلیزی و ئەمەریکی و فەرەنسی چونکە هەندێ لەو وڵاتە عەرەبییانە دۆستی ڕووسیا بوون.

شکۆی حەسەن یەکێک بوو لەو شاعیرانەی تەعبیریان لە ویست و ئارەزووی کوردی قەفقاسی ڕووسیا دەکرد. بەشیعری جوان و ڕەنگینەوە مێشکیان دەکردنەوە و خەیاڵیان فراوان دەکرد.

## نموونەی شیعری

١

لە وەسفی ئەلەگەز شکۆ دەڵێ:

هەمێز کرن پەنجێ رۆیێ
ئەلەگەزا کاو ئو ناز
وێ چەڤ مزدان رابوو خەوێ
وەرگرت خەملا خوەیە خاس
کوبار هوونا زلف و گولی
مینا زەریا دەعوەتێ
موحبەت گورکر هەزار دلی
عەڤد و ئیسان، تەبییەتێ
کۆنی کوردی ل سینگێ وێ
بوونە هەزار خال ئو خەت
هەزار هەزار وار بنگێ وێ
بوونە رەوشا خەون، قودرەت

ئەلەگەز ڕەمزی کوردی ئەو وڵاتەیە، وەک دەشت قشلاقە، مەڵبەندی ژیانی زستانانە، وەک شاخ زۆزان و هاوینەهەوارە، ڕەشماڵی کوردان وەک خاڵی گۆنای جوانانە نیشتۆتە لووتکە و قەدی شاخ. واتە ئەلەگەز بەزستان و بە هاوین بەهار بۆ ئەو کوردانە دێنێ. شاعیر وەک نێوەندێکی پیرۆز تەماشای دەکا.

٢

شکۆ چوارینەکانی بەشێوازی ڕۆمانتیکی هۆنیوەتەوە، لە هەندێکیاندا هەست بەهەناسەی سیمبۆلیزم دەکرێ و لە هی دیکەیاندا گیانی خەیام دەجووڵێتەوە، لە هەندێ لە چوارینەکانیدا ناویشی دەبا.

لە چوارینێکیدا دەڵێ:

ئەز جارەکێ سەر پێگاسێ هەیلۆ چوومە عەرشی عەزمین
ئەحمەد خانی روونیشت بوو سەر پارناسێ مەیی هێشین



ساز – تەنبوورێ خوە نهێری، کە سەرهاتێ، کرە ئاخین
گۆ، بێژە من، بێی کوردستان کورد دنێدا هەلا دژین؟

لەم چوارینە جوانەدا شاعیر بەسواری ئەسپی پێگاس دەچێتە عەرشی ئاسمان (کۆزمۆس). پێگاس ناوی ئەسپێکە ئیلهام دەدا بەشاعیران لە ئەفسانەی گریکیدا. لەوێ چاوی بەئەحمەدی خانی دەکەوێ لەسەر شاخی پارناس دانیشتووە، ئەمەش ناوی شاخێکی ئەفسانەیی گریکە پەرستگای شاعیرانی لێ بووە. ئەحمەدی خانی لەو پەرستگایەدا دانیشتووە، بیر دەکاتەوە سەری سوڕماوە، دەپرسێ پێم بڵێن کورد بەبێ کوردستان ماوە! خانی باش دەزانی خاکی کوردستان لە دەست خاوەنی خۆی نییە.

لە چوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

من گولەک دیت ل ناڤ مێرگێ
قورچمی بوو دەر پا زەرگێ
گۆ مالخراڤ تەزە هاتی
ئیدی من هات بایێ مەرگێ

دواکەوتن کارەساتی لێ دەبێتەوە. نەخۆش لە کاتی خۆی دەرمان نەکرێ بێ سوودە. ئەو گوڵەی ناو مێرگی بەهار ڕەمزە بۆ خۆشەویست و هەموو شتێکی مرۆڤ ئارەزووی دەکا، ئەگەر لە کاتی خۆیدا فریای نەکەوێ بێ سوودە. چونکە گوڵ تەمەنی کورتە زوو سیس دەبێ و دەمرێ.

لە چوارینێکی شکۆ ئەمە هاتووە:

ئاخ چەڤێ رەش ئاخ چەڤێ رەش ئەز کوشتم
وەلاتێ دوور ئو غەریبی یێ ئەز هێشتم
بەژنا نازک، بەژنا سۆسن ئو رحان
دل من سۆتن ئو کەربا وان ئەز هەلیام

شکۆ ئەم چوارینەی لە ساڵی ١٩٦١ لە شاری سانت پیترسبورگ (لینینگرادی ئەوسا) نووسیوەتەوە، ئەو کاتە تازە هاتبووە ئەوێ. جوانانی وڵاتی خۆی هەموویان چاویان ڕەشە، کچانی هاوسێیانی کورد بەتایبەتی گورج و ئەرمەنی ئەوانیش چاویان ڕەشە، چاوی بەچاوی کچە ڕووسە چاوکاڵەکان ڕانەهاتبوو، هەر بیری لە چاوڕەشەکانی خۆیانی دەکردەوە، بەڕاستی لە دەست ئەوان وڵاتی خۆی بەجێهێشت و ژیانی ئاوارەیی هەڵبژارد.

له چوارینێکی دیکەدا دەڵێ:

ئەڤێ حۆری یێ، ئەڤێ زەری یێ هات حوبا من خوەرا بر
وێ ئەز دامە بەر خەنجەرا دل و سەری من ژێکر
سەبەب کی بوو، سەبەب کی بوو، گەلۆ کی بوو، گەلۆ کی؟
مالخرا بۆ، تو نزانی حالێ دلێ خوەیی بەنگر

لەم شیعرەدا شکۆ ئەوە دەردەبڕێ دلبەرەکە هات دڵدارییەکەی لێ سەند، بەمە پەریشانی کرد، ماڵوێران ئایا تۆ نازانی بەمە حاڵی دڵی خۆی شێواند.

٣

له وەسفی شەودا دەڵێ:

شەڤە تەریە، شەڤە رەش
نە هیڤ هەیە، نە ستەیر
نە چڤیکە نە ژی تەیر
هەر تشت نها رازایە
تەنێ فیتینا بایە
دلەرزم ڤێ هنداڤێ
هۆلی تەلیا ناڤا ئاڤێ
بۆی ڤێ کاوێ، بەدەوێ
دکم گازی بەر پەنجەرێ
دبێم: بەدەو، دە تو دەرێ
دە تو دەرێ، دەرێ ژ مال
چەڤێ نەدە دلێ یار
دلێ منی بریندار
دە، تو دەرێ، دەرێ ژ مال
کو ڕاموسانی ئاگری
بدم لێڤێ شەکری

ئەم دڵدارییەی شکۆ شارستانییە لە ڕەوشتی ساکاری گوندایەتی هاتۆتە دەرێ. شەوە



کشوماتە، هەموو شت لە خەودایە. لە بەرپەنجەرە لە دلبەر دەپاڕێتەوە لە ماڵ بێتە دەرێ بۆ ئەوەی لێوی بمژێ و ماچێکی ئاگرینی لێ بکا.

٤

لە شیعرێکی بەناوی «تو من حزکە» دەڵێ:

گەردەن گازی، گولا نازی، گولا نوور
ئەز نەخوەشم، ئەز سەرخوەشم حوبا کوور
دەمێ گولاڤ، حوبا ئالاڤ، حوبا دل
ئەوقاس شاییر، ئەوقاس دەنگبێژ و بلبل

***

هیشتن سەفیل، هیشتن مەحرووم، هیشتن ژار
برنە گۆرێ قیز و خورتێ بێ پەرگال
چقا بلبل، چقا شاروور ئو دەنگبێژ
کو بێن هەرن ئو دەرباز بن، ببن کێش

***

تو یەک وانا، تو یەک وانا نکارە
ب کلامێ حوبا دنێ خلاس کە
حوب کو هەیە، هم ئۆکیانە، هم بەرە
کا سۆبەکار، بەر ئۆکیانا مەقەسکە؟

***

تو من حزکە، تو من حزکە، قیزا قەنج
ئەزی خورتم، ئەز جاهلم، ئەزی گەنج
سەری حوبا، سەری دلە، ئەز ئو تو
کو ئەم شابن، بەختەوار بن تەڤ هەڤدو

لەم شیعرەدا شکۆ گفتوگۆ لەگەڵ دلبەردا دەکا، ئەوەی لە دڵی دایە بۆی هەڵدەڕێژێ، لە پێشانا باس لە جوانی دەکا، ئەوەی بۆ دەگێڕێتەوە ئەو جوانییە بووەتە هۆی ئەو دڵدارییەی دڵ و دەروونی داگیر کردووە. لە پاش ئەوەی تێی دەگەیەنێ کە حەزی لێ کردووە، داوا لە

کیژەکە دەکا ئەویش خۆشی بوێ، هەردووکیان لە تەمەنی لاویەتی دان و بۆ یەکتری دەگونجێن.

## ٥

لە شیعری «کوردستان د شەوتە»دا دەڵێ:

شەرە، شەرە لالێ جان
د شەوتە کوردستان
ژ ناف مژا بارووتێ
دەنگی شین و گری تێ

***

نالینێ کال تفالا
تێ ژ چیا ئو نەوالا
قیژینا قیز، داییکا
کە تیە مێشێ واویکا

***

قوورینا شێر عەفاتا
مینانی شوور ئو بالتا
ئو زلفەقار و خەنجەر
قوتکر دژمن دل – جەگەر

***

شەرە، شەرە، لالێ جان
د شەوتە کوردستان
ژ ناف مژا بارووتێ
دەنگی شین و گری تێ

لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەم کوردستانی عیراق لە لایەن دەسەڵاتی بەغداوە بۆردوومان دەکرا، شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ لە جەنگەی دابوو. ڕۆژنامەکانی ئەوروپا هەواڵی وێرانکردنی کوردستانیان بڵاو دەکردەوە، زۆربەی برووسکەی ڕۆژنامەکان بەناوی «کوردستان دەسووتێ»وە بوو. لەو سەردەمەدا لە ساڵی



**١٩٦٥** شکۆ ئەم لیریکەی لە شاری یەریڤان نووسیوەتەوە. هەستی شاعیرێکە بەرامبەر خاکێک خۆی نەیدیوە، بەڵام باب و باپیرانی لەوێ لە دایک بوون و ئەوە دەزانێ نیشتمانی خۆیەتی.

***

شکۆی حەسەن شاعیرێک بوو شیعری ئەدەبی کوردی لە قەفقاسی ڕووسیا لە چوارچێوەی هونەری ناوچەیییەوە گواستیەوە گێتیی شیعری بەرزی لە دوارۆژدا پێی بلێن کلاسیکی. لە قالبی شیعری کێش و قافیەی میللی خۆماڵی جۆرە شیعرێکی نوێی دروست کرد بەرامبەر لیریکی نەتەوە پێشکەوتووەکانی ولاتی ڕووسیای ئەو سەردەمە بوەستێ. لەبەرئەوە کەوتە بەر نەشتەری ڕەخنەگرانی دواکەوتوو، ئەوانەی گوێیان بەو شیعرەی لەناوە بوو ڕاهاتبوو. بەڵام داهێنانی نوێ ماکی ئەوەی تێدا هەبوو لەسەر پێ بوەستێ و شیعری شکۆ بمێنێ و ڕەخنەگرە نەفامەکان ببنە سەد قەل و بەردێ.

# بەشی چل و یەکەم

## کاکەی فەللاح

**۱۹۲۸ – ۱۹۹۰**

### ژیانی

محەمەد کوڕی محەمەدئەمین کوڕی قادر لە ساڵی ۱۹۲۸ لە شارۆچکەی چوارتا لە دایک بووە. لە خێزانێکی دەست کورت و هەژار و نەخوێندەوار پەروەردە بووە. لە ساڵانی ۱۹۳۹ – ۱۹٤۱ لە قوتابخانەی سەرەتایی چوارتا خوێندوویەتی لەو کاتەی عەبدولواحید نووری بەڕێوەبەر بووە. لە پاشانا چووە بۆ سلێمانی بۆ خوێندنی قۆناغی قوتابخانەی ناوەندی. هەندێکی دەخوێنێ و بۆی تەواو ناکرێ و دەکەوێتە ناو خەباتی سیاسی نهێنییەوە. لە ساڵی ۱۹٤۷ لە کۆبوونەوەیێکی جەماوەری لە سلێمانی شیعرێک دەخوێنێتەوە، لە بەندێکی پێنجینیدا دەڵێ:

کرێکار و قوتابی و چینەکانی ڕووت و بێ نانت
سەپان و کاکی فەللاحی بەرەی تالان کراوانت
لەگەڵ کیژ و هەتیوانی کزی بێ سووچ و تاوانت
ئەڵێ دەی ڕاپەڕە و گوێ بگرە کففەی خوێنی لاوانت
بەدەنگی بەرز ئەڵێ نێزیکە جەژنی بەش خوراوانت

لە دێڕی دووەمی ئەم شیعرەدا ڕستەی «کاکی فەللاح» هاتووە. لە دوای ئەمە لە لایەن خەڵکی سلێمانییەوە ڕستەی «کاکەی فەللاح» دەسەپێنرێتە سەری و دەبێ بەنازناو و ناوی هونەری و تەنیا بەم ناوە دەناسرێتەوە. لە دوای ئەم کۆبوونەوەیە کاکەی فەللاح بەتەواوی دەچێتە ناو گۆڕەپانی خەباتی سیاسی نهێنییەوە.

بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ۱۹٤۸ دەگیرێ بەناوی ئەوەی خۆی لە خزمەتی سەربازی شاردۆتەوە، بەڵام دادگا بەرەڵلای دەکا. لە دوای ئەمە جارێکی دیکەش دەگیرێ لەبەر جموجۆڵی سیاسی دادگا بڕیاری ساڵێک بەندیخانە و ساڵێک دەستبەسەری بۆ دەردەکا. ئەو ساڵانە لە بەندیخانەکانی بەغدا و کووت و ناسرییە و ئەبووغرێب دەباتە سەر. لە دوای ئەمە ماوەی شەش ساڵ بەخۆشاردنەوە و خەباتی نهێنی لە ژیانیدا بەئەنجام



دەگەیەنێ. هەرچۆنێ بێ دەسەڵات دەیدۆزێتەوە، ئەمجارە فەرمانی پێنج ساڵ بەندیخانە و سێ ساڵ دەستبەسەری بۆ دەردەچێ. لە دوای ڕزگاربوونی لە ژیانی بەندیخانە و ئاوارەیی بەیەکجاری واز لە سیاسەت و حیزبایەتی دێنێ. چاپخانەیێکی بچووک پێکەوە دەنێ، هەندێ کتێبی دەگمەنی کوردی دووبارە چاپ دەکاتەوە، خەریکی شیعر و نووسینی خۆی دەبێ. هەر لەو ماوەیەدا چوار ساڵ ڕۆژنامەی «ژین»ی پیرەمێرد بڵاودەکاتەوە. ئەم کارەی پڕ سوود دەبێ لە ڕووی خوێندەوارییەوە خزمەتی کۆمەڵ دەکا و لە ڕووی داراییەوە ماڵ و منداڵی پێ بەڕێوە دەبا. کاکەی فەللاح لە ڕۆژی ۹ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۰ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان نێژراوە.

### شیعری

کاکەی فەللاح لە خێزانێکی هەژاری نەخوێندەواری دەشتی کوردەواری پێ گەیشتووە. لە منداڵییەوە هەستی بەدەست کورتی باوکی و زۆربەی خەڵکی ئاوایی کردووە لە ئەنجامی بەرژەوەندی دەرەبەگ و کاربەدەست و مووچەخۆرانی گەورەی میری. خوێندنەوەی سەرچاوەی ڕەنگاوڕەنگی زانیاری زەمینەیان بۆ خۆش کردووە بیر لە داوڕۆژی هەژاران بکاتەوە، خەیاڵیان زاغ داوە لە شیعر نووسین نەترسێ، ماوەیێکی ژیانی بۆ ئەمە تەرخان کردووە، ئیتر ئازار و چەرمەسەری ژیانی بەندیخانەی چەشتووە، ماوەیێک میوانی ئەو ئێستگە سەختانەی ژیان بووە. لە دواییدا نەیتوانیوە بەرهەڵستی ئەم هەموو ئێش و ئازارە بکا لە پێناوی بیروباوەڕی سیاسی، لەبەرئەوە وازی هێناوە و کەوتۆتە ناو ژیانی هێمنی و ماڵداری لە پێناوی پێگەیاندنی منداڵ و بەڕێوەبردنی ماڵ.

کاکەی فەللاح توانیویەتی شتێک بخاتە سەر سامانی شیعری نەتەوەی کوردەوە شەقڵی تایبەتی خۆی هەبێ. لە ساڵانی دەوروبەری کۆتایی جەنگی دووەمی گێتی دەستی داوەتە شیعر. شیعری لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە بەسێ قۆناغی گۆڕینی شیعری کوردی تێپەڕیوە لە سەدەی بیستەمدا. لە ڕووی پراکتیکییەوە کاکەی فەللاح لە هەرسێ قۆناغدا مەشقی هەیە و بەرهەمی شیعری هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

#### شیعری عەرووزی و یەکێتیی قافیە

لە نموونەی شیعری کلاسیکی قوتابخانەی کرمانجیی کوردستانی باشوور لە سلێمانی کاکەی فەللاح وەک شاعیرێکی لە ڕوو دەکەوێتە بەرچاو، شارەزا لە هەموو مەرجەکانی

شیعری کلاسیکی. هۆنینەوەی ئەو شیعرانەی هوشیارانەیە، لاساییکردنەوەی ئەوە نییە لە ئەنجامی خوێندنەوەی زۆری شیعر گوێی مۆسیقی لا دروست بووبێ، بەڵکو زادەی توانایی بەهرەی ناوەوەی خۆیەتی. لە شیعرێکیدا بەناوی «لەسەر شێوەی کۆن» لە ساڵی ١٩٥٧ هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

لە وەسفی خۆشەویستیتا زمانی لالە هەڵبەستم
ئیستر تۆ پێ بزانی یا نەزانی من چ دەربەستم
ئەپرسی بۆچی جامی دڵ بەنەشئەی بادە مەست نابێ
ئەڵێ لێوڕێژی بادەی عەشقی تۆم و هەر بەتۆ مەستم
ئەگەر باوەڕ بەمن ناکەی وەرە سەیری دەروونم کە
لە دنیای خۆشەویستی تا چ دەریایێکی پڕ هەستم
لەبەر سۆزی دڵم دوور و نزیکی بۆ نییە چاوم
خوڕەی دێ ئاوی سەرچاوەی ئەگەر شادم ئەگەر پەستم
جگە لەو یادە شیرینەت سەرانسەر تاڵە ژینی من
کەچی ئەتوێتەوە غەم چون لەگەڵ ئەو بادە پەیوەستم
بەتاجی عەشقی تۆوە شام لە ناو بەرگی گەداییدا
کە بەندەی تۆم و ئازادەی چەرخ دیلێکی سەربەستم
بەهیوای ئاوڕێکی تۆیە خۆ هەڵبەستەکانی من
لە ڕێی تەیری نیگاییێکتا ئەبێ هێلانە هەڵبەستم

لە ناوی شیعرەکەوە ئەوە دەردەکەوێ کاکەی فەللاح ئاگاداری شیعری کلاسیکی کۆن و شیعری نوێیە، لەبەرئەوە ناوی ناوە (لەسەر شێوەی کۆن). خوێنەر لەم شیعرەدا بەهەڵە ناچێ ئەگەر وابزانێ وەسفی دلبەرێکی شاعیرانی کۆنە چونکە بۆ ئەوە دەشێ، کەچی شاعیر سیمبۆلییانە بۆ مەسەلەکە چووە. ئەو خۆشەویستە یا دلبەرە «ئازادی و بەختیارییە» بۆ گەل و بووە بەسەرچاوە بۆ دانانی ئەم لیریکە.

شاعیر ئاشنایەتی لەگەڵ بەندیخانەدا بووە، لیریکێکی لە ساڵی ١٩٥٦ هۆنیوەتەوە بەناوی «بەندیخانە لە جەژنا» تیایدا دەڵێ:

شوێنە سەیرانگای بەهارم ئێستا بەندیخانەیە
خواردنم نان و پیازە و بەرگەکەم هی کانەیە



شەربەت و خۆشاوی جەژنم چایە یان ئاوی پەتی
چێشتە خۆشەی بەربەیانم نیسکی دانە دانەیە
پێ لە ناو زنجیر و کۆتا دەست و دەم گیرۆدەیە
دڵ لە گۆشەی مەینەتی دا عابید و دێوانەیە

شاعیر لەم دێڕانەدا باس لە گوزەرانی بەندیخانە دەکا، لە بابەت خواردن و کەلوپەل و شتوومەکی ئەوێ دەدوێ. زاراوەی «کانە» بەکار دێنێ ئەمە ناوی هەمموو ئەو شتانەیە کە بەندیخانە دەیداتە بەندییەکان لە جلوبەرگ و خواردەمەنی و سابوون و شتی دیکە. شیعرەکە هونەروەرانە وێنەی ژیانی مەتریالی و گیانی بەندییەکانی ناو بەندیخانەی گرتووە، بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بەبەندکراوی سیاسییەوە هەیە.

لە تاکە شیعرێکیدا کاکەی فەللاح دەڵێ:

ئەگەر غەم ڕۆژ و شەو دەستەو یەخەم بێ
ئەبێ خۆم غەم نەخۆم غەم تووشی غەم بێ

بەمەبەسی داهێنانی وێنەی ڕەوانبێژی لەم دێڕە شیعرە جوانەدا کاکەی فەللاح حەوت وشەی بەکارهێناوە چواریان «غ»ی تێدایە و سێیانیان «خ»ی تێدایە، ئەم دوو دەنگە لە یەکترییەوە نزیکن، نیوەی وشەی شیعرەکە لەم دەنگانە پێکهاتوون بەمەبەسی ڕەوانبێژی لە ڕووی ڕیتم و مۆسیقاوە، جگە لەوەی مانای شیعرەکە پلەی بەرزی شاعیرییەتی کاکەی فەللاح دەخاتە ڕوو.

### شیعری سیلابی خۆماڵی

### قافیەی مەسنەوی

شاعیر لەم بابەتە لیریکەی کەم نییە، بەزۆری هەمموو کێشە بنچینەیییەکانی شیعری سیلابی خۆماڵی حەوت و هەشت و دە بڕگەیی بەکارهێناوە. یاری بەقافیە کردووە وەکو (ا ا ب ب جـ جـ) و (ا ب ا ب).

لە لیریکێکیدا بەناوی «ڕێگای بەختیاری» لە ساڵی ١٩٤٧ دایناوە دەڵێ:

ئەوەی ئەیەوێ ببێ بەختیار
بیروباوەڕم بکا ئیختیار

پێش هەموو شتێ بەرەو نیشانێ
خۆی بکوتێ خۆشی با لەسەر دانێ
چاوی نەترسێ بچێ بێ پشوو
گیانی نەبەزی بکا بەتێشوو
ئەبێ بزانێ لەسەر ئەو ڕێیە
کە نەبێ هەزار چوتورمی لێیە
دوژمنی خاوەن چەکی هەمەڕەنگ
لەسەر چوونی ئەو لەو ڕێیە بوون بەنگ
ئەویش لە سایەی ئەو هێز و تینەی
میللەت داویتێ لەو وەرسی ژینەی
لەگەڵیان بکا بەربەرەکانی
تاکو بڵێسەی گڕی تەکانی
ڕۆشن کەرەوەی بەردەرکی شادی
دەریخا بۆتە شیری ئازادی

ئەم لیریکە دە بڕگەیی خۆماڵی مەسنەوییە ئەستووری بیروباوەڕی ئەو سەردەمەی کاکەی فەللاح بووە. کەسێکی عەقاییدی باوەڕی بەشۆڕش بووە بۆ ڕەشوڕووت و هەژاران، ئامادە بووە گیانی بکا بەقوربانی بۆ ئەو بیروباوەڕە. ئامۆژگارییەکانی شاعیر لەم بەرهەمەدا هەوێنی داهێنانی شیعری نییە، بەڵام ئەو توانیویەتی تەکانێکی هونەری بداتێ و سووک و خۆش بکەوێتە بەرگوێی خوێنەری هەڵگرتووی ئەم ئیدیۆلۆجییەتە. دەبێ ئەوەش بزانرێ ئەگەر شیعرەکە جوانیش بێ لە ڕووی پراکتیکییەوە لە خاوەنی پچڕاوە چونکە لە ناوەڕاستی ژیانیدا وازی لەو ئیدیۆلۆجییەتە هێنا.

لە شیعرێکیدا بەناوی «لەگەڵ شەپۆڵەکانا» لە ساڵی ١٩٦٣ دایناوە دەڵێ:

ئەی زستانی کرێوە و تۆف
پێم بڵێ چیت لێمان ئەوێ
سەرما و سۆڵەی بەئاخ و ئۆف
بۆ وەیشوومەی تۆ ناخەوێ
لەو ڕۆژەوە کە خەزانە
دڵی گەڵا و گوڵ ئەشکێ



بەو دڕکی گەڵاڕێزانە
بلبل خوێنی لێ ئەتکێ
ئاسمانی بەرزی دڵسووتاو
بۆ حاڵی سەر زەوی ئەگری
بەخوڕ فرمێسکی دێ لە چاو
بەلێزمەی بارانی هەوری

لەم لیریکەدا کاکەی فەللاح سیمبۆلییانە لە ساڵی ١٩٦٣ دەدوێ، لەو ساڵەدا گۆڕانی سیاسی لە عیراقدا هەبوو، وەکو کوودیتا کۆنەپەرست و شۆڤێنییەکەی ٨ی شوبات ئازار و ئەشکەنجەیێکی جەرگبڕ بەگشتی تووشی خەڵکی عیراق و بەتایبەتی تووشی ڕاپەڕینی کورد بوو. شاعیر کەژی زستانی کردووە بەڕەمزی فرمێسک و باران و ڕەهێڵە بۆ ئەو کارەساتەی بەسەر عیراقدا هاتووە.

## شیعری نوێ

شاعیر بەشداری بەرچاوی هەبوو لە دەوڵەمەندکردنی شیعری نوێی کوردی. ئەو شیعرە لیریکییەی لە یەک کێشی خۆماڵی زیاتر لە تاکە شیعرێکدا بەکار دەهێنرا، هەروەها ڕەچاوی ڕەنگاوڕەنگی قافیەش دەکرا.

لە لیریکێکیدا بەناوی «بۆچی نابێ» لە ساڵی ١٩٧٥ دایناوە دەڵێ:

نازدارەکەم
گەر نەختێ گوێ ڕاگری لێم
پێ لێ ئەنێم
خۆم خۆش ئەوێ
هەرگیزاو هەرگیز نامەوێ
مۆمی داگیرساوی ژینم
بتوێتەوە
هیچ حەز ناکەم
پشکۆی خۆزگە و خەو بینینم
بکوژێتەوە

خواپەرست بم لە خوا زیاتر
خۆم خۆش ئەوێ
ئەگەر دنیاپەرستیش بم
زۆر زۆر لەم دنیایە زیاتر
خۆم خۆش ئەوێ
ئەزانی بۆ نازدارەکەم
ئەوەندە من خۆم خۆش ئەوێ
لەبەر تۆیە تۆم خۆش ئەوێ
پەیکەری خۆشەویستی بم
بۆچی نابێ
تا ئەم دنیایە دنیا بێ
هەر بمێنم هەر بمێنم هەر بمێنم

کاکەی فەللاح بینای ئەم شیعرەی لەسەر کێشی هەشت برگەیی داناوە. هەندێ دێڕی وەکو خۆی هێشتۆتەوە، هەندێ دێڕی کەرت کردووە و بووە بەچوار برگە. چوار پێنج جۆرە قافیەی بەکارهێناوە. بێ گومان ئەم شیعرە و هەموو ئەو شیعرانەی بەنوێ ژمێرراون گەمەییێکی تەکنیکی لە دێڕی شیعری عەرووزی و خۆماڵی تیایاندا کراوە تازە دەکەونە بەرچاو، کەچی ئەدگاری شیعری عەرووزی و خۆماڵییان تێدا ماوە.

بۆچوونی شاعیر لە بارەی خۆشەویستییەوە ناسک و هونەروەرانەیە. نویشکی ئەوەیە بەدلبەر دەڵێ لەبەرئەوەیە من خۆم خۆش دەوێ چونکە تۆم خۆش دەوێ بەواتای ئەوەی ئەگەر دلبەری خۆش نەویستایە خۆی خۆش نەدەویست. ئەم بیرە ئەگەر لە ناو قالبی کێش و قافیەشدا نەبێ هەر شیعرە.

کاکەی فەللاح لە شیعرێکیدا بەناوی «ئەوە پیرێ، ئەمە دوێنێ، بەڵام ئەمڕۆ» لە ساڵی ١٩٧٨ دایناوە دەڵێ:

ئەژدەهاکەکانی سەردەم
هەموو هەورەکانی مێژوو
کۆبوونەوە
هەموو زام و



برینەکانی ڕابردوو
هەرچی کۆن و نوێیە هەموو
بەناسۆری ڕاست بوونەوە
لە زۆر لاوە
ڕەهێڵەی باران و لافاو
جێ پێی ستەم ئەشواتەوە
لە زۆر لاوە
هەوری ژان خۆی ئەخواتەوە
بۆ دەمی تەووژمی بەتاو
تامەزرۆیە و
تینووە بۆ ماچی هەتاو
تا نەورۆزی ڕاستەقینە
بۆ مرۆڤی ڕاستەقینە
وەکو خۆرێ لە ئاسۆوە
پرشنگ ببەخشێ بەهیوای
ڕەنگاوڕەنگی
هەزاران پەلکەزێڕینە

ئەم شیعرە نموونەییێکی دیکەی شاعیرە لە شیعری نوێدا، سیمبۆلییانە لەو هێزانە دەدوێ کە دەستدرێژی دەکەنە سەر بێ دەسەڵاتان، بەئەژدەهاک ناویان دەبا، ئەمانە تەنیا بێگانە نین، بەڵکو ئەژدەهاکەکانی ناوەوە زۆرداریییان لە ئەوانەی دەرەوە کەمتر نییە.

## کاکەی فەللاحی ڕۆشنبیر

کاری سەرەکی کاکەی فەللاح شیعر بوو، تێیدا سەرکەوتوو بوو. شارەزایی لە مێژووی ئەدەبی کوردی هەبوو، بەتایبەتی قوتابخانەی کوردستانی باشوور و شیعری دیالێکتی گۆرانی. توانای ئەوەی هەبوو لە هەندێ لایەنی ئەدەب بکۆڵێتەوە، هەروەها تێکستی هەندێ دیوانی شیعری کوردی ساغ بکاتەوە و لە پاشاندا بەچاپییان بگەیەنێ. چاپخانەی خۆی لەم کارەدا دەوری هەبوو. بەشێکی زۆر لە نووسینی خۆی لە ڕۆژنامەی «ژین»

بڵاوکراونەتەوە لەو سەردەمەی خۆی بەرپرسی دەرکردنی بوو. جێ پەنجەی هەوڵ و کۆششی کاکەی فەللاح لە پەرەسەندنی سامانی ئەدەبی کوردی دیار و ئاشکرایە. لەگەڵ ئەوەشدا کاکەی فەللاح پێش هەموو شتێک شاعیر بووە.

***

حەمەی حەمەمین ناسراو بەکاکەی فەللاح شاعیرێکە دەچێتە ڕیزی ئەو شاعیرانەی دەستیان هەبوو لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا. لە ڕووی ڕوخسارەوە مەشقی هەموو جۆرە شیعرەکانی هەبوو لە عەرووزی و خۆماڵی و نوێ. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە خۆی لە هەندێ لە مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی کۆن داوە، بەڵام زۆرتر بۆنی لیریکی تازەی لێ دێ، واتە شۆڕشگێڕی و سیاسی و کۆمەڵایەتی بەشێوازێکی ڕۆمانتیکی و سیمبۆلییانە، ئەم هەموو شێوازانە لای ئەو و شاعیرانی دیکە دەچنە ناو ڕێبازی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتییەوە. شاعیر ئەوەندەی بایەخی بەبیری ئەنتەرناسیۆنالیزمی و چینایەتی داوە وەک ڕەنگدانەوەیێکی مارکسیزم ئەوەندە بیری لە مەسەلەی ناسیۆنالیزمی کورد «کوردایەتی» نەکردۆتەوە بەتایبەتی لە بەرهەمی شیعری خۆیدا.

# بەشی چل و دووەم

## عەلی فەتاح دزەیی

۱۹۲۸ – ۱۹۹۲

### ژیانی

عەلی کوڕی فەتاح کوڕی حەوێز کوڕی سلێمان باب و باپیرانی لە ئاغایانی خێڵی دزەیین، لە ساڵی ۱۹۲۸ لە گوندی دووگردکانی لای باشووری شاری هەولێر لە دایک بووە. لە تەمەنی منداڵی سەرەتای خوێندنی لە گوندی دووسەرەی خۆیان لای مەلای گوند مەلا خەلیلی سنجاوی (موخلیسی شاعیر) بووە. کە لە گوندی قازیخانە قوتابخانەی سەرەتایی کراوەتەوە پۆلی یەکەمی لەوێ تەواو کردووە. لە ساڵی ۱۹۳٦ هاتۆتە هەولێر قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئەوولا تەواو کردووە. لە ساڵی ۱۹٤۲ ڕووی کردۆتە قوتابخانەی ناوەندی و ئینجا ئامادەیی لە ساڵی ۱۹٤۸ خوێندنی ئەو قۆناغانەی بەئەنجام گەیاندووە.

لە پاییزی ساڵی ۱۹٤۸ لە کۆلێجی مافی بەغدا (حوقووق) وەردەگیرێ، هەمووی چەند مانگێکی پێ ناچێ لە کانوونی دووەمی ۱۹٤۹ لەسەر جموجۆڵی سیاسی دەگیرێ. دادگا بڕیاری سێ ساڵ بەند و ساڵێک دەستبەسەری بۆ دەردەکا. ماوەی سێ ساڵەکە لە بەندیخانەکانی بەغدا و کووت و کەرکووک دەباتە سەر و ئینجا دەگەڕێتەوە هەولێر. ماوەی دەستبەسەرییەکەی لە هەولێر دەبێ. لە ساڵی ۱۹٥۳ داوای گەڕانەوە دەکا بۆ قوتابیەتی لە کۆلێجی مافی بەغدا، بەڵام ڕێگەی نادەن. بۆ تەواوکردنی خوێندن ڕوو دەکاتە شاری دیمەشق و لە بەشی زمانی عەرەبی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای دیمەشق دەبێ بەقوتابی. ساڵی یەکەم تەواو دەکا و سەردەکەوێ بۆ پۆلی دووەم، بەڵام کەسوکاری کۆلێجەکەی پێ دەگۆڕن و کۆلێجی مافیان پێ باشتر دەبێ. بەم جۆرە کۆلێجی ئەدەبیات بەکۆلێجی ماف دەگۆڕێتەوە و لە هاوینی ۱۹٥۸ باوەڕنامەی زانستگا وەردەگرێ.

لە ساڵی ۱۹٥۹ بەمووچەخۆر لە دادگای هەڵەبجە دامەزراوە، لە ساڵی ۱۹٦۰ گوێزراوەتەوە و بووە بەکارگێڕی پێنجوین. لە دوای ئەوە وەک مووچەخۆرێکی میری گوێزراوەتەوە بۆ هەندێ لە شارەکانی باشووری عێراق. لە ساڵی ۱۹٦٦ گەڕاوەتەوە کوردستان بووە بەکارگێڕی میری لە برادۆست و دیانە. لە دوای بەیانی ۱۱ی مارتی



۱۹۷۰ کراوە بەقایمقامی شارباژێڕ، لە پاشانا بۆ قایمقامی دەربەندیخان گوێزراوەتەوە، تا ساڵی ۱۹۷٤ لەوێ ژیاوە. لەگەڵ تێکچوونی نێوانی دەسەڵاتی بەغدا لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ۱۹٦۱ی کورد، شار و کاری ڕەسمی بەجێ هێشتووە و ڕووی کردۆتە ناو شاخ. لە دوای کارەساتی لەناوچوونی شۆڕش لە بەهاری ساڵی ۱۹۷٥ گەڕاوەتەوە سەر کاری میری لە هەولێر. لە ساڵی ۱۹۷۷ گوێزراوەتەوە شاری ناسرییە لە باشووری عیراق.

لەو ماوەیەدا عەلی هەوڵی دابوو لە کاروباری میری دوور بکەوێتەوە، لە ساڵی ۱۹۸۳ خانەنشین کرا و گەڕایەوە هەولێر، بۆ یەکەم جار دەستی کرد بەکاروباری ئەوقاتی (محامیەتی)، بەڵام زۆری نەبرد لە ساڵی ۱۹۸٦ تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی قوڕگ بوو، چەند ساڵێک ئازاری ئەم نەخۆشییە کوشندەیەی چێشت تا لە ڕۆژی ۲٦ی کانوونی دووەمی ۱۹۹۲ کۆچی دوایی کرد و لە هەولێر نێژرا.

### شیعری

عەلی لە گوندی دووسەرە کە چاوی کردۆتەوە و خۆی ناسیوە لەگەڵ مەلای گوند شاعیری نازناو موخلیس ئاشنایەتی پەیدا کردووە، ماوەیێک لە حوجرە لای ئەو خوێندوویەتی و بووە بەڕێبەری، بۆیە لە دواییدا کۆمەڵێک شیعری لە ستایشی ئەو مامۆستایەی وتووە. لە منداڵییەوە مەیلی ئەوەی بووە بەپیشە ببێ بەئەوقات (محامی) و بەهەوەس ببێ بەشاعیر، بەنووسین و بەقسە ئەم ئارەزووەی دەربڕیوە. وەکو خۆی دەڵێ لە ساڵی ۱۹٤٤ بیری لە شیعر وتن کردۆتەوە، بەڵام لە ساڵی ۱۹٤٦ شیعری نووسیوە، لە ساڵی ۱۹٤۷ شیعری بۆ ئاهەنگی نەورۆزی ئەو ساڵە وتووە کە لە هەولێر نیشتمانپەروەران لە مێرگی بەهاری قەراغ شار گێڕاویانە. بەلای شاعیرەوە قۆناغی دووەمی شیعری لە ساڵی ۱۹٥۳ دەست پێ دەکا.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری عەلی لە ڕووی ڕوخسارەوە لەم تێبینییانەدا ڕوون دەبێتەوە:

۱- بەرهەمی شیعری لە کێشدا دەوڵەمەندە، هەردوو بابەتە کێشی عەرووزی و خۆماڵی بەکارهێناوە، کێشی یەکەمیانی کەمە، ئەوەی دووەمیان زیاترە. لە تاقیکردنەوەکانی نووری شێخ ساڵح و گۆران کەڵکی وەرگرتووە، بەتایبەتی ئەوان لە هەندێ بەحری عەرووزی و کێشی خۆماڵی کێشی تازەیان داهێناوە وەکو حەوت بڕگەیی (٤ + ۳)

خۆماڵی هاوئاهەنگی هەزەجی مەجزووئی مەحزووفە (مفاعیلن فعولن)؛ کێشی یازدە بڕگەیی (٤ + ٤ + ٣) هاوئاهەنگی ڕەجەزی مەقتووعی مەخبوونە (مستفعلن مستفعلن فعولن) و هەندێ کێشی دیکەش.

٢- لە شیعریدا هەموو جۆرە قافیەکانی شیعری کوردی بەکارهێناوە، وەک یەکێتیی قافیەی شیعری کلاسیکی و مەسنەوی و شیعری خۆماڵی و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی شیعری نوێ.

٣- شیعری بەزۆری بەقەوارە و ژمارەی دێڕە شیعر درێژ نین، دەچنە ناو بابەتی لیریکەوە. قەسیدە(شیعری درێژی)کەمە، هەروەها قەسیدەی چوارین و پێنجین و شەشینی هەیە.

٤- زمانی شیعری ئاسان و خاوێنە، شێوەی دیالێکتی سۆرانی ناوچەی شار و دەشتی هەولێری پێوە دیارە.

## شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە زۆرتر خەریکی مەبەسە تازەکانە و کەمتر بۆ مەبەسە کلاسیکییەکان چووە. هەندێ جار ئەمانەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە و وەک لیریکی نوێی هەموو نەتەوەکانی گێتی دەکەوێتە بەرچاو. مەبەسە بنچینەییەکانی شیعری عەلی لە دەوروبەری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و دڵداری و وەسفی سروشت و کۆمەڵایەتی و ماتەمنامە دەسووڕێتەوە.

## پەخشانی

قەڵەمی بەبڕشت و داهێنەری عەلی لە سێ مەیداندا کەوتۆتە جووڵە:

١- وتاری ئەدەبی: ئەمەیان زۆری دەسنووسە و کەمی بڵاوکراوەتەوە. زۆربەی وتارەکانی پێوەندییان بەشیعرەوە هەیە، پەخشانی لە پێناوی ناسینی شیعر بەکارهێناوە، بایەخی بەڕووداوی مێژووی نەتەوەی کوردی داوە.

٢- لێکۆڵینەوە: لە لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ئەدەب سەرکەوتووە. ئەحمەدی خانی جێگەی تایبەتی بووە لە بیری عەلیدا، تێبینی و بۆچوونی ژیرانەی هەیە لە بابەت مەم و زین و نۆباری بچووکان، هەندێ لایەنی نهێنی ئەم بەرهەمانە ئاشکرا دەکا.

٣- شاعیر بایەخی بەوەرگێڕان داوە. لە عەرەبی و ئینگلیزییەوە نووسینی داهێنراو و زانستی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.



## نموونەی شیعری

١

بەناوی «غەزەل»ەوە لە شیعرێکیدا عەلی دەڵێ:

مەڵێ گیانم بڵند پەروازە ئێمشەو
لەگەڵ دڵ چونکە یارم سازە ئێمشەو
چ ئاهەنگێ دەگێڕێ دڵ لە سینە
هەزارێکی چ خۆش ئاوازە ئێمشەو
لە دوو چاوی نیگارم دا دیارە
ستارەی بەختەکەم هەورازە ئێمشەو
بەڕاستی دڵ گوشاد و بەختیارم
لە لام جەژن و شەوی دڵخوازە ئێمشەو
دەوامی بێ خودایە نیعمەتی تۆ
کە نازی یارەکەم شانازە ئێمشەو
خەیاڵم بۆ شکاری شیعری ناسک
لە ئاسمانی غەزەلدا بازە ئێمشەو

لەم شیعرەدا عەلی گەشبینە، هەر خۆی دەزانێ چی بزەیێکی پڕ لە ناز و نیگایێکی تێلاوی چاوی پڕ لە نووزی دیوە، ئەوەندەی شاعیر نزیکبوونەوەی دلبەری پێ خۆشە، زیاتر ئەم مژدەیە دەبێتە هۆی ئیلهام بۆ نووسینەوەی غەزەلێکی تازە.

٢

لە پارچەییێکی دیکەیدا عەلی دەڵێ:

بەقوربان ئاگری دووریت لە دڵدا جۆشی تەندوورە
ئەگەر مەیلێ نەفەرمووی تاقەت و خۆشیم لە تەن دوورە
وەکو یاقووب نەماوە نووری چاوم هێندە بنوارم
وەکو یاقووت ئەوەندەی گریەکەم فرمێسکەکەم سوورە

شەو و ڕۆژ بێ خەو و خۆراک و بێ وەستان و سەرگەردان
دەسووڕێم ئۆقرە ناگرم زامی دڵ هێندە بەناسوورە
وەهات شێواندووم خەڵکی بەشێت ناوم دەبەن هێشتا
لە لام هەروەک خەڵاتی لێوتە ئەم ناو و ناتوورە

لەم شیعرەدا عەلی لاساییەکی وەستایانەی شیعری کلاسیکی کردۆتەوە، لە شیعردا بێ گومان نوێخوازە، ئەو چەند شیعرەی لەسەر مەرجەکانی بەحری عەرووزی دایناون بۆ ئەوەیە بڵێ دەتوانێ هەموو جۆرە شیعرێک دابنێ. لەمەدا ئاوڕی لە هەندێ وێنەی ڕەوانبێژی کلاسیکی داوەتەوە وەکو «تەندوور» بۆ مانایێک «تەن دوور» بۆ مانایێکی دیکە. هەروەکو ئەو «یاقووب» و «یاقووت»، هەرچەندە مۆدەیان لە سەدەی بیستەمدا بەسەرچوو بوو، بەڵام وەک وێنەی هونەری جوانییان تێدا ماوە.

٣

لە شیعرێکیدا بەناوی «کەسک و سوور» شاعیر دەڵێ:

هەموو ڕۆژێکی بەهاران
کە تاو تاو دەبارێ باران
کە دەردەکەوێ شۆخ و شەنگ
جوان بووکی ژێر ئاڵای حەوت ڕەنگ
سەیری دەکەم مەست و دڵشاد
پەرواز دەکا گیانی ئازاد
دەمەوێ وەک جاری جاران
ڕاکەم و تەڕم کا باران
ئەی کەسک و سوورەکەی بەهار
بەبیرت دێ دەهات بەغار
منداڵێک تەمەن هەشت نۆ ساڵ
مەستی نەشئەی خەون و خەیاڵ
ئێستاش ئەو دڵ منداڵە هەر
پیری نەکردووە دەردی سەر



هەموو ڕۆژێکی بەهاران
کە تاو تاو دەبارێ باران
دەیەوێ وەک جاری جاران
ڕاکات و تەڕی کا باران

خوو و ڕەوشتی مرۆڤ بەسەر ناچێ، چێژ و خەیاڵ پیر نابێ، یادگار و بیرکۆن نابێ و لە بیر ناچێتەوە، لە سەرووی هەموویانەوە دڵداری بەڕوخسار دەگۆڕێ و بەناوەڕۆک نەمر و هەمیشەییە. هەندێ وێنەی جوانی عەلی لەم شیعرەدا لە پەراوێزی ئەم بیروباوەڕەدا خۆیان دەنوێنن.

٤

لە شیعرێکیدا بەناوی «سکاڵا» عەلی دەڵێ:

نە کاغەزی بۆ دەنێرم
نە بای شەماڵ ڕادەسپێرم
نە هەڵدەکێشم ئاخی سەرد
نە کەللەی سەر دەدەم لە بەرد
نە ڕۆژ یادی بەهار دەکەم
نە بەشەو شینی پار دەکەم
نە خەیاڵ نە بیرەوەری
هیچ نەما گشتی هەڵوەری
وەک گەڵای ئەم دارستانە
بەم وەرزی چلەی زستانە
درەختێکم ڕووت و بێ بەر
بەفری سپیم نیشتۆتە سەر

شاعیر تووشی ڕەشبینی بووە، وا دەزانێ ئەوەی هەوڵی بۆ دەدا قەت دەستی ناکەوێ، لەبەرئەوە سوورە لەسەر ئەوەی واز لەو دڵدارییە بێنێ، بەڵام مەسەلە بەدەست خۆی نییە، لەو کاتەدا نایەوێ نامەی بۆ بنێرێ، بەڵام لە دواییدا بێ گومان پەشیمان دەبێتەوە چونکە پێش ئەو دڵداران لە قسەی ئەویش زلتریان وتووە.

له شیعرێکیدا بەناوی «خەونێکی خۆش»ەوە لە ساڵی ١٩٥٧ لە دیمەشق هۆنیویەتییەوە دەڵێ:

ماچێک لەم دوو لێوەی پڕت
بۆنێک لەم بن مەمکەی خڕت
بەناز بڕۆ
وەک ئاوازەی فۆکستڕۆ
وەک شنەی با
پێ دانێ سەر باری ڕۆمبا
خێرا وەرە نێو باوەشم
ئەی ئاواتم بەختم بەشم
دەستەکانت بکە ملم
مەمکۆڵەت دانێ سەر دڵم
سا دەی ئۆخەی ئۆخەی
ئوخەخەخەخەی

***

نە بێهۆشی
نە سەرخۆشی
خەونێکی خۆش و شیرین بوو
بووکی خەونەکەش هێلین بوو

ڕەشبینی شاعیر لە شیعری پێشوو، لە هەڵوێستێکدا دروست بوو، ئەم شیعرە لە هەڵوێستێکی دیکەی پڕ لە گەشبینی دروست بووە. جێگە هۆڵی سەما و مۆسیقا و گۆرانییە، بەتایبەتی ئەو سەمایانەی ژن و پیاوێک پێکەوە دەیکەن. عەلی کچێکی جوانی دیوە ناوی هێلین بووە، خۆی دەیزانێ خەڵکی سووریا و لبنان یا ئەوروپایی بووە، دوور نییە عەلی سەمای لەگەڵ هێلیندا کردبێ، چونکە کچی ئەم جۆرە شوێنانە ئارەزووی پیاو ڕەت ناکەنەوە. هەرچۆنێ بێ ئەم هەڵوێستە بۆتە مایەی داهێنانی ئەم شیعرە لیریکییە جوانەی سیمای مرۆڤایەتی و گێتی پێوەیە.





عەلی لە ساڵی ١٩٥٦ شیعری «چرای سوکرات»ی داناوە:

برای من
وەرە پێش چرای من
نەوەک چرایانە
بێ ژمار پەروانە
بەدەورەیدا دەفڕن
شەوقی لێ وەردەگرن
دەبن بەترووسکە
بەگڵپە و برووسکە
وەک خۆرەتاوی پاک
جیهان دەکەن ڕۆناک

***

ئەی شەمشەمەکوێرە
بەدوورکەوە لێرە
بڕۆ بەدوورکەوە
بۆت ناکوژێتەوە
چرای من ڕاستییە
شەوقی سەربەستییە
بەخوێنە سۆتانی
شەهیدە زمانی
برای من
وەرە پێش چرای من

عەلی لە ساڵی ١٩٥٦ ئەم شیعرەی بەزمانی باوکی فەیلەسووفانی گریک سوکرات وتووە. ئەم دانا گەورەیە خاوەنی وتەی «خۆت بناسە»یە. دادگای پیرەکانی ئەتینا بڕیاری خنکاندنی بۆ دەرکردبوو، بەژەهراو خواردنەوە کۆتایی بەژیانی هێنا.

شاعیر بەسەر بیری سەربەستیخوازی سوکرات هەڵدەڵێ، کڕینی سەربەستی بەخوێن کارێکی ئاساییە وەکو سوکرات خۆی دەیڵێ.

***

عەلی فەتاح دزەیی شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیرێکی هاوچەرخ بوو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. شاعیر بوو، هەموو قۆناغەکانی شیعری کوردی دەورکردبووەوە. بەشداریکردنی لە چەسپاندنی «شیعری نوێ» لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە بەرچاوە. جگە لە بەرهەمی داهێنراو لە شیعر و پەخشان، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی هەیە، بەتایبەتی لە بارەی کێش و قافیەی شیعری کوردی و مەم و زین و نەوباری بچووکانی خانییەوە.

# بەشی چل و سێیەم

## عاجز

**۱۹۲۹ - ۱۹٦۷**

### ژیانی

عـەبدوڵڵا کـوڕی مـەلا مـحـەمـەدی حـوسـێنی بەرزنجی، وشـەی «عـاجـز»ی وەک نـازناو هەڵبـژاردووە و لە شـیـعـریدا بەکـاری هێناوە. لە سـاڵی ۱۹۲۹ لە گـوندی چل هەوێزە لە نزیک دیبـەگـە لە پـارێزگـای هەولـێـر لە دایک بووە. قـۆناغـەکـانی خـوێندنی لە حـوجـرەی مزگەوت بووە، بایەخی بەتەجویدی قورئان داوە. زۆربەی ماوەی خوێندنی لە گوندی زیخان لە ناوچەی خۆشناوەتی بووە، ماوەییێکیش لە زێوەی خۆشناوەتی خوێندوویەتی، ئینجا هەر لەوناوە لە گـوندی خـەتە بەشـێکی دیکەی خـوێندنی بردۆتە سـەر. لە پاشـانا هەر بۆ ئەم مەبەسە ڕووی کردۆتە ڕواندز و لە دواییدا گەڕاوەتەوە هەولێر و لە مزگەوتی حاجی قادری دەباغ ئیـجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. لە دوای ئیـجازە وەرگـرتن لە هەندێ لە ناوچەکـانی کوردستان لە مزگەوت مەلایەتی و پێشنوێژی کردووە. لە گوندەکانی هەرمەک و دەراش لە خۆشناوەتی مەلا بووە. ئینجا بووە بەمەلای گوندی گۆمەشین لە دەشتی قەراجی هەولێر، لە پاشانا گەڕاوەتەوە گوندی کۆتەی خۆشناوەتی، ئەوجا گوندی شاوێس لە نزیک هەولێر. لە دوای ئەمە لە لایەن کارگێڕی ئەوقافەوە بووە بەمەلا لە خورماڵ، لە پاشانا لە چەمچەماڵ. لە دواجاردا گەڕاوەتەوە هەولێر و بووە بەمامۆستای قوتابخانەی ئەوقاف و لە مزگەوتی حاجی بەکریش بووە بەئیمام و خەتیب.

لەپڕ عاجز تووشی نەخۆشییێکی دژوار بووە، بردوویانە بۆ نەخۆشخانەی هەولێر بەڵام بێ ئەنجام بووە، ناچار بردوویانە بۆ مـووسڵ لەوێش چاری نەکراوە، بەم جۆرە لە ۲ی مـایسی ۱۹٦۷ لە مـووسڵ کـۆچی دوایی کـردووە و تەرمـەکـەیان هێناوەتەوە هەولـێـر و لە نـزیک مزگەوتەکەیەوە بەخاکیان سپاردووە.



### شیعری

عـاجـز حـەزی لە خـوێندنەوەی شـیـعـری کـلاسـیکی کـوردی بووە، هەروەها بـایەخی زۆری بەئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) داوە. لە ئەنجامی ئەمە گوێییێکی نەرمی مۆسیقی لە لا دروست بووە بەگشتی بۆ بابەتی شیعری ئایینی و دڵداری بەکاری هێناوە.

شیعری عاجز لە ڕووی ڕوخسارەوە بریتییە لە پارچە غەزەلی کورت (لیریک) لەسەر بەحری عەرووز و یەکێتیی قافیە و پاش قافیە دامەزراوە. شیعری زۆر نییە بۆیە بەشێکی کەمی لە دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە، بەم پێیە پاش قافیەشی زۆر نییە. جگە لە غەزەل شیعری بەندی چوارینی و پێنجینی عەرووزی هەیە (ا ا ا ب) و (ا ا ا ا ب).

لە شیعری سیلابی خۆماڵیدا بەزۆری بابەتی بەندی چوارینی (ا ا ا ب) بەکارهێناوە، لە ڕووی کێـشـەوە بەگـشـتی لەسـەر کێـشی حەوت بڕگـەیی و هەشت بڕگـەیی ڕۆیشـتـووە. لە ڕووی ناوەڕۆکـەوە شـیـعـری عـاجـز لە چوارچێـوەی دڵداری شـێـوەی کـلاسـیکی و ئایینی (موناجات و نەعتی پێغەمبەر "د. خ") نەچۆتە دەرەوە. ئەوەی تازە بێ لە لای ئەم شاعیرە ئەوەیە قاڵبی کێشی شیعری خۆماڵی میللی لەگەڵ شیعری ئایینی گونجاندووە. بەشێکی زۆر لە شیعرە ئایینییەکانی لە ڕووی کێش و قافیە و زمانی شیعرییەوە لەسەر بنچینەی بەیتی ئەدەبی میللیی فۆلکلۆری هۆنراونەتەوە. ئەمەی بۆ ئەوە بووە لە ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر ئەم شیعرانە لەسەر ئاوازی گۆرانییە میللییەکان بخوێنرێنەوە بەتایبەتی لە ناو کۆمەڵی خەڵکی هەولێر.

عـاجز شیعری هەندێ شاعیرانی کوردی کردووە بەپێنج خشتەکی لەوانە: عاسی، مەلا شێخ عومەری بالیسانی، راجی، تاهیر بەگ، وافی.

### نموونەی شیعری

#### وەسف و دڵداری

**۱**

لە شیعرێکیدا عاجز دەڵێ:

شۆخـەکەی بێ ڕەحم و ئینسـاف قـاتیلی جانم وەرە
باعـیـسی گومراهی ڕووح و شێخی سـەنعانم وەرە

دڵ هەمیشە ئینتیزاری لوتف و ئینعامی تووە
دەردەمەندی قامەتی تۆم چاو بەگریانم وەرە
دڵ وەکو بولبول دەناڵێ تالیبی ئاوی گوڵە
هەر ئەتۆی پرشەنگی ژینم ماهی تابانم وەرە
گیان و دڵ بۆ تۆ نەماوە پڕ لە ئاه و حەسرەتە
سینە پڕ جۆش و خرۆشە جانی جانانم وەرە
دائیمەن وەک سۆفی مەجزووبە بەعیشقی دلبەران
تا نەفەوتاوم عەزیزم پێشی فەوتانم وەرە
عاشقی وەک من لە بۆ تۆ زەحمەتە پەیدا ببێ
چاوەڕێی تۆم زوو لە بۆ باغ و گوڵستانم وەرە
پاییزی هیجرانی تۆ وا ڕەنگی رووی زەرد کردووم
هەم لەبەر ساردی فیراقت ڕوو لە کێوانم وەرە
(عاجز)م ڕووحی ڕەوانم پڕ لە ئێشە جەرگ و دڵ
تۆی تەبیبم زوو لە بۆ دەرمانی دەردانم وەرە

شیعرێکی ئاسایی دڵدارییە، شاعیر گفتوگۆ لەگەڵ دلبەری خۆشەویستی دەکا، لێی دەپاڕێتەوە. وشەی «وەرە»ی کردووە بەپاش قافیە بۆ ئەوەی لە هەموو دێڕە شیعرێکیدا بڵێ «وەرە تیماری دەردم بکە». لە لیریکەکەدا هەست بەڕەوانییێک دەکرێ. ئەگەر شاعیر وشەی «تووە»ی لەباتی «تۆیە» و هەندێ وشە و تەعبیری دیکەی لەم بابەتەی بەکارنەهێنایە کەس نەیدەزانی شاعیر هەولێرییە و دیالێکتی بچووکی شار یا سۆرانی کرمانجی باشووری زمانی کوردی بەکارهێناوە.

## ٢

لە شیعرێکی دیکەیدا عاجز دەڵێ:

ئەی سەنەم تاکەی بناڵم من لە دووری ڕێ و خێ
بەس بەناحەق پێم پیشان دە غەین و ڕێ وو بێ وو تێ
غوربەتیش یەک جار وەها زوڵمە لە عاشق چاوەکەم
مروەتت بێ پێم بفەرموو ڕێ وو حێ وو میم و تێ



ڕەحمەتت وەسڵە لە بۆ من ئەی گوڵی باغی ئیرەم
تۆم بەسە هەتتا لەباتی حۆری جیم و نوون و تێ
جەننەتی من قامەتی سەروی تووە و گوڵزارەکەی
پڕ لە نارنج و لیمۆی سین و پێ وو نوون و هێ
سینە پڕ سۆزە لە تاووت وەک سەماوەر وا لە جۆش
وا نەزیک سووتانەکەم کە حەرفی ئەلف و گاف و ڕێ
ئاگری عیشقت لە بۆ من ئەستەمە ئەی دلبەرم
زێدە گەرمە مەیلی وەسڵی حێ وو سین و نوون و تێ
حوسنی تۆ بێ شک گەیشتە حەدد و میقداری نیساب
موستەحەققم بێنە حیسسەی زێ وو کاف و ئەلف و تێ
بۆ زەکاتی باغ و بێستانی جەمالت هاتووم
نامەوێ زیاتر لە حەققی شین و ڕێ وو عەین و بێ
پڕ خرۆشە دڵ وەکو بولبول لە دەوری غونچە گوڵ
جارێ دڵ خۆش کە حەبیبم عەین و ئەلف و جیم و زێ (عاجز)

عاجز لەم لیریکەدا خۆی خەریکی گەمەیێکی ڕەوانبێژی کردووە لەسەر دەستووری هەندێ لە شیعری کلاسیکی کۆن. لە نیوە دێڕی دووەمی هەموو دێڕەکان دەنگ و وێنەی هەندێ لە تیپی ئەلفوبێی نووسیوە، لە نیوە دێڕی یەکەمی هەموو دێڕەکاندا تیپەکانی کۆکردۆتەوە و بوون بە وشەی یەکەمی دێڕی دوای ئەو، واتە دەنگەکانی غەین و ڕێ و بێ و تێ دەبن بە «غربت» (غوربەت)، ڕێ و حێ و میم و تێ دەبن بە«رحمت» (ڕەحمەت)...

## ٣

شیعرێکی میللییانەی عاجز بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

ئەی گوڵڕوخی زیبایی من
قەد سەروی دڵ ڕوبایی من
مەلحەمی جان شیفایی من
جاری نەزەرکە لایی من

***

ڕەحمێ بکە بەبولبولان
بۆ دەفعی ئازاری دڵان
هەر تووی غونچەی باغی گوڵان
لای دڵی بێ نەوایی من

بەم دێڕانەش کۆتایی پێ دێنێ:

غەمگین و پڕ لە داغە دڵ
چاونۆڕەبێ لەو باغە گوڵ
کە چونکە شەوچراغە شل
گڵۆپی کارەبایی من

***

جەفا بەسە وەفا بکە
(عاجز) بە وەسڵت شا بکە
لە غەمخۆری ڕەها بکە
ئەو دڵی موبتەلایی من

ئەم شیعرە هەشت بڕگەییە لە ئەدەبی میللی سەرزاری کوردی یەکێکە لە کێشەکانی شیعری گۆرانی. عاجز ئەم جۆرە شیعرەی تەنیا لە ڕووی ڕوخسارەوە دەستنیشان نەکردووە بەڵکو لە ڕووی ناوەڕۆکیش بۆ بابەتی شیعری ئایینی بەکاری هێناوە. ئەم جۆرە شیعرانە ئەوەندە لە ئەدەبی میللییەوە نزیکن ئەگەر ناوی شاعیریان تێدا نەبێ بەگۆرانییێک لە گۆرانییە تازەکان دەژمێررێن کە لە ناو میللەت دروست دەبن و کەس نازانێ خاوەنیان کێیە!.

**شیعری ئایینی (موناجات و نەعت)**

١

عاجز قەسیدەییێکی (بەیتێکی) ئایینی درێژ بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

ئەی سەییدی سەرداری من
ئەی مەحرەمی ئەسراری من



ئەی ئەحمەدی موختاری من
سەڵات لەسەر توو یاری من

***

موددەیکە هیجر و ماتەمە
تاکەی بمینم لەم غەمە
هەروەکو جاران کۆلەمە
با بەس بێ ئینتیزاری من

بەم دێڕانەش کۆتایی پێ دێنێ:

حەمزە و ئەبووبەکری سدیق
فارووق و عوسمانی حەقیق
بەموئمینی دەبوون ڕەفیق
لەگەڵ شێری شکاری من

***

(عاجز) فەقیری ئوممەتە
سائیلی بابی ڕەحمەتە
هەر چاوەنۆڕی هیممەتە
بۆ دەفعی نالە و زاری من

عاجز ئەم شیعرەی بۆ ستایشی پێغەمبەر داناوە، بەسەرهاتی دەگێڕێتەوە بەپێی سەرچاوەکانی ئایینی ئیسلام و حیکایەتەکانی ئەدەبی میللی سەرزاری عەرەبی و کوردی. بەناوی هەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی پێغەمبەر و خەلیفەکانی ڕاشیدی کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ.

٢

شاعیر لە قەسیدەییێکی ئایینی دیکەیدا لە ستایشی پێغەمبەر بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

تو ئەحمەدی موختاری
موقەڕڕەبی غەففاری

شافیعی توڕەداری
لێتبێ سەلامی باری

***

خاکی حیجاز فیدامە
کۆلەی شاه و گەدامە
هەتا ڕۆژی قیامە
نیازی دڵمە یاری

بەم دێڕانەش کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

زەمانە پڕ جەفایە
هەرچی هەیە بەڵایە
فیتنە لە فیتنەدایە
لە دێهات و لە شاری

***

(عاجز) ئەگەرچی خواری
لە دەرگەی شەرمەزاری
مەئیووس مەبە لە یاری
شافیعتە لای غەففاری

لەم شیعرەدا عاجز باس لە هەندێ شەعائیرەکانی حەج و کۆچی پێغەمبەر لە مەککەوە بۆ مەدینە دەکا و لە پێشوازی خەڵکی ئەو شارە دەدوێ و چۆن بەخۆشییەوە پێشوازی ئەو میوانە گەورەیان کردووە.

***

عەبدوڵڵا کوڕی مەلا محەمەدی بەرزنجی ناسراو بە(عاجز)، شاعیرێکی تەمەن کورت بووە، لەبەرئەوە شیعری کەمە. ئەوەی هەیە لە پلەیێکی هونەری دایە ئەدەبی کوردی دەیگرێتە خۆی. مەشقی شیعری عەرووزی و کێشی خۆماڵی هەیە. بایەخی بەشیعری ئایینی و دڵداری داوە، ناوەڕۆکی ئەم جۆرە شیعرانەی لەگەڵ هەردوو بابەتە شیعرییەکەی گونجاندووە، واتە لەگەڵ بەحری عەرووز و خۆماڵی، بەتایبەتی ئەو شیعرە ئایینییانەی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی دایناون. ئەمانە بوون بە بەشێک لە سامانی ئایینی ئیسلام



بەزمانی کوردی، چونکە بەزمانی ئاسانی زۆربەی میللەت نووسراون و لە ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر بەئاوازی گۆرانی کوردی گۆنیدەکان دەیچڕن.

# بەشی چل و چوارەم

## کامەران موکری

**۱۹۲۹ – ۱۹۸٦**

### ژیانی

محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی تەها ناسراو بەکامەران موکری لە ساڵی **۱۹۲۹** لە سلێمانی لە دایک بووە. بنەچەیان دەگەڕێتەوە ناوچەی موکریان. لە پێشانا ماڵیان گواستۆتەوە پشدەر و لە دواییدا هاتوونەتە سلێمانی و لەوێ ژیاون. کامەران برای شاعیری کورد ئەخۆڵە لە دایکەوە.

سەرەتا خوێندنی شەش ساڵی قوتابخانەی لە سلێمانی تەواو کردووە، لە دواییدا ناوەندی و تا گەیشتۆتە قۆناغی ئامادەیی. لەو سەردەمەدا دەستی کردووە بەجموجۆڵی سیاسی، لە بەرەی داواکردنی مافی کورد بووە. لە پێناوی کوردایەتی وازی لە خوێندن هێناوە. لە سەرەتای ساڵی **۱۹٤۹** گیراوە. نزیکەی شەش ساڵ لە تەمەنی لە بەندیخانە جیاوازەکانی عیراق بردۆتە سەر. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا لە بەندیخانەیێک رزگاری بووبێ یەکێکی دیکە چاوەڕێی کردووە. لە خۆپیشاندانە سیاسییەکاندا بەشداری کردووە، دوانی داوە، شیعری خوێندۆتەوە. لە دواندا بەتوانا بووە، دەموپلی لە قسەکردندا وەک ئەکتەرێکی لێزان خستوویەتییە ڕوو. لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی **۱۹٥۸**ی بەغدا دەستی کرد بەجموجۆڵی خوێندەواری. لە ساڵانی **۱۹٦۰ – ۱۹٦۱** سەرنووسەری کۆواری «ڕۆژی نوێ» بوو لە سلێمانی. لە دوای کوودیتا فاشستییەکەی ٨ی شوباتی **۱۹٦۳** و بەدرێژایی شەستەکانی سەدەی بیستەم دەنگی کامەران کپ بوو، وەکو زۆربەی ڕۆشنبیرانی کورد. لە دواییدا لە بەشی زمانی کوردی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای سلێمانی بەمامۆستای موحازیری ئەدەبی کوردی دامەزرا. تا کۆتایی ژیانی لەسەر ئەم کارەی مایەوە. لە کاتی گواستنەوەی زانستگای سلێمانی (**۱۹۸۲**) بۆ هەولێر و گۆڕینی ناوی بۆ «زانستگای سەلاحەدین» کامەرانیش ماڵی گواستەوە هەولێر و لەم شارەدا مایەوە تا ڕۆژی ٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی **۱۹۸٦** کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەی برایەوە سلێمانی و لە گۆڕستانی گردی سەیوان بەخاک سپێررا.



### شیعری

بەقسەی کامەران خۆی لە ساڵی **۱۹٥٤** دەستی داوەتە شیعر نووسین، بەشێکی کەمی بەناوی ڕاستەقینەی خۆی حەمەی ئەحمەدی تەها بڵاوکردۆتەوە. وا دەردەکەوێ باوەڕی بەخۆی نەبووە دەبێ بەشاعیر، تا ساڵی **۱۹٥۷** ئینجا هەستی بەوە کردووە بووە بەشاعیر و ناوی «کامەران»ی هەڵبژاردووە وەک نازناوی شیعری لە دواییدا موکری کردووە بەلەقەب بەناوی ئەوەی بنج و بناوانی خێزانیان لە موکریان بووە. بەم جۆرە ناوبانگی شاعیرێکی تازەی کورد لە ساڵی **۱۹٥۷** لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و کۆوارە کوردییەکانی ئەو سەردەمە کەوتە ناوەوە.

کامەران یەکێکە لەو شاعیرانەی بەرهەمی شیعری دەچێتە ناو بزووتنەوەی شیعری نوێوە، بەتاقیکردنەوەی شیعری کلاسیکی عەرووزی و یەکێتیی قافیە تێنەپەڕیوە، ئەگەر تاک و تەرا بەرهەمی لەم بابەتەی هەبێ نایخەنە پلەی شاعیرێکی بەرچاو.

### شیعری لە رووی ڕوخسارەوە

خاسیەتەکانی شیعری کامەران لە ڕووی ڕوخسارەوە تایبەتمەندیان تێدایە، بەم تێبینییانەی لای خوارەوە هەندێ ڕوون و ئاشکرا دەبنەوە.

١- کامەران تەنیا کێشی سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە، لە ناو ئەمانەشدا زۆربەیان لە کێشە سووکەکانی حەوت و هەشت و دە بڕگەییین. شاعیر ئەم کێشانەی لە شیعری میللیی سەرزار وەرگرتووە، لە ناو ئەمانەدا کێشی دە بڕگەیی زۆر باوە بۆ هەموو مەبەسەکانی شیعر بەکار دەهێنرێ بەتایبەتی بۆ شیعری درامی. دوو کێشەکەی دیکە حەوت و هەشت بڕگەیی بەگشتی لە شیعری میللیی سەرزار بۆ گۆرانی و سروود و شیعری منداڵان و مەتەڵۆک بەکار دەهێنرێن، لە شیعری نوێشدا لە بابەتی دڵداری و ویژدانی و ناوەڕۆکی سووک و ساکار و شیعری مانا لە ڕوو دەبینرێن.

لێرەدا ئەگەر تەماشای بەرهەمی کامەران بکرێ ئەوە دەردەکەوێ لە سەدا هەشتای لەسەر کێشی هەشت بڕگەییە. ئەوانی دیکەی لەسەر کێشی دە بڕگەییە. ئەوەی جێی سەرنج ڕاکێشانە ئەوەیە کامەران چۆن توانیویەتی بەشی هەرە زۆری شیعری لەسەر کێشی هەشت بڕگەیی بهۆنێتەوە ئەوەی بە هەرمێنترین کێشێکە لە گۆرانیی میللیی سەرزاری کوردی (فۆلکلۆر)، وەکو لە گۆرانییێک هاتووە:

چاوت ڕەشە بەخومارەوە
مەمکت سێوە بەدارەوە
خودا داویە مەیشارەوە

ئەم دیاردەیە لە لای کامەران دەکرێ بەدوو جۆر لێک بدرێتەوە. یەکێکیان وەستایەتی شاعیر دەنوێنێ چۆن توانیویەتی ئەم هەموو ناوەرۆکە جیاوازانە لەگەڵ تاکە کێشێک بگونجێنێ! ئەوی دیکەیان ئایا کامەران لەم سنوورە تەسکەی کێشدا توانیویەتی زاڵ بێ بەسەر چێژی خوێنەری و گوێی ڕابێنێ ئەم هەموو شیعرە لە قاڵبی کێشێکدا قورس نەبێ لە لای لەگەڵ ئەوەی سووکترین کێشی خۆماڵی شیعری کوردییە!

٢- بەشێکی کەم لە شیعری کامەران ئەو پارچە لیریکانەن لە شیعرێکدا چەند کێشێک بەکار دێنێ وەکو خۆیان یان بەکەرتکردنیان، وەک لە کەرتکردنی دە بڕگەیی پێنج بڕگەیی دروست دەکا، یا لە هەشت بڕگەیی چوار بڕگەیی دروست دەکا.

٣- قافیەی شیعری کامەران لەو شیعرانەی لەسەر یەک کێش داینراون جووت قافیەیە (مەسنەوی)، ئەوانەی لەسەر کێشێک زیاتر هۆنراونەتەوە قافیەیان ڕەنگاوڕەنگە.

٤- زمانی شیعری کامەران ئاسان و ڕەوانە، وشە و زاراوەی کوردی پەتی بەکار دێنێ بەتایبەتی لە لیریکەکانیدا چونکە زمانی ئەو جۆرە شیعرە میللییە پێویستی بەوشەی بێگانە نییە. بەپێچەوانەوە شیعرە سیاسییەکانی ئەوانەی بەزۆری کوردایەتییان تێدا دەکا، زاراوەی زانستی و وشەی بێگانە بەکار دێنێ. زمانی بەگشتی دەوڵەمەندە، ڕەنگدانەوەی لێکسیکۆنی گوندایەتی و ناوچە کشتوکاڵییەکانی دوور لە شارە.

## شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە

ناوەڕۆکی شیعری کامەران لە ڕووی جوانکارییەوە بەرزە و داهێنانی تێدایە، بەڵام لە ڕووی بابەتەوە تەسکە و هەموو گێتیی فراوانی شیعری نەگرتۆتەوە بەڵکو لە دەوروبەری بابەتەکانی خەباتی کورد لە پێناوی ڕزگاری و هەندێکیش ئەنتەرناسیۆنالیزم و دڵداری ڕۆمانتیکی دەسووڕێتەوە. ئەو ڕووداوانەی کاریان لە شاعیر کردووە بریتین لە بەسەرهاتی سیاسی و هەڵسان و ڕاپەڕین لە کۆمەڵدا، قەومانی کارەسات لە سروشتدا وەکو بوومەلەرزە و لافاو، یا مردنی گەورەپیاوان. ئەم جۆرە شیعرانەی لە قاڵبی تەسکی کلاسیکی هێناوەتە دەرەوە و بەخەباتی نەتەوەیی و هەندێ بەخەباتی چینایەتی بەستۆتەوە.



شیعری کامەران برووسکەیێکی کورتە بەقەوارە لەو هەواڵە سیاسییانە دەکا کە لە ڕۆژنامەکانا بڵاو دەکرێنەوە، ئەم دیاردەیە تەنیا لە شیعرە کورتەکانیدا دیار ناکەوێ، لە شیعرە درێژەکانیشیدا دێرە شیعری یەکێتیی خۆی هەیە، جگە لەوە چەند دێڕێک یا چەند بەندێک کە یەکێتییان تێدا هەیە دەتوانرێ بەشیعرێکی سەربەخۆ بژمێررێ. بۆ بەڵگە ئەو شیعرە سیاسییانەی لەسەر کێشێکی دیاریکراو دانراون، بەئاسانی دەتوانرێ تێکەڵ بەیەکتری بکرێن بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکرێ لە یەک بابەت نین.

## کامەرانی ڕۆشنبیر و نووسەر

کامەران لە نێوان ساڵانی ١٩٥٢ – ١٩٥٧ کۆمەڵێک چیرۆکی بڵاوکردۆتەوە پێش ئەوەی وەک شاعیرێک لەسەر پێ بوەستێ و نازناوی کامەران بۆ خۆی هەڵبژێرێ. چیرۆکەکانی بەژمارە شەش بابەتن: سزا، ئەم ئینسانانە، نانی سیلاوی، کۆتەرە خەڵووزێک، لە بیابانێکدا، مانگ و دڵێکی بەسەزمان.

ئەم تاقیکردنەوە کەمە لە مەیدانی چیرۆکدا لە ژیانی ئەدەبی کامەران بەڵگەی شارەزاییی لە نووسینی چیرۆک و زانینی زمانی کوردییە. جا ئەمە پێشدەستییێک بوو واز لە چیرۆک بێنێ و خوو بداتە شیعر! یا ئەگەر هەر لەسەر نووسینی چیرۆک بەردەوام بوایە دەگەیشت بەچی! هەروەها شیعری لە ڕووی هونەرییەوە دەگاتە چیرۆکەکانی! ئەمانە هەمووی پرسیارن لە ئەنجامی بەراوورد لە نێوان بەرهەمی پەخشان و شیعری کامەران وەرام دەست دەخرێ.

چیرۆکی کامەران لە بابەت ژیانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵە، بەشی گوند و شاریان تێدایە. قارەمانەکانی بەگشتی دەوڵەمەند و هەژاری شار و لادێکانن. لە هەندێ چیرۆک بیابانی عەرەب بووە بەشانۆی ڕووداو، کەسی عەرەب بووە بەقارەمانی گێڕانەوە وەکو چۆن لە شیعریشدا لەسەر جەمیلە بووحێردی جەزائیری دەکاتەوە. حەسەن جاف بەجوانی بۆ ئەم مەسەلەیە چووە لە بابەت کامەرانەوە دەڵێ مرۆڤی نەتەوەپەروەری ڕاستەقینە گشت نەتەوەکانی جیهانی خۆش دەوێ و بەمەش دەگاتە چڵەپۆپەی مرۆڤایەتی.

ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی لە ژیانی هەژاران و دەستدرێژی دەوڵەمەندان و گیانی ئەنتەرناسیۆنالیزمی لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم لە ئەدەبی کوردیدا هەوێنی ئەو چیرۆکانە بوو لەبەر ڕۆشنایی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی نووسەرانی کورد دەیانهێنانە بەرهەم.

ئەم چیرۆکانەی کامەران ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی ئەو سەردەمەنە و دەچنە ڕیزی ئەو چیرۆکانەی لەو کاتەدا دەنووسران و بڵاودەکرانەوە.

جگە لە چیرۆک کامەران وەکو ڕۆژنامەنووسێک لەو کۆوارانەی سەرپەرشتی کردوون یا ئەوانەی وتاری بۆ نووسیوون هەندێ نووسینی هونەری ڕۆمانتیکی شیعر شێوازی بڵاوکردۆتەوە، ئەمانە دەچنە خانەی داهێنانی ئەدەبییەوە. هەروەها هەوڵی داوە لە بارەی مێژووی ئەدەب و ڕەخنە هەندێ وتار بنووسێ، ئەم کارانەی بە بەرهەمی زانستی دەژمێررێن لە ئەدەبدا ناگەنە ئەو پلە هونەرییەی کارە داهێنراوەکانی لە شیعر و چیرۆکدا.

## نموونەی شیعری

### کوردایەتی

١

لە شیعرێکیدا کامەران دەڵێ:

گوڵاڵەی شادیم لە گەشە دایە
هیچ بایێک نییە هەڵیوەرێنێ
دڵیشم وەکو پارچەی پۆڵایە
کەس توانای نییە تێکی شکێنێ

***

شەهید کە چاوی ژیانی لێک نا
گەر بەر ئەبێتە وڵاتی ئارام
دوا گەردشی سوور لەگەڵ دوژمنا
بەزاڵ بوونی کورد ئەگاتە ئەنجام

لەم شیعرەدا وێنەی هونەری کامەران بریتییە لە دوو برووسکە، لە قاڵبی چواریندا، یەکەمیان گوڵاڵە سوورەی سەرکەوتن هیچ بایێک نایوەرێنێ، دڵیشی وەک پۆڵایە تێکشکانی بۆ نییە. کورد ئەگەر ئامادە بێ شەهید بدا، هەر دەگاتە هیوای خۆی.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:



ژین لە لای دڵسۆز هەر تێکۆشانە
هەوڵە بۆ خاکی ئەم کوردستانە
خۆزگە ئەندازەی ژیان و تەمەن
تێکۆشان بوایە بۆ خاکی وەتەن
ئاخۆ تەمەنی کام دڵسۆزی کورد
لە چوار پێنج ساڵێ تێپەڕی ئەکرد

لەم شیعرە جوانەدا کامەران ئاوات دەخوازێ بۆ ئەوەی کاشکی تەمەن پێوانە بوایە بۆ ژیان، ئەو کاتە تەمەنی هەموو دڵسۆزێکی کورد لە چوار پێنج ساڵ تێپەڕی نەدەکرد. ئەم شیعرە لە دروشمی سیاسییەوە دوورە، بەهەناسەیێکی ڕۆمانتیکییانە لە واقیعی بەردەوامی کورد دەدوێ لە خەباتیدا لە پێناوی مافە نەتەوایەتییەکانی.

٣

لە شیعرێکیدا بەناوی «پێڵوو»، کامەران یادی دوو قارەمانی کوردستانی ئێران عەلیی شێرزاد خانی بۆکانی و برای دەکاتەوە:

لەپڕ پەنجەی ناسکی گەست
خوێنی گەشی ڕایەڵەی بەست
بەو خوێنە ڕووی کوڕی ڕەنگ کرد
ووتی بژی ڕووسووری کورد

بەدرێژایی ڕۆژگار میللەتی کورد شەهیدی داوە، زۆرینەی کوڕی کورد ڕوویان بەو خوێنە شۆراوە. ئاوڕدانەوەیێکی دیکەی کامەرانە بەمەبەسی داهێنانی شیعری لە چوارچێوەی کوردایەتیدا.

٤

کامەران لە ژیاندا لەگەڵ کۆڵنەدانە، ئەمەی تەنیا بۆ ئادەمزادی کورد نییە، بەڵکو لە هەموو دیاردەیێکیدا دەیبینێ. لە لیریکی «ئەستێرە و مەل و خەزان»دا دەڵێ:

ئەو گوڵەی خەزان وەرانی و نەمرد
ئەو دڵەی ناسۆر لە هیوای نەکرد
ئەو پرپشکانەی دامردنەوە
بەڵام هەمیسان گریان گرتەوە

ئەو ئەستێرەیەی کشا بۆ ناوچەم
لە سەرەمەرگا خەندەی لەسەر دەم
ئەو مەلەی بای وەشت باڵی هەڵوەران
لە بەستە ووتن نەکەوت لە ئاسمان
وان لە ناو دڵی منا میوانن
چونکە نموونەی قەت کۆڵ نەدانن

شاعیر دەنوارێتە گوڵ و دڵ و ئەستێرە و باڵدار ئەمانە وەک ڕەمزی کۆڵنەدان دەکەونە بەرچاوی. ئەمانە لە ناو دڵی شاعیر دان چونکە لە ژیانا جگە لە خەبات کاری دیکەیان نییە، تا ئەو کاتەی کۆتاییبیان دێ دەمیان لە بزە و خەندە ناکەوێ.

## وەسف و دڵداری

١

کامەران کیژۆڵەیێکی خۆشویستووە، لە شیعرێکیدا بەناوی «گڕ» بەم جۆرە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکا:

کە پرچت ئاڵان لە گەردن
گڕت بەردا لە دڵی من
کە پەرچەمت ڕشتە سەر ڕوو
ئاگر لە دەروونم بەر بوو
ئەی زۆرداری جوانی بچووک
تکایە کچی ئێسک سووک
لێرەوە مەیە شەیدام بۆت
وەباڵی دڵم بەئەستۆت

بەشێوەیێکی ساکاری ڕۆژهەڵاتیانە کامەران قسە لەگەڵ ئەو کیژۆڵەیە دەکا. ئەگەر ئەم شیعرە لە دیوانی ئەم شاعیرە نەخوێندرێتەوە لەوانەیە بیری خوێنەر بۆ شیعری میللیی سەرزاری فۆلکلۆری ناوچەی سلێمانی بڕوا.

٢



کامەران لە بینینی کیژۆڵەکەوە باز دەداتە لای ژنێک بۆ ئەوەی وەسفی جوانی بکا، لە شیعری «ئەو ژنە»دا دەڵێ:

گوڵی پاراو کاتێ کە دێتە شنە
جوانتر نییە لەو ڕوومەتە خڕپنە
گڕی کاڵی پشکۆی کەمێ گەشاوە
ڕەنگی جوانی ناگا بەو بەرگەردنە
نەغمەی باغی شەوی بەشەونم شۆراو
بەسۆز نییە وەک تریفەی ئەو ژنە
هەنگی چرپەی لەرەی بەژنی ناسکی
مۆسیقای گیان ئاواتی دڵی منە
هەرچەند ئەکەم ووشەیێکم بۆ نایە
بێهاوێمە بەردەمی ئەو شەرمنە

ڕوومەت و گەردن و ڕەوت و بزە و کردەوەی دیکەی ئەو ژنە لەگەڵ شتومەکی ناو سروشت و گوڵ و ئاواز و دیاردەی دیکە بەراوورد دەکا. ئەو ژنە شەرمنە ئەوەندە جوان و دڵگیرە شاعیر نازانی چۆن شیعرێکی بۆ بڵێ، شیعر بەشی جوانییەکەی ناکا.

٣

لە شیعرێکیدا بەناوی «تەلار» کامەران دەڵێ:

من ئاواتێکم هەبوو زوو
وەک خەوی خۆش لە دەستم چوو
یارێکم هەبوو وەک باڵدار
فڕی بۆ ناو کۆشک و تەلار
مەل بۆ گریا نەگریام خۆم
سەرم نەنایە سەر ئەژنۆم
ئەی گوڵی گەشاوەی بەهار
با تۆ ماچ کەم لەجیاتی یار

شاعیر دڵی چۆتە کچێکی جوان، لەبەر هەر هۆیێک بێ پێی نەگەیشتووە، چونکە

شووی بەخاوەن کۆشک و تەلارێک کردووە، لەبەرئەوە لە پێش چاوی کامەران کەوتووە. بۆیە بەگوڵاڵە سوورەی بەهار دەڵێ تۆ ماچ دەکەم لەباتی یار.

**یادی بێ نەوایان**

کامەران لەو کاتەی بەگشتی بیری لە چارەنووسی میللەتی خۆی کردۆتەوە، لەگەڵ هەست و نەستی هەژاران و بێ نەوایانی سەر ڕووی زەوی بووە.

١

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

هەزاران مانگی تریفەی زیوین
لە دڵی منا ئەدرەوشێنەوە
گوڵ بەمیلیۆنان هی سوور و زێڕین
لە باغی دڵما ئەگەشێنەوە
ڕووناکی لە ناو دڵێکا ئەبێ
هەژاران تیایا نەچەوسێنەوە

لە ناو مێشک و خەیاڵ و چێژی شاعیردا هەزاران وێنەی خۆشی خۆیان دەنوێنن، کەچی دڵ ڕووناکی تێ ناکەوێ تا هەژار لەسەر ڕووی زەوی بمێنێ.

٢

لە شیعرێکی تازەی سەر بەبزووتنەوەی شیعری نوێ (ڕۆمانتیکی) بەناوی «تینوومە» کامەران دەڵێ:

ئەمڕۆ تینوومە
زۆرم تینووە هەروەک بیابان
لمی سووتاوم تاسەی تاساووم
تینوون بۆ نەختێک دڵۆپی باران
سادەی هەورەکەری ژیان! بارانێ
ڕامالێت پووشی نائومێدی دڵ
خەندە و گریانێ
شۆڕشی لێشاو



با هەستێ بەتاو
بۆ سەر قەڵاکەی سەختی دەروونی
سزا و نەبوونی
دەرهێنێ لە بێخ ژاڵەی پەژارە
ژیانم تاڵە
ئەمڕۆ تینوومە هەروەک بیابان

لەم شیعرەدا ڕەشبینییانە کامەران دەنوارێتە ژیان، هەرچی مەینەتیی خەڵکی چەوساوەی سەر ڕووی زەوی هەیە کەوتۆتە ناو دڵی ئەوەوە. دیارە بەشی نەتەوەی خۆی لە هەموویان زیاترە. شێوازی سیمبۆلی بەکارهێناوە بۆ دەربڕینی ئەوەی لە خەیاڵی دایە. لیریکەکە وەک نموونەیێکی جوانی «شیعری نوێ»ی کوردی دەکەوێتە بەرچاو.

**لافاوەکەی ساڵی ١٩٥٧ی سلێمانی**

بەهۆی لافاوەکەی سلێمانییەوە کامەران قەسیدەیێکی درێژی پۆیێم ئامێزی هۆنیوەتەوە بەناوی «لافاو»ەوە. ئەو شیعرە دەوری گرنگی هەبوو بۆ ناوبانگی دوارۆژی کامەران وەک شاعیرێک. لە هەڵبژاردەی ئەو شیعرەدا دەڵێ:

ئەی فرمێسکی لێل بلەرزە
لە عەزرەت باران و تەرزە
دیسان هەستی هۆنراوەی دڵ
وەکو مەنجەڵ هاتۆتە کوڵ

***

گۆیژە گریا گریا بەخوڕ
لافاو هەستا بەتین و گوڕ
خوێناوی شاخی مات و تەزیو
خانووی ڕائەدا بۆ ناو شیو
بێشکەی منالی ئێسک سووک
بوو بوو بەگۆڕێکی بچووک
خانووی گڵی کۆڵانی تەنگ

ئەكەوتە ناو گۆماوى مەنگ
كە پەنگى ئەخواردەوە ئاو
ئەيزريكان سوپاى لافاو

***

ئێوارە بوو لێشاوى سوور
هەر لاشەى ئەهێنا لە دوور
دەمێك سەريك و پرچى زەرد
تاوێك دەس و پەنجەى بێگەرد

***

ئەبێ ساڵى جارێك ئێرە
وێران كا بيكا بەگێرە
ئەبێ شينێك هەر ساز بكا
خەڵكى وا پەرەواز بكا
دەرگاى شاديمان دابخا
ئالاّى ڕەشمان بۆ هەڵبكا
نيوەشەو بوو دەنگێ هەڵسا
بانگى بەناو شارا ئەدا
ئەيووت ئەوى ماڵوێرانە
ڕوو بكاتە خەستەخانە

ئەم قەسيدەيە وەسفێكى فۆتۆگرافيانە و هونەرييانەيە بۆ لافاوەكە. شاعير جەوهەرەكانى چيرۆكى مەلحەمى بەكارهێناوە لە بابەتى تراجيديا. ناوى جێگە و ڕێگە و خەڵك هاتووە. زيانى لافاو زياتر بەر هەژاران كەوتووە لە ئەنجامى ڕووخانى خانوويان چونكە لە گڵ دروست كراون. ئەمە يەكەمين كارەساتى سلێمانى نييە لەو كاتەوە كە لە نيوەى دووەمى سەدەى هەژدەم بناغەى لێدراوە تا ئێستا. كۆتايى تراجيدياى كامەران بەوە هاتووە دەڵێ ئەوەى كارەساتى بەسەرهاتووە ڕوو بكاتە نەخۆشخانە و مردووى خۆى بدۆزێتەوە.



**بۆ قازى محەمەد**

لە ڕۆژى **٣١**ى مارتى **١٩٤٧** لە لايەن ڕژێمى كۆنەپەرستى ئێرانەوە قازى محەمەد لە سێدارە درا. درەنگتر بەهۆى بيرەوەرى شەهيدبوونى قازى لە ساڵى ١٩٦٠ كامەران شيعرێكى هۆنيوەتەوە بەناوى «ئاگرى ڕووت»ەوە، لە هەڵبژاردەيدا دەڵێ:

ئەى پێشەوا
يادت لە دڵما ناڕوا
بيروباوەڕى گەشى تۆ
وەكو ديارى گڕ و پشكۆ
ڕژايە سەر سەهۆڵى ژين
بەفرى پەروا و ترس و بەزين
ڕاماڵى كەژى دواكەوتن
دارستانى سامى مردن

***

ئالاّى كورد لە دڵ و چاوا
لە كەژا جۆگەى خوێناوا
بۆ ئەم گەلەى هى تۆ و منە
ووردە ووردە كەوتە شنە

***

ئەى پێشەوا
تۆى نموونەى گەشى بڕوا
دواى كۆچى تۆ براى ڕەنجبەر
لاوى بێ پەرواى تێكۆشەر
پێچاوى پشتێنى نەبەزين
بۆ هەڵمەت بۆ ڕۆژى خوێنين

***

دەس هەڵنەگرێ تا كوردستان
ڕزگار ئەبێ ئەى قارەمان

ئەی ئاگری ڕووت پێشەوا
یادت وەک گوڵاڵە ڕووا

شاعیر لەگەڵ پێشەوا دەدوێ، ئەوە دەردەبڕێ ڕاستە ئەو لەسەر مەسەلەیێک لە سێدارە دراوە، بەڵام مەسەلەکە نەدۆڕاوە بەڵکو ئاگری خەبات بەگڕتر بووە، هەروەکو قازی خۆی لەسەر قەنارە وتبووی، ئێوە تەنیا قازییێک لەناودەبەن، بەڵام کورد زۆرن. شاعیر بەڵێن دەداتە پێشەوا کە ڕۆڵەکانی سوورن لەسەر هێنانە دی هیوا و ئامانجیان بەهەر نرخێک بێ.

**بۆ شێخ مەحموود**

لە یادی ساڵی یەکەمی کۆچی دوایی شێخ مەحموود لە ساڵی ١٩٥٨ کامەران قەسیدەیێکی ماتەمنامەی داناوە بەناوی «شێخ مەحموودی نەمر»ەوە، لە هەڵبژاردەی ئەو شیعرەدا دەڵێ:

بۆت ئەڵێم لە دێڕی شیوەن
دوور لە ووردەکاری و لە فەن
کام ووردەکاری کام هونەر
هەڵبەستی جوانی وەک گەوهەر
ئەتوانێ وەسفی تۆ هەرگیز
بنێتە سەر کاغەز بەڕێز

***

گەورەپیاوەکەی نیشتمان
هەمیشە زەردەخەنەی جوان
لەسەر لێوی وەک زیوی خاو
یا وەک گزنگی خۆرەتاو
بریسک و هۆڕی بوو شیرین
وەکو نیشانەی نەبەزین
لە دەربەندی بازیان کە هات
کڵپەی ئەسەند گڕی خەبات



بەتاو کە هێرشی ئەبرد
ئەینرکان و بانگی ئەکرد
مردن بۆ گەل شانازییە
دڵم بەو مەرگە ڕازییە

***

لەبەر فرمێسکی لێڵ و خوڕ
خامەکەم هەرچەند هاتە گوڕ
نەیتوانی بنووسی پتر
بۆ یادی کۆچ کردووی نەمر
هەر ئەوەندە بڵێم مەگەر
گیانی پیرۆزی تێکۆشەر
ئەوی ئالاکەمان پێدا
وا لە ناو دڵی ئێمەدا
ئیستە لە یاد بۆی ئەچنین
وێنەیێکی جوان و شیرین
ئاخۆ کەی بێ کورد لە گەوهەر
لە یاقووت بۆی بکا پەیکەر

کامەران شانازی بە سەرداریکەوە دەکا لە هێڵی جەنگا لە پێشی پێشەوە بووە، تەنیا بەرنامەی ستراتیجی بۆ جەنگ دانەناوە، وەکو سەربازێکی سوپایی لە مەیدانی جەنگدا بریندار کراوە. بەلای شاعیرەوە شێخ ئەوەندە گەورەیە لە توانای خەیاڵی شاعیردا نییە ئەوەی پێویستە بۆ ستایشی ئەو بینووسێ، لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر چاوەنۆڕی ئەوەیە نەتەوە بگاتە ئامانج ئەو کاتە لە جەواهیر و یاقووت پەیکەرێک بۆ شێخ دروست دەکا.

**بۆ جەمیلە بووحێرد**

جەمیلە بووحێرد کچە قارەمان و موجاهیدی جەزائیری بوو. کامەران لە ساڵی ١٩٥٨ شیعرێکی ستایش و پێداهەڵدانی بۆ هۆنییەوە بەناوی «جەمیلە»وە. لە هەڵبژاردەی ئەو لیریکەدا دەڵێ:

ئەی جەمیلە
سڵاو لە ئاگر و ژیلە
لە حەیرانا لە لاووکا
کاتێ کچ لەگەڵ باوکا
هەڵمەت ئەبەن بەرەو مردن
بەرەو قەڵای سەختی دوژمن
لە هێرشی سەرکەوتنا
لە کاتی بۆ گەل مردنا
کاتێ لە نزار لە مەڵبەن
ئەمان سووتێنن بۆ وەتەن
ناوت وەکو ووشەی نەمر
ئەڕژێتە ناو گەرووی ئاگر

***

ئەی باڵندەی هەستم بەگوڕ
بفڕە بۆ ناو بڵێسە و گڕ
بۆ جەزائیر خاکی ژیلە
بڵێ بەخۆشکە جەمیلە
سڵاوی گردەکەی سەیوان
سڵاوی گەرمی نیشتمان
پێشکێش بەتۆ ئەی کچی لاو
ئەی پەروەردەی گڕ و خوێناو
ئەی خاکی ئاگر و ژیلە
هەزار سڵاو لە جەمیلە

ئەم شیعرە سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەیە کامەران بەناوی کورد و کوردستان و سلێمانی و گردی سەیوانی مەڵبەندی شەهیدانەوە بۆ جەمیلە بووحێردی جەزائیری دەنێرێ. ئەم شیعرە ڕەمزی هاوکاری ئەنتەرناسیۆنالیزمییە لە نێوان میللەتە ستەمدیدەکانی سەر ڕووی زەوی. کارەساتی نەتەوەیی کورد و جەزائیرییەکان لە زۆر شت لە یەکتری دەکەن. هەرەوەزی لە



نێوان چەوساوەکان لە دژی چەوسێنەرەکان لە دەرەبەگ و سەرمایەداران دیاردەیێکە هەموو گێتیی گرتبووەوە. لەبەرئەوە لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی جەزائیر کارێکی ئاسایی بوو جەمیلە بووحێرد مێرد بەکابراییێکی فرەنسی بکا، چونکە میللەتی فرەنسەی خۆش دەویست و لە دژی دەستدرێژی ئەمپریالیستی فرەنسی بوو. هەروەها کابرا فرەنسییەکەش دۆستی خەڵکی جەزائیر و دژی فەرمانڕەواکانی دەوڵەتی خۆی بوو.

**بۆ مستەفا بارزانی**

لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی بەغدا کە مەلا مستەفا بارزانی لە ڕووسیا (یەکێتیی سۆڤیەتی ئەو کاتە) بەڕێگەی ڕۆمانیاوە گەڕایەوە نیشتمان کامەران بەشێوەی برووسکە لە شیعرێکیدا بەناوی «بارزانی»یەوە پیرۆزبایی لێ کرد. لە هەڵبژاردەی شیعرەکەدا دەڵێ:

ڕۆمانیا
بۆ وولاتی ڕۆمانیا
شەقامی تاسەی دیداری
کۆشکی ڕۆڵەی کوردەواری
گەورەم کە نامەکەتان هات
نامەی ئاگرینی خەبات
هەموو ئازاری لەشم لەرزی
ووشە لە ناو دەمما تەزی
گەورەم! وا میلیۆنان کۆتر
جێیان هێشت باغی پڕ ئاگر
بەری ئاسمانیان ڕێک تەنی
بەپۆل هاتوون بۆ دیدەنی

***

سڵاو لە ئێوە و لەوانە
کە تیشکن بۆ ئەم ژیانە
کە بوون بەپێشڕەوی کاری
ڕزگاربوون لە چنگ زۆرداری

هاوڕێم هەزار سڵاو
لە ئێوە و لە لەشکری لاو

بەتاسەوە میللەتی کورد بەگشتی لە دوای جەنگی دووەمی گێتییەوە بیری لەو ڕۆڵە بارزانیانە دەکردەوە ماوەیێکی زۆر لە ناو ژیانی سەختی ئاوارەییدا تەمەنیان بردەسەر، بەتایبەتی لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایی ستالین و جەعفەر باقیرۆڤی ئازربێجانی دوژمنی کورد. کە هەواڵی گەڕانەوە بلاوبووەوە جێی شادمانی هەموو کورد بوو. هەزاران هەزار ئاشتیخواز پێشوازییان لە بارزانی کرد و گوشادی خۆیانیان پێ ڕاگەیاند. کامەران یەکێک بوو لەوانە، بەختیار بوو بەوەی ئەو بارزانییانەی لە کاتی خۆیدا لە زۆرداری ئێرە ئاوارەبوون، ئێستا لە زۆرداری ئەو جێیەی لێی بوون ڕزگارییان بوو.

**دوا شیعری کامەران**

پێش کۆچی دوایی کامەران لە ساڵی ١٩٨٦ لە هەولێر شیعرێکی هۆنیوەتەوە، لە پاشانا بەناوی «دوا شیعری کامەران»ەوە بلاوکراوەتەوە:

قژت لادە لەسەر کوڵمی پشکۆی ئاگر
لەسەر سنگ و لاملی وەک کلووی بەفر
لەگەڵ تۆمە ئەی دوا تیشکی خۆرەتاوم
دوا پریشکی دڵی دامرکاوم
لەگەڵ تۆمە دوا دێڕی عەشقی ژیانم
دوا هەنسک و دوا قەترەی ئەشکی گریانم
تاکەی ئەنواڕیتە لێڵی گۆمی چاوم
ڕووی بەخەفەت و پەژارە هەڵقرچاوم
ئەو ووشەیەی لە ناو دڵتا قەتیس ماوە
بیدرکێنە نە ئاگرە و نە لافاوە
ئەم دڵ لێدانەی شاعیر مەڕەنجێنە
بەو ووشەیە دڵی شیعرم بجووڵێنە
تەنیا جارێ پێم بڵێ من تۆم خۆش ئەوێ
بەڵکو ئەم دڵە گرۆزەم پێی بسرەوێ



ئەم شیعرە سیمبۆلی ڕۆمانتیکییەی کامەران جەوهەر و حەقیقەتی دڵداری دەخاتە ڕوو و ئەو تیۆرییە بەڕاست دەزانێ کە دەڵێ ئەگەر دڵداری نەبێ شیعریش نابێ، شاعیری ڕاستەقینە جوانکاری بۆ هەر مەبەستێک بەکار بێنێ دڵداری لە بیر ناکا.

***

حەمەی ئەحمەدی تەهای ناسراو بەکامەران موکری. نووسەر بوو، وتار و چیرۆکی دەنووسی. لە پاشانا خۆی گواستەوە بۆ مەیدانی شیعر، دەیتوانی خەریکی هەردووکیان بێ، کەچی لە دواییدا لەسەر شیعر نیشتەوە. ئەم شاعیرە دیاردەیێکی دەگمەن بوو لە ئەدەبی کوردیدا. لە قاڵبی تەنیا یەک دوو کێشی سیلابی خۆماڵی زۆربەی هەرە زۆری شیعری لە قاڵب دا. ڕەنگە ئەم کارە بۆ خوێنەر مەلەلێک پەیدا بکا. بەڵام چۆن ئەم شاعیرە توانی ئەم هەموو بابەت و هونەرە شیعرییانە لە یەک دوو کێشی سیلابی خۆماڵی کۆبکاتەوە!.

کامەران موکری یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی کورد لە مەیدانی شیعری نوێدا ئەوانەی ئاوڕیان لە شیعری کلاسیکی و بەحری عەرووزی نەداوەتەوە.

## بەشی چل و پێنجەم

## حەسیب قەرەداغی

**۱۹۲۹ - ۱۹۹۷**

### ژیانی

حەسیب کوڕی عەلی کوڕی عەبدولڕەحمان ناسراو بەحەسیب قەرەداغی لە ساڵی ۱۹۲۹ لە گوندی سۆڵەی چرچە قەڵا لە ناوچەی قەرەداغ لە دایک بووە. باوکی مەلای مزگەوتی گوند بووە و بەلای چینی هەژارانا شکاوەتەوە. سەرەتای خوێندنی حەسیب لای باوکی بووە لە حوجرەی مزگەوت، کە قوتابخانە لە گوندەکەیاندا کراوەتەوە لە پۆلی سێیەم وەرگیراوە، لە پاشانا قوتابخانەی سەرەتایی لە قەرەداغ تەواو کردووە. لە ساڵی ۱۹٤۷ لە ئاوەدانی مەحاویل لە ناوچەی حیللە بووە بەقوتابیی خانەی مامۆستایانی هەرێمە کشتوکاڵییەکان. بەهۆی ڕووداوە سیاسییەکانی عیراق لە ساڵی ۱۹٤۸ کە لە دواییدا بەوەسبە «وثبة» (ڕاپەڕین) ناوی دەرکرد لەو خانەیەدا دەرکرا و گەڕایەوە سلێمانی. لە ساڵی ۱۹٤۹ بوو بەقوتابیی قوتابخانەی ناوەندی لە سلێمانی بەهۆی کاری سیاسییەوە بۆی نەکرا تەواوی بکا و ناچار گەڕایەوە گوندی سۆڵە تا ساڵی ۱۹٥٤ لەوێ ژیانی بردەسەر و ئەوجا گەڕایەوە سلێمانی. لە کاتی هەڵگیرسانی کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ۱۹٥۸ی بەغدا حەسیب وەکو زۆربەی خەڵکی عیراق پێشوازییێکی گەرمی کرد. لە دوای کوودیتا فاشستییەکەی ۸ی شوباتی ۱۹٦۳ وەکو خەڵکێکی زۆری عیراق زیندانی کرا و تا ناوەڕاستی ساڵی ۱۹٦٥ لە بەندیخانەی نوگرەت سەلمان لە باشووری عیراق مایەوە.

لە ساڵی ۱۹٦٥ەوە تا ساڵی ۱۹٦۹ لە بەغدا بەماڵ و منداڵەوە ژیانێکی هەژارانەی بردبووە سەر. ئەو سەردەمە هەڵسوکەوتێکی تایبەتی لە ناوەوە بوو لە عیراق و کوردستانی عیراقدا. نێوانی دەسەڵاتی بەغدا و شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ۱۹٦۱ی کورد هەندێ هێوور بووبووە و هێمن و لەسەرخۆ بوو. لەو ساڵەدا (۱۹٦۹) لێبووردنێکی گشتی لە دەسەڵاتی بەغداوە دەرچوو لە بابەت هەموو ئەو کەسانەی بەهۆی سیاسییەوە لە مووچەخۆری میری دوور خرابوونەوە. حەسیب بەر ئەو لێبووردنە کەوت، بەمووچەخۆرێکی بچووک لە کارگەی



چیمەنتۆی سەرچنار لە سلێمانی دامەزرا.

گەورەترین کارەساتێک لە ژیانی شاعیری دڵ ناسک ئەوە بوو لە ساڵانی ۱۹۸۳ و ۱۹۸٤دا دوو کچی لە هەرەتی گەنجێتیدا کەژاڵ و بەهار لەناکاو هەڵوەران. ئەمە لە پەلوپۆی خست و بۆ ماوەیێکی زۆر هەست و نەستی هەژاند. شیعری بۆ ئەم کارەساتە وت، بەڵام ئەوەندە دژوار بوو شاعیرییەتی دەرەقەتی نەدەهات و ئەو شیعرانەی لە ڕووی هونەرییەوە نەگەیشتنە پلەی ئازاری کارەساتەکە. زیاتر لە دە ساڵیش لە پاش ئەو ڕووداوە حەسیب لە ژیاندا مایەوە تا لە ڕۆژی ٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۹۷ لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد.

### شیعری

حەسیب دەیتوانی ببێ بەشاعیری بەرەی کلاسیکی و شیعر لەسەر بەحری عەرووز و یەکێتیی قافیە بهۆنێتەوە، چونکە لە نێوەندی خوێندنی بەرایی لە حوجرەی مزگەوت گوێی بەکێشی ئەو جۆرە شیعرە ڕاهاتبوو. بەڵام زوو هاتە سەر سیستێمی شیعری نوێ بەبێ ئەوەی مەرجەکانی شیعری کۆن بخاتە پشتگوێ. بەم جۆرە زۆری بەرهەمی شیعری حەسیب ڕێگە بۆ ئەوە خۆش دەکا بووترێ لە هەموو بابەتەکانی شیعری کوردی هەیە لە کۆن و تازەدا. جگە لە بەحری عەرووزی بایەخێکی زۆری بەکێشی سیلابی خۆماڵی داوە، هەموو کێشەکانی بەکارهێناوە بەتایبەتی کێشە سووکەکانی ۷ و ۸ و ۱۰ بڕگەیی. لە «شیعری نوێ»یدا ۸ بڕگەیی و ۱۰ بڕگەیی کەرت دەکا و دەیانکاتە ٤ بڕگە و ٥ بڕگە، بەم جۆرە دێڕە شیعری ٤ بڕگەیی و ٥ بڕگەیی دروست دەبێ. هەروەها بایەخ بەو بابەتە شیعرە میللییانە دەدا کە لەسەر کێشی دە بڕگەیی دادەمەزرێن و لە ڕووی قافیەوە دەچنە ناو جووت قافیەوە (مەسنەوی).

یەکێ لە خاسیەتە تایبەتییەکانی شیعری حەسیب ئەوەیە لە لیریکێکدا دوو بابەتە کێش بەکار دێنێ بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی، ئەم دیاردەیە زۆرتر لە شیعرە کورتەکانیدا دیاردەکەوێ.

ناوەڕۆکی شیعری حەسیب دەوڵەمەندە گەلێ لایەنی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی دەگرێتەوە. دڵداری و وەسفی سروشت جێگەی دیاریان هەیە، بەڵام بەگشتی لە مەبەسەکانی دیکەی شیعردا دەتوێنەوە. حەسیب شاعیری غەمخۆری کوردە، لەسەر هەژار و بێ دەسەڵات و بێ نەوایان دەکاتەوە، دژی ئەمپریالیستەکانی ڕۆژئاوایە، ڕق و کینی بەرامبەر بەدوژمنانی

کورد بەتینە. لەو کاتەی وەک کەسێکی پڕ لە گیانی نەتەوەیی دێتە بەرچاو، لەسەر هەموو چەوساوەکانی مرۆڤایەتی دەکاتەوە.

پێوەندی کۆمەڵایەتی فراوان بوو، لە نزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵ خوێندەوار و ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەر و گۆرانیبێژ و هونەرمەندان هەبوو، شیعری ستایش و پێداهەڵدانی برادەرایەتی نووسیوەتەوە بۆیان، یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی بەشێکی زۆر لە بەرهەمی شیعری دەچێتە ناو خانەی شیعری هاوڕێیەتی لە ستایش و پێداهەڵداندا.

حەسیب ئیلهامی تەنیا لە خەیاڵی کەسێتی خۆی وەرنەگرتووە. لەم لایەنەوە سەرچاوەی گەلێ زۆرە. لەوانە، وردە گێڕانەوەی ئەدەبی میللیی سەرزار و قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و شیعری کوردی کلاسیکی و شیعری شاعیرانی سەردەمی ژیانی خۆی و هەروەها شیعری نەتەوە موسوڵمانەکانی هاوسێی کورد و شیعری نەتەوەکانی ئەورووپای کۆن و تازە، لەوانەوە شیعری بۆ دەهات، لە ڕووی ڕوخسارەوە شیعری لەسەر کێش و قافیەی ئەوان دەهۆنییەوە. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بەشێکی وەکو خۆی وەردەگرت، بەشێکی دیکەی بەدەسکارییەوە دایدەڕشتەوە، لە هەندێکیشیانا وێنە و بیری تازەی لێ دروست دەکردنەوە. شەقڵی ئەم هەموو سەرچاوانە بەسەر هەندێ لە بەرهەمی شیعریدا دیارە.

## بەرهەمی شیعر

### جەژنانە

١

حەسیب جەژنانە لە دلبەری داوا دەکا:

ڕۆژی جەژنە چاوەکانت جوانە جەژنانەم ئەوێ
من بەهەڵپەم چاوەکانم! جامێ پێوانەم ئەوێ
سەروی باڵات نەوبەهارە و باغی سینەت پڕ لەبەر
خوانی تۆیە پڕ لە نانە بۆیە لەو نانەم ئەوێ
وەک هەژارێ هاتمە دەرگات وا لە دەرگای تۆ ئەدەم
خاوەنی باغ و بەهاری وەرزی ئەو دوانەم ئەوێ
من سەرم گەرمی شەرابی عەشقە بۆچی بێ مەزەم
من مەزەی مزری هەنار و سێوی ئەو بانەم ئەوێ



چونکە گیانم وا لە کوڵدا و کوورەیە ناخی دڵم
بۆ ئەوەی دڵ دابمرکێ یاری دێوانەم ئەوێ
ڕۆژی جەژنە و سواڵکەرێکم بێ حەیا و بێ شەرم و ڕوو
وا بەکوردی پێت دەبێژم پێکی لێوانەم ئەوێ

لە دەستپێکردنی خوێندنەوەی ئەم شیعرە خوێنەر ئەو شیعرە جوانەی دێتەوە یاد کە زێوەر لە ساڵی **١٩٢٣** بەهۆی جەژنێکی ئاینییەوە پیرۆزبایی جەژنی پێشکێش بە شێخ مەحموود کردووە:

ڕۆژی جەژن ئەتفالی وردە پوولی جەژنانەی ئەوێ
هەریەکە لای باب و مامی ڕوپیە یا ئانەی ئەوێ

حەسیب لە ڕوخسارا تەنیا کێش و ڕیتم و قافیەی وەرگرتووە، ناوەڕۆکی نوێیە. ئەوەی زێوەر کۆمەڵایەتییە، ئەمەی حەسیب دڵدارییە، ماچ و مووچ و دەست لە ملانێ و گوشینی مەمکی دەوێ لە دلبەر وەک جەژنانە، پوول و پارە و دیاری دیکەی پێویست نییە.

### ڕووبار

٢

لە لیریکێکیدا حەسیب دەڵێ:

دوو ڕووباری شێت و وێتن مەمکەکانت
بەسینەتا وەکو تاڤگە هاژەیان دێ
کە دەگەنە سەر نەرمایی پێستی سکت
دەبنە دڵۆپی یاقووت و ڕادەوەستن
خۆشییان نایێ لە کرداری ڕێگە بەستن
وردە وردە وەکو دەنووکی نێرەکەو
قوت دەبنەوە قاسپە قاسپێ دەست پێ دەکەن
جام تێدەکەن
بەناو چاوی بیماراندا دێن و دەچن و ڕێ دەکەن
داوای دەستی دڵدار دەکەن
داوای دەمی بەبەی جوان و نازدار دەکەن

داوای تیشکی سوخمە دڕی ئەشعار دەکەن
بۆیە منیش لە سێبەرتا
کێشی هەموو شیعرەکانم
دەبێ بکەم بەکەمەرتا

لەم شیعرەدا دوو مەمکی دلبەر بەدوو ڕووبار دەچوێنێ، لەگەڵ وێنەی داهێنراوی هونەرییانە بەراووردیان دەکا. ئەو مەمکانە خۆشی دەبەخشنە ئادەمزاد، بەوەی داوای دەستی دڵدار دەکەن، کاریان تەنیا ئەم خۆشی گیانییە نییە، خۆشیی مەتریالییان هەیە، شیر دەدەنە بەبەی جوان و نازدار، ڕەمزی ژیان و مانەوەی مرۆڤایەتی.

**گمە**

٣

حەسیب وەسفی دەنگی کۆتر دەکا:

کۆترە گاویلکەی شیعرێ بوو
لەسەر پەرژینی چاوانم بای باڵی دا
زۆری گمان
چاوم باری خەوی خست و
گلێنەشم کەوتە جمە
گوێیان ڕاگرت بۆ ئاوازی
قوول بوونەوە بۆ ناو ڕازی
تمەز بەستەی شاعیرێک بوو
کە دەستی برد بۆ گیرفانی
ئەوسا زانی
شیعر برسێتی ناکوژێ
برسێتیش واز لەو ناهێنێ

خەبات و بۆ یەکتری چوونە مەیدان دیاردەی هەمیشەیییە لە نێوان شیعر یا ڕاستتر داهێنانی هونەری و هەژاری یا برسیێتی. هەردووکیان بەبێ یەکتری هەڵناکەن و دەرەقەتی یەکتریش نایەن. هەژاری مایەی بەشێکی داهێنانی هونەرییە، ئەگەر ئەو نەمێنێ



ئەو سەرچاوەیە کوێر دەبێتەوە، لەبەرئەوە لە لایێکی دیکەوە گریمان ئەگەر هەژاری نەمێنی دەرگای داهێنان داناخرێ، چونکە سەرچاوەیێکی دیکە هەیە «دڵداری» ئەمەیان هیچ کۆتایی نایێ هەتا ئادەمزاد لەسەر ڕووی زەوی بمێنێ.

**کاروان**

٤

لە شیعرێکدا بەناوی «کاروان»ەوە حەسیب دەڵێ:

کە کاروانی ماندووی بادە
دەگاتە هەورازی سەرم
لە ناخمەوە دەکرێمەوە
وەک شۆڕەیی گۆمی ووشک
بەسەر خۆمدا دەشکێمەوە
لە ڕێی خۆری واقیعمان دا
تەپکەی بێژنگ دەنێمەوە
ئەو زۆر قورسە و منیش هیلاک
ئیتر بۆ خۆم دەتوێمەوە
کێ دەتوانێ خەبەر بدا
منی عاشق جارێکیکە دەڕوێمەوە

لەم پارچە لیریکە کورتەدا شاعیر دیمەنێکی ئەفسانەیی تەمومژاوی دەکێشی، لە کاتێکدا سەرخۆشە و هۆشی لای خۆی نییە. لەم وەختەدا دەتوانێ بیر لە شتێک بکاتەوە لە سەردەمی هوشیار ناسەرخۆشیدا ناتوانێ بیری لێ بکاتەوە. دان بەوە دەنێ ژیانی سەختە، ژیانی خۆی و کۆمەڵی، لەو کاتەدا ناتوانێ ئەم سەختییە ببەزێنێ، بەڵام ئایا جارێکی دیکەش دەتوانی هەڵمەت بەرێ و ئەمجارەیان سەربکەوێ!.

## ٥

لە لیریکێکیدا حەسیب دەڵێ:

هۆ ستەمدیدە گەلی کورد جەژنی نەورۆزت بەهات
ئاگری نەورۆز و گڵپەی مەشخەڵن بۆ ڕێی خەبات
تۆ و خەبات و هەوڵ و کۆشش قەت لەیەک جیا نابنەوە
میللەتانی سەر زەمینیش بەم غەمە دەتناسنەوە
تۆ لە کوورەی مامە کاوە پەنگری هەردەم گەشی
بۆ لە مافی زۆر ڕەوای خۆت تاکو ئەمڕۆش بێبەشی
ئەی ستەمدیدە گەلی کورد! ڕێگە هەر ڕێی کاوەیە
ڕابەری ئاڵا و دروشمت هەر هەمان سەرچاوەیە
بەشکراویت بەشخوراویت پێ لە گشت مافت دەنێن
چوونە ناخت وەک جنۆکە و وا لە هۆشیشتا دەزێن
ڕاپەڕینێک! سا درەنگە با هەموومان یەک گرین
گەردەلوولی ئێش و ئازار ڕوو بکاتە یەک برین
با برینمان یەک برین بێ و با غەمیشمان هەر غەمێک
با سروودمان یەک سروود بێ وەک تیۆری سەردەمێک
خاکی کوردستانە غەممان ناوی کوردستان ژەمە
کوردستانە مولکی بابمان خاتوو زینمان بۆ مەمە
قیبلەمان گۆڕی شەهیدە جۆگەیێکمان زەمزەمە
داد و دوژمن بابزانن هەر وەلی یاری شەمە
هەر وەلی یاری شەمە هەر وەلی یاری شەمە

حەسیب ئەم شیعرەی لە پێش جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٩٢ نووسیوە، نەورۆزنامەیێکە یادی ئەم جەژنە پیرۆزە دەکاتەوە، ڕوو دەکاتە کورد و بەگلەییەوە ئامۆژگارییان دەکا، قسەکانی لە ڕووی واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو ڕۆژگارە هەڵقولاوە. شاعیر دەڵێ پێویستە یەک برین و یەک غەم و یەک بۆچوونمان هەبێ لە ڕێی خەباتی ڕزگاری نەتەوەیی،



ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەو ڕۆژگارە، لەمێژ نەبوو کاروباری بەڕێوەبردن لە هەندێ لە ناوچەکانی کوردستانی عیراقدا کەتبووە دەست کورد خۆی، لەو کاتەی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی عیراق لەو ناوچانەدا کشابووەوە. ئیتر کارگێڕانی کوردی ناوچە ئازادکراوەکان بووبوون بەدوو بەشەوە. شاعیر ئامۆژگارییان دەکا بە دووبەرەکی قەت خەباتی نیشتمانی کورد بەڕێکی ناگاتە ئەنجام. حەسیب لەم شیعرەیدا یادی هەندێ ڕەمزی خۆشەویست دەکاتەوە لە مێژووی کۆن و نوێ و ئەفسانەیی و ڕاستی کورد وەکو مامەی کاوەی ئاسنگەر و کاکە مەم و خاتوو زینی بۆتانی و وەلیی دێوانە و شەمی نازەنینی هەورامان.

***

حەسیب قەرەداغی بەدرێژایی ژیانی لە شیعر دوور نەکەوتبووەوە، لەبەرئەوە بەرهەمی زۆرە، دیوانی شیعری گەورەیە، بۆیە لە ڕووی ڕوخسارەوە لە هەموو بابەتە شیعرێکی هۆنیوەتەوە. شیعری کلاسیکیی کۆن و شیعری نوێ، بەڵام هەموویان ڕەنگدانەوەی واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو ڕۆژگارەن کە ژیانی تێدا بردۆتە سەر. شیعری سەر بە ڕێبازە سەرەکییەکانی سەدەی بیستەمی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. دڵداری و وەسفی سروشت جێگەی دیاریان لە بەرهەمیدا هەیە. زۆربەی شیعری دەچێتە ناو خانەی لیریکی، هەرچەندە زاراوەکە لە ڕۆژئاواوە هاتووە، بەڵام بەناوەرۆک لە ناو بەرهەمی نەتەوەکانی هەموو گێتیدا هەیە.

# بەشی چل و شەشەم

## بێبەش

**١٩٣٢ - ١٩٩٨**

### ژیانی

مەرد بە نامەرد ئیشی کەوێ گەر بۆی نەکا پێی مەردییە

مەردیش بەمەرد ئیشی کەوێ گەر بۆی نەکا نامەردییە

مەسعوود کوڕی مەلا عەبدوڵڵای شەنەغەیی لە ساڵی ١٩٣٢ لە هەولێر لە دایک بووە. شەنەغە گوندێکە لە دەشتی کەندیناوەی هەولێر خەڵکی عەشرەتی سیانی لێ دەژی. لەو کاتەی خۆی بەشاعیر ناسیوە نازناوی «بێبەش»ی هەڵبژاردووە، لە هەندێ شیعریدا بەکاری هێناوە. باوکی مەلای مزگەوتی ناو بازاڕی هەولێر بوو (لە هەولێر مزگەفتی ناوەندی باژێڕی پێ دەڵێن). سەرەتای خوێندن و هەموو قۆناغەکانی زانستی ئیسلامی و زمانی عەرەبی لای باوکی بووە.

بێبەش دەنگی خۆش بووە، بایەخی زۆری بەتەجویدی قورئان داوە. شارەزایی لەو هونەرەدا پەیدا کردووە لە ڕووی تیۆری و پراکتیکەوە. لە ساڵی ١٩٥٦ هەندێ لە هونەری تەجویدی قورئانی گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی و بەکتێب بڵاوی کردۆتەوە. بەشێک لە خوێندنەکانی بەدەنگی خۆی تۆمار کراون.

گوزەران و بەڕێوەچوونی ژیانی لە ڕووی داراییەوە لەسەر مەلایەتی بووە. لە مزگەوتێکی بچووکی گەڕەکی خۆیان مەلایەتی کردووە، بەڵام بەگشتی بەپێچەوانەی ژیانی مەلایان لە کۆمەڵی کوردەواریدا ئەوەندە لێیانەوە نزیک نەبووە، زیاتر پێوەندی لەگەڵ ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەر و مووچەخۆران بووە. جوببە و عەمامەی لەبەر نەکردووە، لە پێشانا شەرواڵ و مرادخانی و لە پاشانا ڕانک و چۆغەی لەبەر کردووە.

بێبەش کەسێکی قسە خۆش و گیان سووک بوو، نوکتە لە دەمی نەدەکەوت، لە هیچ پرس و هەڵوێستێکدا دانەدەما، هەولێری زۆر خۆش دەویست، بەدرێژایی ژیانی لێی دوور نەکەوتەوە. تا لە ڕۆژی ٢٥ی مایسی ١٩٩٨ لە هەولێر کۆچی دوایی کرد.



### شیعری

بەهرەی دەنگ خۆشی بێبەش هانی داوە گۆرانی و مەقام بچڕێ و قورئان بەتەجوید بخوێنێ. ئەم دیاردەیە گوێیێکی مۆسیقی هوشیاری لا دروست کردووە و بەرەو گێتیی شیعری کلاسیکی پاڵی پێوە ناوە، چونکە ئەمەش لەسەر ئاواز و ڕیتم دامەزراوە. لە تەمەنی مێردمنداڵییەوە پێوەندی لەگەڵ شاعیرانی دەوروبەری خۆی بووە لە هەولێر، بەتایبەتی لەگەڵ جاهید و پیربال مەحموود. لەگەڵ جاهید هەوڵی داوە پێکەوە شیعر دابنێن. حەزی لە شیعر خوێندنەوە بووە، شیعری زۆری لەبەر کردووە، شانازی بە شێخ ڕەزاوە کردووە و بە مامۆستای خۆی داناوە.

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

بێبەش پێڕەوی هەموو مەرجەکانی شیعری کلاسیکی کردووە. بەگشتی شیعری دەچێتە ناو خانەی شیعری کلاسیکییەوە. لە کێشدا بەزۆری بەحرەکانی ڕەمەڵ و هەزەجی بەکارهێناوە، لە قافیەدا لەسەر یەکێتیی قافیە دەڕوا. زۆرینەی شیعری بەقەوارە کورتن لە بابەتی لیریکن، قەسیدەی درێژی کەمە. بایەخی زۆری بەچوارین داوە، بەشێک لە دیوانی لەم بابەتەیە، هەروەها تاکیش بەرچاو دەکەوێ. لە سیستێمی بەندا (کووپلە) بەندی پێنجین و شەشینی هەیە. لەو کاتەی پێنجین لە دیوانی بێبەشدا بەرچاو دەکەوێ، لەو زیاتر هۆگری پێنج خشتەکی بووە، شیعری کۆمەڵێک لە شاعیرانی کوردی کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە: نالی، حاجی، سانی، وەفایی، حەمدی، سابیری، سافی، بێکەس، کەمالی، مەلا ئەسعەدی مەحوی، جاهید، هێمن، هەردی و هی دیکە.

#### شیعری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

جگە لە دڵداری کە مەبەسی سەرەکی شیعری بێبەشە، ناوەڕۆکی شیعری کوردایەتی ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی لاوانی هەولێری پەنجا و شەستەکانی سەدەی بیستەمە. لەو شیعرانەدا هەستی گیانی نەتەوەیی و سۆزی خۆشەویستی کوردستان لە دڵ و دەروونی گەنجاندا دەجووڵێنێ. ئەو شیعرانە لە هەندێ ماوەی فەرمانڕەوایی دیکتاتۆری و ڕەشبگیری حوکمی عورفی هەرچەندە قەدەغەبوون و بڵاوکردنەوەیان ئاسان نەبوو، بەڵام لە ناو خەڵکی بە ئەزبەر دەخوێنران و لەبەر دەکران.

مەبەسی هەرە گرنگ لە شیعری بێبەشدا ئەو شیعرانەیە لە هونەری بابەتی داشۆرین و

شیعری کراوە (ئیرۆتیک). بێبەش شێخ ڕەزایانە ئەم دوو بابەتەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. بەرهەمی لەم ڕەنگەی زۆرە، بەڵام ئەوە هەیە تا ئێستا بڵاونەکراونەتەوە، بەناوی ئەوەی ئەو شیعرانە بۆ کەسانی دیارکراو وتراون. بنەماڵەی شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەن ئەو شیعرانە ئەگەر بڵاو بکرێنەوە ناوی خاوەنەکانیان پێ دەزڕێ.

## نموونەی شیعری

### دڵداری

لە شیعرێکیدا بێبەش هەستی دەروونی دەردەبڕێ بۆ ئەو خانمەی خۆشی دەوێ، لە ساڵی ١٩٤٩ هۆنیویەتییەوە:

لە عەشقی تۆ ئەزانم من نەجاتم
مەحاڵە تاوەکو مابێ حەیاتم
بەداوی زولفی هارووتت بەقوربان
دڵم بەندە هەتا وەختی مەماتم
لە دڵدا نەقشی بەست نەقشی جەماڵت
هەیە حەقم نەبیتن گەر سەباتم
هەموو دەم ئینتیزارم خوایە کەی دێ
کەرەم کا پێم بدا ماچی زەکاتم
بەعەزمی قەتڵەوە گەر بێیە لامان
موتیعم بەندەتم فەرموو فیداتم
ئەبم بەندەی کەسێک موخلیس بەتۆ بێ
ئەگەرچی غەرقی دەریایی جەفاتم
لە تاریکی فیراقت دامە (بێبەش)
هەموو دەم ئینتیزاری ڕۆژهەڵاتم

شاعیر لەسەر دەستووری دڵداریی شاعیرانی کلاسیک هەرچەندە بەکردەوە دلبەر لەگەڵی خراپ بێ و لێی دوور بکەوێتەوە، ئەو هەر خۆشی دەوێ. هەوڵ دەدا ئەوە بخاتە ڕوو مەسەلەکە بەدەست خۆی نییە. ئاگری دڵداری نهێنی لە ناو دڵیدا نەخشی کێشاوە، چارەسەری بەدەست خۆی نییە، لە تاریکی دووریدا دەژی بۆیە چاوەنۆڕی ڕووناکیی



ڕۆژهەڵاتە، چاوەنۆڕی ئەوەیە ماچێک وەک زەکات لە دلبەر وەربگرێ. ئەمە هەموو ئاواتێکی بۆ دەهێنێتە دی.

### کوردایەتی و نیشتمانپەروەری

١

بێبەش ڕوو دەکاتە ئەو کوردانەی خۆیان بەکورد نازانن و پێیان دەڵێ:

کوردی بۆ حاشا ئەکەی دایم لە قەوم و خوێش و کار
کوردی بۆ کورد نیم ئەڵێی ئەگریت و ڕێگەی چەوت و خوار
کوردی بۆ کەم تێ ئەگەی کەم خۆتی جارێ نا هەزار
کوردی وەک تۆ دەک نەمێنێ کوردی وا بێ شەرم و عار
لاڵ و کەڕ بێ پڕ کەدەر بێ هەر بکێشێ ئاه و زار
سووک و ڕیسوا بێ هەموودەم نەیبێ قەدر و ئیعتیبار

ئەم پارچە شیعرە بەندێکە لە قەسیدەیێکی شەشین، بێبەش لە ساڵی ١٩٥٠ هۆنیویەتییەوە. قسە لەگەڵ هەندێک لە خەڵکی شار دەکا، ئەمانە بە نەژاد کوردن و بەکوردی پەروەردە بوون، بەڵام خۆیان بەکورد نازانن و هەندێکیان دوژمنایەتی کوردیش دەکەن بە یادی دەسەڵاتی عوسمانی پێشوو و بیری کەمالییەکانی تورکیا لە مەسەلەی نەتەوەیی کورددا.

٢

لە شیعرێکیدا بێبەش لە نایەکسانی و مافخوراوی ناو کۆمەڵی عیراق دەدوێ، بەتایبەتی خەڵکی کوردستان:

حەق و ناحەق بەجارێ تێکەڵاوە
ئەگەر ڕاستیت دەوێ ڕاستی نەماوە
هەزاری بێ نیشانت پێ پیشان دەم
کە ڕوتبەی بەرزی ئێستا پێ دراوە
هەزاران عاقڵ و داناش ئەبینی
لە ژێر باری غەما پشتی چەماوە

هەزاران خانەدان خانەی خرا بوو
هەزاران ناپیاو ئێستا پیاوە
هەزاران ڕاستگۆش ئێستاکە بەندن
لە بەندیخانەیی کووت و سەماوە
دەمت ئەبڕن وشەی حەق بێ لە دەمتا
بڵێی حەق تەق دەروونت کون کراوە
عەدالەت وابێ تف بێتە عەدالەت
لە لام وایە عەدالەت هەر بەناوە
عەدالەت حەق ئەزانی چینە ئەمڕۆ
لە حەق لادان و زوڵم و بەند و داوە
خەیاڵت خاوە (بێبەش) بێبەشت دەن
دەبێ بستێندرێ حەق کەی دراوە

بێبەش ئەم شیعرەی لە نیسانی **١٩٥٧** هۆنیوەتەوە. لەو ڕۆژگارەدا دەسەڵاتی ڕژێمی مەلیکی لە عیراق بەهۆی دەست تێوەردانی ئەمپریالیستی ئینگلیزی و تا ڕادەییێکیش ئەمەریکی لەو ساڵانەدا خەڵکی عیراق شپرزە بوون. نیشتمانپەروەر و پێشکەوتنخواز بەربەرەکانی دەکران. نیشتمانفرۆش و بێ توانا دەوڵەتیان بەڕێوە دەبرد. خەڵکی دڵسۆز پێ بەکۆت و زنجیر لە بەندیخانەکاندا ئازاریان دەچەشت. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەم بەند و باوە سەر ناگرێ، میللەت ڕادەپەڕێ، مافی خۆی وەردەگرێ، چونکە ماف وەردەگیرێ و نادرێ.

### ٣

شاعیر بەهۆی گەڕانەوەی مستەفا بارزانی و بارزانییە پەنابەرەکان لە ساڵی **١٩٥٨** لە ڕووسیاوە بۆ نیشتمان دەڵێ:

لە هەر لا وەک بەهەشت ڕازا جیهانی کورد و کوردستان
کە ژەنراڵ مستەفا دەرچوو لە غوربەت بوو بەرەو بارزان
بەدەرکەوت ڕۆژی ڕووناکی لە ژێر هەوری خەفەت باران
فەرەح کەوتە دڵی مەردم نەما لاچوو هەموو غەمان



سوپاس بۆ خوا بکەن ئیتر لە هەر لا ئەی گەلی کوردان
گەیینە ڕۆژی ئازادی نەما ئازار و تێهەڵدان

بێبەش ئەم پارچە شیعرەی وەک بروسکەییێک نووسیوە پیرۆزبایی لە بارزانی دەکا بەهۆی گەڕانەوەی لە ئاوارەیی ڕووسیایەوە بۆ نیشتمان. بارزانی و کۆمەڵێک لە جەنگاوەرانی بارزانییان لە دوای جەنگی دووەمی گێتی ئاوارەی ڕووسیا بوون ماوەی دە دوازدە ساڵ لەوێ مانەوە. گەڕانەوەیان جێی خۆشی و گوشادی بوو بۆ بێبەشی شاعیر و بۆ هەموو کورد.

### ٤

بێبەش لە شیعرێکیدا باس لە ڕۆژانێکی ڕەشی کورد دەکا، لە مێژووی کوردا ئەم ڕۆژە ڕەشانە زۆرن:

بەختی بەدی ئێمەی کورد تاکەی لە بەدی دابێ
هەستن لە خەوی غەفڵەت هەستا ئەوی هەستا بێ
هەر میللەتێ ئەیبینی ئێستا هەموو سەربەستن
هەر کوردە هەتا ئێستا بێبەش کە وەها مابێ
هەر کوردە لە ژێر دەست ما و هەر کوردە کە بێ هەست ما و
هەر کوردە کە چاوبەست ما و هەر کوردە بەتەنیا بێ
هەر کوردە کە ئەیبینی یێکی کە دووسەد دێنێ
وەختی کە لە جەنگ دابێ وەک ئەو نییە ئازا بێ
گەر یەکێتی بنوێنن ئەو مافە زوو دەستێنن
زۆر حەیفە لە جەنگدا بن دوژمن لە تەماشا بێ
(بێبەش) کە ئەڵێن کوردە گەر وورد بێ ئەوی مەردە
لەم خاکە کە هەیتی کورد بێ مەلجەئو مەئوا بێ

ئەم شیعرە لە ساڵی **١٩٦٦** نووسراوەتەوە، ئەو کاتە کورد لە کارەساتدا بوو، شۆڕشی ئەیلوولی **١٩٦١**ی کوردستانی عیراق دەوری گرنگی هەبوو لە داواکردنی مافی کورد، بەڵام سیاسەتی ناوەوەی عیراق و دەست تێوەردانی دەرەوە لە ئەمپریالیستی ئەوروپا و ئەمەریکا و دەوڵەتە هاوسێکانی عیراق لەبار نەبوو بۆ سەرکەوتنی شۆڕشەکە. لەم

شیعرەدا شاعیر سیمبۆلییانە ئاماژەی هەیە بۆ ئەو دووبەرەکییەی لە ناو ڕیزی شۆڕش پەیدا بوو لە ساڵی ١٩٦٦ و کورد کەوتنە کوشتنی یەکتری و دوژمن بەخۆشییەوە تەماشای دەکرد و سوودی لێ وەردەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی بە ئازایی و لاوچاکی کورد هەبوو، ئەگەر یەکێتییان هەبێ دەتوانن بگەنە ئامانجی خۆیان.

**٥**

لە شیعرێکی دیکەیدا شاعیر دیسانەوە لەو سەردەمە ڕەشانەدا دەژی، بۆ پیرۆزبایی جەژنی نەورۆز دەڵێ:

لاوی کورد نەورۆزە ئیمڕۆ جەژنەتە
دوژمنت جەرگی لە داخا لەت لەتە
بەرگی زستانیت فڕێدە داکەنە
تێبکۆشە ئیمڕۆ ڕۆژی هیممەتە
تۆش وەکو کاوەی نەبەز دەست کە چەکووچ
لێدە سەر زەحاکی ئەمڕۆت فرسەتە
نیشتمانت چاوەنۆڕی تۆ دەکات
تۆی هەیە ڕزگاری کات لەم زیللەتە

بێبەش ئەم شیعرەی لە هەولێر وتووە بۆ پیرۆزبایی جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٦٨. ڕوو دەکاتە لاوی کورد، واقیعی ئەو ڕۆژەی کوردی بۆ دەگێڕێتەوە، دوژمن چۆن چڕنووکی لە لەشی گیر کردووە. ئامۆژگاری دەکا، پەند لە کاوەی ئاسنگەر وەربگرێ و دژ بەزەحاکی ئەو ڕۆژگارە بجەنگێ کە دەسەڵاتی بەغدا بوو.

**٦**

لە پێنج خشتەکییێک لەسەر دێڕێکی فایەق بێکەس، بێبەش دەڵێ:

ئەی برای کوردی نەبەردم کوردی مەردی بەشخوراو
وا لە بەینی عارەب و تورک و عەجەم دابەشکراو
تێت بگەینم تێبگە کاتێ کە دیتت تۆ بەچاو
(هەر زەمانێ قەومی کورد دەرچوو لە زیللەت بوو بەپیاو
جەژنی من ئەو ڕۆژەیە نەک جەژنی قوربانی و پلاو)



لەم شیعرەدا بێبەش دێڕە شیعرێکی بێکەس شی دەکاتەوە، بەوەی کورد جەژنی زۆرە، دەتوانێ هەموویان پیرۆز بکا، بەڵام جەژنی ڕاستی لەو کاتەدا دەبێ کە لە دیلی ڕزگاری دەبێ و بەئازادی دەژی.

**٧**

لە پێنج خشتەکییێکی دیکەیدا دیسانەوە لەسەر دێڕە شیعرێکی بێکەس، بێبەش دەڵێ:

نامەوێ شەڕ تا بڵێی دووری شەڕم
دێمە شەڕ بۆ مافی میللەت بێ شەرم
هەستیارم ئاشکرایە جەوهەرم
(شاعیرێکی کوردم و کوردپەروەرم
بۆ هەموو کوردێکی کورد بێ نۆکەرم)

لەم پێنج خشتەکییەدا بێبەش سوورە لەسەر ئەوەی کوردە و لە نەتەوەیێکی دیکە نییە. دێڕە شیعرەکەی بێکەس دەکاتە بەڵگە. هەروەها خۆی وا دەخاتە ڕوو ئاشتیخوازە، شەڕی ناوێ، بەڵام شەڕ بۆ هێنانە دی ئاشتی بۆ کورد کارێکی بەجێیە.

**٨**

ئەستووری بیروباوەڕی شاعیر و زۆربەی ڕۆشنبیری کورد لەم دێڕە شیعرەی بێبەش ڕەنگی داوەتەوە:

کەس بەکورد ناوەستێ تەنیا خائینانی کورد نەبێ
لێکی ناکا دۆست و دوژمن تاکو ئەستۆی ورد نەبێ

وەک تیۆرییێکی ڕاست لە زانستی کۆمەڵایەتیدا مەسەلەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد لە ناوەوە دەست پێ دەکا. دوو کردەوە دژی مەسەلەکەن. یەکێکیان ئەو تاوانبارانەی دوژمنایەتی لەگەڵ کورددا دەکەن، ئەوی دیکەیان بەناوی کوردایەتییەوە دووبەرەکی دەنێنەوە، کردەوەی هەردوو لایان بەخراپە دەگەڕێتەوە. جا با یەکەمیان دوژمنایەتی ڕووت بێ و دووەمیان بەناو سۆزی نیشتمانی و کوردایەتی تێدا بێ!.

## داشۆرین و شیعری کراوە (ئیرۆتیک)

بێبەش مەبەسەکانی داشۆرین و شیعری کراوەی (سێکسی) تێکەڵ بەیەکتری کردووە. شیعرێکی زۆری لەم بابەتەی هەیە، هەندێ نەریتی کۆمەڵایەتی بوونەتە هۆی بڵاونەکردنەوەیان. بۆ نموونەی ئەم بەشەی لەسەر بێبەش نووسراوەتەوە لەم کتێبەدا توانرا هەندێ لەو جۆرە شیعرانە دەست بخرێن. بنەماڵەی شاعیر بەتایبەتی مەحموود زامداری برای جێگەی سوپاسن بۆ پێشکێش کردنی ئەو شیعرانە.

١

لە شیعرێکیدا بێبەش بەم جۆرە کەسێک دادەشۆرێنێ:

حەمەی وەستا سەوری ڕاستە سەورییە
سەورییە هەر بۆ جیناس و تەورییە
وا ئەویش خۆی خستە داوم تێپەڕی
ئیفتیرام با پێ بکاتن دەورییە
دەورە دەورە دەوری ویش تێپەڕ دەبێ
لێی ئەسێنرێ ئەم کڵاو و هەورییە
ئەحمەقە حەققە بڵێم پێی ئەم کەرە
وەک کەری کەوری کەرە نەک کەورییە
موستەحەققی هەجوە شیعری هەجوی من
وەک جەنابی شێخ ڕەزایە فەورییە
لایەقی هیچ شت نییە تەنیا دەڵێم
بیکەنە بەس پاسەوان و دەورییە
ڕێوییە پێویست دەکا من ڕاوی نێم
ڕاوی ڕێوی با بڵێم بۆ کەوڵییە
ئەیبڕیتن کلکی بێ کەڵکی حەمە
شیعری هەجووم تیژە هەروەک تەورییە
حەز لە جێگەی چەورەکاتن وەک دەڵێن
سەوری چی ئەو چاوەنۆڕی چەورییە



زۆر سوارە شیعرەکانم وەک ڕەزا
بۆ پەلاماردان دەڵێی وەک بەورییە

لەم شیعرەدا حەمەی وەستا ڕەمزێکە بۆ کەسێکی دیاریکراو، گرنگ ئەوە نییە کەسەکە بناسرێ بەڵکو نرخی هونەری و جوانکاری شیعرەکەیە. لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە شاعیر سەرکەوتووە، بەتایبەتی کە وشەی «سەوری» (شۆڕشگێڕ) دووبارە و سێبارە دەکاتەوە. ئەو کەسە بەخۆپەرست و هەلپەرست دەخاتە ڕوو. کەسێکی بێ بارە، بۆیە بوو بەمووچەخۆرێکی گەورەی دەسەڵاتی میری. شاعیر ئەوە دەردەبڕێ ئەو کەسە شایانی ئەم مەقامە نییە. لە دواییدا شانازی بەشاعیرییەتی خۆی دەکا و شێخ ڕەزا بەمامۆستای گەورەی خۆی دەژمێرێ.

٢

لە چوارینێکیدا بێبەش بە«حاجی»یێک دەڵێ:

حاجی حیز بابی تەرەس گەووادی کۆنی دوودەکی
حاجی ڕاستم پێ بڵێ حیزی لەکی یا باڵەکی
بۆم بەدەرکەوت مەزهەب و ئایین و دینت پارەیە
لازمە بتکەن بەتەمسیل کاحەمە و حاجی مەکی

شاعیر حاجییێکی کردۆتە نموونەی ئەو دەوڵەمەندانەی پارە لە لایان هەموو شتێکە. بەناوی حەج کردنەوە هەموو جۆرە فێڵ و فەنەرێک بەکار دێنن بۆ دەوڵەمەندبوون. لە کۆمەڵی کوردەواری ئێمەدا بەتایبەتی لە شاران کەسانی لەم بابەتە زۆرن. شاعیر پێشنیاز بۆ کاکە حەمە و حاجی مەکی دەکا ئەو حاجییە بکەن بەقارەمانی چیرۆکێکی شانۆ یا سینەما. ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە مەبەسی لە «کاکە حەمە» محەمەد سدیقی محامییە لەگەڵ حاجی مەکی ئەکتەری شانۆ و سینەمای کوردی لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم هەردووکیان لە هەولێر دەژیان و دۆستایەتییان لەگەڵ بێبەشدا هەبوو. بەتایبەتی محەمەد سدیق لە بەهرەی دانانی شیعر بێ بەش نەبوو، لەگەڵ بێبەشدا شەڕە شیعری زۆرە.

٣

لە چوارینێکی دیکەیدا بێبەش بەم جۆرە لەگەڵ نەیارێکی قسە دەکا:

بشتگێم ئەی سەفیل قازانجی تۆیە
وەکو تۆ نیم ئەمن ئاگام لەخۆیە
لەوەش زلتر دەبی گەر بێت و بتگێم
بەگیانی تۆ ئەوەی من بێ درۆیە

ئەم شیعرە ڕەوانە شەوچەرەییێکی دیکەیە بۆ کۆڕی ڕابواردنی شاعیر و شیعردۆستان. هەرچۆنێک بێ ڕەنگدانەوەی ڕووداوێکە لە ناو کۆمەڵدا هەیە. ئەم دیاردەیە تەنیا لە ئەدەبی نووسراودا نییە، لە ئەدەبی میللی بە پەخشان و شیعرەوە جێگەی دیاری هەیە.

***

مەلا مەسعوودی بێبەش مەلا و شاعیر بوو. مەلایەتییەکەی بۆ نان بوو، وەک ڕۆشنبیر و شاعیر و دەرچووی قوتابخانەی تازە بابەت خۆی دەنواند. شاعیرێکی خۆڕسک بوو، گوێی مۆسیقی بەهێز بوو. شیعری عەرووزی کلاسیکی لاسایی بۆ مەبەسی تازە بەکارهێناوە. شیعری لە دەوری سێ مەبەسی گرنگ دەسووڕێتەوە. یەکەمیان دلّداری بەشێوازی کلاسیکی کۆن؛ دووەمیان نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لە قالّبی شیعری کۆندا؛ سێیەمیان داشۆرین و شیعری کراوەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، لایەنی داشۆرینی قوتابخانەی شیعری شێخ ڕەزای دەولّەمەند کردووە.

زمانی شیعری بێبەش سادە و ڕەوانە، وشە و لێکسیکۆنی دیالێکتی ناوچەیی سۆران و بەتایبەتی شاری هەولێری پێوە دیارە. بەرهەمی شیعری بێبەش بەڕاستی ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردستانی عیراقە بەگشتی و کۆمەڵی هەولێرە بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.

# بەشی چل و حەوتەم

## پیرباڵ مەحموود

### ١٩٣٤ - ٢٠٠٤

### ژیانی

پیرباڵ کوڕی مەحموود لە ساڵی ١٩٣٤ لە هەولێر لە دایک بووە. تەنیا بەناوی خۆی و باوکی لە ناو خەڵکیدا ناسراوە و لە ژیانی ئەدەبیدا بەکاری هێناوە. نەیویستووە بەهیچ ناو و نازناوێکی دیکەوە بناسرێ. باوکی لە ڕووی داراییییەوە دەست درێژ نەبووە، دایکی لە خێزانێکی ئایینی سەر بە مزگەوت و شەریعەت و تەریقەت بووە. قوتابخانەی سەرەتایی لە هەولێر تەواو کردووە، لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی گەیشتۆتە پۆلی پێنجەمی بەشی ئەدەبی بەڵام تەواوی نەکردووە. لە سەردەمی لاویەتیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، چێژی لە ئەدەب وەرگرتووە، لە سیاسەت نزیک کەوتۆتەوە، بیری لەگەڵ بێ نەوایان و زەحمەتکێشاندا بووە. بۆ دابینکردنی گوزەرانی لە دوای وازهێنانی لە خوێندن بە مووچەخۆر لە کارگێڕی شارەوانی هەولێر دامەزراوە. لە ساڵە نەهاتەکەی عیراق و کوردستانی عیراق لە دوای کوودیتا فاشستییەکەی ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ی بەغدا لەگەڵ کەسانێکی یەکجار زۆر گیراوە. لە پاش ئازادبوونی لە دوای دوو ساڵ گەڕاوەتەوە هەولێر. لە ساڵی ١٩٦٥ بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی دارایی خەریکی کاری ئەرزوحاڵ نووسی بووە و کاروباری زەوی و خانوو فرۆشتنی لە تاپۆ بۆ خەڵکی گەیاندۆتە ئەنجام. لە ساڵی ١٩٦٨ بەمووچەخۆر گەڕاوەتەوە کارگێڕی شارەوانی هەولێر و لە بەشی تایپرایتەر دامەزراوە. لە ساڵی ١٩٨٣ خانەنشین کراوە.

کە خانەنشین کرا تا دوایی ژیانی لە نێوەندی ئەدەبی و ڕۆژنامەگەرییەوە نزیک بوو. لەسەر هەندێ لە بەرهەمی ئەدەبی لە شیعر و پەخشان دەژیا، سەرپەرشتی بڵاوکردنەوەی چاپەمەنی دەکرد لە کتێب و ڕۆژنامە و کۆوار. لە ساڵانی دوایی ژیانیدا نەخۆشیی دڵ ئازاری دەدا، تا ڕۆژی ١٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٤ لە نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر کۆچی دوایی کرد.



### شیعری

پیرباڵ لە منداڵییەوە هەوەسی لە شیعر بووە، حەزی لێ کردووە، توانای لەبەرکردنی بەهێز بوو، زوو شیعری لەبەر دەکرد، بۆ ماوەیێکی زۆریش لە بیر نەدەچووەوە. ئەم دیاردەیە بەهرەی گوێی مۆسیقی لە لا دروست کردبوو. خانەکانی ناو مێشکی پڕبوون لە وێنە و ئاوازی گەلێ لە شیعری کوردی و عەرەبی و تورکی. خانە بەتاڵەکانی ناو مێشکی دەیانتوانی هەندێ لە تارمایی ئەو وێنە و ئاوازانە بدزن و بەشێوەیێکی دیکە بیانکەن بە بەرهەمی شیعری. بەرهەمی پیرباڵ هەمووی ناچێتە ناو ئەم بابەتەوە شیعری هەیە داهێنانی خۆی پێیانەوە دیارە.

یەکەمین نووسینی پیرباڵ پارچە پەخشانێک بووە لە عەرەبییەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی و لە ساڵی ١٩٥٥ لە کۆواری «هەتاو» لە هەولێر بڵاوی کردۆتەوە. لەوەدەمەوە لە گەلێ ڕۆژنامە و کۆواری کوردی و هەندێکی عەرەبی شیعر و نووسینی هەیە. جگە لەوە لە بڵاوکردنەوەی شیعری لە سیپارە و کتێبی بچووکدا چالاک بوو. ناوە ناوە شیعرە بڵاوکراوەکانی جارێکی دیکە لە دوو توێی کتێبدا دەیگەیاندنە خوێنەر. هەندێ لە بڵاوکراوەکانی «لافاو» (کەرکووک ١٩٥٧)؛ «بەهەشتی دڵداری» (کەرکووک ١٩٥٨)؛ «بزەی سروشت» (بەغدا ١٩٨٥)؛ «مەرگی نەوجەوانێ» (هەولێر ٢٠٠٤) و هی دیکە بوون. پیرباڵ بەڕاستی لە شاعیرییەتی خۆی گەیشتبوو، ئەوەی لە دڵی ڕەخنەگردا بوو خۆی دەربڕی و دەیووت: «من هەواکارم پیشەکار نیم» بەو مانایەی هەوەسی شیعری هەیە و شیعر نەبووە بەپیشەی. سەرچاوە بنچینەییەکانی بۆ پەیداکردنی زانست و زانیاری لە بابەت ئەدەبەوە بەتایبەتی شیعر دیوانی شاعیرانی کوردی کۆن و نوێ بوو. ڕێبازی ڕۆمانتیزمی زۆر پێ خۆش بوو، لەبەرئەوە بەرهەمی شاعیرانی مەهجەری عەرەب و جەماعەتی ئەپۆلۆ و شاعیرە ڕۆمانتیکەکانی میسر و لبنان بەتایبەتی عەلی مەحموود تەهای موهەندس سەرچاوەیێکی گرنگ بوون بۆ مشتوماڵ کردنی بیر و چێژ و خەیاڵی پیرباڵ. شاعیر بەسەلیقە لە زۆربەی بابەتەکانی شیعری کوردی سەردەمی خۆی دەنووسییەوە. هەردوو جۆرە کێشی بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە. لە قافیەدا یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی) و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی هەیە. لە بابەت ڕوخسارەوە «شیعری نوێ»ی هۆنیوەتەوە، واتە ئەو شیعرەی لە تاکێکدا زیاتر لە کێشێک و قافیەییێک بەکار دێنێ.

بەگشتی پیربالّ بایەخ بەکێش و ڕیتم و مۆسیقا دەدا، ئەوەندە بەتەنگ ماناوە نییە، لەبەرئەوە هەرچەندە زمانی ڕەوانە، میللییانە و زمانی قسەکردنی ڕۆژانەیە و مۆرکی دیالێکتی ناوچەیی هەولێر (سۆرانی) پێوەیە، بەلّام هەندێ جار وشە و تەعبیری وا بەکار دێنێ بەم کارەی مانا دەکاتە قوربانی کێش و ڕیتم، بەلّام لەگەلّ ئەوەشدا ئەو جۆرە دێڕانە لە شیعریدا قورس خۆیان نانوێنن و بەناسکی دەکەونە بەرگوێ و ناودلّی خوێنەرەوە.

## نموونەی شیعری

### لەسەر گۆڕی یار

پیربالّ لە تافی لاویدا لەگەلّ کچێکی خزمی خۆی پەیمانی دلّداری بەستووە. لەناکاو و لە سەردەمێکی چاوەنۆڕ نەکراو لە سالّی ١٩٥٥ سەعادەتی دەسگیرانی جوانەمەرگ دەبێ. ماتەمنامەی بەکولّی بۆ ئەم خۆشەویستە بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

لەسەر گۆڕت وەکو بولبول ئەنالّێنم هەتا ماوم
دوای ڕۆیینی تۆ گێتی هەموو ڕەش بوو لە بەرچاوم
سەراپا گولّخەنی ژیلە و زوخالّە گیانی سووتاوم
هەموو قورگی غەم و ئێش و گرینە ژینی ڕووتاوم
دەبا ون بێ لە پاشی تۆ لە ڕووی ئەم ژینەدا ناوم
لەبەر مەرگی سیاهی تۆ وەها سیس و پەشۆکاوم
وەکو ئەستێرەیی گەش بووی لە ئاسمانی ژیانم تۆ
گولّاوی کامی بێ غەش بووی لە باغی بێ زیانم تۆ
گزنگی خۆری گەردوش بووی لە تافی بەربەیانم تۆ
پڕیشکی ئالّی ئاتەش بووی لە ئومێدی نیانم تۆ
فریشتەی شەنگی ئەندێشەم دلّارامی درەوشاوەم
تەلاری پەیکەری بالّام پەرستگەی بەرزی ڕووخاوم

لەم لاواندنەوەیەدا شاعیر شین بۆ کەسێک دەکا بووە بە بەشێک لە پەیکەری خۆی وەک دیاردەیێکی مەتریالّی، هەروەها بووە بەشێک لە گیان و دلّ و دەروونی. بە مردنی ئەو بەشە، بەشەکەی دیکەی کە ماوەتەوە شاعیر خۆیەتی چۆن دەتوانێ بژی! ئەگەر لەش چارەی بکرێ، گیان چۆن دەتوانێ بە لەتکراوی و نیوەچلّی بژی. ئێشی ئەم



دوورکەوتنەوەیە گران کەوتووە. ناخی دەروونی شاعیر لە جوولّانەوە دایە، ئۆقرە ناگرێ، چونکە جوانی وەک ئەوەی لە دەستی چوو نەبووە و نابێتەوە. لەم بابەتەوە دەلّێ:

جوانی من جوانێ بوو بەدلّ وەک شەونمی گولّ بوو
خەونگەی وێژەوانێ بوو کە وێژەی مەشخەلّی دلّ بوو
لە شێوەی ئەرخەوانێ بوو هەمیشە شایەنی چلّ بوو
چ سووچێکی نەبوو نا نا سروشی زەنگی بولبول بوو
ئیتر بۆچی لەپڕ هاتی بەرەو بەختی بریقاوم
ڕماندت کۆشکی ئاواتم وەراندت نێرگسی لاوم

ئەو پەیکەرە ونبووەی شاعیر شەونمی گولّ بوو، سەرچاوەی ئیلهامی شاعیر بوو، شاعیر خۆشی بولبول بوو. مەرگ ڕیشەی دلّداری لە بن هەلّکەند و شاعیری تووشی ڕەشبینی بوو. پیربالّ بەم دێڕانە کۆتایی بەقەسیدە شەشینەکەی دێنێ:

کە کۆچی کرد نیگاری من ئەمن بۆ کۆچ نەکەم کاکە
لەبەرچی من بمێنم وا ئەویش بنوێ لە ئەم خاکە
لە نێو گۆڕێکی تاریکا کەوا شوێنێکی سامناکە
دەبا بمرم منیش وەک ئەو نەمانم مردنم چاکە
لە ئەو ژینەی کەوا تالّە لە شێوەی ئەشکی شاراوم
کە ئەیڕێژم لەسەر مەرگی ئومێدی پاکی ژاکاوم
لەتەک ئەو گۆڕە بمنێژن کە دەورەی بێ دڕ و دالّە
کە بەرگی خۆلّەکەی بەردی سیاه و قاوەیی و ئالّە
لەسەر کێلّی گەرا قویم کە ڕەمزی مردنی تالّە
بنووسن ناوم و ناوی (سەعادە)ی شەنگ و (پیربالّ)ە
لە زین و مەم زیاتر بووین بەلّام ئەو چوو ئەمن ماوم
فەلەک تەختت سەرەنگوون بێ بەدەستی تۆ پەشووکاوم

شاعیر لە ناو تەمومژی ئەشکەوتێکی ئەفسانەیی پڕ لە ترس و لەرز پەیکەری قووپاوەی خۆی دەبینێ. باکی بەوە نییە خۆی چی جۆرە ئازار و ئەشکەنجەیێک دەچێژێ، لەو ئانەدا گیانی لە ناو لەشی سەعادەتی خۆشەویستی تواوەتەوە. ئەشکەوتەکە ڕەمزی ئەو گۆڕەیە نازەنینەکەی هەتا هەتایە تێیدا خەوی لێ کەوتووە. ئاواتەخوازی ئەوەیە زوو بگاتە

سەعادەت کە ئەوپەڕی بەختیارییە بۆی و لەسەر گۆڕیشی ناوی هەردووکیان بنووسن بۆ ئەوەی هەموو ڕێبوارێک یادی ئەو دڵدارییە بکاتەوە.

### فەرامۆشم نەکەی

لە لیریکێکی وەسفدا پیرباڵ دیالۆج لەگەڵ دلبەری دەکا:

بەیانان کاتێ گوڵ پشکووت لە گوڵزاری گوڵەندامان
خوداوەندی جوانی هاتە بانیژەی دڵارامان
شەرابی پاکی پیرۆزان درەوشاوە لە نێو جامان
لەوێدا لەو کەیفگایەی کە تێدا بووین لەگەڵ ڕامان
فەرامۆشم نەکەی گیانە ئەمن شایانی باڵاتم
هەتا ماوم لە دنیادا تروسکەی ئاڵ و واڵاتم

لە هاوینا لە کاتێکا کە خۆر هەڵهات لە پشت کێوان
قژی تاڵ تاڵ و زێرینی ڕژایە سەر بەی و مێوان
لە کاتی هەر دڵی مەست بوو بەمیسک و عەنبەری لێوان
لەوێدا لەو کەیفگایەی کە بۆ تۆ هۆشمی شێوان
فەرامۆشم نەکەی گیانە ئەمن شایانی باڵاتم
هەتا ماوم لە دنیادا تروسکەی ئاڵ وواڵاتم

لە پاییزدا لە کاتێکا کە دار ڕووتە لە کۆساران
کەو و قومری بەکوڵ گریان لەسەر ئاواتی شاکاران
لە کاتێ گەردەلوولی بۆر سوپای هێنا وەکو هاران
لەوێدا لەو بەزمگایەی کە تۆم لێ دی لەگەڵ یاران
فەرامۆشم نەکەی گیانە ئەمن شایانی باڵاتم
هەتا ماوم لەگوڵشەندا تروسکەی ئاڵ و واڵاتم

لە زستاندا لە کاتێکا هەور گرما لە گوێی دۆڵان
گەواڵە کردییە ڕێژنە لەسەر خاشاکی زەندۆڵان
لە کاتێکا گیا و گوڵت ئەدەیتە پۆلی ئاسکۆڵان
لەوێدا لەو ژوانگایەی کە ڕۆڵی دی لە نێو ڕۆڵان
فەرامۆشم نەکەی گیانە ئەمن شایانی باڵاتم
هەتا ماوم لە گوڵشەندا تروسکەی ئاڵ و واڵاتم



هۆی لە دایکبوونی ئەم لیریکەی پیرباڵ بەم جۆرە بوو: لە ساڵی ١٩٥٦ لە هەولێر لە ماڵان شیعری کوردی دەخوێندرایەوە. جارێکیان لە هەڵبژاردەی یەکێ لە دەستنووسە بەنرخەکانی نەجمەدین مەلا بەناوی «سۆزی نیشتمان» (١٩٤٥)، لیریکێکی چوارین بەند بەناوی گۆرانەوە تۆمار کرابوو خوێندرایەوە، بەندی یەکەم و دوایی ئەمانەی لای خوارەوە بوون:

لە گوڵزارا لە سەرچاوەی بەهارا
لە چیمەن دا لە بن سایەی چنارا
لە گوڵشەن دا لەگەڵ ناڵەی هەزارا
فەرامۆشم نەکەی من گیرۆدەی تۆم

***

لە گەنجی دا لەسەر تافی جوانی
کە گەردوون ڕانە گیانە تۆ شوانی
لە وەختی لێ ئەدەی لافی جوانی
فەرامۆشم نەکەی من گیرۆدەی تۆم

لە دوای ئەوەی پیرباڵ گوێی لە شیعرەکە گرت، بۆ خۆی نووسییەوە، ئینجا لە پاش چەند ڕۆژێک لە کۆبوونەوەی شیعر خوێندنەوە لیریکەکەی خۆی خوێندەوە. بەئاشکرا دیارە شاعیر ئیلهامی لە شیعرەکەی گۆران وەرگرتووە، بەڵام مانا و وێنەکانی شیعری پیرباڵ جیاوازن لەگەڵ ئەوەی گۆران. نیو سەدە بەر لە ئێستا پرس لەسەر ئەم شیعرە هەبوو، ڕاستە نەجمەدین مەلا بەناوی گۆرانەوە تۆماری کردووە، بەڵام ئەم شیعرە لە ناو شیعرە بڵاوکراوەکانی گۆراندا نییە، لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا هەندێ کەس بەشیعری ئیبراهیم ئەحمەدی دادەنێن، هەندێکی دیکە بەشیعری ڕەشید نەجیب (فەرامەرز)ی حسێب دەکەن. هەرچۆنێ بێ شیعرێکی جوانە. پیرباڵ لە دانانی شیعرەکەیدا سەرکەوتووە ئەگەر هەندێ ڕستە و تەعبیری نائاسایی بەداهێنان بۆی بژمێررێ.

### هەڵبەستەکانم

لە شیعرێکی کۆمیدی ئامێزی پڕ لە قسەی سووک لە بابەت شیعری خۆیەوە پیرباڵ دەڵێ:

شیعرەکانی من قوماشی خۆمن
شیعرەکانی وان پینە و پەڕۆکن

من خۆمم ئەوان ڕوونووسی خەڵکین
ئەمن هەراش و ئەوان زارۆکن
من خۆمم ئەوان تاپۆی خودی من
من داهێنەرم ئەوان دزۆکن
ئەمن گوڵاوی گوڵشەنی کوردم
ئەوان وردە بای نێو ڕیخەڵۆکن
کاتێ دەچڕن لەسەر شانۆدا
گوێگران دەڵێن هەر خاپەرۆکن
بێ تام و چێژ و بۆن و بەرامەن
بێ ڕواڵەت و بێ ناوەڕۆکن
توورگی سەفین و پیرەمەگروونن
ڕێوی کەرکووک و زاخۆ و دهۆکن
لە دیوی دەرێ زێڕی تیزابن
لە دیوی ژۆریش بەردی بلۆکن
هەر ڕۆژێ چەشنە بەرگێ دەگۆڕن
نازانم مارن یا مارمێلۆکن
قەنقەڵاشکی نێو دار و دەوەنن
قەنقەڵاشکی چی! حوشترالۆکن
گەر بڵێم سەگن سەگ ئەمەکدارە
ڕێوی فێڵباز و کتکی بزۆکن
گوژاڵکی تاڵ و خڕنووکی ژاڵن
بانی تەپی وو زەوی ڕفۆکن
من خۆر و ئەوان هێلەگی کون کون
من مانگم ئەوان سەگی چەپۆکن
گەواهی قسەم چەند بەڵگەییێکە
بۆ تاوانیان وەک کەتەلۆکن
گۆشت بۆ قەسساب و نان بۆ نانەوا
من کێرد و چەقۆ ئەوان تیرۆکن



شاعیر ڕیالیزمیانە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بیروڕای خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر بەو کەسانەی خۆیان بەشاعیر دادەنێن و بەڕاستی شاعیر نین، ئەو بیروڕایانەی بەڕستەی جوان و وێنەی شیعری داهێنراو دەڕازێنێتەوە. شاعیر لێرەدا ستایشی خۆی دەکا، جا ئەوەی دەری دەبڕێ بەرامبەر بەخۆی ڕاست بێ یا ڕاست نەبێ گرنگ نییە، بەڵام لە کۆمەڵدا کەسانی وا هەن لافی شاعیرییەتی لێ دەدەن کەچی ئەوە نین. ئەگەر ئەم شیعرە لە مانای پلەی شاعیرییەتی پیربالْ دەربهێنرێ و ببێ بەموتڵەق، وەک شیعرێکی داهێنراوی بەرز دەکەوێتە ڕوو. بێ گومان مەبەسی بنچینەیی لە هەموو داهێنانێکی ئەدەبی و هونەری ئەوەیە لەو قاوغەی بۆی دانراوە بچێتە دەرەوە و ببێ بەموتڵەق.

لەم شیعرە و لە هەندێ شیعری دیکەی پیربالیش وشە و ڕستەی وا دەکەونە بەرچاو لە لێکسیکۆنی زمانی کوردی نەبیستراون لە ڕووی دەستووری زمان و مانای وشەکانەوە، خۆی دروستی کردوون و بەرگرییان لێ دەکا و لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەوەی ئەو نووسیویەتی ئەویش ڕاستە و دەبێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی زمان و ئەدەبی کوردی.

***

پیربالْ مەحموود کەسێک بوو زیرەک و هوشیار. شیعری خۆش دەویست، بەبێ شیعر خوێندنەوە هەڵی نەدەکرد، بیری تیژ بوو بۆ لەبەرکردنی شیعر، گوێی مۆسیقی بەهێز بوو. توانای ئەوەی هەبوو قسە و گفتوگۆی ڕۆژانە بخاتە ناو چوارچێوەی وتەی کێش و قافیەدار. شیعری لەسەر بەحری عەرووز و کێشی سیلابی خۆماڵی هۆنیوەتەوە، یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی) و قافیەی ڕەنگاوڕەنگی بەکارهێناوە. هەوای ڕۆمانتیکی بەسەر شیعرییەوە دیارە، بایەخی بەدڵداری و وەسف داوە. شیعری کۆمەڵایەتی هەیە، لە نیشتمانپەروەری و کوردایەتی بەدوور نەبووە. شیعری پیربالْ بەزۆری کێش و ڕیتم و مۆسیقایە. زۆر بایەخی بەناوەڕۆک نەداوە. هەندێ شیعری کلاسیکی و نوێی کوردی و عەرەبی بوون بەسەرچاوە و ئیلهامیان داوەتە پیربالْ شیعری جوان بهۆنێتەوە وەک ڕەنگدانەوەییێکی ئەو شیعرانە.

# بەشی چل و هەشتەم

## جەلال میرزا کەریم

**١٩٣٥ - ١٩٩٣**

## ژیان و شیعری

### ژیانی

جەلال میرزا کەریم لە ساڵی **١٩٣٥** لە سلێمانی لە دایک بووە. ماڵی باپیرانی لەگەڵ بناغە لێدانی شاری سلێمانی لە سەدەی هەژدەم لە قەلاچۆلانەوە هاتوونەتە شاری تازە. لە گوزەراندا دەست ڕۆیشتوو و دەوڵەمەند بوون. خوێندنی بەرایی لە قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی بووە.

جەلال لە خێزانێک پەروەردە بووە باوک و کەسوکاری هەڵگری بیروباوەڕی مارکسی بوون، وایان دەزانی بەو ڕێگەیە و بەهۆی ڕووسیاوە (یەکێتیی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە) کورد دەگاتە شادبوون بەمافی نەتەوایەتی. بەم جۆرە جەلال لە منداڵییەوە بەخۆڕسک و لاساییکردنەوەی دەوروبەری خۆی بووە بەهەڵگری ئەو فەلسەفەیە. لە تەمەنی مێردمنداڵییەوە لە ڕیزی یەکێتیی قوتابیانی عیراق بوو و مەشقی بەربەرەکانی کۆنەپەرستانی دەکرد. لە تەمەنی شازدە هەڤدە ساڵیدا لەگەڵ هاوڕێیانی دیکەی بۆمبای تەقینەوەی فڕێ دایە ناو سەرای سلێمانی و لە خۆپیشاندانە سیاسییەکانی دژی دەسەڵات بەشداری دەکرد. لە ساڵی **١٩٥٦** لەو کاتەی ئەندامی ڕێکخراوی قوتابیانی عیراق بوو و تەرمی شێخ مەحموودیان لە بەغداوە هێنایەوە سلێمانی لە خۆپیشاندان‌دا بەشدار بوو، لە دواییدا گیرا. دادگا فەرمانی سێ مانگ بەندکردن و ساڵێک دەستبەسەری بۆ دەرکرد، ئەم ماوەیەی لە شاری بەدرە بردەسەر.

لە دوای کوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی **١٩٥٨**ی بەغدا بوو بە ئەندامی لیژنەی ناوچەیی پارتی کۆمۆنیستی عیراق لە سلێمانی. لە ساڵی **١٩٥٩** بوو بەکارگێڕی کۆواری «هیوای کوردستان» ئۆرگانی یەکێتیی قوتابیانی عیراق لە سلێمانی. لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمدا بەهۆی سیاسەتی دیکتاتۆری عەبدولکەریم قاسم لە عیراق



بەگشتی و لە کوردستان بەتایبەتی هەڵسوکەوت نالەبار بوو. لە ساڵی **١٩٦٢** لە یادی ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلوولی **١٩٣٠** سلێمانی جارێکی دیکە گیرایەوە. فەرمانی دوو ساڵ بەندکردنی بۆ دەرچوو، ماوەی زیندانییەکەی لە بەندیخانەی شاری حیللە لە باشووری عیراق بردەسەر. لە دوای ئازادبوون گەڕایەوە بەغدا و لە ساڵی **١٩٦٤** لە ئێستگەی ڕادیۆی کوردی وەک مووچەخۆرێک دامەزرا و چەند ساڵێک لەوێ مایەوە.

لە ساڵی **١٩٧٠** بەئەندامی دەستەی نووسەرانی کۆواری «بەیان» هەڵبژێررا. ئەم چاپەمەنییە لە لایەن کارگێڕی گشتیی ڕۆشنبیری کوردی سەر بەوەزارەتی ڕاگەیاندنی عیراق لە بەغدا بڵاودەکرایەوە. تا ساڵی **١٩٧٤** کە شەڕ دەستی پێ کردەوە لە نێوان دەسەڵاتی بەغدا و بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد جەلال بەغدای بەجێ هێشت و ڕووی کردەوە شاخ. لە ساڵی **١٩٧٦** ژیانی ئاوارەیی هەڵبژارد و ڕووی کردە ئەمەریکا. لە دواییدا وتبووی باشتر ئەوە بوو نەچوومایە ئەمەریکا، چونکە پەنابەری سیاسی لەوێ نەبوو و نەدەدرا بەکەس. لە ساڵی **١٩٨٢** لە ئەمەریکا ئۆتۆمۆبیل لێی دابوو و لەشی تێکشکاند بوو و تووشی نەخۆشیی لەرزۆکی کردبوو.

لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی **١٩٩١**ی کوردستانی عیراق جەلال گەڕایەوە نیشتمان. لە ئەیلوولی **١٩٩٢** لە ئێستگەی ڕادیۆی کوردستانی عیراق لە هەولێر دامەزرا. لە ڕۆژی ١٤ی کانوونی دووەمی ساڵی **١٩٩٣** بەهۆی نەخۆشی دڵ لە نەخۆشخانەی کۆماری هەولێر کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی برایەوە سلێمانی و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژرا.

### شیعری

لە تەمەنی دەوروبەری بیست ساڵیدا خەیاڵی شیعری لای جەلال خەملیوە وەک دیاردەییێکی هونەری مێشکی خزاندۆتە ناو هەست و نەستی ناوەوەی، لە کەسێتی خۆیەوە تەقیوەتەوە، لە سەرەتادا پێوەندی بەئێش و ئازاری کۆمەڵەوە نەبووە. لای ئەم شاعیرە کەسێتی ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە تەمەنی سی ساڵیدا لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەم دروست بووە. زۆربەی شیعری لە ڕۆژنامە و کۆوارەکاندا لە ناوەوە و دەرەوەی نیشتمان بڵاوکراونەتەوە، هەندێ بەشی لە نامیلکەی بچووک گەیشتوونەتە دەستی خوێندەواران.

جەلال مەشقی شیعری عەرووزی و کێشی شیعری میللیی سیلابی خۆماڵی نییە. لەو شاعیرە تازانەیە بەشیعری نوێ دەستی پێ کردووە. کۆمەڵێک لەو شیعرە نوێیانە لە

ناوەوە بووە بەشی ئەوەیان کردووە گوێی مۆسیقی لای جەلال دروست بکەن. شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە لە پارچەی لیریکی و قەسیدەی درێژ (پۆێم) پێکهاتووە. لە هەر شیعرێکیدا چەند کێشێکی خۆماڵی و چەند قافیەیێک بەکار دێنێ وەکو لیریکی نوێی نەتەوەکانی سەر ڕووی ئەم زەوییە. بێ گومان کاری ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپا تا پلەیێک بەسەریانەوە دیارە.

لە ناوەڕۆکدا شیعری دەچێتە خانەی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتییەوە، لە پێشانا خەریکی سۆزی دڵداری ناوەوەی دەروونی خۆی دەبێ، ئینجا هیوا و ئامانجی گەلی کورد لە پێناوی ڕزگاریی نەتەوە (کوردایەتی) دەبێتە سەرچاوەیێکی گرنگ بۆ دانانی شیعری. ئیدیای ئەنتەرناسیۆنالیزم و بیرکردنەوە لە چارەنووسی مرۆڤایەتی هەوێنی هەندێ لە بەرهەمەکانیەتی. ناوەڕۆکی شیعر لای جەلال هەندێ جار بەشێوازی ڕۆمانتیکی و هەندێ جاری دیکە بەشێوازی سیمبۆلی لە پارچە شیعرێکی لیریکیدا دەخاتە ڕوو. جاری وا هەیە هەردوو شێوازەکە تێکەڵ بەیەکتری دەکا و مانا دەچێتە ژێرەوە وبەرهەمەکە قورس دەکەوێتە بەرگوێ، بەڵام کێش و ڕیتم و مۆسیقا ڕەوانن.

شیعری جەلال ڕەنگدانەوەی بیروڕای سیاسی و ئیدیۆلۆجی خۆیەتی. شاعیر بەڕاستی بۆ مەسەلەکە چووە کەوا زان دەکا ئەدەب نابێ ڕاستەوخۆ وەرامی تیۆرییێکی زانستی یا ئیدیۆلۆجی بێ، واتە وەرامی خواست و ئارەزووی هیچ ڕێکخراو و پارتییێکی سیاسی بێ. داهێنانی ئەدەبی بۆ هەموو توێژەکانی کۆمەڵە، ئەگەر بۆ تاکیش بێ لە دوایی دەبێتە هی کۆمەڵ، هەروەها بۆ تاقمێک و توێژێک و چینێکی دیاریکراویش نییە. ئەدەب لە سیاسەت گەورەتر و فراوانترە. داهێنانی ئەدەبی و هونەری بەبێ سیاسەت سەر دەگرێ، بەڵام بەرهەمی ناوەڕۆک سیاسی و ئیدیۆلۆجی بەبێ جوانکاری سەرناگرێ.

## نموونەی شیعری

١

لە لیریکێکیدا جەلال بەناوی «خۆشەویستییێکی شێتانە» دەڵێ:

گیانە! نەمویست
بەم چەند دێڕە
لاڵ و کوێرە



بڵێم تۆم ویست
چونکە هەرچی وزە و توانای
شیعرە هەمە
هەڵیرێژم بۆتی بڵێم
هێشتا کەمە
ڕەنگە نەغمەی شیعر وتن
تەواو ببێ
ساز و دەنگی پیا هەڵوتن
تەواو ببێ
گوڵ هەڵوەرێ
هەزار بمرێ
بەڵام هەتا ڕووی تەبیعەت
وا والا بێ
هەرگیز هەرگیز جوانی ئافرەت
تەواو نابێ

***

وەک شاعیرێک شیعرەکانم
هەر بەموڵکی خۆم نازانم
بەڵام وەک دڵدارێک کە هەم
وا تێ ئەگەم
هەر جوانی ئافرەت پەرستم
هەر بۆ ئەویش خۆشەویستم

***

من ئەمەوێ هەر وەکو شێت
ڕێ بگرم لێت
هەر چیم بوێ

داوای کەم لێت
من ئەمەوێ گوڵی ئاگر
لەجیاتی زێڕی ساردوسڕ
بکەم بەقژی ژاکاوتا
بە بەرۆکی وەک هەتاوتا

***

وەک ڕێبوارێ
بست بست دنیای جوانت پەیکەم
وەک باڵدارێ
ئاسمانی پەنهانیت تەی کەم
وەکو شێتێ خۆشەویست بم
وەکو شێتێ تۆ پەرست بم

لە بەندی یەکەمی شیعرەکەیدا جەلال وەسفە هەمیشەییەکەی دڵداری دەکا، بەڵگەی ئەو دڵدارییە ژنە. هەوا و هەناسەیێکە لە ئەقڵی تەرکیبییەوە هەڵقوڵاوە. ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی کۆن لێی دوور بووە. ئەدەبی ڕۆژئاوای کۆن و تازە نموونەی هەیە. بەلای شاعیرەوە ئەو شیعرەی ئێستا دەیڵێ و ئەوەی وتوویەتی بەشی ئەو دڵدارییە ناکەن. ژن ماکی بنچینەیی دڵدارییەکەیە، چونکە ئەگەر گوڵ نەمێنێ و بلبل لەناوبچێ، تەنیا سروشت بمێنێ جوانیی ژن بێ پایانە و تەواو نابێ. لێرەدا دیسانەوە سێ کوچکەی سۆفیزمەکە لە دڵدار و دلبەر و سروشت دروست دەبێ.

لە بەندی دووەمدا ئەوە دەردەبڕێ شیعر پێویستە لە هەموو شتێکی دیکە خۆشەویستتر بێ لای شاعیر، کەچی ئەو جوانی ژن دەپەرستێ و لە شیعرەکانی خۆشەویستترە، چونکە ئەگەر ژن نەبێ شیعریش نابێ.

لە بەندی سێیەمدا ئەوە دەخاتە بەرچاو شاعیر ڕێ لە خۆشەویست دەگرێ، دەیەوێ هەرچی ئارەزوو دەکا لێی داوا بکا. ئەو جوانییەی قژە ژاکاوەکەی سەر سنگ و مەمکی ڕەنگیان لە هەڵاوی ئاگر وەرگرتووە نەوەکو زێڕ.

لە بەندی دواییدا دەڵێ گێتیی جوانی ئەو خۆشەویستە بێ پایانە، ئاسمانی نهێنییەکانی فراوانە، ئارەزوو دەکا وەک ڕێبوارێک و باڵدارێک جوانییەکان بدۆزێتەوە و



نهێنییەکان ئاشکرا بکا. لە دڵداری ڕاستدا ئەقڵ ون دەبێ، شێتی ڕەمزی دڵدارییە.

**٢**

لە بەهاری ساڵی **١٩٨٩** جەلال لیریکێکی هۆنیوەتەوە بەناوی «وەرزەکان». ئەمە ڕەنگدانەوەی ڕۆژە ڕەشەکانی دوای بەهاری ساڵی **١٩٧٥** بوو، ساڵی نسکۆی شۆڕشی ئەیلوولی **١٩٦١**ی کوردستانی عیراق. لەوەدەمەوە ساڵ دوازدەی مانگ و هەموو وەرزەکانی ساڵ ڕۆژانی ڕەش بوون. سەرەتای شیعرەکە بەم بەندە دەست پێ دەکا:

چوار وەرزی ساڵ
لە دامێنی ئاسمانی وڵاتی منا
لە چوارچێوەی بێ کۆتایی
تەمەنی ئاواتی منا
بۆتە ئاوێنەی ئاوەژووی
مێژوویێکی ئێجگار جەنجاڵ

لەم پێشەکییەدا بۆ وەرزەکان شاعیر دەڵێ لە نیشتمانی مندا وەرزەکان گۆڕاوون، وێنەی ڕاستیمان نانوێنن وەکو وڵاتانی دیکە، ڕووداویان بەپێچەوانەی نیشتمانی خەڵکی ڕووی ئەم زەوییەیە.

ئینجا لە بابەت بەهارەوە دەڵێ:

بەهارمان دێ و لەجیاتی نێرگسی دیاری
چۆڕاوگەی خوێن
بەری دەرگای نەورۆز ئەگرێ
لە یادی ناشتنی تەرمی دوێنێی پڕ لە نادیاری
لیستەیێکی تری قوربانی
لە بەردەم دەرکی سەرادا هەڵئەواسرێ

لافاوی خوێن لەباتی چەپکە نێرگس هێرش دەباتە سەر دەرگای نەورۆز. ئێمە دوێنێ یادی تەرمی شەهیدەکانمان دەکردەوە لەناکاو لیستەیێکی ناوی شەهیدانی دیکەیان لەسەر دەرگای سەرای سلێمانی هەڵواسی.

لە بابەت هاوینەوە دەڵێ:

هاوین دادێ و
خۆری چلە ئارەقەی گڕی لێ ئەتکێ
لێوی کانیاوەکان چین چین
بەدیواری خۆی هەڵئەستێ
لەجیاتی سروەی پڕ بزەی
سەرچاوەی زەڵم و بادینان و شەقڵاوە
گاز و بۆمبا و فڕۆکەیە
ڕەشماڵی مەرگی هەڵداوە

چلەی هاوینی گەرم ئارەقەی هەڵاوی لێ دێتە خوار، کانیاوەکان وشک بوون و قەراغی خۆیان دەخۆنەوە. لەباتی شەپۆلی ئاوی زوڵاڵ سەرچاوەکانی زەڵم لە شارەزوور، کانیاوەکانی بادینان و شەقڵاوە گاز و بۆمبا و فڕۆکە دەپژێن.

لە بابەت پایزەوە دەڵێ:

وا سەردەمی بەرەو چوونی سروشتی گەڵاڕێزانە
پەڵە چەواشەی ساڵێکی کەس نەزانە
با هەڵوەرێ
غونچەی چاوی کووچەکانی ئومێدی شار
تازە خۆزگەی عیشقی ئیمڕۆ
ناچێتەوە بەر هەوارگەی پار و پێرار

لە وەرزی گەڵاڕێزاندا پەڵە سەری لێشێواوە، کۆڵانەکانی شاری سلێمانی ئەوەی ئەمڕۆ چاویان پێی دەکەوێ هەر ئەوەی پار و پێرارە. لە وێرانکاری بەولاوە هیچی دیکە نییە.

لە بابەت زستانەوە دەڵێ:

دیسان نۆرەی گەردەلوولی چەک لە شانی
خۆشەویستی هەڵچوونی بەرەو ئەشکەوتە
زستانە! شەوچەرەی هیوای
پێشمەرگەی ئەم کوردستانە لەت و پەتە
بێدارییە، تێڕامانە لە یەکتری نەنوستنە
بۆ وەرزی نوێ ڕێگا بیر و چەک گرتنە



لەم وەرزی زستانەدا پێویستە چەک لە شان بکشێتەوە ناو ئەشکەوتی شاخ. ئەو شاخە نەبوایە، چەک لە شان نەما بوو، کوردیش نەدەما. لە ناو ئەشکەوتدا چەک لە شانەکان بێدارن، نانوون، تەنیا بیر دەکەنەوە بۆ ڕاپەڕینێکی دیکە.

### ٣

لە لیریکێکیدا بەناوی «سووتان لە ئاهەنگی ئاشتی یا» دەڵێ:

خنکاین! خنکاین!
لە دووکەڵی بوخوردی درۆی ئاشتی یا
برژاین! برژاین!
لە دۆزەخی بەهەشتی پڕ سوێی ئاشتی یا
کوژراین! کوژراین!
لە ژێر گەڵا زەیتوونی بێ بۆی ئاشتی یا
ڕزاین! ڕزاین!
لە ناو کۆشکی وەک زیندانی نوێی ئاشتی یا

***

پەنجەرەکان بکەنەوە
با هەڵمژین
هەناسەی شەهیدەکانمان
دەروازەکان بکەنەوە
با ببیسین
گۆرانیی پێشمەرگەکانمان
چاوی تفەنگ
زیانی دەنگ
هەڵبێننەوە
شاری گریاو
ژێر کەنەوە
باڵ بەکۆتری سەر براو

بگرنەوە
لە سەنگەرا
لە سروودی تەواو نەبوونی جەنگاوەرا
داستانی تەمەنی ئاشتی
ئاشتی ڕاستی
بنووسنەوە

لەم شیعرەدا جەلال بەشێوەییێکی هونەری لە دیاردەییێکی باش و پێویست دەدوێ لە ژیانی مرۆڤایەتی کە ئاشتییە. دەبێ کەس هەبێ ئاشتی نەوێ! بەڵام مەسەلە ئەوەیە ئەم ئاشتییە بۆ مەبەسی ئامانجێکی دیاریکراو بەکار بهێنرێ چاکەی بەهێزی تێدا بێ و بەخراپە بۆ بێ هێز بگەڕێتەوە، ئەمە گەمەییێکی رووسە سۆڤییەتییەکان بوو لە دوای جەنگی دووەمی گێتییەوە بازرگانییان پێوە دەکرد بۆ چاکە و بەرژەوەندی خۆیان. شاعیر ئاماژە بەوە دەکا کورد کە چەک هەڵدەگرێ بۆ ئەوەیەتی ئاشتیی هەمیشەیی بکەوێتەوە. بێ گومان ئەم بیروڕایە لەوەوە هاتووە لە ڕۆژگارێکدا چەک هەڵگرتن و شۆڕش پێویست بوون، کەچی بۆ ڕۆژگارێکی دیکە دەست نادەن.

***

جەلالی میرزا کەریم دیاردەییێکی لەبار بوو لە کۆمەڵی کوردەواریدا. نیشتمانپەروەر و شاعیر و نووسەرێکی بەدیمەن بوو. بەدرێژایی ژیانی باوەڕی بەهەر فیکر و ئیدیۆلۆجییەتێک بووبێ، وای زانیوە سوودی بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بووە. وەک شاعیرێک بەرهەمی کەمە، بەڵام لە پلەییێکی بەرزی هونەری دایە. ئاگاداری کۆمەڵی کوردەوارییە. لە دروستکردنی شیعردا زیاتر پێڕەوی ئەدگاری شیعری ئەوروپایی دەکا. هوشیارانە هەندێ بەڵگە و زاراوە و ناوی جێگە و ڕێگەی کوردەواری بەکار دێنێ، بەمە شەقڵی کوردی دەداتە بەرهەمەکەی، ئەگینا لە شیعریدا ئەگەر ئەم جەوهەرانە نەکەونە بەرچاو بیری خوێنەر و خوێندەوار بۆ ئەوە دەڕوا لە شیعری ئەوروپایی وەرگیرا بێ. شیعری جەلال نموونەییێکی جوان و بەفەڕی شیعری نوێی کوردییە.

## بەشی چل و نۆیەم

## دڵشاد مەریوانی

**١٩٤٧ – ١٩٨٩**

### ژیانی

دڵشاد محەممەدئەمین مەریوانی لە ڕۆژی ٢٨ی مارتی ساڵی ١٩٤٧ لە سلێمانی لە دایک بووە. قۆناغەکانی خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەنجی و ئامادەیی لەوێ تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٦٨ بووە بەقوتابی لە بەشی زمانی کوردی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای بەغدا (ئەو کاتە ناوی کۆلێجی زمانان بوو). لە ساڵی ١٩٧٢ کۆلێجی ئەدەبیاتی تەواو کرد. یەکسەر لە کارگێڕی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی سەر بەوەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن دامەزرا. لەو دەسگایەدا لە بەشی ڕۆژنامەنووسیدا سەرپەرشتی کاروباری زمانەوانی چاپەمەنییەکانیانی دەکرد. لە دوای دوو ساڵ بەهۆی زیرەکی خۆی و دەرچوونی بەپلەیێکی بەرز لە بەشی زمانی کوردی کۆلێجی ئەدەبیات، لەو بەشە دامەزرایەوە وەک موعید، بەڵام ئەو کاتە موعەلیم جامیعییان پێ دەوت. هەرچەندە دڵشاد خاوەن شەهادەی بەرز نەبوو مافی ئەوەی هەبێ موحازەرە لە زانستگا بڵێتەوە، بەڵام ئەگەر ئەو کارەی پێ بسپێرایە بەسەرکەوتوویی دەیبردە سەر. بۆ بەڵگە لە ساڵی ١٩٧٤ کە نێوانی فەرماندەی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ لەگەڵ دەسەڵاتی بەغدا تێکچوو و خەڵکێکی زۆری کورد ڕوویان کردە ناو شاخ. بەشێکی زۆر لە مامۆستا و قوتابیانی زانستگای سلێمانی شاریان بەجێ هێشت. بەشێک لە قوتابیانی بەشی کوردی زانستگای سلێمانی لە شار مابوونەوە. ئیتر بۆ ئەوەی ئەو قوتابیانە زیانی ساڵێکی خوێندنیان لێ نەکەوێ مامۆستایانی بەشی زمانی کوردی کۆلێجی ئەدەبیاتی بەغدا لە هاوینی ساڵی ١٩٥٤ ڕوویان کردە سلێمانی و پرۆگرامی خوێندنیان پێ تەواو کردن. دڵشاد مەریوانی یەکێک بوو لەو مامۆستایانەی لە ماوەی دوو سێ مانگدا بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵیاندا بوو، فێری دەکردن و موحازەرەی بۆیان دەدا.

لە ساڵی ١٩٧٣ کە شیرین کەمال بوو بەقوتابی لە بەشی زمانی کوردی ناسیاوی لەگەڵ دڵشاد مەریوانی پەیدا کرد، ئەمە بوو بەهاندەرێکی دیکە شیرین بایەخ بەشیعر بدا و لە



دواڕۆژدا ببێ بەشاعیر و نووسەر. لە ساڵی ١٩٧٦ دڵشاد مەریوانی بوو بەمامۆستای زمانی کوردی لە قوتابخانەی ناوەندی سەرچنار لە سلێمانی. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ شیرین کەمال بوون بەهاوسەر و بنەماڵەیان پێکەوە نا.

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٩ دڵشاد ڕووی کردە دەرەوەی نیشتمان ماوەی چوار مانگ لە سووریا و چیکۆسلۆڤاکیا و هەنگاریا و ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەو سەردەمە و سوید مایەوە بەئومێدی ئەوەی دەربازی ڕووسیا بێ بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا کەچی هیوای لەم بابەتەوە سەرنەکەوت و گەڕایەوە نیشتمان و چووەوە سەر کارەکەی پێشانی خۆی.

لەو ماوەیەدا جموجۆڵی خوێندەواری دڵشاد مەریوانی بەهێز بوو، بەکوڵ دەستی دابووە نووسین و کۆکردنەوەی تێکستی ئەدەبی میللیی سەرزار. زۆر ئاگاداری قوتابیانی بوو، لە پەروەردەکردن و فێرکردنی منداڵان وێنەی کەم بوو. چاوی ئاسایشی دەسەڵاتی پارتی بەعس بەدوایەوە بوو. لە ڕۆژی ٩ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٨ ئەفسەری ئاسایشی سلێمانی داوای دەکا و پێوەند دەخاتە دەستییەوە. تاوانی سەرەکی دڵشاد ئەوە بووە گۆیا قوتابیانی خۆی فێری ئەلفوبێی لاتینی کردووە. ئیتر بێ بەزەییانە هەندێ ڕۆشنبیری بەناو پێشکەوتنخواز دەکەونە پیلان دانان بەهۆی کوردی نیشتمانفرۆشی ئەڵقە لە گوێی پارتی بەعس و کاربەدەست لە بەڕێوەبەرایەتییە درۆزنەکەی ئەفتونۆمی هەرێمی کوردستان (١٩٧٤ – ١٩٩١) سوور دەبن لەسەر ئەوەی نووسینی کوردی بەلاتینی تاوانێکە لە ئیسلام و عەرەب دەکرێ لەبەرئەوە پێویستە دڵشاد مەریوانی بکوژرێ.

کوشتنی دڵشاد مەریوانی بەبڕیاردەدەری کارگێڕی ئاسایشی سلێمانی سپێردرا بوو، ئەفسەرێکی پۆلیسی عەرەب بوو. لە کاتی بەئەنجام گەیاندنی تاوانی کوشتنی دڵشاد بەئەفسەرەکەی وتبوو: دەمێکە بڕیارتان داوە من بکوژن، زووکەن بڕیارەکەتان بهێننە دی! ئەفسەرەکە وتبووی: سەر دانوێنە. ئەویش بەشانازییەوە سەری بڵند کردبوو. ئیتر گوللەی بەنێوچەوانیەوە نابوو، لە پاشانا بەدەمانچە گوللەیێکی دیکەی بەسەرووی گوێچەکەیەوە نابوو. ئەم کارەساتە لە کارگێڕی ئاسایشی سلێمانی لە ڕۆژی ١٣ی مارتی ساڵی ١٩٨٩ ڕوویدا بوو. بەم جۆرە دڵشاد مەریوانیش بوو بەکاروانچییێکی دیکەی کاروانی قەڵەم و شۆڕش لە پێناوی کوردایەتیدا.

## شیعری دڵشاد

دڵشاد شاعیرێکی خۆڕسک بوو، چێژی لە شیعری کلاسیکی وەردەگرت، زۆری لەبەر بوو چونکە زۆری دەخوێندەوە، دەمخۆشی لە هەموو شاعیرێک دەکرد کە شیعری جوانی بخوێندایەوە، بەڵام هەوڵی نەدەدا لاسایی شیعری کلاسیکی بکاتەوە، لەبەرئەوە بەرهەمی شیعری دەچێتە ناو بەرهەمی «شیعری نوێ»وە. لەمەدا بەتەواوی کێش و قافیەی شکاندووە، کەچی لە ڕووی مۆسیقییەوە دێڕە شیعری گەلێ ڕەوانە، شکانەکە تەنیا لە ژمارەی ئەو کێشانەیە کە لە لیریکێکیدا بەکاریان دێنێ، واتە کێشێکی زۆر و قافیەیێکی زۆرتر لە تەنیا شیعرێکدا بەکار دێنێ.

کاریگەری ئەدەبی میلییی سەرزار (فۆلکلۆر) زۆر بەهێزە لە شیعری دڵشاددا، لە یەکەم خوێندنەوەدا هەست بەم دیاردەیە دەکرێ، بەڵام لە پاشانا داهێنانی هونەری شاعیر بەسەر شیعرەکەدا زاڵ دەبێ و کاریگەرییەکە ون دەبێ. گەلێ جار دوو دیاردە ئەگەر لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجییەوە بەراوورد بکرێن لەوانەیە وەک دوو شتی پێچەوانەی یەکتری بکەونە بەرچاو، دڵشاد وەستایانە ئەم دوو شتە دەگونجێنێ لەگەڵ یەکتری تا ڕادەیێک هەردوو ئامانجەکە دەبن بەیەک. دوو شتەکە دڵداری و نیشتمانپەروەری یا کوردایەتین.

لە هەموو تەمەنی کورتیدا دڵشاد شیعری فەرامۆش نەکردووە، بەرهەمی شیعری ئەوەی ماوەتەوە کەم نییە، ئەگەر خەریکی بابەتەکانی دیکەی ئەدەبی کوردی نەبوایە ئەوانەی بە پەخشان دەنووسرێتەوە بێ گومان بەرهەمی شیعری زۆر لەوەی لە بەردەست دایە زیاتر دەبوون.

کۆمەڵێک شیعری بەنامیلکە بڵاوکردۆتەوە لەوانە «فرمێسک و زەردەخەنە» و «پەلکەزێڕینەش نامۆ مەکەن» و «بێن بەتیشک» و «سەمفۆنیای وەنەوشە»، کۆمەڵێکی دیکەش لە ڕۆژنامە و کۆوارەکاندا بڵاوکراونەتەوە، جگە لە هەندێ بەرهەمی شیعری دیکە کە تا ئێستا چاویان بەمەرەکەبی چاپخانە نەکەوتووە.



## چیرۆک و درامای دڵشاد

کە دڵشاد قوتابیی کۆلێجی ئەدەبیات بوو پێی دەووترا، هەندێ لە چیرۆکەکانت سەرچاوەی شیعرن نەوەکو پەخشان، واتە ئەو چیرۆکانە دەکرێن بەپۆیێم (قەسیدە یا شیعری نیمچە درێژ) دەیووت وای پاش دەزانم وەکو هەیە، واتە ئەو چیرۆکانەی بەپەخشان نووسراونەتەوە دەچنە ناو ئەو پەخشانانەی بەشیعر ئامێز ناسراون. هەرچۆنێک بێ سیفەتی هەرە گرنگی چیرۆکەکانی ئەوەیە لە قاڵبی کلاسیکی کۆن دەری هێناون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر خوێنەر بەقووڵی لێیان ورد ببێتەوە هەست بەدەمار و هەوای کلاسیکییانە دەکا بەجۆرێک سیفەت و خاسیەتی تازەگەری لە نووسینەکاندا بەهێزتر دەکەن. دڵشاد هوشیارانە توانیویەتی هەندێ لە ڕێبازەکانی چیرۆکی ئەورووپایی و میسری بێنێتە ناو چیرۆکی کوردییەوە بەشێوەیێک ئەدگارەکانی ئەو چیرۆکانەی کردووە بەکوردی نەک پێچەوانە بەوەی ئەدگارە کوردییەکان لە ناو ئەوەی ئەوانا بتوێنەوە.

بەپێی تەمەن کورتی دڵشاد چیرۆکی کەم نییە، هەندێکیانی لە چەند کۆمەڵێکدا کۆکردۆتەوە و بڵاوی کردوونەتەوە، لەوانە «دێر یاسین» و «بەپەنجەکانم دەتبینم» و «دڵدارانی شۆڕش» و «یەکەم هەنگاو»، جگە لە بەشێکی دیکەی کۆوار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە، هەندێکی دیکەی بەدەسنووسی ماونەتەوە و لە ئەرشیفدا پارێزراون.

دڵشاد تەنیا نووسەری دراما نەبوو. وەک نووسەرێکی هەڵکەوتوو درامای «بووکەخان»ی نووسییەوە، هەر خۆشی سیناریۆی بۆ دانا. واتە ئەو توانایەی لا دروست بووبوو وەک ڕیجیسیۆرێک لە گێتیی هونەری شانۆی هاوچەرخی کوردی بکەوێتە بەرچاو، نەک تەنیا ئەمە بەڵکو لە چیرۆکی «لانەوازان»دا وەک ئەکتەرێکی سەرکەوتوو دەوری «قوتبەدین»ی بینی. لە ناو خەڵکی ئەوەندە بەناوبانگ بوو خەریک بوو «قوتبەدین» وەک ناوێک بسەپێتە سەر دڵشاد و ناوی خۆی ون ببێ و بەقوتبەدین بناسرێ.

## وتاری ئەدەبی دڵشاد

بەپێچەوانەی هەندێ نووسەری کورد دڵشاد سنوورێکی دیاریکراوی لە نێوان وتاری ئەدەبی و چیرۆک دانا بوو. وتاری زۆر نەبوو کەچی چڕ بوو، زیاتر لە لیریکێکی دەکرد، بەتایبەتی لەو کاتەی بایەخی بەشێوازی ڕۆمانتیکی یا سیمبۆلی دەدا زۆرتر لە ڕووی ماناوە کەمتر لە ڕووی ڕوخسارەوە واتە زمان و وشەی فەرهەنگییەوە. لە هەشتاکانی

سەدەی بیستەمدا کە کەوتە هەوەسی ئەوەی باسی زانستی و ڕەخنەی ئەدەبی تاقی بکاتەوە بایەخی بەوتاری کۆمەڵایەتیش دەدا، ئەمەیان وەک ژانرێک یا بابەتێک لە نێوان وتاری ئەدەبی هونەری و باسی ئەکادیمی دەوەستێ. ئەم جۆرە بەرهەمە لای دڵشاد لە هەندێ لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی ئەو سەردەمە بڵاوکراونەتەوە. دەتوانین زۆربەی گفتوگۆ و تێبینییەکانی لە کۆبوونەوە ئەدەبییەکاندا لە یانە و ڕێکخراوە ئەدەبی و هونەرییەکاندا لەم بابەتە وتارانە بژمێرین.

## لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی دڵشاد

دڵشاد لێکۆڵینەوەی لە ئەدەبی کوردیدا هەبوو، بایەخی بەئەدەبی سەردەم دەدا بێ ئەوەی ئەدەبی کلاسیکی بخاتە پشت گوێ. ڕەنگە زۆر کەس لەو سەردەمەدا دڵشادییان بەکەسێکی نوێگەری زیادە ڕۆیشتوو لە قەڵەم دابێ، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەو لەسەر ئەو بیروباوەڕە بوو لە ناو قاڵبی شیعری کلاسیکی عەرووزی تازەگەری دەدۆزرێتەوە، بەو مانایەی شاعیر دەتوانێ شیعری بەرزی سەردەم بهۆنێتەوە بەهەوای شیعری کلاسیکی. وا بوو لەسەر ئەم مەسەلانە ڕەخنەی لە شاعیری ناودار هێمن گرتبوو، لەو سەردەمەدا لە بەغدا دەژیا. کە وتارەکەی دڵشادی لە ڕۆژنامەدا خوێندبووەوە کاری تێ کردبوو و دڵی شکا بوو، نەک لەبەرئەوەی ڕەخنەکە باشە یا خراپە، بەڵکو لەبەرئەوەی هێمن وای دەزانی گەنجێک چۆن جورئەت دەکا ڕەخنە لە گەورەشاعیرێکی وەکو ئەو بگرێ. هەرچۆنێ بێ بۆچوونەکانی دڵشاد جێگەی ڕەزامەندی زۆربەی خوێندەوار و ڕۆشنبیرانی کورد بوون.

بەرهەمی دڵشاد لە مەیدانی ڕەخنەدا زۆر نەبوو. کاری هەرە دیاری لەم لایەنەوە ئەو نامیلکەیە بوو کە بەناوی «پێشوازی خاوەن شکۆ و دوو چیرۆکنووس» لە ساڵی **١٩٧٣** لە سلێمانی بڵاوی کردەوە. بەچاوێکی وردبین و ڕەخنەییێکی زانستییانە دەنوارێتە دوو چیرۆک بەناوەڕۆک لە یەک سەرچاوە هەڵقوڵاون. یەکەمیان چیرۆکی «پێشوازیی خاوەن شکۆ»ی خاوەنی ئەم کتێبە. دووەمیان چیرۆکی «پێشوازی»ی محەمەد مەولوود (مەم). دڵشاد ڕێبازێک یا میتۆدێکی تازەی بەکارهێناوە هەندێ لە ئەوەی ئەوروپاییان دەکا، بەدەگمەن لە ڕەخنەی کوردیدا بەرچاو دەکەوێ. ئەوەی گرنگ بێ لەم ماوەیەدا ئەوەیە بۆچوونەکانی لە ڕووی ئیدیۆلۆجییەوە ڕاست بێ یا نا! شێوازی نووسین و بیرکردنەوەی دڵشاد ئەوە دەگەیەنێ لە تێبینییەکانیدا وردە و لە بۆچوونەکانیدا وەک ڕەخنەگرێکی شارەزا دەکەوێتە بەرچاو.



## بایەخدان بەئەدەبی میللیی نەنووسراو

لە سەرەتای ژیانی خوێندەوارییەوە ئەدەبی میللیی نەنووسراو (فۆلکلۆر) جێگەی تایبەتی بووە لە پرۆژە خوێندەوارییەکانی دڵشاد بەڵام مەرگ ماوەی نەدا. لە سەرەتاوە ئەو کاتی تایبەتی نەبوو بۆ کۆکردنەوەی تێکستی بەرهەمی ئەدەبی میللی، بەڵکو ئەمە خووی ڕۆژانەی بوو، لە هەر کوێییێک بەقسە یا سەرچاوەی نووسراو تووشی شتێک بوایە لەم بابەتەوە لە دەست خۆی نەدەدا. بەتەما بوو لەم کارەیدا بەجارێک دوو مەبەس بپێکێ، یەکەمیان کۆکردنەوەی ئەو تێکستانەی بڵاو نەبووبوونەوە، ئەوی دیکەیان زانستییانە لێیان بکۆڵرێتەوە، دڵشاد توانای ئەمەی هەبوو. بۆ ئەم مەبەسە کەرەستەییێکی باشی کۆکردەوە بەڵام مەرگ بوو بەتەگەرە بۆ نەگەیاندنی ئەم مەبەسە بەئەنجام. لەگەڵ ئەوەشدا خۆی سوودی زۆری لەم کارەیدا وەرگرت بوو بە بەڵگەی ئەوەی شێوازی ئەدەبی میللی لە هەموو ڕوویێکی هونەرییەوە لە هەندێ لە بەرهەمە داهێنراوەکانی دڵشاددا بەدی دەکرێ.

## ڕۆژنامەنووسی و وەرگێڕان و نامەی ئەدەبی

دڵشاد مەریوانی گەلێ لایەنی مەیدانی ڕۆشنبیری تەنی بوو، لەگەڵ ئەوەی بەهۆی تەمەنەوە تاقیکردنەوەی زۆر نەبوو، بەڵام لە کارەکانیدا سەرکەوتوو بوو، زیادەڕۆیی نەدەکرد، هەر کارێکی دەرەقەتی نەهاتایە لێی نزیک نەدەکەوتەوە. لە ڕۆژنامەگەریدا دوور نەبوو، لەبەرئەوە پێویست بوو، وردە نووسین بۆ کۆوار و ڕۆژنامەکان ئامادە بکا. دەستی وەرگێڕانی هەبوو، عەودالّی خوێندنەوەی شیعری عەرەبی نوێی سەردەم بوو، هەندێ لەو پارچانەی وەری دەگێڕانە سەر زمانی کوردی ئاسۆییێکی شیعرایەتی تازەی پێ دەبەخشین بەبێ ئەوەی لە مەبەس و مانای شاعیرەکە لابدا.

دڵشاد نووسەرێکی داهێنەر بوو لە پەخشانی نامە نووسین و یادداشتدا. پێوەندی فیکری زانستی و سۆزی برادەرایەتی لە لای بەهێز بوو. حەزی لە نامە نووسین و تۆمارکردنی یادداشتی ڕۆژانەی بوو. لە سەرەتادا بەبێ ئەوەی هەست بکا نامەکانی شێوەی ئەدەبییان وەردەگرت، لە دواییدا ئەمە بوو بەشێواز. هەندێ لە نامەکانی دەبوون بەداهێنانێکی ئەدەبی سەرکەوتوو، لەو کاتەی ئەگەر نامەییێکی دووردرێژی بۆ دۆستێکی دوور وڵاتی بنووسیایە، یا کەسێکی بۆ ماوەییێکی زۆر چاوی پێ نەکەوتایە. کۆمەڵێک لەم جۆرە ئەدەبە بەنرخانەی دڵشاد مەریوانی هێشتا ڕووناکییان نەدیوە.

دڵشاد فرزەندێکی بەکار بوو، ناوی لە مێژووی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا دەدرەوشێتەوە، نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لە خۆی دەهات، سەربەرزانە بوو بەشەهیدی ئەدەبی کوردی.

## نموونەی شیعری دڵشاد

١

لە لیریکێکیدا بەناوی «وێنە» دڵشاد دەڵێ:

کوا شوناسنامەکەت؟ کوا؟
– گەڕا
گیرفانەکانی گەڕا
نەبوو
غەمێکی قورس گرتی و بردیان
ئەوان دەیان وت و
ئەم بیری دەکردەوە
«داخۆ وێنەی ئەو کچەی لە شوناسنامەکەدا بوو
چی لێ هاتووە؟
بێناز ژێر چ پێیێک کەوتووە؟»
– غەمەکەی گرانتر بوو
تفەنگ بەدەستەکان
بەرامبەری وەستان
کە چاویان بەستەوە
بیری کەوتەوە
«پێش ونبوونی
لە ناو دیوانێکدا
دام نا
دەنا ژێر پێ نەکەوتووە»



– زەردەخەنەییێک گرتی
ڕێزێک تەقەی لێ کرا
سەری بەشلی
کەوتە سەر شانی
بەڵام زەردەخەنەکەی
نەترازا...

لەم شیعرە بەرزەدا دڵشاد دوو دیاردە کۆدەکاتەوە، یەکێکیان دڵدارییە، ئەمە هەمیشەیی و نەمرە، کچێکی خۆش دەوێ، تا ئەو پلەیە گرفتارییەتی وێنەی لەگەڵ ناسنامەی خۆی هەڵگرتووە، بۆ ئەوەی هەمیشە لەگەڵی بێ و لە باغەڵیدا لە دڵیەوە نزیک بێ. دیاردەکەی دیکە خەباتە لە ڕێگەی ڕزگاریی کوردستانا. پیاوکوژەکانی پارتی بەعس دەیگرن، ناسنامەی لێ داوا دەکەن. دیار نییە، شاعیر ماتەم دایدەگرێ لەبەرئەوەی وێنەی خۆشەویستەکەی لەگەڵ ناسنامەکەیە، کە ئەمەیان دیار نەبێ دیارە وێنەکەش لەگەڵ ئەودا بزر بووە. لە دواییدا زەردەخەنەی خۆشی لە دەموچاویدا دەفرێ کە بیری دەکەوێتەوە وێنەی خۆشەویستی لە ناو دیوانێک داناوە. لەگەڵ زەردەخەنەی خۆی تەقەی لێ دەکرێ و سەری لار دەبێتەوە و دوایی بەژیانی دێ.

بەڕاستی ئەم شیعرەی دڵشاد پێشبینییێکە تێیدا وەسفی کۆتایی ژیانی خۆی دەکا. قارەمانی ئەو شیعرەی جەنگاوەر و نیشتمانپەروەرێکی کوردە، ئەو چارەنووسەی دڵشاد بۆ ئەو قارەمانەی دیاری کردووە، لە دواییدا بەسەر خۆی هاتووە. ئەمە وەکو ئەوە وایە بە وردی ماتەمنامەی بۆ خۆی نووسیبێ و وەسفی لەناوچوونی خۆی کردبێ و چۆن دوایی بەژیانی دێ. لەم شیعرەدا دڵشاد دڵداری و خەبات، سۆز و سیاسەتی کۆکردۆتەوە، کوردایەتییەکەی لە دروشمی سیاسی ڕۆژانە چۆتە دەرەوە و ڕێبازێکی ڕۆمانتیکییانەی هونەری وەرگرتووە و بووە بەلیریکێک لەگەڵ بەسەرچوونی لایەنی سیاسی مەسەلەی نیشتمانی کورد ئەو بەسەر ناچێ و دەمێنێتەوە.

٢

دڵشاد لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «ژوورەکە» دەڵێ:

هاوسەرەکەی خەریکی دەرزی و دەزوو بوو
چاوەکانم کز بوون

دەزووەکەم بۆ پێوە ناکرێ
نا! گیانەکەم، ژوورەکە تاریکە دەنا
چاوەکانت هەر جوان و
گەش و
ڕووناکن
دەرگایان ئاوەڵا کرد و هاتنە ژوورێ
قۆڵ بەستیان کرد و بردیان
خۆیان پرسیار و وەڵام بوون
فەرمانیان دا
بخنکێنرێ
پێش هەڵواسین داوای کرد هاوسەرەکەی بێ:
– گیانە دەزووەکەت بۆ پێوە کرا؟
– بەڵێ گیانە
– دڵنیا بووی
لەوەی چاوەکانت کز نین و
ژوورەکەمان تاریک بوو؟
– بەڵێ گیانە
گەشایەوە
ڕووی کردە گاردەکەی و وتی:
– چاوپێکەوتنمان تەواو
کارم نەما
فەرموو ببەن

ئەم شیعرەی دڵشاد بەناوەڕۆک لە شیعرەکەی پێشوو دەکا، بەشێوازی دەربڕین جۆرێکی دیکەیە و داهێنانی تێدایە. لە خێزانێکدا ژن و مێرد دڵدار و دلبەری ڕاستەقینەن. ژنی جوان لەبەرئەوە نییە چاوی کز بووە بۆیە ناتوانێ دەزووەکە بەدەرزییەکەوە بکا، بەڵکو لەبەرئەوەیە ژوورەکەیان تاریکە. لەم کاتە خۆشە و لەم گفتوگۆیە ڕۆمانتیکییەدا زەبانیە پیاوکوژەکانی دەسەڵاتی بەعس بەبێ دەرگا لێدان دێنە ژوورەوە، هاتوون پیاوەکە بگرن،



پێشین بڕیاری خنکاندنیان دەرکردووە. پێش لە سێدارەدانی چاوی بە دلبەری خۆشەویستی دەکەوێ. بەبێ بایەخدان پێشوازیی مردن دەکا، لەو کاتەی دڵنیا دەبێ چاوی دلبەرەکەی هەر جوانە و گەشاوەیە دەتوانێ دەزوو بەدەرزییەوە بکا. گفتوگۆ لەگەڵ دلبەری خۆشەویست تەواو دەبێ و بەپیاوکوژەکان دەڵێ: فەرموو ببەن!.

### ٣

لە لیریکێکی ڕەنگینی دڵداریدا بەناوی «جورئەت» دەڵێ:

کەسەکەم بۆ من نازانم وەها باوە
هەموو جۆرە دڵدارییێک کە کراوە
یەکەم هەنگاو هی کوڕ بووە
نازی کچی هەڵگرتووە
سەرەڕێگەی پێ گرتووە
تا نامەیێکی داوەتێ
پەڕ و باڵی دەرکردووە
من ئەوانە چاک ئەزانم
بەڵام چی لە جورئەت ئەکەی
هەرکە چاوم پێت ئەکەوێ
قاچەکانم تێکەڵ ئەبن
لە لەنجەکانتا ون ئەبم
هەر نازانم ڕێگەم کوێیە
ئەوەم هەر بیر ئەچێتەوە
کە نامەی دڵداریم پێیە
نەگبەتیەکەش ئا لەوایە
وەکو من ئەوە حاڵمە
دڵی تۆش وەها زاڵمە
کە هیچ نەبێ
زەردەخەنەیێک ناتگرێ

هاندەر بێ
بە بەرگی ئاوریشمینەوە
لە بەردەمی منی لاتا
تازە تێرێتی ئەفرۆشی
کێ ئەوێرێ بێ بەلاتا
من خۆم ئەزانم کوێم دێشێ
بەو داخەوە ڕۆژێ ئەمرم
برینم گەییبە سەر ئێسقان
ڕوویێکی خۆشی تۆم نەدی کچی عاسمان
کە تۆ بەو حاڵە ئەبینم
لەوە ئەچێ خۆم نەبینم
گیرفانەکەم قووڵتر ئەبێ
نەکو نامە
هەر دەستیشمی تیا ون ئەبێ
ئیتر جورئەت لە کوێ بێنم
نامەی گیرفانم دەربێنم

ئەم لیریکە جوانەی دڵشاد ڕەنگدانەوەی ناو دڵ و دەروونی هەموو لاوێکی هەرزەی هەژاری دەست کورتە. دڵشاد تەعبیر لە سۆزی قوتابییێکی زانستگا دەکا. قوتابی هەستی دڵداری بەهێزە، بەڵام شەرمنە، ڕەنگە شەرمنییەکەی لە دەست کورتی خێزانییەوە هاتبێ. دڵی چۆتە کچێکی جوانی شۆخ و شەنگی دەوڵەمەند، لەوانەی دەزانن جوانن، ئەمە فیزێک و لووت بەرزییێکی لە لا دروست کردووە. شاعیر هونەروەرانە باس لە شەرمنی ئەو دڵدارە هەرزەیە دەکا کە جورئەتی ئەوەی نییە هەستی ناو دڵی بۆ ئەو کچە جوانە دەوڵەمەندە هەڵڕێژێ، نەک تەنیا ئەوە بەڵکو ناتوانێ ئەو نامەیەی لە بابەت دڵدارییەکەوە بۆ کچەکەی نووسیوە لە گیرفانیدا دەری بێنێ و بیداتێ یا بۆی بنێرێ.

ئەم لیریکە بەزمانێکی ساکاری ئاسان نووسراوەتەوە، لەبەرئەوەی بەڕاستی و هونەروەرانە وێنەی ناو دڵی لاوان دەکێشی لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا زۆر بەناوبانگ بوو لە نێوەندی لاوان و بەتایبەتی لە ناو قوتابییانی زانستگاکاندا.



٤

وەک لاسایی کردنەوەیێکی هەندێ گۆرانیی میللیی سەرزار دڵشاد دەڵێ:

حاجی لەقلەق دوو پێیە
لەسەر بانی بووکێیە
دەکچێ ماچێکم بەرێ
پیرێژن چاوی لێیە

***

چەند خۆشە سکی برسی
برنج و شلەی قەیسی
توخوا ماچێکم بەرێ
توو سەری عەدنان قەیسی

***

پەلکە پیازم تێ مەگرە
من شێتی باینجانم
شلەی بامێ مەهێنە
مەلەوانی نازانم

***

بەو عاسمانە بەو هەورە
بەڕیشی مامە گەورە
دوێنێ کچێکم ماچ کرد
ئەمڕۆ سمێڵم چەورە

دڵشاد ئەم کۆمەڵە شیعرەی وەک لاساییکردنەوەی شیعری میللیی سەرزار هۆنیوەتەوە. ئەگەر هەندێ وشە و ناو و تەعبیری سەردەمی تێدا نەبێ وەک بەرهەمێکی میللیی بێ خاوەن دەکەوێتە بەرچاو. ئەم گۆرانییانەی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی حەوت برگەیی داناوە. ئەم کێشە لە سووکترین و ڕەوانترینی کێشەکانی شیعری میللییە، بۆ گۆرانی و سروودی منداڵان بەکار دەهێنرێ. بەناوەڕۆک بریتییە لە قسەی خۆش و پلار گرتن و ڕەخنە و کۆکردنەوەی وێنەی شیعری پێچەوانەی یەکتری. لەو گۆرانییانەدا دڵشاد ناوی عەدنان

قەیسی هێناوە ئەمە لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم کابرایێکی ئەمەریکی بوو بە نەژاد عیراقی، گۆیا قارەمانی زۆرانبازی و مستەکۆڵە بوو، گەڕابووە و بەغدا دەسەڵاتی عیراق ماوەییێک سەرنجی خەڵکی عیراقی ڕاکێشا بوو بۆ شانۆی ئەو زۆرانبازییەی ئەم کابرایە لەگەڵ قارەمانی دیکەی ئەم وەرزینە دەیکرد.

***

دڵشاد محەمەدئەمین مەریوانی نووسەر و شاعیر و دراماتوورگ و ئەکتەر و ڕۆژنامەنووس بوو. بەرهەمی کەم بوو چونکە زۆر نەژیا، ئەو بەرهەمە کەمەی ئەدەبی کوردی دەوڵەمەند کرد. داهێنانی شیعری زۆر بوو. بەرهەمی نموونەی لیریکی نەتەوەکانی گێتی بوو لە ئەدەبی کوردیدا. ناوەڕۆکی بنچینەیی دڵداری بوو، خۆشەویستی ژن و سروشت، ئەمەی تێکەڵ بەئاواتی میللەتەکەی کردبوو کە سەربەستی و ئازادی و ڕزگاری نەتەوایەتی بوو. سەری بۆ دوژمنی کورد دانەنواند، لە ئەنجاما بوو بەقوربانی وشەی کوردی. شەهید لەوە گەورەتر هەیە تاوانبار بکرێ بەوەی ئەلفوبێی لاتینی بەقوتابیانی کورد وتووە! یا هەر لەبەرئەوە بەدەستی پیاوکوژەکانی پارتی بەعس کوژراوە چونکە کورد بووە!

# بەشی پەنجایەم

# جەمیل ڕەنجبەر

**١٩٤٨ - ١٩٨٠**

## ژیانی

جەمیل کوڕی ساڵح گۆران لە ساڵی ١٩٤٨ لە هەولێر لە دایک بووە، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە. لە دوای ئەمە لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی خوێندوویەتی و لە ساڵی ١٩٦٧ بڕوانامەی ئەو ئامۆژگایەی وەرگرتووە و بووە بەمامۆستای قوتابخانەی مێرگەسوور، لە پاشانا گوێزراوەتەوە قوتابخانەی سەرەتایی هەریر. لە ساڵی ١٩٧٤ کە نێوانی شۆڕشی کورد و دەسەڵاتی بەغدا تێکچوو جەمیل وەکو خەڵکێکی زۆر ڕووی کردە ناو شۆڕش، لەوێ زۆر نەمایەوە لە بەهاری ١٩٧٥ لە دوای هەرەس هێنانی شۆڕش یەکێک بوو لەوانەی کە چوونە ئێران و گەڕانەوە وڵات و دەستی کردەوە بەخەباتی نهێنی تا ساڵی ١٩٧٧ لە لایەن دەسەڵاتەوە گیرا و لە دادگا فەرمانی بەندکردنی هەتا هەتایەی بۆ دەرچوو. لە دوای ماوەیێک دەسەڵاتی بەغدا لێبووردنێکی گشتی دەرکرد بۆ بەندە سیاسییەکانی مەسەلەی کورد. جەمیل بەر ئەو لێبووردنە کەوت و لە بەندیخانە ئازاد بوو. ئیتر ئەم ماوەیەی بەهەلێکی لەبار زانی و یەکسەر ڕووی کردەوە ناو شۆڕش و چووە ڕیزی چەکدارانەوە. لەو کاتەوە جەمیل هەستی بەشاعیرییەتی خۆی کردووە ناوی «ڕەنجبەر»ی هەڵبژاردووە وەک نازناو بۆ شیعری و ناسینی لە ناو خەڵکیدا.

ئەم ماوەیە دوا قۆناغی ژیانی جەمیل بوو، چەک بەشانەوە لە خەباتدا بوو تا پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٠ لە گوندی جەلکانی پشدەرە ڕەقەی بناری کێوە ڕەش لە ناوچەی سەنگەسەر دوو هەلیۆکۆپتەری بچووک بەدۆشکە کۆمەڵێک جەنگاوەری کوردیان گوللەباران کرد، لە ئەنجامدا هەشت کەس شەهید کران یەکێکیان جەمیل ڕەنجبەر بوو. تەرمی هێنرایەوە هەولێر و لە گۆڕستانی سەید مەعرووف بەخاک سپێررا.



## شیعری

جەمیل لە ساڵی ١٩٦٦ دەستی بەشیعر وتن کردووە، واتە لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا. سەرەتا بەشیعری میللی کێشی سیلابی و جووت قافیە (مەسنەوی) دەستی پێ کردووە. یەکێکە لەو شاعیرانەی نەوەی تازە بەتاقیکردنەوەی شیعری بەحری عەرووزی تێنەپەڕیون و یەکسەر لەسەر دەستووری بزووتنەوەی «شیعری نوێ» ڕۆیشتوون. بەرهەمی تاقیکردنەوەی جەمیل لە کێشی شیعری خۆماڵیدا بەزۆری لە ساڵانی ١٩٦٦ - ١٩٦٨ بەرچاو دەکەون. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ لە پێشانا ئەم جۆرە شیعرەی وتووە، لە پاشانا هاتۆتە سەر ئەو شیعرەی دەچێتە خانەی «شیعری نوێ»وە، واتە ئەو شیعرەی لە قەسیدەییێکدا زیاتر لە کێشێک و زیاتر لە قافیەییێک بەکار دێنێ. شاعیر لە سەرەتای شیعر وتنەوە تا کۆچی دوایی لە دانانی شیعر دوا نەکەوتووە.

شاعیر هەموو کێشە سیلابییە خۆماڵییەکانی لە شیعریدا بەکارهێناوە، بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ هەشت بڕگەیی زۆر بەکار دێنێ. لە شیعرێکدا هەشت بڕگەیی دەکا بەدوو کەرت، یەکێکیان درێژ ٨ بڕگە، یەکێکیان کورت ٤ بڕگە. هەندێ جاری دیکەش لە شیعرێکدا سێ جۆرە دێڕە شیعر بەرچاو دەکەون ٤ بڕگە، ٨ بڕگە، ١٢ بڕگە. جگە لەوەی کێشەکانی دیکەی ٧ بڕگەیی و ١٠ بڕگەیی لەگەڵ ئەو کێشانەی ناویان هێنرا لە شیعرێکدا هەموویان بەکار دێنێ. قافیەی شیعری جەمیل یا مەسنەوییە، یا ڕەنگاوڕەنگە. مەسنەوییەکە لە شیعری دە بڕگەیی بەرچاو دەکەوێ، ڕەنگاوڕەنگەکە لە شیعرە نوێیەکە بەکاری دێنێ کە چەند کێشێکی خۆماڵی بەکارهێناوە لە هۆنینەوەیدا. شیعری جەمیل لە ڕووی ڕوخسارەوە هەمووی دەچێتە ناو لیریک، ئێستا ئەم جۆرە هونەرە کە لە بنچەدا ڕەنگدانەوەی لیریکی ڕۆمانتیکی ئەورووپای سەدەی نۆزدەمەوە بووە بەعالەمی. لەگەڵ ئەوەشدا چوارینی ڕوخساری شیعری کلاسیکی کوردی هەیە، بەڵام ئاسۆیێکی میللی کوردی داوەتێ بەوەی لەسەر کێشی دە بڕگەیی و جووت قافیە (مەسنەوی) هۆنیویەتییەوە. چەند چوارینێکیشی هەیە لەسەر قافیە کلاسیکییەکە (ا ا ب ا) ڕێکی خستووە.

شاعیر ناوەڕۆکی بیری کوردایەتی شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەم تێکەڵ بەسۆزی مرۆڤایەتی کردووە، دڵداری جەوهەرێکی گرنگە لە بەرهەمی شیعریدا. لە پیشاندانی نموونەی شیعری هەندێ لایەنی شاعیرییەتی ڕوون دەبێتەوە.

١

جەمیل ڕەنجبەر وەکو شاعیرێک هەستی بەوە کردووە شیعری بۆ دێ، ئەوەی خستوویەتیە سەر کاغەز بەدڵی بووە، لەمەدا لە بەشێکی زۆر لە شیعریدا بەهەڵە نەچووە. بەڵگەی باوەڕ بەخۆکردن، یا تێگەیشتن لەو بەرهەمەی بەوێنەی داهێنانێک دەیداتە خوێنەران لە دوا کۆپلەی قەسیدەی «شیعر بەبووک دەبەن»دا بەدی دەکرێ:

ئەمڕۆ هەندێ ووشەم خۆشویست
شیعرێکی شۆخم لێ چنی
پیتەکانم هەڵگیرساند و
ئاواتێکم خستە بنی

ئەو وشانەی شاعیر خۆشیویستوون ئەوانەن مانای تازە تیایاندا دۆزیوەتەوە، ئەگینا ئەگەر بۆ مانای ئەو وشانە لە فەرهەنگدا بگەڕێ ماناییێکی دەست دەکەوێ بەکەڵکی شیعر نایە.

٢

ڕیتم لای شاعیر لەنگەری سووکی ئاوازی شیعری میللی (فۆلکلۆری) پاراستووە، چونکە بناغەی وشە و ڕستە و تەعبیر بەپێی دەست لە ملانێی دەنگەکان هارمۆنیا بەڕێوە دەچێ. کێش ڕەوان و قافیە سوارە، لە شیعری «پێکەنینێک لە باوەشی گریانا» دەڵێ:

چاوێکی تیژ لە ژێر چاویلکەی بەردەسێل
بیر بەنینۆک هەڵدەکەنێ
بەقاندرمەی قەڵاتی کورد هەڵدەگەڕێ
بۆ داهاتووی چاوی خوێنین پێدەکەنێ
لە ڕاپۆرتی ئارەق ڕێژێکا نووسرا بوو
هەرچی بڵێم تەمی هەوا دەیقۆستەوە
تەرازووی شەو بەدوامەوە
خۆی دەکێشێ

قەڵاتی کورد دروشمی «ئازادی کورد»ە. لەبەرئەوەی کورد ئازادی نەدیوە، دەبێ بەخەیاڵ ئەو قەڵاتە دروست بکا. لە قەڵاتەکەدا چی نهێنییێک هەیە؟ نایزانێ! خۆ دەبێ بیر لەوەش



بکرێتەوە کە هیچی تێدا نییە. کەوا بێ ئەگەر بگاتە ناوی پێویستە بەکەلوپەل و ناوماڵی وەشاوە بیرازێنێتەوە. لەو ڕۆژگارەدا ساڵی ١٩٧٣ شاعیر لە ڕەشبینیدا دەتلایەوە چونکە ١١ی مارتی ١٩٧٠ خۆی نەکرد بە ساڵی گەیشتن بۆ سەر «قەڵاتی کورد» بۆیە «چوونە ناو قەڵات» بێ ئەنجام بوو. لە پاش ساڵێکی دیکە یا دوو ساڵ (١٩٧٥) قەڵاتەکە تالان کرایەوە.

٣

ئەگەر سەرێک لە شیعری «مردن لە گۆڕی سەرشۆڕی دەژیت»ی جەمیل ڕەنجبەر بدەین، هەندێ ڕاستیمان دەست دەکەوێ لە بابەت شاعیرەوە. لەم قەسیدەیەدا شاعیر لایەنگری ئەو باوەڕەیە «مردن لە پێناوی ژیان»، واتە کۆمەڵێک خەڵک گیانیان دەبەخشن لە پێناوی ئەوەی کۆمەڵێکی دیکە یا نەوەی داهاتوو سەربەست و بەختیار بژین. ئەمە لەخۆبووردن و قوربانی تێدایە. مرۆڤ جارێک دەمرێ، گەل نەمرە، شاعیر لەگەڵ ئەمەیە. بۆ ئەم مەبەسە تاک پێویستە گیانی ببەخشێ، چونکە سیفەتی مردن و لەناوچوونی تێدایە، لە پێناوی گەل ئەوەی نەمری و هەمیشە زیندوویی تێدایە. ئەمەیە ئەستووری بیروباوەڕی جەمیل ڕەنجبەر. ڕێکەوتێکی سەیر بوو، ڕۆژگار ئەم تیۆرییەی خستە پراکتیکەوە لە ژیانی شاعیر خۆیدا. لە کاتێکدا ژیانی لە دەست دا کە تفەنگ بەشانیەوە بوو. لە ئازادی دەگەڕا بۆ میللەتەکەی. گەلی ژێردەست بۆ ئازادی دەگەڕێ، گەلی برسیش بۆ نان، دەبێ «تاک» قوربانی بۆ ئازادی و نان بدا.

شاعیر وێڵی ئازادییە، بەشوێنیدا دەگەڕێ. کۆڵ نادا، ئەوەتا لە شیعری «کێ لە سەربەرزی بەتەمەنترە» لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

گوڵی خۆزگە
چۆن بۆ چڵی داری ژیانی دەگەڕێ
یا چۆن سەعات قورمیشی لێ ون بووە
ئارەقەی دواکەوتن دەسڕێ
گیانە منیش وێڵی چاوتم
سەد ئەوەندە لێت دەگەڕێم

لە کۆتاییشدا دەڵێ:

ئەرێ گیانە
ئیتر نامەم بۆ مەنێرە
پوولی پۆستە نامەکانم دەپشکنێ
سندووقی سوور
گۆڕی مردن بۆ وشەی جوان هەڵدەکەنێ
ئیتر نامەم بۆ مەنێرە
بەرێگەی کۆن بۆم مەنێرە
تا دێمە لات یا تۆ بەخۆت دێیتە ئێرە

شاعیر دۆش داماوە، سەری لێ شێواوە. «ئازادی» لێ بووە بەئەفسانە! هەموو جۆرە بەرنامە و پیلانێکی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەو «ئازادی»یە. وەکو بلێی رێگە و پیلانی دیکە نەماوە بۆ ئەم ئامانجە بەکار بهێنرێ. مەبەسی شاعیر جۆر و شێوەی دیپلۆماسییەت و پۆلیتیکێکی کلاسیکییە تا **٢**ی ئاغستۆسی **١٩٧٣** - رۆژی دانانی شیعرەکە - بەکار هێنراوە بۆ گەیشتن بە«ئازادی». ئەمەی لە دێڕی «بەرێگەی کۆن بۆم مەنێرە» دەربڕیوە. لە پاش ئەوە دیسانەوە شاعیرانە سەری لێ شێواوە، چونکە نازانێ خۆی دەگاتە ئەم ئازادییە! یا ئازادی دێتە لای. ڕەنگە ئەمە نموونەی دوارۆژبینی بێ لای شاعیر. ئەوەتا ئێستا هەموو بەڵگەییێک ئەوە دەگەیەنن ئێمە بۆمان نەکرا بگەینە ئازادی، بەڵام لەوە دڵنیاین پۆلیتیکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەورێکی باڵای دەبێ لە دوارۆژدا لە هێنانی ئازادی بۆ خاکی ئێمەش.

٤

شاعیر لە ئازادی بەولاوە شتی دیکە نابینێ، یاخود بەلای ئەوەوە ئازادی لە هەموو شتێکی دیکە گرنگترە. لە شیعری «پیرێکی بەندکراو»دا، مامە پیرە، مامە سوارەیە، بەڵگەی «کوڕی ئازا»ی کوردە. هەرچەندە کوڕی ئازا ناگیرێ، بەند ناکرێ، ئەگەر بەرێکەوت بەدیلیش بگیرێ، زوو کۆت دەشکێنێ و پێوەند دەپچڕێنێ و خۆی ئازاد دەکا، ئەویش وێڵی ئازادییە. لە پشت چیای قاف، لە نزیک ئەشکەوتی کانیاوی ئاوی ژیانیشی بێ، دەبێ ئازادی بدۆزێتەوە. شاعیر ئازادی لە گوارەی نازەنین و نیگار و شۆڕەکچاندا دەبینێ:



مامە سوارە
مناڵەکان چاوەڕێتن لەو بنارە
ڕۆ ڕۆیانە! دەگریەن بۆ جووتێ گووارە
بۆ دەسگیرانی دێرینیش کوانێ گووارە
مامە سوارە! کوانێ گووارە
کوانێ گووارە
بێنە گووارە
جارێ گووارە نییە، بەڵام جوانان بەبێ گووارەش دەژین.

٥

دوورکەوتنەوەی قوتابیان لە مامۆستا کارەساتێکی جەرگبڕ و تەپینی دەروونە بۆی. یەکێ لە شیعرە پڕ لە سۆز و گیانییەکانی جەمیل ڕەنجبەر «برووسکەییێک لە دڵەوە»یە.

شاعیر مامۆستا بوو، زوو زوو دەبوو بەمیوانی گرتووخانە و بەندیخانە و ناو ئەو شاخانەی نەدەکەوتنە بەرچاوی نەیاران. لە قوتابیان دوور دەکەوتەوە. دوورکەوتنەوە پچڕانی ڕەگ و دەماری ژیانە بۆ ئەو مامۆستایەی قوتابیی خۆی خۆش بوێ و بەبێ ئەو هەڵنەکا.

جەمیل ڕەنجبەر هەست و نەستی ناسکی دەڕژێنێتە سەر تەلی کەمانجە. ئاوازی نەمر دەخزێ تا هەموو «بوون» دەگرێتەوە. بەڵێ! شاعیر بەلەش لە شاگردەکانی دوورە، بەڵام بەگیان لەگەڵیاندا یەکە، بەم جۆرە قسەیان لەگەڵدا دەکا:

لەگەڵتانم
شاگردەکان! دوور نیم لێتان
نزیکتانم
توخمی شیلەی گوڵە گەنمی فەریکتانم
لە ناو جانتای کتێبتانا
دەرسی شیکاری شەوتانم
نزیکتانم کاوەی نەورۆزی خەوتانم
لەگەڵتانم لە هاتوچۆی قوتابخانە
دڵم لە ناو دڵتانایە

پەپوولەی زیندانی تەمەن
لە ناو باغی گوڵتانایە

٦

دەبێ هەستی شاعیر چۆن گۆڕانێکی بەسەردا هاتبێ لەو کاتەی دوایی بەژیانی لاوانی وەکو شەهاب و جەعفەر و ئەنوەری بەرگوێ کەوتووە! ڕەنگە ئەگەر شاعیرانە بۆی بچین، دەبێ بڵێین جەمیل ڕەنجبەر لەو کاتەدا خۆزگەی کردووە ئەویش یەکێک بوایە لەوان، چونکە لەگەڵیاندا هاوپیشە بوو لە گۆڕەپانی وشە و خەباتی کوردیدا، بەڵام لە شیعری «بەیادی تاڤگە سوورەکە» لە سووچێکی دیکەوە دەنوارێتە دیمەنەکە.

ئەم شیعرەی جەمیل ڕەنجبەر لە دوای لە سێدارەدانی قارەمانەکان نەنووسراوەتەوە، بەڵکو لە پاش تێپەڕبوونی ساڵێک واتە یۆبیلی پیرۆزی ساڵێکی شایی و زەماوەندی خوێن. تاقیکردنەوەی هەستی شاعیر ساڵێکی خایاندووە. ماوەی ساڵێکی تەواو لە کەلێنێکی شارراوەی دڵ و مێشکی شاعیردا وێنەی سێ قارەمانەکە ئاوا نەبووە، تاقیکردنەوەکە شیعرێکی پڕ لە سۆزی داهێناوە، لە دوا کۆپلەیدا دەڵێ:

ئەی چاوەکان
ساڵی ڕۆیی تیشکەکانتان ئاگر دەگرن
داڵی خنکان بەتۆوی لاشەتان دەمرن
زۆر چاوی تر بۆ بارەگای ئێوە دێن و
بڕیاری سەربەرزی دەدەن
لە خاکی گڕ تێبەربووا
بەرماڵی شۆڕش ڕادەخەن
زۆر گیانی تر
تەرمەکانتان ماچ دەکەن و
دەبنە پردی بەرەو بەیان
لافاوی ڕووناکی زۆر چاو
میوانی ماڵی هەژارە
بۆ خواستنی یەک دەسگیران



٧

شاعیر داهێنانی لە مانا و ناوەڕۆکدا زۆرە، هەروەها لە ناونانی شیعری. لەوانەیە ناوی هەموو شیعرێک زوو لە بیر بکرێ، یا پشتگوێ بخرێ، بەڵام هەندێ لە ناوی شیعر جەمیل ڕەنجبەر خۆیان دێڕە شیعرن، یاخود پارچە شیعرێکی سەربەخۆن. لێرەدا ئێمە نامانەوێ ناوی شیعری «ئەو کتێبەی وشەی بەخەنجەر نووسراوە» بکەین بەبەڵگە بۆ ئەم مەبەسە، بەڵکو ناوەڕۆکی شیعرەکە خۆی گرنگە بەلامانەوە، لە سەرەتای شیعرەکەدا کە دەڵێ:

ڕێزە چیاکان
وەکو تەونی بەرەبەیان ڕاچەندرا بوون
برۆی ڕووناکی چاوی خۆر
وەکو ڕیسی مافووری دەستی قەیرە کچ
بەگوڵاڵەی باڵا لاوی ڕایەڵ کرا بوو

مەبەسی دروستکردنی ئەبستراکتێکە (تجريد) خاک لە ناو سروشتدا لە قاڵب دەدا. ئەو خاکە بووە بەمایەی ئازار و ئەندێشە، بەڵام ناشیرین نەبووە، لەبەرئەوە هەر جوانە و خۆشەویستە. لە پاش گەشتێک لە گێتیی وردەکاری وشە و ڕستە و تەعبیر و مانا، ناشیرینی لە خاک دوور دەخاتەوە، جوانی دەکا بەئەدگاری هەمیشەیی ژیان کە دەڵێ:

هاتم هاتم
ناویان لێنام بزمار کوتە
چەکوشێ بووم
ئەو دارتاشەی ئەسکەملی ئەنجومەنی
کۆشکی سپی دروست دەکرد
ئاسنگەرێ کە شیشبەندی
بەندیخانەی خوێنی باستیلی خەست دەکرد
هێزی منی پێ نەکڕا
کەوی کێوی باوەڕی پێ هەڵنەفڕا

لێرەدا شاعیر ئاماژەی زیرەکانەی هەیە کە دەڵێ کوردستان لە ئازادی دەگەڕێ، لەبەرئەوە خراوەتە ناو بەندیخانەوە. ئینجا باستیلی پاربسی کردووە بە ڕەمزی ئەو بەندیخانەیە،

کۆشکی سپیی ئەمەریکاش دەوری ئەمپریالیستی گرنگی هەبوو لە شێواندنی کێشەی کورد لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا. بەراووردی جوانی شاعیرانەی جەمیل ڕەنجبەر لەوەدایە، ئەو دارتاشەی کورسی و مێزی کۆشکی سپیی دروست کردووە، لەگەڵ ئەو ئاسنگەرەی شیشی بەندیخانەی باستیلی بەستووە، واتە دوژمنانی کورد، ئەمانە ناتوانن بەسەر هێزی ڕزگاری کورددا زاڵ بن.

***

جەمیل ڕەنجبەر شاعیرێکی ناسک و هێمن و لەسەرخۆ بوو، لە مەیدانی وشەی زمانی کوردیدا ورد و لە گۆڕەپانی خەباتی چەکداری کوردایەتیدا درشت بوو. لە گێتیی جوانکاریدا هونەروەر بوو. زمانی کوردی باش دەزانی، لە پەروەردە شارەزا و لە وانە وتنەوەی قوتابیانی قوتابخانەی سەرەتایی سەرکەوتوو بوو. لە کۆڕی خەبات و جەنگدا خوێن گەرم و بزێو و چالاک بوو. بەهەموو جۆرێ جەمیل ڕەنجبەر لە هەردوو باردا، لە وشەی جوان و خەباتی چەکدار ڕاستگۆ بوو لەگەڵ خۆی. بیروباوەڕە ناسیۆنالی و مرۆڤایەتییەکانی کردبوو بەبەرنامەی ژیانی، نەک تەنیا بەقسە، بەڵکو بەکردەوە هەموو تیۆرییەکانی گواستبووە مەیدانی پراکتیک.

جەمیل ڕەنجبەر سی و سێ ساڵ لە تەمەنی بەقەوارە کورت و کەم، بەناوەڕۆک درێژ و زۆر لەسەر تەختەڕەشەی قوتابخانە و گۆڕەپانی جەنگاوەری و ژووری تاریکی بەندیخانە بردۆتە سەر. یاد و بیرەوەرییێکی زۆری بەجێ هێشتووە، بەڵام بەنرخترین میراتی دیوانی شیعریەتی.

# ليستى ناوى كەسان

# لیستی ناوی جوگرافی

## ئـ





## ب



## پ



## ت

## ج



## چ



## ح



## خ



## د







## ر



## ز



## س

# بیبلیۆگرافیا

بەشی زۆری سەرچاوەکانی ئەم بەرگە لە بیبلیۆگرافیای بەرگەکانی پێشوودا تۆمار کراون، بەپێویست نەزانرا لەم بەرگە دووبارە بکرێنەوە. جگە لەو زانیاری زۆر لەبارەی شاعیرانی ئەم بەرگە و بەرگی شەشەم لە ئەنجامی پێوەندی هاوڕێیەتی دانەر لەگەڵیاندا هەروەها نووسینی ژیانی خۆیان بۆ دانەر، هاتوونەتە ناو کتێبەکەوە.


- ن. ئاری، هۆنراوەکانم (شیعر)، بەغدا، ١٩٦٩.
- ئیبراهیم ئەحمەد، کوێرەوەری، بەغدا، ١٩٥٩.
- ئیبراهیم ئەحمەد، ژانی گەل، سلێمانی، ١٩٧٣.
- ئەحمەد هەردی، ڕازی تەنیایی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٧؛ چاپی دووەم، سلێمانی ١٩٨٤.
- ئەخۆڵ (ئەحمەد دەروێش)، پەیمان و شیوەن (شیعر)، سلێمانی، ١٩٧٠.
- ئەشکی باوان، بەرهەمی بڵاونەکراوەی کامەران موکری، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، هەولێر، ٢٠٠١.
- ئەمینی عەبدال، مەمێ و زینێ (پۆیێم)، یەریڤان، ١٩٥٨.
- ئەمینی عەبدال، بەهارا یەکی (شیعر)، یەریڤان، ١٩٦١.
- بەرهەمی خەبات، بەشێک لە بەرهەمەکانی أ. ب. هەوری، بەکۆششی فازیل نیزامەدین، هەولێر، ٢٠٠٢.
- پیرباڵ مەحموود، مەرگی نەوجەوانی (شیعر)، هەولێر، ٢٠٠٤.
- تریفە و ڕێژاو، دیوانی شیعری محەمەد حوسێن بەرزنجی (ع. ح. ب)، بەغدا، ١٩٨٥.
- جاسمی جەلیل، ڕۆژی من (شیعر)، یەریڤان ١٩٦٠.
- جاسمی جەلیل، کۆفیا دیا من (شیعر)، یەریڤان، ١٩٨٤.
- چەپکە گوڵ، چەند پارچەیێک لە شیعری شامی کرماشانی، تاران، ١٩٨٤.
- چوارینەکانی جاهید، بەغدا، ١٩٧٩.
- حاجی جندی، هەواری (یارمەتی دان) (ڕۆمان)، یەریڤان، ١٩٦٧.
- حەسەن جاف، کامەران موکری چیرۆکنووس، بەغدا، ١٩٨٨.
- حەسیب قەرەداغی، فەرهەنگی غەم (سەرجەمی شیعری)، بەرگی یەکەم و دووەم، هەولێر، ٢٠٠٢.
- دڵشاد عەلی، دیلان شاعیر و ئازادیخواز، بەغدا، ١٩٨١.
- دڵشاد مەریوانی، پێشوازی خاوەن شکۆ و دوو چیرۆکنووس، بەغدا، ١٩٧٣.
- دڵشاد مەریوانی، سەمفۆنیای وەنەوشە (کۆمەڵە شیعر)، بەغدا، ١٩٨٠.
- دیلان، شەڕ و ئاشتی (شیعر)، سلێمانی، ١٩٥٤.





- دیلان، شێخ مەحموودی زیندوو (شیعر)، بەغدا، ١٩٥٧.
- دیلان، شیعر، بەغدا، ١٩٦٩.
- دیلان، پاییزی جاران (شیعر)، سلێمانی، ١٩٧٣.
- دیوانی ئەخۆڵ، سلێمانی، ١٩٨٣؛ چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- دیوانی بەختیار زێوەر، ئامادەکردنی مەحموود زێوەر، هەولێر، ٢٠٠٣.
- دیوانی حەیدەری (ناسیح حەیدەری)، ئامادەکردنی شێروان حەیدەری، هەولێر، ٢٠٠٠.
- دیوانی حیلمی، ئامادەکردنی ئومێد کاکەڕەش، سلێمانی، ١٩٨٥.
- دیوانی دەشتی، شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەحمەد دەشتی، (بەرلین ٢٠٠١)، هەولێر، ٢٠٠٣.
- دیوانی دڵزار، ستۆکهۆڵم – سوید، ١٩٩٢.
- دیوانی شیعر، محەمەد ساڵح دیلان، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە عەبدوڵڵا ئاگرین، ١٩٨٤.
- دیوانی عاجز، ئامادەکردنی محەمەد سەید عەبدوڵڵا بەرزنجی، بەغدا، ١٩٨٦.
- دیوانی عارف عورفی، ساغکردنەوەی ئومێد کاکەڕەش، سلێمانی، ١٩٨٥.
- دیوانی عەونی، هەولێر، ١٩٩٧.
- دیوانی فانی، بەسەرپەرشتی کەمال میراودەلی، سلێمانی، ١٩٧٦.
- دیوانی کاردۆخی، بەغدا، ١٩٧٠.
- دیوانی لوتفی، ئامادەکردنی عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی، بەغدا، ١٩٨٤.
- دیوانی موخلیس (باغی لاوان)، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی ئیبراهیم ئەحمەد حوسێن (دەسنووسی نامەی ماجستێر لە ئەدەبدا)، ١٩٨٩.
- ڕەشید نەجیب، ژیان و بەرهەمەکانی، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، هەولێر، ٢٠٠١.
- سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجیی شەهید، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی سامان مارف بەرزنجی و عومەر مەعرووف بەرزنجی، پێشەکی و پەراوێز و ساغکردنەوە عومەر مەعرووف بەرزنجی، هەولێر، ١٩٩٣.
- سەرجەمی بەرهەمی حەسەن قزڵجی، ئامادەکردنی موحسین قزڵجی، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- شکۆی حەسەن، ڤالچیچەک (شیعر)، یەریڤان، ١٩٦١.
- شکۆی حەسەن، تەمبووریێ کوردا (شیعر)، یەریڤان، ١٩٦٥.
- شکۆی حەسەن، مەرەمی گلێ کورد (شیعر)، یەریڤان، ١٩٧٠.
- عەلی عەبدولڕەحمان، خاتێ خانم (ڕۆمان)، یەریڤان، ١٩٥٩.
- عەلی عەبدولڕەحمان، دێ (دایک) (شیعر و پەخشان)، یەریڤان، ١٩٦٥.
- عەلی فەتاح دزەیی، خرۆشان و ڕامان (دیوانی شیعر)، هەولێر، ١٩٨٧.
- عوسمان دەشتی، هێمن – دەربارەی ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی شیعرەکانی، سلێمانی، ٢٠٠٣.

– قاچاغی مراد، شەوق (شیعر)، یەریڤان، ١٩٥٩.
– قاچاغی مراد، گولپەری (شیعر)، یەریڤان، ١٩٦٢.
– قاچاغی مراد، بەهارا تەزە (شیعر)، یەریڤان، ١٩٦٥.
– الكاتب الكردي قدری جان، قصص ومقالات، شعر وجمع واعداد دلاور زەنگی، ترجمة هورامی یزدی ودلاور زەنگی، اربیل، ٢٠٠١.
– کاکەی فەللاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٨.
– کامەران (حەمەی ئەحمەد تاها)، ئاشتی، سلێمانی، ١٩٥٤.
– کامەران، دیاری، بەغدا، ١٩٥٧.
– کامەران، ئاگر و ژیلە، سلێمانی، ١٩٥٨.
– کامەران، شانازی، سلێمانی، ١٩٥٨.
– کامەران، گوڵ ئەستێرە، سلێمانی، ١٩٥٩.
– کامەران، گوڵاڵە سوورە، سلێمانی، ١٩٥٩.
– کامەران، ئاوات و ڕەنج، سلێمانی، ١٩٦٨.
– کامەران، زەبری هۆنراوە، سلێمانی، ١٩٧١.
– کەریمی حیسامی، یادی هێمن، سوێد، ١٩٨٧.
– کوڕی کورد (ڕەحیمی قازی)، هشیار بوون (شیعر و پەخشان)، یەریڤان، ١٩٥٩.
– گوڵی وەریو، بەشێک لە هۆنراوەکانی شێخ لەتیف، سلێمانی، ١٩٧٥.
– محەمەد سدیق عارف (حوسێن عارف)، کامەران و هۆنراوەی نوێ، بەغدا، ١٩٥٨.
– محەمەد مەولوود (مەم)، چیرۆکەکانی مەم، بەغدا، ١٩٧٠.
– مذکرات الاستاذ اوسمان صبری (١٩٠٥ – ١٩٩٣)، ترجمة هورامی یزدی ودلاور زەنگی، بیروت، ٢٠٠١.
– مەلا مەسعوود، بەشێک لە دیوانی بێبەش، بەغدا، ١٩٧١؛ چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٨٧.
– مەدهۆش، هەمیشە بەهار، بەغدا، ١٩٤١.
– مەدهۆش، دڵ و گڵ، سلێمانی، ١٩٦١.
– مەدهۆش، سەرگوڵ، سلێمانی، ١٩٦١.
– مەدهۆش، شیرین، سلێمانی، ١٩٦٢.
– مەدهۆش، دڵی کچان، بەغدا، ١٩٦٧.
– مەدهۆش، نەریمان چی لێ هات؟، سلێمانی، ١٩٦٨.
– مەدهۆش، دڵی کوڕان، سلێمانی، ١٩٧٢.
– مەدهۆش، یانەی دڵان (هەموو بەرهەمی)، ئامادەکردنی محەمەدی مەلاکەریم، بەغدا، ١٩٨٢.





– نامەکانی مەم (محەمەد مەولوود)، ئامادەکردنی ئیسماعیل بەرزنجی، هەولێر، ٢٠٠٢.
– وەزیری نادری، وەتەن و هزکرن (نیشتمان و دڵداری) (شیعر)، یەریڤان، ١٩٦١.
– هەژار، بۆ کوردستان (شیعر)، ١٩٦٦.
– هەواری خاڵی، سەرجەمی نووسینی هێمن بەسەرپەرشتی بەدران ئەحمەد و عوسمان دەشتی، بەرگی یەکەم و دووەم، هەولێر، ٢٠٠٣.
– ا. ب. هەوری، ئازار و ئاوات (شیعر)، بەکۆششی مەحموود خەزنەدار، بەغدا، ١٩٥٦.
– ا. ب. هەوری، بەرهەمی خەبات (شیعر)، بەغدا، ١٩٥٩.
– ا. ب. هەوری، شیعری کۆن و نوێ، سلێمانی، ١٩٧٥.
– هێدی، ئاوێنەی شکاو (بیرەوەری)، هەولێر، ٢٠٠٤.
– هێمن، تاریک و ڕوون (کۆمەڵە شیعر)، بەغدا، ١٩٧٤.
– هێمن، هەواری خاڵی، چەپکێ لە پەخشانەکانی، بەغدا، ١٩٧٩.
– هێمن، کاروانی خەیام (شیعر)، هەولێر، ١٩٩٧.
– یادی سەجادی، کۆکردنەوەی دلێر عەلائەدین سەجادی، بەغدا، ١٩٨٧.

# ناوەڕۆک

# تاريخ الادب الكردي

## ١٩٤٥ - ١٩٧٥

B

ان هذا الجزء من الكتاب هو متمم للجزء السادس، ويضم بين دفتيه عرضاً لحياة خمسين شاعراً وكاتباً،

ودراسة مستفيضة لابداعاتهم الادبية.

الجزء السابع

**الدكتور معروف خزنەدار**

أربيل ٢٠٠٦

